# قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا

نووسینی: عەلی باپیر



چاپی ٢٠٢٢ز- ١٤٤٣ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice



ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

٥٧٧لاپەڕە .

١٧* ٢٤ سم .

بابەت، ئاینی .

ISBN: 978-9922-654-18-8

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی (٨٨٥ ) ی ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە.

«بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ»

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

دیزاین: نوسینگەی تەفسیر

# قورئانی مەزن
# لە نۆزدە تەوەردا





نووسینی

عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ٧٦ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ
كَرِيمٞ ٧٧ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ٧٨ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ٧٩ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ
ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٠﴾ الواقعة



# پێشکەش بۆ

بەهەرکەسێك کە هەوڵ دەدات:

هەرچی ڕاستتر قورئان بناسێ و پێی ئاشنابێ.

هەرچی جوانترو ڕێکتر بیخوێنێ.

هەرچی قووڵترو فراوانتر لێی تێبگات.

هەرچی باشترو زیاتر پێوەی پابەند بێ و کاری پێ بکات.



# پێشەکی

**إن الحمـد للـه نحمـده ونسـتعينه ونسـتغفره، ونعـوذ باللـه مـن شرور أنفسـنا ومـن سـيئات أعمالنـا، مَـنْ يهـده اللـه فـلا مُضـلَّ لـه ومـن يضلـل فـلا هـادي لـه، وأشـهد أن لا إلـه إلا الله وحـده لا شريـك لـه، وأشـهد أن محمـداً عبـده ورسـوله...**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب

أمـا بعـدُ، فـإن خـيرَ الحديـث كتـابُ اللـه، وخـيرَ الهـدي هـديُ محمـد صـلَّى اللـهُ عليـهِ وسـلَّمَ، وشرَّ الأمـورِ محدثاتُهـا، وكلَّ بدعـةٍ ضلالـةٌ وكلَّ ضلالـةٍ في النـارِ...

**خوێنەری بەڕێز!**

قورئـانی مـەزن کۆتـا فەرمایشـتی خـوا لەگـەڵ جنـدو مرۆڤـداو، کۆتا پەیامـی خـوا بۆیـان، هەرچەنـدە مـەدح و سـتایش بکـرێ و، لەبارەیـەوە بگوتـرێ و بنـووسرێ و، بەهـەر شـێوازێک لـە شـێوازەکانی خزمـەت،

خزمەت بكرێ، هەڵدەگرێ و شایستەیەتی و، بگرە هەرچی بۆی بكرێ، هەر كەمەو بە بەژنی بەرزی هەڵناگات.

بەندەش دوای تەواوكردنی ڕوونكردنەوەو تەفسیركردنی سەرجەم سەدو چوارده (١١٤) سووڕەتەكانی قورئان بە: (٦٢٣٦) ئایەتەكانیان و، (٧٧٤٣٩) وشەكان و، (٣٢١١٨٠) پیتەكانیانەوە، لە ڕۆژانی: (٢٠٢٠/٨/٢٨) تاكو: (٢٠٢٠/٩/١٨)زدا، لە دوو توێی نۆزده (١٩) تەوەرو، لە میانی بیست (٢٠) وتاردا، لە بارەی قورئان، دوا كتێب و پەیامی خواوە، دوام، بە ناو و نیشانی: (قورئانی مەزن لە نۆزده تەوەردا)، كە دوایی پاش هێنرانە سەر كاغەزو تایپكرانیان، ئەو بیست وتارە، ئەم كتێبەیان لێ بەرهەم هات.

## شایانی باسیشە:

ئەم كتێبە دوای تایپكران و دیزاین (تصمیم) كرانیشی[1]، دوو كەڕەتان بە وردیی پێیدا چوومەوەو، دەستكارییم كردوەو وردەكارییم تێیدا كردوە، تاكو بەم شێوەیەی لێهاتوە.

ئەم كتێبەش وێڕای چاپكرانی بە تایبەت و لە شێوەی كتێبێكدا، خوا پشتیوان بێ دەشیكەین بە پێشەكی گشتیی كۆی تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێزو، لە چاپی دووەمیدا دەیخەینە سەرەتای بەرگی یەكەمی.

لە پێشكەشكردنی ئەم زنجیرە دەرسەشدا «كە ئێستا بە هەرسێك شێوەی: دەنگیی و ڤیدۆیی و نووسین، هەن» كۆمەڵێك ئامانجم هەبوون:

١ـ زیاتر ناساندنی قورئان و تیشك خستنە سەری، چونكە بە دڵنیایی چاك ناسینی هەر شتێك و باشتر پێ ئاشنابوونی، بناغەی ڕاست و دورست مامەڵە لەگەڵدا كردنیەتی.

(١) - زۆریش سوپاس و پێزانینم بۆ برای دڵسۆزم كاك حاجی حیدر مظفر هەیە و، خوا پاداشتی بداتەوە، كە زەحمەتی زۆری بەهەڵە چنیی ئەم كتێبەوە كێشاوە.

٢ـ زیاتـر بـڕوا دامەزراویـی و دڵنیایـی و بەرچاوڕوونیـی مسـوڵمانان، لەبـارەی کۆتـا کتێـب و پەیامـی خـوای زانـاو توانـاوە، لـەم ڕۆژگارەدا، کـە ناحـەزانی ئیسـلام و قورئـان و موحەممـەد کۆتـا پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) زۆرن.

٣ـ ڕەواندنـەوەی تـەم و مـژی گومـان و تۆمەتـە جۆراو جـۆرەکانی کەسـانێک کـە بـە چاویلکـەی ڕۆژئاواییـەکان، کە پێـی لە کتێبـە گۆڕراوو دەسـتکارییکراوەکانی خۆیـان: «پەیـمانی کـۆن و پەیـمانی نـوێ» دەڕوانـن، تەماشـای قورئـان دەکـەن، لـە حاڵێکـدا کـە قورئـان بـە وردتریـن شـێوەی دیکۆمێنتیـی (توثیقـي) بـە ئێمە گەیشـتوەو، بە باشـترین شـێوەی پاراسـتن، پارێـزراوەو، مسـوڵمانان نـەک لەسـەر ئایـەت و بڕگەیـەک، بگـرە لەسـەر وشـەو پیتێکیـش ڕاجیاییـان نیـەو، کتێبـەکانی دیکـەی خـاوەن کتێبانیـش «بەبـێ هەڵاواردن» زۆر دەسـتکاریی کراون و، پڕکراون لە ئەفسـانەو قسـەی پـڕو پـووچ و، لەگـەڵ عەقـڵ و زانسـت و واقیعـدا دژو نەگونجـاو.

٤ـ ئیقناعکـردن یـان بـەلای کەمـەوە: بـێ قسـەکردن و دەمکوتکـردنی ئەوانـەی بـە نەزانیـی و نەشـارەزایی لەبـارەی قورئانـەوە دەدوێـن و، بـە بیانـووی پـووچ و بـێ جـێ «وەک قیاسـکردنیە سـەر کتێبـەکانی خـاوەن کتێبـان» خۆیـان لـەو هەمـوو خێـرو پیـت و پێـزو ڕۆشـناییە بـێ وێنەیـەی بێبـەش دەکەن و، زانیاریـی هیرمینوطیقـا (Hermeneutics)[1] کە لەڕۆژئاوا بـۆ مامەڵـە لەگـەڵ کتێبـە گـۆڕڕاو و دەسـتکاریی کراوەکانیـان (پەیمانـی کـۆن و پەیمانـی نـوێ)دا بەرهەمیـان هێنـاوە، بەسـەر تاکـە کتێبـی لەهەڵـەو دەسـتکاریی پارێـزراوی خوا (قورئـان)دا، دەیچەسـپێنن و، خۆیـان گیرۆدەی گێژاوێکـی بـێ پاسـاوی ترسـناك دەکـەن!

(١) - علم تأویل النصوص: زانیاریی ماناکردنی دەقەکان.
کە مەبەست لەدەقەکان (النصوص) دەقەکانی کتێبە ئاسمانییەکانە جگە لەقورئان.

٥- ئەم بەرهەمە وەک کتێبێکی زانستەکانی قورئان (علوم القرآن)ی فراوان و نایاب وایەو، بۆ باشترو ئاسانتر لێتێگەیشتنی قورئان، ڕێ تەخت و ئاچووغ دەکات و، گەلێک کۆسپ و لەمپەران لا دەبات.

هیواداریشم ئەم بەرهەمە سەرجەم ئەو ئامانجانەی بۆیان نووسراوەو تێیدا ڕەچاو کراون، بە باشترین شێوە بیانهێنێتە دی.

خوای میهرەبان بە بەزەیی بێ سنووری خۆی، هەرچی زیاتر بە کۆتا کتێب و پەیامی خۆیمان ئاشنا بکات و، لە پیت و پێزو ڕۆشناییە بێ وێنەکەی، پتر بەهرەمەندمان بکات و، هاوکاریشمان بێ بۆ زیاتر بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکانی و، چەسپاندنی بەهایەکانی و، جێبەجێکردنی یاساو حوکمەکانی و، سەرەنجام: پاک و چاکتر کردنی بەندەکانی خواو، ڕێکترو ڕاستەڕێترکردنی کۆمەڵگایەکەمان.

٤/ ذي الحجة/ ١٤٤٢ ک

١٤ / ٧ / ٢٠٢١ ز

هەولێر



# ڕێخۆشکردن

الحمد لله رب العالمين، وصلوات الله وسلامه وبركاته على جميع الأنبياء والمرسلين، خصوصاً سيدهم وأفضلهم وخاتمهم محمد، إمام المتقين وقائد المجاهدين وسيد الأولين والآخرين، وآله أجمعين من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم الدين.

**بەڕێزان!**

دوای ئەوەی خوای پەروەردگار کەرەم و لوتفی لەگەڵ نواندین و یارمەتی داین تەفسیری کۆتا فەرمایشتی بکەین، کۆتا کتێبی دابەزێنراوی بۆ سەر پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، کە لە ڕۆژی عاشووڕا لە (١٠ی مانگی موحەڕڕەم)ی ساڵی ١٤٤٢ی کۆچییدا، کۆتا دەرسمان لە بارەی کۆتا سووڕەتی قورئان سووڕەتی (الناس)، سووڕەتی سەدو چواردەمین، پێشکەش کرد، بەچاکم زانی لەبارەی قورئانەوە ئەم نۆزدە کورتە باسە بخەمە ڕوو، چونکە دوای ئەوەی لە تەفسیری قورئان بوومەوە، ئێستا بەرچاو ڕۆشنیی زیاترم هەیە لەبارەی کۆتا فەرمایشتی خواوە، کە مرۆڤەکان و جندەکانی پێ دواندوون، بێگومان کۆتا فەرمایشتی خوا -(سُبحانه وتعالى) - کۆتا دواندنی خوا بۆ مرۆڤ و جند، بەشێوەیەکە کە تەنیا شایستەی خوایە، خوا (سُبحانه وتعالى) لە قەدەر خۆی فەرمایشت دەفەرموێ و، قەدری خۆیشی وەک بۆی شایستەیە، بەس خۆی دەیزانێ، وەک خۆی دەفەرموێ:

﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾ الأنعام: ﴿٩١﴾ .

واتـە: وەک بـۆ خـوا شایسـتەیە قـەدری خوایـان نەزانیـوە، ڕێـزو حورمـەتی خـوای پەروەردگاریـان نەگرتـوە، یانـی: ئەوانـەی بێبـڕوان.

بەڵـێ فەرمایشـتی کۆتایـی خـوا، **یـەک:** لـە قـەدەر خوایـە، **دوو:** بـە ئەنـدازەی پێویسـتیی مـرۆڤ و جنـدە، ئەوەنـدەی لەسـەر زەوی ژیـانی تاقیکرانـەوەی خۆیـان دەگوزەرێنـن، کەواتـە: هەرچـی مـرۆڤ و جنـد بـۆ تێپەڕانـدن و گوزەرانـدنی ژیانیـان لـە سـەر زەوی پێویسـتییان پێیـەتی، کۆتـا فەرمایشـتی خـوا گرتوویەتـە خـۆی.

بێگومـان قورئانێـک خـوا - سـبحانە وتعـالى - دایبەزێنـێ بـۆ سـەر سـەروەری پێغەمبـەران (محمـد) صـەڵات و سـەلامی خـوای لەسـەربێ، بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی بـە درێژایـی زەمـان و ڕۆژگار، بـە پانایـی زەمیـن، هەتـا تاکـە مرۆڤێـک و تاکـە جندێـک لـەم سـەر زەوییـە مابـێ، قورئانێکی ئـاواو فەرمایشـتێکی ئـاوای خـوا، بێگومـان لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە بـێ سـنوورە.

فەرمایشـتی خـوا لـە قـەدەر خوایـەو، لەقـەدەر پێویسـتیی مـرۆڤ و جندەکانـە، کـە لەسـەر زەوی ژیـان دەگوزەرێنـن، بۆیـە نابـێ هیـچ کـەس ئومێـدی ئـەوەی هەبـێ، کـە هەرچـی لـە قورئانـدا هەیـە، دەرکـی بـکاو بیزانـێ، تەنیـا خـوا -(سُـبحانە وتعـالى) - بـە هەمـوو نهێنییـەکانی فەرمایشـتی خـۆی ئـاگادارەو، هەمـوو ئـەوەی ئایەتـەکانی قورئـان دەیگەیەنـن و دەلالـەتی لەسـەر دەکـەن، بـە تەواویـی، تەنیـا خوا -(سُـبحانە وتعـالى) - دەیزانـێ، ئێمـەی مـرۆڤ لـەم سـەرزەوییە هەرچـی بیـن، هـەم لـە ڕووی بوونـەوە، هـەم لـە ڕووی توانایەکانمانـەوە، سنووردارین؛ لـە ڕووی تەمـەن و بوونمانـەوە، ئەوەنـدە سـاڵانەی بۆمـان دیارییکـراون، ئەگـەر شەسـت و حەفتایـە، ئەگـەر تۆزێـک هەڵدەکشـێ، کـە بەدەگمـەن دەگاتـە

سـەدو لـە سـەد سـەرتر دەكـەوێ، ئێمـە لـە ڕووی تەمەنـەوە لـە ڕووی ئـەو كاتـەوە، كـە بۆمان دیارییكـراوە، لەسـەر زەوی بیگوزەرێنین، سـنووردارین، هەروەهـا لــە ڕووی توانــا جەسـتەیی و ڕووحیــی و فیكرییەكانیشــانەوە، هــەر سـنووردارین، وەك خــوا (سُــبحانه وتعــالی) فەرموویــەتی:

﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ الإسراء: ٨٥ .

واتە: كەمێكیش نەبێ زانیارییتان پێ نەدراوە.

مرۆڤێكـی ڕێژەیـی كـە تواناكانی ڕێژەییـن، تەمەنی ڕێژەییـە، لە ڕووی جەسـتەوە، لـە ڕووی ڕووحـەوە، لـە ڕووی فیكـرەوە، سـنووردارەو ڕێژەییـە، بێگومـان ناتوانـێ بـە تەواویـی لـە فەرمایشـتی مانـا ڕەهـای خـوای بـەرزی بـێ هاوتـا حاڵیـی بـێ، واتە: وەك پێویسـت لێی حاڵیـی بێ، بەڵام هەركەسـە دەتوانـێ بـە ئەنـدازەی خـۆی لـە كۆتـا فەرمایشـتی خـوا (سُــبحانه وتعــالی) حاڵیـی بـێ و تێبـگا، ئەگـەر هەوڵی بـۆ بدا.

﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ القمر: ١٧ .

واتە: بەڕاسـتیی قورئانمان ئاسـان كـردوە بۆ لێ تێگەیشـتن، ئایا كەس نیـە بـێ لێی تـێ بـگات؟! یـان: قورئانمان ئاسـان كـردوە بـۆ خوێندنـەوە، ئایا كـەس نیـە بـێ بیخوێنێتـەوە، لێـی تێبگاو تێـوەی ڕامێنـێ و لێـی بەهرەمەند بێ ؟!

ئنجا بێگومان وەك زانایانی دیكە، ئێمەش لە ڕۆژگاری خۆماندا هەوڵمانداوە: هەم بە بەهرە وەرگرتن لە زانایان و ڕوونكەرەوانی قورئان، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ و، خوا پاداشتیان بداتەوە، هەم بۆ خۆشمان بە پێی پێویستیی ڕۆژگاری خۆمان و كۆمەڵگای خۆمان و، دەوروبەری خۆمان، هەوڵمانداوە ، ئەوەی بەڕاستترمان زانیوەو لە تواماندا هەبووە، لەبارەی ڕوونكردنەوەی چەمك و واتای ئایەتە بەپێزەكانی قورئانەوە، بیخەینە ڕوو.

ئنجا بۆیەش ئێستا ئەم بابەتە [قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا] دەخەمە ڕوو، چونکە دوای ئەوەی گەیشتووینە کۆتایی تەفسیرکردنی قورئان، ئێستا دەتوانین بە ئەندازەی خۆمان بڵێین: قورئان چی تێدایە؟ کۆی ئەو باس و بابەتانەی کردوومانن، بەرچاو ڕوونییەکیان پێداوین لەبارەی قورئانەوە.

ئەم بابەتەش کە دەیخەینەڕوو، بێجگە لە قورئان و سوننەت، ئایەتەکانی قورئانی بەرزو بەپێز، دەقەکانی ڕێبازی پێغەمبەری پێشەوا (صلى الله عليه وسلم) پشتم بە چەند کتێبێکیش بەستوە، کە ئەمانەن:

١- المقدمات الأساسية في علوم القرآن، تأليف عبدالله بن يوسف الجديع، ط الثانية/١٤٢٤هـ - ٢٠٠٤م، ليدز/بريطانيا. (١)

٢- النشر في القراءات العشر، تأليف الإمام الحافظ أبي الخير محمد المحمد الدمشقي الشهير بابن الجزري المتوفي سنة ٨٣٣ الهجرية، المكتبة العصرية/١٤٣٤هـ - ٢٠١٣م، واعتنى به نجيب الماجدي.

٣- معجم القراءات القرآنية مع مقدمة في القراءات وأشهر القراء، الدكتور أحمد مختار عمر، الأستاذ بكلية دار العلوم، جامعة القاهرة، والدكتور عبدالعال سالم مكرم، الأستاذ بقسم اللغة العربية والآداب بجامعة الكويت الجزء الأول، الطبعة الثانية، ١٤٠٨هـ، ١٩٨٨م، المجلد الأول.

٤- موسوعة الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله، الكتاب الخامس، الإيمان بكتب الله (سُبحانه وتعالى).

٥- مباحث في علوم القرآن، الدكتور صبحي الصالح، دار العلم للملايين،

(١)- ئەو کتێبە لەهەموویان پتر لێی سوود مەند بووم و، کردوومە بەسەرچاوەی بنەڕەتیی زۆربەی تەوەرەکانی، بەڵام بەتێبینیی وسەرنج و هەڵسەنگاندنی خۆمەوەو و، بۆ ( تخريج )ی زۆربەی دەقەکانیش پشتم پێبەستوە، چونکە نووسەرەکەی ( د. عبدالله بن يوسف الجديع ) پسپۆڕێکی بواری فەرموودە ناسییە.

الطبعة الحادية عشرة أيلول - سبتمبر ١٩٩٠م.

٦- المحرر في علوم القرآن، إعداد دكتور مسافر بن سليمان بن ناصر الطيار، مركز الدراسات والمعلومات القرآنية بمعهد الإمام الشاطبي، الطبعة الثالثة، ١٤٣١هـ ، ٢٠١٠م.

بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە فراوانەی: [قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا] لێیان پێکدێ، لەم شەش سەرچاوەیە بەهرەم وەرگرتوە.

ئێستاش بە باشی دەزانم چاوێک بە ناوونیشانەکانی ئەو نۆزدە تەوەرەدا بگێڕین، تاکو بەرچاوی هەموو لایەک ڕۆشنبێ، بینەران و بیسەران و، دواتر خوێنەرانی بەڕێزیش، بەرلەوەی بچینە نێو وردەکارییەکان:

**تەوەری یەکەم: ناساندنی قورئان.**

**تەوەری دووەم: چۆنیەتی دابەزینی قورئان و حیکمەتەکەی.**

**تەوەری سێیەم: هۆکارەکانی دابەزینی هەندێک لەئایەتەکانی قورئان.**

**تەوەری چوارەم: زانینی مەککەیی و مەدینەیی لە نێو ئایەتەکانی قورئاندا.**

**تەوەری پێنجەم: یەکەمینی و دوایەمینی قورئانی دابەزێنراو.**

**تەوەری شەشەم: دابەزینی قورئان لەسەر حەوت پیتان، ( إنزال القرآن على سبعة أحرف).**

**تەوەری حەوتەم: پارێزرانی قورئان لە دەستکاریی کران و گۆڕدران.**

**تەوەری هەشتەم: کۆکردنەوەی قورئان (جمع القرآن).**

**تەوەری نۆیەم: هەڵوێستی هاوەڵان لە کۆکردنەوەی عوثمان**

(خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـۆ هەمـوو سـوورەتەکانی قورئـان لـە دوو توێـی موصحەفێکـدا.

تەوەری دەیەم: ڕێکخستنی قورئان (ترتيب القرآن).

تەوەری یازدەیەم: ڕێنووسی عوثمانیی (الرسم العثماني) .

تـەوەری دوازدەیـەم: گواسـتنەوەی قورئـان (نقـل القـرآن) و، ئـەو شـوبهانەی لەسـەر نەقڵـی قورئـان هـەن و، بەرپەرچدانەوەیـان.

تەوەری سێزدەیەم: خوێندنەوەکانی قورئان (قراءآت القرآن).

تـەوەری چواردەیـەم: پێشـەوایانی قورئـان خوێنـدن (أئمـة قـراءة القـرآن).

تەوەری پازدەیەم: هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا.

تەوەری شازدەیەم: تەفسیری قورئان.

تەوەری حەڤدەیەم: چاک خوێندنەوەی قورئان ( تجويد القرآن).

تـەوەری هەژدەیـەم: ئەدەبـەکانی خوێنـدنی قورئـان (آداب تـلاوة القـرآن).

تـەوەری نۆزدەیـەم و کۆتایـی: چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ قورئـانی بـە پێـزدا بکەیـن؟!



بەڕێزان !

ئەم تەوەرەی یەکەمە لە یازدە بڕگەدا دەخەینەڕوو:

## بڕگەی یەکەم: پێناسەی قورئان:

### أ. لە ڕووی زمانەوانییەوە:

قورئان وشەیەکی عەرەبییەو چاوگ (مصدر)ە بە مانای خوێندن (قراءة)، بەڵام وێڕای ئەوە، قورئان بە مانای کۆکردنەوە (جمع)یش دێ، لەبەر ئەوەی سوورەتەکان کۆ دەکاتەوەو دەیانگرێتە خۆی، بۆیە ناوی لێنراوە قورئان. ئنجا ڕایەکیش دەڵێ: قورئان ناوێکی جامیدە، واتە: دانەتاشراوە لە: (قرء يقرأ قرءآناً)ەوە، بەڵکو ناوێکی (جامد)ە وەک تەورات و ئینجیل، کە هەم بە (قران) واتە: بەبێ هەمزەو، هەم بە (قرآن)یش گۆ کراوەو دەکرێ، ئەم ڕایەش بژاردەی شافیعییە ڕەحمەتی خوای لێ بێت.[1]

بەڵام هەندێکی دیکە لە زانایان ڕایان وایە قورئان لە: (قرء يقرأ قرءاناً) هاتوە، واتە: خوێندیەوە، دەیخوێنێتەوە، خوێندنەوە، ئەمەش ڕایەکی دیکەی زانایانە، کە وشەی قورئان داتاشراوە لە (قرأ)ەوە، بەڵام بە پێی ڕایەکەی یەکەم بێ، قورئان ناوێکی جامید (اسم جامد)ەو لە وشەیەکی دیکەوە دانەتاشراوە، هەروەک چۆن تەورات و ئینجیل ناون بۆ ئەو دوو کتێبەی کە دابەزێنراونە سەر مووساو عیسا - صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ - قورئانیش ناوە بۆ ئەو کتێبەی دابەزێنراوەتە سەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ئەوە لە ڕووی زمانەوانییەوە.

(١)- (مناقب الشافعي للبيهقي)، بەرگی یەک لاپەڕە ٢٧٦ - ٢٧٧ دا، هەروەها (الأسماء و الصفات للبيهقي)، بەرگی دوو لاپەڕە ٢٧ و ٢٨.

ب. لەڕووی زاراوەییەوە:

واتـە: لـەو ڕووەوە کـە زانایـانی پسـپۆڕ و شـارەزا، چۆن لەسـەر پێناسـەی قورئـان ڕێککەوتـوون؟ لـەو ڕووەوە بـە چەنـد جۆرێک پێناسـەی قورئـان کـراوە، کـە ئێمـە دوانیـان لـێ هەڵدەبژێریـن:

أ- یەکەمیـان لە کتێبی: (المقدمات الأساسـية في علوم القرآن)دا[١] هاتوە دەڵـێ: (القرءان، وهو اسـم للكتـاب العربيِّ المنَّزل على محمـد (صلى الله عليه وسـلم) المكتـوب في المصاحـف، المبتـدأ بالبسـملة، فسـورة الفاتحـة والمختتـم بسـورة النـاس)، واتـە: قورئـان بریتییـە لـەو کتێبـە عەرەبییـە دابەزێـنراوە بـۆ سـەر موحەممـەد (صلـى اللـه عليـه وسـلم) کـە لـە موسـحەفەکاندا نووسراوەتـەوە، بە - بسـم الله - و پاشـان سـوورەتی فاتیحە دەسـت پێدەکات و، بـە سـوورەتی - النـاس - کۆتایـی پـێ دێت.

ب- پێناسـەیەکی دیکـە، دکتـۆر (صبحـي الصالح) لـە کتێبەکەی خۆی (مباحـث في علـوم القـرآن)دا[٢] هێناویەتی ، دەڵـێ: (القرءان هو الـكلام المُعجْز المنَّـزل علـى النبـي، المكتـوب في المصاحـف، المنقـول عنـه بالتواتـر المُتَعبَّـد بتلاوته).

کـە مـن ئـەم پێناسـەی دووەمیانم پـێ بەهێزترو پەسـەندتر و گشـتگیر تـرە، دەڵێ: قورئـان بریتییە لەو فەرمایشـتە دەستەوسـتانکەرە دابەزێنراوە بۆ سـەر پێغەمبـەر موحەممـەد (صلى الله عليه وسـلم) کـە لە موسـحەفەکاندا نـووسراوەو، بـە تەواوتـور لـە پێغەمبـەری خـواوە (عليـه الصـلاة والسـلام) گوازراوەتـەوەو، خوێندنەوەکەیـشی بە خواپەرسـتیی دادەنرێ.

(١)- ص٩، نووسراوی: عبدالله بن يوسف الجديع.
(٢)- ص٢١.

ج. پێناسەی خوای بەرز:

خوا (سُبحانە وتعالى) لەبارەی قورئانەوە دەفەرموێ:﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ﴾ البروج: ٢١.

واتە: بەڵكو ئەو كتێبە (یان ئەو فەرمایشتە) قورئانێكی پایەبەرزە، لە تەختەیەكی پارێزراودا.

هەروەها لە سوورەتی الواقعة، ئایەتەكانی(٧٧ و ٧٨ و ٧٩ )دا دەفەرموێ﴿ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾ الواقعة.

واتە: بە دڵنیایی ئەمە قورئانێكی بەخشندەیە (یاخود بەڕێزە). لە نووسراوێكی شێردراوەدایە، جگە لە پاككراوان دەستی ناگەیەنێ (كە مەبەست پێیان فریشتەكانە).

هەروەها هەر لەبارەی قورئانەوە خوای موتەعال، لە سوورەتی - عبس - ئایەتەكانی( ١١ – ١٦)دا دەفەرموێ:

﴿ كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ ﴿١٦﴾﴾ عبس.

واتە: وانیە وەک ئەوان دەڵێن، (یاخود ئەی موحەممەد! جارێكی دیكە وا مەكە، كە ڕووت لە بابایەكی وەک عبدالله ی كوڕی ئوممی مەكتووم وەرچەرخێنی)، بە دڵنیایی ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە، هەركەسێک بیەوێ بیری دەكەوێتەوە، (پەندی لێ وەردەگرێ و بەهرەی لێ وەردەگرێ)، لە چەند پەڕەیەكی ڕێز لێگیراودایە، بەرزكراوەو پاككراوەن، بەدەستی نوێنەرەكانەوەن، ئەو نوێنەرانە زۆر بەڕێزن و زۆر چاكەكارن.

هەروەها خوا (سُبحانە وتعالى) لەچەند جێیەكی دیكەش دا، بە چەند جۆرێک پێناسەی فەرمایشتی خۆی دەكات، كە بواری هێنانی هەموویانمان نیە.

## بڕگەی دووەم: تێکڕای سوورەت و ئایەت و وشەکانی قورئان، هەموویان فەرمایشتی خوان:

واتە: قورئان هەمووی بە تێکڕای سوورەتەکانیەوە کە (١١٤) سوورەتن و، بە تێکڕای ئایەتەکانیەوە کە وەک دوایی دەڵێین: (٦٢٣٦) ئایەتن و، بە تێکڕای وشەکانی و، سەرجەم پیتەکانیەوە، هەمووی فەرمایشتی خوایەو، خوای پەروەردگار ئێمەی مرۆڤ و جندی پێ دواندوە، خوا (سُبحانه وتعالى) لە ڕێی جیبریلەوە بە گوێی پێغەمبەری خاتەمیدا داوە (صلى الله عليه وسلم) و، جیبریل دایبەزاندوە، وەک چۆن لە خوای پەروەردگاری وەرگرتوە، ئاوا گەیاندوویەتی بە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ النحل: ١٠٢.

واتە: بڵێ (روح القدس) لە پەروەردگارتەوە بە حەق دایبەزاندوە.

هەروەها لە سوورەتی (الشعراء)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾ الشعراء.

واتە: بە دڵنیایی ئەم قورئانە دابەزێندراوی پەروەردگاری جیهانییانە (الروح الأمين) دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، تاکو تۆ لە ترسێنەران و وریاکەرەوان بی.

بەڵێ ئەم قورئانە کە خوا فێری جیبریلی کردوە، بەو شێوەیەی بەس خوا خۆی دەزانێ چۆنە! جبریلیش دایبەزاندوە بۆ سەر دڵی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) کە دوایی لە تەوەری دووەمدا باسی چۆنیەتی دابەزینی قورئان و حیکمەتەکەی دەکەین،

جیبریل بەو شێوەیە کە لە خوای موتەعال وەریگرتوە، دابەزاندوە بۆ موحەممەد (علیە الصلاة والسلام) بە بێ ئەوەی نەک ئایەتێک و ڕستەیەک، بەڵکو وشەیەک و بگرە پیتێکیشی لێ بگۆڕێ و، موحەممەدیش (علیە الصلاة والسلام) گەیاندوویەتی بە هاوەڵانی و بە ئۆممەتەکەی لە دوای خۆی، ئەوانیش بە هەمان شێوە نەک ئایەتێک و ڕستەیەک و وشەیەک، بەڵکو پیتێکیشیان لێ زایە نەکردوەو، ئەوەی کە خوا لە ڕێی جبریلەوە دابەزاندووەتە سەر دڵی موبارەکی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ئێستا هەر ئەوەیە بەدەستی ئێمەوەیە، لە دوو توێی ئەو موسحەفانەدا کە لە بەردەستماندان و، لە دڵ و سینەی هەموو ئەوانەشدا هەن کە قورئانیان هەموو لەبەر کردوە، خواش (سُبحانه وتعالی) بەڵێن و پەیمانی داوە بە هەموو لایەک کە کتێبەکەی خۆی بپارێزێ لە گۆڕان و دەستکاریی کران.



## برگەی سێیەم: نەمانی قورئان:

ئایا هیچ کاتێک بەسەر زەویدا دێ، بەسەر مرۆڤ و جندا دێ، کە قورئان نەمێنێ؟

جارێ خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرمووێ:
﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾﴾ الإسراء.

واتە: هەروەها ئەگەر بمانەوێ ئەوەی بۆ لای تۆمان سروشکردوە، لایدەبەین، دوایی تۆ هیچ سەرپەرشتیارێکت (لەبارەی هێشتنەوەی قورئانەوە) لەسەر ئێمە چنگ ناکەوێ، مەگەر بە بەزەییەک لەلایەن پەروەردگارتەوە (قورئان لەلای تۆ بهێڵین)، بێگومان بەخششی خوا لەسەر تۆ گەورەیە.

کەواتە: قورئان دەمێنێتەوە لەسەر زەوی بۆ مرۆڤ و جند، تاکو ئەو کاتەی خوا (سُبحانه وتعالى) لایدەبات، لەو بارەوەش فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتوە:

**(عن حذيفة بن اليمان وأبي هريرة رضي الله عنهما عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال:**

**ليسرى على كتاب الله عزوجل في ليلة فلا يبقى في الأرض منه آية).**

حديث صحيح أخرجه ابن ماجة ٤٠٤٩.

وأخرجه الحاكم في المستدرك ٨٤٦٠، من طريق أبي معاوية الضرير عن أبي مالك الأشجعي عن صبحي بن خراش عن حذيفة بن اليمان، قال: قال الرسول (صلى الله عليه وسلم) : **يدرس الإسلام كما يدرس وَشْيُ الثوب حتى لايُدْرى ما صيام ولا صلاة ولا نسك ولا صدقة، وليسرى على**

**كتـاب الله عـز وجل في ليلـة فلا يبقـى في الأرض منـه آية، وتبقـى طوائف من النـاس الشـيخ الكبير والعجـوز يقولون أدركنـا آبائنا على هـذه الكلمـة: لا إله إلاّ اللـه، فنحـن نقولها.** قلت إِسـناده صحيح، وقـال الحاكم حديـث صحيح على شرط مسـلم وقال البوصيري في زوائد بن ماجة: ج٣ ص١٥٤ هذا إسـناد صحيح رجاله ثقات.

وأمـا مـن حديـث أبي هريـرة أخرجه ابـن حبـان في صحيحه رقـم ٦٨٥٣ من طريـق عـلي بـن مـوسر عن سـعد بـن طـارق، وهو أبـو مالك الأشـجعي عـن أبي حـازم عـن أبي هريـرة عـن النبـي (صلى اللـه عليـه وسـلم). في الجملـة المذكورة إِسـناده صالح.

ورواه فضيـل بـن سـليمان عـن أبي مالـك الأشـجعي عن ربعي عـن حذيفة عـن أبي حـازم عـن أبي هريـرة قـالا: قـال رسـول اللـه (صـلى اللـه عليه وسـلم): **يـسرى عـلى كتاب الله ليلاً فيصبـح الناس ليس في الأرض ولاجوف مسـلم عنه آيـة.** أخرجـه الضياءُ المقدسي في اختصـاص القرآن بعوده إلى الرحيـم الرحمن، رقم ١٧: في مسـند فـردوس ج٤ ص١٦٧ وإسـناده صحيح.

ئەمە هەمووی کتێبی (المقدمات الأساسـية في علوم القرآن) هێناویەتی کە هـەرکام لـە (حذيفـة بن اليمان) و (أبو هريـرة) خوا لێیان ڕازی بـێ، لە پێغەمبەری خواوە (عليه الصلاة والسـلام) هێناویانە، کە فەرموویەتی:

شـەوێک کتێبـی خـوا - عزوجل - ناهێڵدرێـت، لەسـەر زەوی یەک ئایەتی لـێ نامێنێت، ئنجا ئەمە لـە دوو فەرموودەوە وەریگرتـوە، یەکێکیان: حوزەیفەی کـوڕی یەمـان دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (عليـه الصـلاة والسـلام) فەرمـووی: ئیسـلام دەسـڕێتەوە وەک چۆن ڕەنگی پۆشـاک دەچێتەوە، تاکو نازانرێ ڕۆژوو چییـەو، نوێـژ چییـەو، قوربانیی سـەربڕین چییەو سـەدەقەو خێر چییـە، کتێبی خـوا - عزوجـل- لە شـەوێکدا ناهێڵرێت، یەک ئایـەتی لەسـەر زەوی لێ نامێنێ،

کۆمەڵێـک لە خەڵـک دەمێنن پیاوی بەتەمـەن و ئافرەتی بەتەمـەن دەڵێن: ئێمە بـاب و باپیرانمـان لەسـەر ئـەم وشـەیە بینیـوە: لا إلـه إلا اللـه، بۆیـە ئێمەیـش دەیڵێین.

هەروەهـا ئەو حەدیسـەی ئەبوهورەیرە دەیهێنێ کە دەڵێ: شـەوێک کتێبی خـوا ناهێڵدرێ، خەڵک ڕۆژێـک بەیانیی دەکەنەوە کە لەسـەر زەوی لە هەناوی یەک مسـوڵماندا ئایەتێک نامێنێ.

کەواتـە: ئـەم قورئانـە تاکـو لەبـەر دەسـتماندایە و خـوای پـەروەردگار هێشـتوویەتەوە، عاقڵ ئەو کەسـەیە کە باشترین بەهرەی لـێ وەربگرێ، چونکە کاتێـک دێ کـە قورئـان ئایەتێکـی لەسـەر زەوی لـێ نامێنێ.



## بڕگەی چوارەم: بێگومان قورئان سیفەتی خوایەو فەرمایشتی خوایە (سُبحانه وتعالى) :

قورئـان سـیفەتی خودایـە، نـەک دروسـتکراوی خوابـێ، وەک کاتی خـۆی موعتـەزیلـە و ئێسـتاش ڕەنگە هەندێک کەس وا بیـر بکەنەوە، چونکە خوا (سُـبحانه وتعـالى) کـە دەفەرموێ:

﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴾ النساء: ١٦٤.

واتە: خوا بە دواندن موسای دواندوە.

کەواتە: دواندن بۆ خوا سـیفەتێکی خوایە، ئنجا ئایا خوا چۆن مووسـای دوانـدوە؟ ئێمـە نازانیـن، ئنجـا بـە هەمان شـێوە خوا (سُـبحانه وتعـالى) ناوی لـە قورئانیش ناوە: فەرمایشـتی خوا:

﴿ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴾ النساء: ٨٧.

﴿ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴾ النساء: ١٢٢.

﴿ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ﴾ التوبة: ٦.

مانای وایە قورئانیش فەرمایشـتی خوایە، خوا بەو سـیفەتەی کە مووسـای پـێ دواندوە کە دواندنی خوایە، بەهەمان شـێوە ئەو سـیفەتەی لەم موسـحەفەش دا بەرجەسـتە بـووە کـە قورئانـە و مرۆڤایەتیـی پـێ دوانـدوە، هەروەهـا هەمـوو کتێبەکانی دیکەی خواش چ سـوحوفی ئیبراهیم و مووسـا، چ تەوڕاتی مووسا، چ زەبووری داوود، چ ئینجیلی عیساو، هەموو پەیامەکانی دیکەی خوا، فەرمایشتی خـوان و، دوانـدنی خوا بوون بۆ مرۆڤایەتیی یان بەشـێک لە مرۆڤایەتیی، هەرکام لـە قۆناغـی ژیانی ئەو پێغەمبـەرەدا (علیه الصلاة والسلام) کە ئـەو کاتە بووە.

بێگومـان وشـەی قورئـان ناوە بۆ کـۆی فەرمایشـتی خوا کـە مرۆڤایەتیی پـێ دوانـدوە، هەروەهـا جندیشی پـێ دواندوە.

**برگـەی پێنجـەم: بێگومـان وەک چـۆن بـە کـۆی قورئـان دەگوتـرێ: قورئـان، بـە هـەر سـەدوچواردە سـوورەتەکەو، بـە هـەر شـەش هـەزارو دووسـەدو سـی و شـەش ئایەتەکـەوە، بەهەمـان شـێوە بـە بەشـێک لـە قورئـان و بـە سـوورەتێکیشی هـەر دەگوتـرێ: قورئـان:**

بە بەڵگەی ئەوە کە خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:
﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ الأعراف: ٢٠٤.

واتـە: هەرکاتێـک قورئـان خوێندرایـەوە، گوێـی بـۆ هەڵبخـەن و بێدەنگـبن، بەڵکـو بەزەییتـان لەگـەڵ بنوێـنرێ.

کـە بەتەئکیـد مەبەسـتی هەمـوو قورئـان نیـە، واتـە: ئەگـەر سـوورەتێکی قورئـان یـان چەنـد ئایەتێـک لـە قورئـان خوێندرانـەوە، کەواتـە: بـە سـوورەتێکی قورئـان و، بـە چەنـد ئایەتێـک لـە قورئانیـش هـەر دەگوتـرێ: قورئـان.

## بڕگــەی شەشــەم: ژمــارەی ســوورەت و ئایــەت و پیتــە کانی قورئــان:

ژمارەی سوورەتە کانی قورئان سەدو چواردەیە (١١٤).

ئایەتـە کانی قورئـان چەنـد ژمارەیە کیـان بـۆ دانـاون: لـە: ٦٢٠٤ تاکـو ٦٢٣٦ ، بـەڵام زۆربەیـان ڕایان وایـە کە ژمارەی ئایەتـە کانی قورئان (٦٢٣٦) ە، جیاوازیـی زانایانیـش لە ژمارەی ئایەتە کانی قورئانـدا، ناگەڕێتەوە بۆ ئەوە کـە یە کێکیـان بڵـێ: ئـەو ڕستەیە قورئانە، ئـەوی دیکـە بڵێ: نەخێـر قورئان نیـە، چونکـە زانایـان لەسـەر وشـەیە کی قورئانیـش ڕا جیاییـان نیـە، بەڵکـو هـۆکاری ڕاجیاییەکـە دە گەڕێتـەوە بۆ ئـەوە کە لە کوێ دەوەستێ؟ هەندێک لـە زانایـان ڕستەیە کیان کـردوە بـە دوو ئایـەت، هەندێکیـان کردوویانـە بـە یـە ک ئایـەت، لێرەدا ڕا جیایی پەیـدا بووە، لە ژمـارەی ئایەتـە کانی قورئاندا، لـە کورتیـی و درێژیـی ڕسـتەکاندا و، لـە شـوێنی وەسـتان و شـوێنی دەستپێکردنەوەی ئایەتە کانـدا.

ژمــارەی وشــە کانی قورئــان: حەفتــاو حــەوت هــەزارو چوارســەدو ســی و نـۆ (٧٧٤٣٩)یـەو، ژمـارەی پیتـە کانی قورئانیش: سێسـەدو بیسـت و یـە ک هـەزارو سـەدو هەشـتا (٣٢١١٨٠)یـە، هەڵبەتـە چ لـە بـارەی ژمـارەی وشــە کان و، چ ژمــارەی پیتە کانــەوە، دە گونجــێ ڕای دیکــەی جیاوازیــش هەبـێ، بـەڵام ئەمـە ڕای زۆرینەیانـە.

## بڕگەی حەوتەم: ناوەکانی قورئان:

خـوای کارزان وەک: لـە بڕگـەی هەشـتـەمدا بـاس دەکەیـن، بـە زۆر وەسـف ،کۆتـا فەرمایشـتـی خـۆی پێناسـەو وەسـف کـردوە، بـەڵام پێنـج نـاو بـۆ قورئـان بـەکار هاتـوون:

**یەکەم:** (الکتاب)، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ﴾ البقرة: ٢.

ئەو کتێبە هیچ دوو دڵیی هەڵناگرێ و، دوو دڵیی تێدا نیە.

**دووەم:** (القرآن):

﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴾ الحجر: ١.

هەروەها : ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾ النمل: ١.

(قرآن)یـش یەکێکـە لـە نـاوەکانی ئـەم کۆتـا فەرمایشـتـەی خـوا، کـە (کتـاب) بـە مانـای نـووسراو (مکتـوب)ەو، قورئانیـش بـە مانـای خوێندراو (مقـروء)دێ، یاخـود ناوێکـی جامیـدە بـۆ کۆتـا فەرمایشـتـی خـوا.

**سـێیەم:** (الفرقـان): ئەمیـش یەکێکـە لـە نـاوەکانی قورئـان، وەک خـوا - عزوجـل - لـە سـوورەتی (الفرقـان)دا دەفەرمـوێ:

﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾ الفرقان: ١.

واتـە: بەرزیـی و پێـز بـۆ ئـەو زاتـەی کـە فورقـانی دابەزاندووەتـە سـەر بەندەکـەی، تاکـو وریاکـەرەوەو ترسێنەربێ بـۆ هەمـوو جیهانییـان.

**چوارەم:** (الذکر):

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ الحجر: ٩.

ئێمە خۆمان ذیکرمان دابەزاندوەو، هەر خۆیشمان پارێزەرینی.

**پێنجەم:** (کلام الله):

ناوێکی دیکە کە خوا بۆ فەرمایشتی خۆی بەکاری هێناوە، بریتییە لە: (کلام الله)، وەک خوای بەرزی مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾ التوبة: ٦.

واتە: ئەگەر یەکێک لە هاوبەش بۆ خوا دانەران پەنای لە تۆ خواست کە پەنای بدەی، پەنای بدە تاکو گوێبیستی فەرمایشتی خوا دەبێ، دوایی بیگەیەنە شوێنێکی دڵنیایی خۆی، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە نازانن.

ئەم پێنج ناوە قورئانیان پێ دەناسرێ، هەڵبەتە دوای ئەوەی لە سەردەمی عوثماندا خوا لێی ڕازی بێت، هەموو سووڕەتەکانی قورئان خرانە دوو توێی دوو بەرگەوە، ناوی (مصحف)یشی بۆ بەکار دەهێندرێ بەڵام موسحەف ناوێکە لە نێو مسوڵماناندا باوەو، موسوڵمانان بەکاریان هێناوە، بەڵام ئەو پێنج ناوەی دیکە هەر پێنجیان خوا (سُبحانه وتعالى) بۆ کۆتا فەرمایشتی خۆی بەکاری هێناون.



## بڕگەی هەشتەم: سیفەتەکانی قورئان (أوصاف القرءان):

لێرەدا دەگەڕێمەوە بۆ کتێبی پێنجەم (الإیمان بکتب الله (سُبحانه وتعالی)) لە مەوسووعەی (الإسلام کما یتجلّی في کتاب الله)دا، و چل لە سیفەت و وەسفەکانی قورئان کە خوا (سُبحانه وتعالی) بۆ کۆتا فەرمایشتی خۆی بەکاری هێناون، هێناومن، ناشڵێم قورئان تەنیا ئەو چل وەسفەی هەیە، دەگونجێ زیاتریش بن، بەڵام من ئەو چلەم کەوتوونە بەرچاو، لەو مەوسووعەیەدا کە کاتی خۆی لە سجنی ئەمریکاییەکاندا نووسیومە:

### سیفەتی یەکەم: [العظیم]:

وەک خوا (سُبحانه وتعالی) دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴾ الحجر: ٨٧

کە (السبع المثاني) بریتین لە حەوت ئایەتەکانی سوورەتی (الفاتحة)، بەڕای زۆربەی زانایان، چونکە لە نوێژەکاندا دووبارە دەبنەوەو، ستایشیان پێ دەکرێ بۆ خوا (سبحانه وتعالی) [القرءان العظیم] یش بریتییە لە کۆی سەدو چواردە سوورەتەکەی قورئان.



سیفەتی دووەم: (الكريم):

وەک خوا فەرموویەتی:
﴿ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴾ الواقعة: ٧٧.
(كريم) واتە: خاوەن ڕێز و قەدر و شەڕەف، بەخشندە، بێگومان هەرکەسێک لەگەڵ قورئاندا بەو شێوەیە کە شایستەیە، مامەڵە بکات، قورئان لە هەموو سیفەتەکانی خۆی کەم و زۆر پێی دەبەخشێ.

سیفەتی سێیەم: (المجيد):

وەک خوای بەرز فەرموویەتی:
﴿ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ٢١ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ٢٢ ﴾ البروج.
مەجیدیش بریتییە لە خاوەنی مەجدو بەرزیی و سەرۆکایەتیی و گەورەیی.

سیفەتی چوارەم و پێنجەم: (علي حكيم):

وەک خوای بەرز فەرموویەتی:
﴿ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٣ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ٤ ﴾ الزخرف.
واتە: ئێمە گێڕاومانە بە قورئانێکی عەرەبیی بەڵکو بفامن و، ئەم کتێبە لە ئوممولکیتاب (لە زانیاریی خۆمان)دا لەلای ئێمە بەرزی کارزانە.
عەلی واتە: بەرز، خاوەن پێگەی بەرز، حەکیمیش واتە: خاوەن حیکمەت و لێزانیی و کارامەیی.

سیفەتی شەشەم: (عزیز):

وەک خوای موتەعال لە سوورەتی - فصلت -دا دەفەرموێ:
﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ٤١ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ٤٢ ﴾ فصلت.

واتە: ئەوانەی بێبڕوان بە ذیکر کاتێک کە بۆیان هات و بە دڵنیایی قورئان کتێبێکی زاڵە، باڵا دەستە، باتیڵ و ناحەقیی نە لە پێش دەستیەوە نە لە دوایەوە بۆی نایەت، لە لایەن خوایەکی کارزانی ستایشکراوەوە دابەزێنراوە.

(عزیز)یش واتە: خاوەن عیززەت و باڵا دەست کە هیچ کەس و هیچ شتێک بەسەریدا زاڵ نەبێت و زاڵ بێ بەسەر هەموو لایەکدا.

سیفەتی حەوتەمی قورئان: (عجب):

وەک لە سوورەتی جینن ئایەتی ژمارە یەکدا خوا دەفەرموێ:
﴿ قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ﴾ الجن: ١.

واتە: بڵێ سروشم بۆلا کراوە کە کۆمەڵێک لە جند گوێیان هەڵخست گوتیان: ئێمە گوێمان لە قورئانێکی عەجەب بوو.

عەجەب چاوگی (عَجِبَ، يعجَبُ، عَجَباً)ە، کە لێرەدا بە مانای سەر سوڕهێنەرە، (عجب) واتە: ئەو شتەی کە هەرکەسێ بیبینێ، یان بیبیستێ، پێی سەرسام و سەرسوڕماو دەبێ، وەک فەرهەنگەکانی زمان دەڵێن.

دیارە ئەم وشەیە هەم بۆ مەدح بەکاردێ هەم بۆ زەم، بەڵام بەپێی ڕەوت (سیاق)ی ئەو ئایەتانە لێرەدا، دەزانین کە بۆ مەدح و ستایشە.

## سیفەتی هەشتەمی قورئان:

بریتییە لە (مُبین) واتە: ڕۆشن یاخود ڕۆشنکەرەوە. وەک لە سوورەتی (یوسف)دا خوا دەفەرموێ:
﴿الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾ یوسف: ١.

واتە: (ئەلیف ، لام ، ڕا) ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی ڕۆشنن، یاخود ڕوونکەرەوەن، دیارە (مُبین) هەم بە مانای ڕۆشن دێ لە خودی خۆیدا و، هەم بە مانای ڕوونکەرەوەش دێ. چونکە (بان الشيءُ، أي وضح و ظهر، و أبان الشيءُ أي ظهر، وأبان فلانٌ قَصْدَهُ أي أظهره) واتە: (مُبین) لە (أبان)ەوەیە کە هەم حاڵەتی لازیمی هەیە: (أبان القَمَرُ) مانگەکە دەرکەوت، هەم حاڵەتی تێپەڕێنەر (متعدّي)ی هەیە بۆ بەرکار، (أبان فلان قصدَهُ) فلانکەس مەبەستی خۆی دەرخست. کەواتە: (مُبین)یانی: ڕوون، ڕوونکەرەوە.

## سیفەتی نۆیەمی قورئان: (مبارک):

خوا - عزوجل - لە سوورەتی - الأنعام -دا دەفەمەرموێ:
﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾ الأنعام: ١٥٥.

واتە: ئەمە کتێبێکە دامانبەزاندوە موبارەکە، شوێنی بکەون و پارێز بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ، موبارەک واتە: خاوەن خێرو بەپێز و بەرهەمدار.

سیفەتی دەیەمی قورئان: (نور):

وەک خوا لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:
﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴾ المائدة: ١٥.
واتە: بە دڵنیاییی لە خواوە ڕووناکیی و کتێبێکی ڕوونکەرەوە، یاخود کتێبێکی ڕۆشنتان بۆ هات، (نور) واتە: ڕووناکیی، ئەوە کە لە خودی خۆیدا ڕۆشنبێ و بۆ غەیری خۆیشی ڕوونکەرەوەبێ.

سیفەتی یازدەیەمی قورئان: (حق):

وەک خوای موتەعال دەفەرموێ:
﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾ الزخرف: ٣٠.
واتە: کاتێک حەقیان بۆ هات، گوتیان: ئەمە جادوویە و ئێمە پێی بێبڕواین.
وشەی (حق)یش لە ئەسڵی زماندا بە مانای چەسپاوو نەلەقاوو دامەزراو دێ.

سیفەتی دوازدەیەم: (برهان):

لە سوورەتی (النساء)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴾ النساء: ١٧٤.
واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە بورهانتان بۆ هاتوە و ڕوناکییەکی ڕۆشنکەرەوەمان بۆ دابەزاندوون.
(برهان) بریتییە لە بەڵگەیەکی ڕوونی ئاشکرا، کە هیچ کەس نەتوانێ نکووڵیی لێ بکا.

سیفەتی سێزدەیەمی قوڕئان: (بينة):

وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ﴾ الأنعام: ﴿١٥٧﴾.
واتە: بەدڵنیاییەوە لە پەروەردگارتانەوە (بَيِّنَة)تان بۆ هاتوە، هەروەها ڕێنمایی و بەزەیی، (البَيِّنة هي الحجة القاطعة الدامغة التي تُفْحِمُ المقابل وتُسْكِتُهُ) (بَيِّنة) بریتییە لەو بەڵگە هەڵبڕەرە کە بەرامبەر بێدەنگ دەکات و دەستەوسانی دەکا.

سیفەتی چواردەیەمی قوڕئان: (هدى):

وەک خوا فەرموویەتی:
﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ﴿٢﴾.
ئەو کتێبە هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، ڕێنماییە بۆ پارێزکاران، دیارە (هدى) هەم بە مانای ڕێنمایی و ڕێ پیشاندان دێ، هەم بە مانای بە ئامانج گەیاندن دێ، کە قوڕئان بە هەردوو واتایە کە (هدى)یە.

سیفەتی پازدەیەم: رحمة:

وەک خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:
﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ النحل: ﴿٦٤﴾.
واتە: ئێمە کتێبێکمان بۆ تۆ دانەبەزاند، مەگەر بۆ ئەوەی هەرچی تێیدا کەوتوونە ڕا جیایی، بۆیان ڕوون بکەیەوەو ڕێنمایی و بەزەیی بێ بۆ کۆمەڵێک کە بڕوا بێنن.
بەڵێ قوڕئان ڕەحمەتە، واتە: هەر کەسێک شوێنی بکەوێ، دەیگەیەنێ بە بەزەیی خواو بە بەخششی خواو بە ڕەزامەندیی خوا.

سیفەتی شازدەیەم بۆ قورئان: (موعظة):

وەك خوا لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾ یونس: ٥٧.

واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتوە، ئامۆژگارییش بریتییە لە هەر قسەیەک کە لە کەسێکی بە پەرۆشەوە دەردەچێ و هاندان و ترساندن، یاخود ئارەزوو مەندکردن و ترساندنی ئاوێتە بکرێ، بۆ ئەوەی بابای ئامۆژگارییکراو لێی بەهرەمەندبێ.

سیفەتی حەڤدەیەمی قورئان: (شفاء):

وەک خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:
﴿ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّٗا لَّقَالُواْ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ءَا۬عۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۖ ﴾ فصلت: ٤٤.

واتە: ئەگەر قورئانمان گێڕابایە بە قورئانێکی ئەعجەمیی، (بە زمانی غەیری عەرەبیی)، دەیانگوت: بۆچی ئایەتەکانی ڕوون نەکراونەوە، ئایا قورئان غەیری عەرەبییەو بۆ سەر عەرەبێک دابەزێندراوە؟ بڵێ: ئەم قورئانە ڕێنمایی و شیفایە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە.
شیفا: بریتییە لە لاچوونی دەردو نەخۆشیی و چاکبوونەوە لە نەخۆشیی و ،گەڕانەوەی تەندروستیی بۆ مرۆڤ.

سیفەتی هەژدەیەم: (بُشْری):

یەکێکی دیکە لە وەسف و سیفەتەکانی قورئان کە خوا کۆتا فەرمایشتی خۆی پێ وەسف کردوون، بریتییە لە: (بشری). وەک لە

سوورەتی (النحل)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ النحل: ١٠٢.

خوا بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ (عليه الصلاة والسلام) بڵێ: ڕوحولقودس لە پەروەردگارتەوە بە حەق دایبەزاندوە، تاکو ئەوانەی بڕوایان هێناوە پێی بچەسپێنێ وڕێنمایی و دڵخۆشکەرە بۆ مسوڵمانان.

(بشری) و (بشارة)، بریتییە لە هەر قسەیەک یان هەواڵێکی دڵخۆشکەر کە دڵخۆشیی دەخاتە دڵی باباى بیسەرەوە، بێگومان کتێبی خواش مرۆڤ و کۆمەڵگا دڵخۆش دەکا، بە خێرو چاکەو دنیاو دوا ڕۆژ، بۆ هەرکەسێک کە تێیبگات و بەهۆیەوە پێ بگات و، دەستی پێوە بگرێ.

سیفەتی نۆزدەیەم: (ذکری):

وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْعَـٰلَمِينَ ﴾ الأنعام: ٩٠.

واتە: بڵێ: من لە سەر گەیاندنی قورئان هیچ کرێتان لێ داوا ناکەم، قورئان تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان.

(ذکری): بریتییە لە هۆکاری بیرخستنەوەو پەند وەرگرتن و ئامۆژگاریی، یاخود بریتییە لە زۆر بیرخستنەوە.

سیفەتەکانی بیست و بیست و یەک: (بشیر ونذیر):

وەک لە سوورەتی (فصلت)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ حمٓ ١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٢ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٣ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ٤ ﴾ فصلت.

واتە: حا میم، دابەزێنرانی ئەم قورئانە لە لایەن خوای بە بەزەیی بەخشندەوەیە، کتێبێکە ئایەتەکانی ڕۆشنکراونەوە، قورئانێکی عەرەبییە بۆ کۆمەڵێک، بۆ خەڵکێک بزانن، دڵخۆشکەرەو ترسێنەرە.

(بشیر) واتە: (مُبَشِّر)، دڵخۆشکەر و مۆژدەدەر، کەسێک کە هەواڵێک دەدا بەکەسێک کە پێی دڵ خۆشبێ، (نذیر)، بە واتای (منذر) ە، کەسێک کە هەواڵ دەدات بە شتێک کە جێگای مەترسییە بۆ ئەوەی خۆی لێ بپارێزرێ، قورئانیش مۆژدە دەدا بە شوێنکەوتوانی، کە ئەگەر فەرمانبەریی خوا بکەن خوا (سُبحانه وتعالى) مۆژدەیان پێ دەدا بە گەیشتنیان بە ڕەزامەندیی خواو پاداشتی خواو بە بەزەیی خوا، هەروەک دەشیانترسێنێ کە ئەگەر سەرپێچیی لە خوا بکەن، خوا لێیان تووڕە دەبێ و دوچاری سزاو تۆڵەی خوا دەبن.

سیفەتەکانی بیست و دوو و بیست و سێ: (صدق وعدل):

وەک لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ الأنعام: ١١٥.

واتە: فەرمایشتی پەروەردگارت تەواوی کردوە لە ڕاستیی و دادگەرییدا، هیچ گۆڕەرێک نیە بۆ فەرمایشتەکانی خوا.

واتە: فەرمایشتی خوا - سبحانه وتعالى - لە ڕاستیی و لە دادگەرییدا

تـەواوی کـردوە، هەواڵەکانی هەموویان ڕاسـتن و، حوکمەکانیشی هەموویان دادگەرانەن و سـتەمیان تێدا نیە.

سـیفەتی بیسـت و چـوار: کـە خـوا کۆتـا فەرمایشـتی خـۆی پـێ پێناسـە کـردوە: (روح):

وەک لە سوورەتی (شوری)دا خوا دەفەرمویّ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ ﴾ الشوری: ٥٢.

واتـە: هەر بەو شـێوەیە (کـە بۆ پێغەمبەرانی پێشـوو پەیامـی خۆمانمان نـاردوە)، بۆ لای تـۆش ڕووحێکمان لـە فەرمانی خۆمانـەوە دابەزاندوە.

وەک چۆن جەسـتە بەبـێ ڕووح کەلەشـێکە جیاوازیـی نیـە لەگـەڵ مـاددەی دیکـەو خاکـی دیکـەی زەویـدا، بـە هەمـان شـێوە مرۆڤیـش و ژیانی مرۆڤیـش بەبـێ وەحیـی، بەبێ قورئـان کـە لەشـێکی بـێ ڕووحـە.

سیفەتی بیست و پێنجەمی قورئان: (محي):

لـە چەنـد ئایەتێکـی قورئانـدا خـوای پـەروەردگار ئـەوەی فەرمـووە، بۆ وێنە:

أ- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ ﴾ الأنفـال: ٢٤.

واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! وەڵامـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بدەنـەوە هەرکاتێـک بانگیانکـردن بـۆ شـتێک کـە دەتانژیەنێتـەوە (کـە قورئانـە).

کەواتە: قورئان ژیەنەرەوەیە.

ب- هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا فەرموویەتی:

﴿ أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ ﴾ الأنعـام: ١٢٢.

واتـە: ئایا کەسێک کـە مـردوو بـوو، ژیاندمانـەوە و ڕوناکییەکیمان پێـدا کـە لـە نێـو خەڵکـدا پێـی ڕێـکات، پێـی بەڕێـوە بچـێ، وەک کەسـێک وایـە کـە لـە تاریکاییـان دایـە لێیـان دەربـاز نابـێ؟!

بێگومـان فەرمایشـتی خـوا ژێنـەرەوەی مرۆڤـە، کەسـێک دەبینـی سـەرگەردان، سەرلێشـێواو، ماڵوێـران و بـەڕێ نـەزان، هەرکـە دەسـتی گیربـوو لـە قورئـان، یەکسـەر ڕۆشـن دەبێتـەوە، عەقڵـی ڕۆشـن دەبێتـەوەو هۆشـیار دەبێتـەوە، دڵـی بێـدار دەبێتـەوە، ڕەوشـتی و ئـاکاری ڕاسـت دەبێتـەوە، هەڵـس و کـەوت و هەڵوێسـتی کۆمەڵایەتیـی و سیاسـیی ڕاسـت دەبێتـەوە، بەرپێـی خـۆی دەبینـێ، دۆسـت و دوژمـن دەناسـێ، دەزانـێ حـەڵاڵ چییـەو حـەڕام چییـە، چاکـە چییـەو خراپـە چییـە، ڕاسـت چییـەو چـەوت چییـە؟!

سیفەتی بیست و شەشەم: (أحسن الحدیث):

خوا فەرموویەتی﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ الزمر: ٢٣.

واتە: خوا باشترین فەرمایشتی دابەزاندوە.

بێگومـان فەرمایشـتی خـوا لەقـەدەر خوایـە، خـوا (سُـبحانە وتعـالی) لـە چاکیـی و جوانیـی و تێـرو تەواوییـدا، سـنووری نیـەو ڕەهایـە، فەرمایشـتەکەشی بێگومـان باشـترین فەرمایشـتە، هەرکەسـە سـیفەتەکانی لەقـەدەر خۆینـی و، قورئانیـش سـیفەتی خوایـەو دوانـدنی خوایـە بـۆ خەڵکـی سـەرزەوی، کەواتـە: باشـترین فەرمایشـتە.

سیفەتەکانی بیست و حەوت و بیست و هەشت: (مُتاشبهاً مثاني):

واتـە: وێـک چـوو و دووبـارە بـووەوە، لـە سـوورەتی (الزمـر)دا خـوا دەفەرمـوێ:
﴿ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾ الزمر: ٢٣.

واتـە: ئـەم قوڕئانـە کتێبێکی وێکچوویـەو دووبـارە بووەوەیـە، ئەوانەی سـام و هەیبەتیان بەرامبەر بـە پەروەردگاریان هەیە، بەهۆیەوە پێسـتیان ڕێک دێ و تـەزووی پێـدا دێ، دوایـی پێسـتیان و دڵیان بەرەو یادی خـوا نەرم دەبێ.

قوڕئـان ئایەتـەکانی پێکدەچـن، سـوورەتەکانی پێـک دەچن، لـەوەدا کە هەموویـان یەکـدی بەڕاسـت دادەنێـن، یاخـود لە جوانیـی و پاکیـی و چاکییدا وێـک دەچـن، هەروەها قوڕئـان (مثاني)ە، بـەو واتایە کە مەبەسـتە بەرزەکانی تێـدا دووبـارە دەبنەوە، یاخـود لەبەر ئەوەی کە قوڕئان سـتایشی خـوای بەرزو مەزنی پـێ دەکرێ.

وەسف و سیفەتی بیست و نۆیەم: (غیر ذي عوج):

وەک لە سوورەتی (الزمر)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ الزمر: ٢٨.

واتـە: قوڕئانێکـی عەرەبییـە، (غیـر ذی عـوج)، واتـە: هیـچ لاریـی تێدا نیـە، خـاوەنی هیـچ جۆرە لاریـەک نیـە، بەڵکـو پارێزکاریـی بکەن.

عـوج: بریتییـە لـە نارێکیـی لـە بێـژەدا و لـە واتـادا، بـەڵام فەرمایشـتی خـوا لـە ڕووی بێژەکانیـەوە لـەو پـەڕی پاراویـی (فصاحة)دایـەو، لـە ڕووی ماناکانیشـیەوە لەوپـەڕی ڕەوانبێـژی (بلاغة)دایـەو، بێگومـان لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە، لـە لووتکەدایـە.

سیفەتی سییەم: (تبیاناً لکل شيء):

ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێک، وەک لە سووڕەتی (النحل)دا خوا دەفەرموێ:
﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾
النحل: ٨٩.

واتە: کتێبەکەمان دابەزاندووەتە سەر تۆ، ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێک و ڕێنماییە و بەزەییە و موژدەیە بۆ مسوڵمانان.

بێگومان قورئان ڕوونکەرەوەو بەرچاو ڕۆشنکەرەوەیە بۆ هەموو شتێک کە ژیانی مرۆڤ پەکی لەسەری بکەوێ، دەبێ ئاوا لەم ئایەتە موبارەکە تێبگەین، نەک وابزانرێ کە قورئان هەموو شتێکی تێدایە، دوایی بڵێی: ئەدی بۆچی باسی دروستکردنی سەیارەو تەیارەو پاپۆڕ و چی و چی ناکات؟! نا، خوا کە دەفەرموێ: (تبیاناً لکل شيء)، واتە: هەر شتێک کە ژیانی مرۆڤ پەکی لەسەری کەوتبێ و لە مەودای عەقڵ و بیرکردنەوەی مرۆڤدا نەبێ، قورئان ڕوونی کردۆتەوە، بەڵام ئەو شتانەی کە لە مەودای عەقڵی مرۆڤ و بیرو هۆشی مرۆڤدان، خوای پەروەردگار بۆ مرۆڤ لێیان گەڕاوە.

سیفەتی سی و یەکەم: (تفصیل كلِّ شيء):

خوا لەسووڕەتی (یوسف)دا دەفەرموێ:
﴿مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ یوسف: ١١١.

واتە: ئەم قورئانە ناگونجێ قسەیەکی هەڵبەستراوبێ، بەڵکو بەڕاست دانەری هەموو ئەو کتێبانەیە کە لەپێشیەوە بوون و

ڕوونکەرەوەیـە بـۆ هەمـوو شـتێک و، ڕێنمایـی و بەزەییـە بـۆ کۆمەڵێـک بـڕوا بێنـن.

کـە دەفەرمـوێ: (تفصیـل) دیـارە شـتێکە بـە کورتیـی بـێ، خەڵـک کەمـتر لێـی تێـدەگا، بـەڵام کاتێـک درێـژ دەکـرێ و ڕوون دەکرێتـەوە، زیاتـر لێـی تێدەگـەن، بـەو واتایـە کـە قورئـان هەمـوو ئـەو مەبەسـتانەی خـوای موتەعـال بـە پێویسـتی زانیـون کـە مـرۆڤ بـاش لێیـان تـێ بـگات، بەجارێـک و دوو و سـێ لێیـان نەگـەڕاوەو، بـە چەنـدان شـێوە باسـی کـردوون و ڕوونی کردوونـەوە.

سیفەتەکانی سی و دوو و سی و سێ: (أُحكمت آياته ثم فُصِّلت):

وەک لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ:
﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾ هود: ١.

واتـە:- (ئەلیـف، لام، ڕاء) ئەمـە کتێبێکـە ئایەتـەکانی پتـەوو قایـم کـراون، دوایـی ڕوونکراونـەوە لـە لایـەن (خـوای) کاربەجێـی شـارەزاوە.

(إحـکام) بریتییـە لـە هێزو پتەویـی و دووریی لـە نارێکیـی، (تفصیل) یـش مەبەسـت پێـی ڕوونکرنـەوەو شـکردنەوەیە، کـە ئایەتـەکانی قورئـان لـە لایەکـەوە قایـم و پتـەوو مەحکەمـن و، دوورن لـە بـێ هێزیـی و کـەم و کوڕیـی، لـە لایەکـی دیکەشـەوە: ڕوون و ڕۆشـنن.

دیـارە هـەر کەسـێک بـە ئەنـدازەی خۆی لـە قورئـان بەهرەمەنـد دەبێ، بـەڵام هیـچ کەس ناگاتـە ئەوپـەڕی قورئـان، وەک گوتمان ئەوپـەڕی قورئان هەمـوو مانـاو مەبەسـتەکانی، تەنیا بێژەرەکـەی کە خوای موتەعالـە دەزانێ.

سـیفەتەکانی سـی و چـوارەم و سـی و پێنجـەم: (مصدقـاً لمـا بیـن یدیـه مـن الکتـاب ومهیمنـاً علیـه):

لە سوورەتی - المائدة - ئایەتی ٤٨دا ،خوا دەفەرمویٚ:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾ المائـدة: ٤٨.

واتـە: ئێمە کتێبمان بە حەق دابەزاندووەتە سـەر تـۆ، هەموو کتێبەکانی دیکە کە لەپێش دەسـتیەوەن بەڕاسـتیان دادەنێ و بەسەریشیاندا چاودێرە.

قورئـان کتێبـەکانی پێـش خـۆی هەمـوان بەڕاسـت دەزانـێ و دادەنـێ، کـە هەموویـان لە لایـەن خواوە هاتـوون، وەک ئەسـڵەکەیان، بەسەریشـیاندا چاودێـرە لـە شـوێنێک دەسـتکاریی کرابـن و گۆڕدرابـن، قورئـان ئـەوەی بـە پێویسـتی زانیبـێ ڕوونی کردوەتـەوە، وەک لـە سـوورەتی (النمـل)دا دەفەرمـویٚ:

﴿ إِنَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ النمل: ٧٦.

واتـە: ئـەم قورئانـە بـە سـەر بەنـوو ئیسـڕائیلدا (بەسـەر گـەلی جوولەکـەدا) دەخوێنێتـەوە زۆربەی ئەوەی کـە تێیدا کەوتوونـە ڕاجیاییەوە، (ئـەوەی خـوا بـە پێویسـتی زانیبـێ).

سیفەتی سی و شەشەم: (قیِّم):

لە سوورەتی (الکهف)دا خوا دەفەرمویٚ:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ١ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ ٢ ﴾ الکهف.

واتـە: سـتایش بۆ ئەو خوایە کە کتێبەکـەی دابەزاندووەتە سـەر بەندەکەی خـۆی، ڕێك وڕاسـتە، (هیچ نارێکیی تێدا دانەنـاوە)، تاکو (خوا) لـە لایەن خۆیەوە

هۆشـداریی بدات لە هاتنی مەترسییەکی سەخت.

(قَيِّـم)، بـە مانـای ڕێـک و ڕاسـت و دادگـەر، دێ، کـە هیچ کـەم و کوڕیی و نارێکیـی تێـدا نیـە، وەک فەرهەنگـەکانی زمـان بـۆ نموونـە: (المصبـاح المنيـر) وایگوتـوە، هەروەهـا فەرهەنگـەکانی دیکەیش.

سیفەتی سی و حەوتەم: (ءايات بينات):

وەك لە سوورەتی (العنكبوت)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ العنكبـــوت: ٤٩.

واتـە: بەڵکـو ئـەو (قورئـان) ئایەتـە ڕۆشـنەکانن لـە سـینەی ئەوانـەدا کـە زانیارییـان پێـدراوە، جگـە لـە ستەمکارانیش هیـچ کـەس نکوڵیـی لـە ئایەتـەکانی ئێمـە نـاکات.

کەواتــە: قورئــان لــە چەنــد ئایەتێــک پێــک دێ و، ئایەتــەکان هەموویــان ڕۆشــنن و ڕۆشــنکەرەوەن.

سیفەتی و سی و هەشتەم: (قول فصل):

وەک لە سوورەتی (الطارق)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلٞ فَصۡلٞ ١٣ وَمَا هُوَ بِٱلۡهَزۡلِ ١٤ ﴾ الطارق.

واتـە: بـە دڵنیاییـەوە قورئـان قسـەیەکی، (یـان فەرموودەیەکـی) لێک جیـا کەرەوەیـە، (حـەق و ناحـەق، حـەڵاڵ و حـەڕام، پەسـەندو ناپەسـەند، ڕاسـت و هەڵـە، چـاک و خـراپ لێـک جیـا دەکاتـەوە). هەروەهـا ئـەو گاڵتـە نیـە، هەمـووی جیددییـە هیچـی سـوعبەت و گاڵتـە نیـە.

## سیفەتی سی و نۆ: (یهدي للتي هي أقوم):

وەک لە سوورەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ:
﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ﴾ الإسراء: ٩.

واتــە: ئــەم قورئانــە بــە دڵنیایــی ڕێپێشــانی خەڵــک دەدا بــەرەو ڕاستەڕێ کـە ڕاستترەو چاکترەو بـەرەو ژیانێـک، کـە باشـترە و ڕاسـترە.

واتـە: قورئـان ڕێنمایـی خەڵـک دەکا، ڕێ پێشـانی خەڵـک دەدا بـەرەو ژیانێــک کــە لــە هەمــوو ڕوویەکــەوە ڕاســتترە، تەندروســتترە، چاکــترە، لــە ڕووی بوونناســییەوە، لــە ڕووی ئیــمان و عەقیــدەوە، لــە ڕووی فیکــرو ڕۆشــنبیرییەوە، لــە ڕووی پەرســتش و پارێزکارییــەوە، لــە ڕووی تەزکیــەی نەفســەوە، لــە ڕووی ئــەدەب و ڕەوشــتەوە، لــە ڕووی ئابووریــی، لــە ڕووی سیاســیی و ئیــدارەدان و ...هتــدەوە.

## سیفەتی چلەم و کۆتایی: (مخرج الناس من الظلمات إلی النور):

وەک لە سوورەتی (إبراهیم)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ الـرۚ كِتَـابٌ أَنزَلْنَـاهُ إِلَيْـكَ لِتُخْـرِجَ النَّـاسَ مِـنَ الظُّلُمَـاتِ إِلَى النُّـورِ بِـإِذْنِ رَبِّهِـمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيـزِ الْحَمِيـدِ﴾ إبراهیـم: ١.

واتــە: (ئەلیــف، لام، ڕاء) ئەمــە کتێبێکــە بــۆ لای تۆمــان دابەزانــدوە، تاکــو خەڵــک لــە تاریکاییانــەوە دەربازبکــەی بــەرەو ڕۆشــنایی بــە فەرمــانو، مۆڵــەتی پەروەردگاریــان، بــەرەو ڕاســتە شــەقامی خــوای زاڵــی ستایشــکراو.

قورئــان خــوا بۆیــە دایبەزانــدوە تاکــو موحەممــەد (علیــه الصــلاة والســلام) بــە هــۆی قورئانــەوە، خەڵــک لــە هەمــوو جــۆرەکانی تاریکایــی دەربێنــێ بــەرەو ڕۆشــنایی.

جێی سەرنجە کە لە هەموو قورئاندا خوا - سبحانه وتعالى - تاریکایی هەر بە کۆ (ظلمات) هێناوە، بەڵام ڕووناکیی (نور) هەمیشە بە تاک هاتووە، چونکە لە هەر شتێکدا حەق بەس یەکە، بەڵام ناحەق زۆرو جۆراو جۆرە، دوو کۆ دوو ئەنجامە ڕاستەکەی چوارە (٢+٢=٤) بەڵام ئەنجامە هەڵەکان، پێنج بڵێی، سێ بڵێی، هەزار،...هتد، هەرچەند بڵێی، هەر هەڵەیە.

لە هەموو ڕوویەکەوە حەق یەکە، بۆیەش خوا (نور)ی بەکارهێناوە بۆ تەعبیر کردن لەو حەقەی کە قورئان گرتوویەتە خۆی لە هەموو ڕووەکانەوە، ناحەق و باتیڵیش زۆرو جۆراو جۆرە، بۆیەش خوا وشەی (الظلمات)ی بۆ بەکار هێناوە[1].




(١)- موسوعة: الإسلام كما يتجلىّ في كتاب الله، الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله، ص٩٩-١٠٩، الطبعة الثانية/٢٠١٧م.

## بڕگەی نۆیەم: پێناسەی سوورەت و ئایەت:

قورئـان لـه سـەدو چـوارده سـوورەت پێـک هاتـوه، کـه بە سـوورەتی (الفاتحـة) دەسـت پێـدە کات و، بـه سـوورەتی (النـاس) کۆتایـی پێدێـتو، لـه شـەش هـەزار و دووسـەدو سی و شـەش (٦٢٣٦) ئایـەت پێـک هاتـوه، بـەڕای زۆربـەی زانایـان.

د. سـوورەت: ئنجـا ئایـا سـوورەت (السـورة) بـه پیتـی (س) مانـای چییـە؟ هەروەهـا ئایـەت (آية)یـش مانـاو واتایەکـەی چییـە؟!

بـۆ مانـای وشـەی سـوورەت زانایـان زۆر شـتیان گوتـوه، بـەڵام ڕەنگبـێ ئـەم سـێیەیان لـه هەموویـان دیارتربـن:

یەکـەم: سـوورەت (السـورة) بـه پێگەیـەک دەگوتـرێ: لـه بینایەکـدا، لـه کۆشـکێکدا، بێگومـان سـوورەتەکانی قورئانیـش هەموویـان پێگـه پێگـەن و هەرکامێکیـان لـەوی دیکـه دابـڕاوەو، پێگەیەکـی سـەربەخۆی خـۆی هەیـە.

ئـەوه مانـای یەکەمـی سـوورەت کـه بریتییـە لـە: (المنزلـة مـن البناء)، پێگەوپلـە لەخانوویەک دا .

مانـای دووەمـی سـوورەت: (الـشرف والمنزلـة). وەک (النابغـة الذبيـاني) گوتوویـەتی:

(ألم تر أن الله أعطاك سورة     ترى كل ملك دونها يتذبذب)

ئایـا نابینـی چـۆن خـوا سـوورەتێکی بەتـۆ داوه، (واتـە: پێگـەو شـەرەفێکی بـە تـۆ داوه) هـەر موڵکێکـی دیکـە جگـە لـەو لەرەلەریـەتی!

بۆیـە سـوورەتێکی قورئـان پێـی گوتـراوە سـوورەت، لەبـەر شـەرەف و پێگـەو پایـەی بەرزیـی.

مانــای سـێیەمی سـوورەت: ئەوەیـە کـە لـە ئەسـڵدا لـە (سـؤر)وە هاتــوە، [وهــی بقيــة الــشيء، و تــرک الهمــز فيهــا تسـهيلاً لكثرتــه في الـكلام والقـرآن].

واتــە: سـوورەت لـە (سـؤر)وە هاتــوە، کـە بريتييـە لـە شـتێک کـە لـە شـتێک دەمێنێتــەوە، بــەڵام هەمزەکـەی لاچــووە، لەبــەر ئـەوەی زۆر بەکارهێـنراوە لـە قورئانـداو لـە قسـاندا، بۆيـە سـوورەت واتــە: بەشـێک لــە قورئــان[1].

ه. **ئايــەت:** دەربــارەی ئايــەت: ١- (الآيــة: العلامــة)، ئايــەت لــە زمـانی عەرەبييــدا بــە مانــای نيشــانە (علامــة) دێ، بۆيــەش وا گوتــراوە، چونکــە هــەر ئايەتێــک نيشــانەيەکە بـۆ کۆتايـی هاتنـی قسـەيەک و دەسـتپێکردنی قسـەيەکی ديکـە، يـان لەبـەر ئـەوەی هـەر ئايەتێـک لــە ئايەتــەکانی قورئــان، وەک چــۆن نيشــانەو قووچکــە لــە ڕێــدا دادەنێرێــن، بــۆ ئــەوەی خەڵــک بــەڕێ بزانــێ، هــەر ئايەتێــک لــە ئايەتــەکان نيشــانەيەکە بــۆ ئــەوەی مرۆڤــەکان بەڕێــی بــەرەو خــوا چــوون و ڕێــی ژيــانی خــوا پــێ پەســەندانە، پــێ بزانــن.

٢- واتايەکـی ديکـەی ئايـەت ئەوەيـە کـە بـە واتـای: کۆمـەڵ دێـت، لـە لای هەندێـک لـە عەرەبيـی زانـان، بۆيـە بـە ئايـەت گوتـراوە ئايـەت، چونکـە کۆمەڵێـک پيـت وشـە لـە خۆيـدا کـۆ دەکاتـەوە[2].

---

(١)- لسان العرب، ج٤ ص٣٨٦، ٣٨٧، مادة: س و ر.
(٢)- معجم مقاييس اللغة، لابن فارس، ج١ ص١٦٨، ١٦٩و مختار الصحاح، للجوهري لفظ: آية.

## بڕگەی دەیەم: قورئان موعجیزەی هەرماوی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، و ڕووەکانی ئیعجازی قورئان بێ سنوورن:

لەمەشدا دەگەڕێینەوە بۆ کتێبی پێنجەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله).

بێگومان پێغەمبەری خاتەم - صەڵات و سەلامی خوای لەسەربێ - تاکە موعجیزەیەک کە وەک بەڵگە بەکاری هێنابێ بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، بریتی بووە لە قورئان، واتە: موعجیزەکانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) هەموویان لە قورئاندا کورت هەڵنەهاتوون، بەڵکو پێغەمبەری خاتەم (عليه الصلاة والسلام) موعجیزەی دیکەیشی بوون، بەڵام تاکە موعجیزەیەک کە وەک بەڵگە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی خۆی بەکاری هێنابێ و خوای پەروەردگار پێی دابێ، بریتییە لە قورئان.

باشترین بەڵگەش لەو بارەوە، ئەم دوو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی - العنكبوت- ن، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: بێبڕوایەکان گوتیان: دەبوایە لە پەروەردگاریەوە نیشانەکانی دابەزنە سەری، (خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ) بڵێ: نیشانەکان تەنیا لە لایەن خواوەن و من تەنیا ترسێنەرێکی ڕوون و ئاشکرام، (یاخود ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەرم)، ئایا بۆ ئەوان بەس نیە کە ئێمە کتێبێکمان

دابازاندووەتـە سـەر تـۆ، بەسـەریاندا دەخوێندرێتـەوە، بێگومـان لـەوەدا بەزەیـی و بیرخسـتنەوە (یـان پەنـدو ئامۆژگاریـی) هەیـە بـۆ کۆمەڵێـک بڕوا بێنن .

بێگومـان قورئـان تاکـە بەڵگـە و موعجیـزەی پێغەمبـەری خاتەمـە - صـەڵات و سـەلامی خـوای لەسـەربێ - بـۆ سـەلماندنی ئـەوە کـە پێغەمبـەری خوایـە، چونکـە پێغەمبـەر (علیـه الصـلاة والسـلام) بـۆ تێکـڕای مرۆڤایەتیـی هاتـوە و بـۆ تێکـڕای جنـد هاتـوە، بـە درێژایـی زەمـان و بـە پانایـی زەمیـن، ئنجـا ئەگـەر هاتبـاو پێغەمبـەری خاتـەم - صـلی اللـه تعـالی علیه و آله وسـلم - موعجیـزەکانی دیکـەی بـۆ وێنـە: کـە ئـاو لـە نێـو پەنجـەکانی هاتووەتـە دەرێ، هەروەهـا کـە خـواردنی کەمـی بـۆ زۆر بـووە، هەروەهـا هەندێـک نەخۆشـیی کە لەسـەر دەسـتی ئـەو خـوای پـەروەردگار شـیفای بۆ نـاردوون، دیسـان کـە بەدوعـای ئـەو هـەور هاتۆتـە ئاسمان و بـاران باریـوەو، زۆرێـک لـە موعجیـزەکان، ئەگـەر ئەوانـەی کردبانـە بەڵگـە، بێبڕوایـانی هەمـوو ڕۆژگارەکان بۆیـان هەبـوو بڵێـن: کاتـی خـۆی پێغەمبەرەکەتان بۆ سـەلماندنی پێغەمبەرایەتیـی خـۆی ئـەو بەڵگانـەی هێناونـەوە، ئێـوەش بەڵگـەی ئـاوا بێنـن، ئەوکاتـە ئێمـەش دەستەوسـان دەبوویـن، بـەڵام نـا، موحەممـەد (علیـه الصـلاة والسـلام) بـۆ هیچکـەس جگـە لـە قورئـان بـە بەڵگـە نەیهێناوەتـەوە، ئـەو شـتانەی دیکـە زیاتـر بـۆ بڕواداران بـوون، کەلـە تەنگژەیـەک دەربـازی کـردوون کـە تووشـی بـێ ئاویـی بـوون، پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیه وسـلم) دوعـای کـردوە، یاخـود تـووشی بـێ خۆراکیـی بـوون دوعـای کـردوە خۆراک زیـاد بـووە، یـان بـۆ ئـەوە بـووە کـە بـڕواداران زیاتـر دڵیـان بچەسـپێ، یـان گرفتێکیـان هەبـووە، یەکێـک چـاوی کوێـر بـووە، یەکێـک تـووشی نەخۆشـییەکی دیکـە بـووە، یەکێك لاقـی شـکاوە، دوعـای بـۆ کـردوەو

چاک بووه، بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) بەکاری هێناوە وەک بەڵگە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی خۆی، تەنها قورئانە و قورئانەکەش ئێستا لەبەردەستی ئێمەش دا هەیە.

ئەوە بە نسبەت موعجیزە بوونی قورئان و، بەڵگە بوونی قورئانەوە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) دیارە لە شوێنەکانی دیکەدا بە درێژیی باسمان کردوە، کە خوا (سُبحانه وتعالى) بە سێ قۆناغ تەحەددای بە قورئان کردوەو، داوای هاتنە مەیدانی بەرامبەرەکانی کردوە بۆ قورئان:

١. لە قۆناغی یەکەمدا فەرموویەتی: با قورئانێکی وێنەی ئەم قورئانە بێنن، وەک لە سووڕەتی (الطور)دا دەفەرموێ:

﴿ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴾ الطور: ٣٤ ؛ واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن باقسەیەکی وەك وی بێنن.

واتە: ئەوەندە قورئانی تاکو ئەو کاتە دابەزیوە.

٢. ئنجا کە ئەوەیان نەتوانیوە، لە سووڕەتی (هود)دا خوا (سُبحانه وتعالى)، بۆی سووک کردوون، فەرموویەتی:

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ ﴾ هود: ١٣.

واتە: یان دەڵێن: (موحەممەد) قورئانی هەڵبەستوە، با ئەوانیش دە سووڕەتی هەڵبەستراو بێنن، وێنەی وی.

٣. ئنجا کە ئەوەشیان نەتوانیوە، بۆیان هاتووەتە سەر یەک سووڕەت، وەک لە سووڕەتی (یونس)دا و، لە سووڕەتی (البقرة)شدا دووبارە کراوەتەوە کە دەفەرموێ:

﴿ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾ البقرة: ٢٣.

واتە: وێنەی یەک سووڕەتی وی (قورئان) بێنن.

یـەک سـوورەتی قورئـان، کورتترین سـوورەت لـە قورئاندا سـوورەتی - الکوثـر -ە، کـە سـێ ئایەتـەو لـە ڕووی پیتەکانیشـەوە کورتـترە، ئەگـەر نـا هـەرکام لـە سـوورەتەکانی - العـصر - و - النـصر - یـش یەکـی سـێ ئایەتـن، بـەڵام سـوورەتی - الکوثـر - لـەو دوو سـوورەتانە، کورتـترە لـە ڕووی پیتەکانـەوە.

کەچـی دەستەوسـان بـوون و، نەیانتوانیـوە وەڵامـی ئـەو داوای مەیدانارییـەی قورئـان بدەنـەوە.

ئنجـا ئێسـتا دەڵێیـن: ئایـا دەگونجـێ ڕووی ئیعجـازی قورئـان دیاریـی بکـرێ؟ مـن لەو کتێبـەدا کە ئاماژەی پـێ دەکەم[1]، باسـم کردوە کـە: (لایمکن تحدیـد وجـه إعجـاز القـرآن العزیـز)، ناگونجـێ ڕووی دەستەوسـانکەرێتیی (إعجـاز)ی قورئـان دیاریـی بکرێـت، لەبـەر چی؟!

خـوا (سُـبحانه وتعـالی) بـە گشـتیی فەرموویـەتی: وێنـەی قورئـان بێنـن، ئنجـا کـە بـە گشـتیی وایفەرمـووە، کەواتـە: ڕووی کردۆتـە هەمـوو کـەس، لەجنـدو لـە مـرۆڤ، لـە هەرجێیـەک هـەن و، لـە هـەر حاڵێکـدا هـەن و، لەهـەر کاتێـك دا هـەن، ئنجـا ئەگـەر بـۆ وێنـە: ئیعجـازی قورئـان -وەک کاتی خـۆی زانایانمـان زۆریـان جەختیـان لـە سـەر ئـەو لایەنـە کردۆتـەوە- ئەگـەر تەنیـا لـەڕووی بەیانیـی و ڕەوانبێژییـەوە بوایـە، ئـەوە تەنیـا بـۆ ئەوانـەی پسـپۆڕو شـارەزان لـە ڕووی ڕەوانبێژیـی و بەیـان و دەربڕینـەوە، تەنیـا بـۆ ئـەوان دەستەوسـانکەر دەبـوو، بـەڵام بـۆ بابایەکـی جووتیـار یـان بـۆ کەسـێک کـە لـەو بـوارەدا شـارەزا نیـە، بـۆی نەدەبـووە موعجیـزەو بەڵگـە.!

بـەڵام قورئـان لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە موعجیزەیـە، لـە هەمـوو

(١) - موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله. الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله عزوجل .

ڕووەکانـەوە دەستەوسـانکەرە، لـە هەمـوو ڕووەکانـەوە بەرابـەرەکانی خۆی دەستەوسـان دەکات و هیچیـان بەدەسـت ناهێڵـێ.

بـەڵام مـن وەک ڕوونکردنـەوە، دە (١٠) ڕووم لـە ڕووەکانی ئیعجـازی قورئـان هێنـاون، کـە بریتیـن لـە:

١-ئیعجازی ڕووحیی.

٢-ئیعجازی زگماکیی.

٣-ئیعجازی عەقڵیی.

٤-ئیعجازی زانستیی.

٥-ئیعجازی تەزکیەیی.

٦-ئیعجازی ڕەوشتیی.

٧-ئیعجازی کۆمەڵایەتیی.

٨-ئیعجازی مێژوویی.

٩-ئیعجازی زانیاریی.

١٠-ئیعجازی بەیانیی.

ئنجـا ئیعجـازی بەیانییـش لـە سـێزدە بڕگـەدا باسـمان کـردوە، ئـەوەش لـە ڕاسـتییدا وەک چەنـد نموونەیـەک هێناومنـەوە، ئەگـەر نـا بێیـە سـەر بـاری حـەق، ڕووەکانی ئیعجـازی قورئـان بـێ سـنوورن، چونکـە قورئـان فەرمایشـتی خوایـەو، بێگومـان بەزانیاریـی بـێ سـنووری خـوا دابەزێنراوە، وەک لـە سـوورەتی (الفرقـان)دا خـوای موتەعـال دەفەرمـوێ:

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الفرقان: ٦.

واتـە: بڵـێ: زاتێـک قورئـانی دابەزانـدوە، کـە نهێنیـی ئاسـمانەکان و زەوی دەزانـێ و خـوا لێبـوردەی میهرەبانـە.

کەواتــە: زاتێــک کــە قورئـانی دابەزانـدوە، نهێنیـی و شـێردراوەکانی ئاسـمانەکان و زەوی هەموویـان دەزانێـت، بۆیــە ئــەم قورئانــە کــەم و زۆر نهێنییــەکانی گــەردوون، واتــە: ئاســمانەکان و زەوی گرتوونــە نێــو خــۆی و تاکـو زانسـتی بەشـەر بـەرەو پێشـەوە بچـێ، مەزنیـی قورئـان، بەرزیـی قورئـان و، ئیعجـازی قورئـان زیاتـر دەردەکـەوێ، وەک ئایـەتی پێـش کۆتایـی لـە سوورەتی - فصلت - دا، ئـەو هەواڵەمـان پـێ دەدا، کـە دەفەرمـوێ:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلـت: ٥٣.

واتــە: لەمــەو دوا، نیشـانەکانی خۆمانیـان لـە ئاسـۆیەکان ولـە خـودی خۆیشـیاندا پیشـانیان دەدەیـن، تاکـو بۆیـان دەربکـەوێ کـە قورئـان حەقـە، ڕاناوەکـە بـۆ قورئـان دەچێتــەوە، بـاس بـاسی قورئانـە کـە قورئـان حەقـە، یاخـود کـە خـوای پـەروەردگار حەقـە.

﴿ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾ فصلت: ٥٣.

ئایـا بـەس نیـە بۆ ئـەو پـەروەردگارەت کـە چاودێـرەو ئاگادارە بەسـەر هەموو شـتێکەوە!

ئـەو قورئانـەش کـە خـوا دایبەزانـدوە، هـەر نهێنییـەک کـە مرۆڤەکان پێویسـتییان پێبـێ، بـۆ زانینـی ئـەوە کـە ئـەم قورئانـە فەرمایشـتی خوایـە، ئـەو نهێنییانـەی هەموویـان گرتوونە خـۆی، چ پەیوەندییان بە ئاسـۆیەکانەوە هەبـێ، چ پەیوەندییـان بـە خـودی خۆشـیانەوە هەبێ.

## بڕگەی یازدەیەم: تایبەتمەندییەکانی قورئان:

بـــۆ ئەمـــەش جارێکی کـــە دەگەڕێینەوە ســـەر کتێبـــێ پێنجەمی (موســـوعة: الإســـلام كما يتجلى في كتـــاب الله).

ئێمـە پێمان وایە: ئـەم قورئانـە بـەرزو بەڕێزە، ئـەم کۆتا فەرمایشـتەی خـوا، چـوار تایبەتمەندیـی هـەن، کە تەنیـا لـە قورئانـدا ئـەو تایبەتمەندییانە هـەن، بێگومـان کتێبـەکانی دیکـەی خـوای موتەعال هەمـوو کتێبـەکان کە فەرمایشـتی خـوان، هەموویـان لـە قـەدەر خـوان و، خـوا (سُبحانه وتعـالى) لەقـەدەر خـۆی فەرمایشـتی خـۆی فەرمـوە، بـەڵام تاکـە کتێبێـک و تاکـە فەرمایشـتێکی خـوا لەدەسـتی ئێمەدا مابێتـەوەو، لێی دڵنیابیـن کە هەمووی فەرمایشـتی خوایـەو، نەگـۆڕدراوەو دەسـتکاریی نەکـراوە، تەنیـا قورئانـە.

قورئان ئەم چوار تایبەتمەندییەی هەن:

### یەکەم: قورئانی مەزن هەم بەرنامەیە،
### هەم موعجیزەو بەڵگەشە لەیەک کاتدا:

قورئـــان لەیـــەک کاتـــدا، هـــەم بەرنامـــەی پێغەمبـــەری کۆتایـــی و ئۆممەتەکەیـــەتی و، هـــەم بەڵگـــەو موعجیـــزەی پێغەمبـــەری کۆتایـــی و ئۆممەتەکەشـــیەتی.

پێغەمبـــەرانی پێشـــوو - صـــەڵات و ســـەلامی خوایـــان لەســـەر بـێ - کتێبیـــان پێدراوە،بـــەڵام موعجیزەکەیـــان جیابـــووە لـــە کتێبەکەیـــان، وەک: حوشـــترەکەی صالـــح، گۆچانەکـــەی مووســـا و دەســـتی ســـپی مووســـا، زینـــدوو کردنـــەوەی مـــردوان بـــۆ عیســـا و چاککـــردنی نەخۆشـــییەکان و،

دروستكردنی باڵندە لە لایەن عیساوە (علیه الصلاة والسلام) ئەوان بەرنامەكەیان شتێك بووەو موعجیزەكەیان شتێكی دیكە بووە.

بەڵام پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) بەرنامەكەی و موعجیزەكەی یەك شتە، كە بریتیە لە قورئان، ئەمە یەكەمین تایبەتمەندیی قورئانە، وەك پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتێكدا ئاماژەی پێداوەو دەفەرموێ:

(ما من الأنبياء نبي إلا أعطي ما مثله آمن عليه البشر، وإنما كان الذي أوتيته وحياً أوحاه الله إليَّ، فأرجو أن أكون أكثرهم تابعاً يوم القيامة.) أخرجه البخاري رقم ٤٩٨١ و مسلم رقم ٣٨٣ عن أبي هريرة رضي الله عنه.

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ:

هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران نەبووە، مەگەر ئەوەی پێدراوە كە لەسەری بەشەر بڕوای پێ بێنن، (واتە: موعجیزەو بەڵگەیەكی پێدراوە)، ئەوەش كە بە من دراوە، وەحییەك بووە خوا بۆ منی ناردوە، سروشێك بووە خوا بۆی كردووم، بۆیە ئومێدم وایە كە لەڕۆژی دواییدا لە هەموویان شوێنكەوتووم زیاتربن، (چونكە بەڵگەكەی دەمێنێتەوە، هەتا ئایینەكە بەردەوامبێ، بەڵگەكەیشی هەر لە نێو خۆیدایەو بەردەوام دەبێت).



## دووەم: ئەوەیە کە قورئانی بەڕێز بەرنامەی بەردەوامی خوایە بۆ جندو بۆ مرۆڤ بە تێکڕا:

خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴾ الفرقان: ﴿١﴾.

واتە: بەرزو بەپێزە کەسێك کە جیاکەرەوەی دابەزاندۆتەسەر بەندەکەی تاکو وریاکەرەوە بێ بۆ جیهانییان.

عالەمین واتە: عالەمی جندو مرۆڤ لە پێش هەمواندا.

هەروەها خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ﴿١٠٧﴾.

واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر بەبەزەیی بۆ جیهانییان.

هەروەها خوا (سُبحانه وتعالى) لە چەندان ئایەتی دیکەدا ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، کە کۆتا بەرنامەی خوا بۆ مرۆڤ و بۆ جندیش بریتییە لە قورئان، قورئان و، ئەو بەرنامەیەش کە گرتوویەتە خۆی، بۆ تێکڕای مرۆڤایەتییەو بۆ تێکڕای جندەکانیشە، لە سەر خڕۆکەی زەوی هەتاکو ژیان بەردەوامبێ.



## سێیەم: ئەوەیە کە قورئان بە پاراستنی خوای باڵا دەست، لە گۆڕدران و دەستکاریی کران پارێزراوە

وەک لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ:
﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ الحجر: ٩.

واتە: ئێمە خۆمان ذیکرمان دابەزاندوەو خۆشمان پارێزەرینی.

ئنجا بۆچی خوا (سُبحانه وتعالى) پاراستنی قورئانی بە دەست خۆیەوە گرتوە، بەڵام پاراستنی کتێبەکانی دیکەی نا، وەک لە سوورەتی (المائدة)دا خوا فەرموویەتی:
﴿ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَ ﴾ المائدة: ٤٤.

بەو هۆیەوە کە ڕەببانیی و حەبرەکان[1] پاراستنی کتێبی خوایان پێ سپێردراوەو بەسەریەوە چاودێر بوون.

بەڵام لەبەر ئەوەی قورئان بۆ هەموو بەشەر هاتوە، خوا سوحوفی بۆ ئیبراهیم ناردوەو، دوای سوحوف تەوراتی بۆ مووسا ناردوەو، دوای تەورات زەبووری بۆ داود ناردوەو، دوای زەبوور ئینجیلی بۆ عیسا ناردوە، ئنجا ئەگەر گۆڕانکارییەک لە هەر کتێبێکدا کرابێ، کتێبەکەی دواتر ڕاستی کردوەتەوە، بەڵام لەدوای قورئان کتێبێکی دیکە نایەت و، خوا لە دوای ئەو دواندنەی کە مرۆڤ و جندی پێ دواندوون لە قورئاندا، جارێکی دیکە جندو مرۆڤ نادوێنێتەوە ڕاستەوخۆ لە ڕێی پێغەمبەرێکەوە، موحەممەد

(١)- الربانیون: جمع الربّاني، والأحبار جمع حَبرْ، دوو جۆرن لە زانایانی خاوەن کتێبان.

کۆتـا پێغەمبـەرەو قورئانیـش کۆتـا دوانـدن و فەرمایشـتی خوایـە، بۆیـە خـوا پاراسـتوویەتی لـە گـۆڕان و دەسـتکاریی کـران، تاکـو ببێتـە بەڵگـە لەسـەر کـۆی مرۆڤایەتیـی کـە خـوا ئـاوا ڕێـی پێشـان داوەو بـەو شـێوەیە ئێـوەی دوانـدوە.

## چوارەم: قورئان کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ، بەڵام بەسەریشیانەوە چاودێرە:

وەک پێشتریش ئایەتەکەمان هێنایەوە:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ المائـدة: ٤٨.

دوایـی کتێبـمان بـۆ سـەر تـۆ دابەزانـد بـە حـەق، کتێبـەکانی پیـش خـۆی بەڕاسـت دادەنـێ و بەسەریشـیانەوە چاودێـرە.

واتـە: ئەگـەر کـەم و کوڕیـی و دەسـتکاریی کرانێـک لـەو کتێبانـەدا ڕووی دابـێ، قورئـان چاودێـرە بەسـەریانەوە و ڕاسـتی دەکاتـەوە، هـەر شـتێک کـە بـە پێویسـتی بزانـێ، وەک لـە سـوورەتی - النمـل - دا دەفەرمـوێ:

﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ النمل: ٧٦.

واتـە: بـە دڵنیایـی ئـەم قورئانـە بەسـەر وەچـەی ئیسـڕائیل، گـەلی جوولەکـەدا دەخوێنێتـەوە، زۆربـەی ئـەوەی کـە تێیـدا کەوتوونـە ڕا جیایـی.

بۆچـی هەمـووی نـا؟! چونکـە دیـارە هەمـووی خـوا بـە پێویسـتی نەزانیـوە کـە قورئـان قسـەی لەبـارەوە بـکات و، ڕاسـتی بکاتـەوەو ڕاسـت و چـەوتی لێـک جیـا بکاتـەوە.

لێرەدا کۆتایی بەم تەوەری یەکەمە دێنین، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیی هەموو لایەکمان بدات، کە وەک بۆ قورئان شایستەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین؟ بە خوێندنی، بە لێتێگەیشتنی، بە لەبەرکردنی، بە کار پێکردنی، بە بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکانی و، ڕۆشنکردنەوەی خەڵک و وڵاتمان بە ڕووناکیی ڕاستییەکانی قورئان.



بەڕێزان!

لەم تەوەرەدا لە سێ بڕگەدا چۆنیەتی دابەزینی قورئان و، حیکمەتەکەی باس دەکەین،

ئایا قورئان ئەو دوا فەرمایشتەی خوا (سُبحانه وتعالى) چۆن دابەزیوە؟ حیکمەتی ئەو جۆرە دابەزاندنەش چییە؟

هەروەها کێ قورئانی بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)هێناوە؟

## بڕگەی یەکەم: ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی دابەزینی قورئان:

ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین و تەماشای سیرەو ژیاننامەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بکەین، زۆر ڕوونە کە قورئان بە پچڕ پچڕ و بەش بەش بۆ سەر پێغەمبەری خاتەم (عليه الصلاة والسلام) دابەزیوە، نەک هەمووی پێکەوە، وەک چۆن کاتی خۆی مووسا (عليه الصلاة والسلام) کە تەوراتی پێدرا، لە لەوحەکاندا هەموویان پێکەوە بوون، ئنجا نازانین ئایا هەرکام لە کتێبەکانی دیکەی پێغەمبەرانیش (عليه الصلاة والسلام) هەر وەک تەوراتی مووسا، هەمووی بەیەکەوە بووە، یاخود بەش بەش بووە؟

بەڵام شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە قورئان لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا، دابەزیوەتە سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)،با تەماشا بکەین:

أ- لە سوورەتی (الفرقان)دا خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴾ الفرقان: ٣٢.

واتــە: ئەوانــەی بێبــڕوان گوتیــان: دەبوایــە بەیــەک جار هەمــوو قورئانی دابەزیبایــە ســەرێ، (خوا دەفەرمــوێ) بۆیە بەو جۆرە دامــان بەزاندوە (هەمووی بەیەکــەوە نــا، بــەش بــەش و ســوورەت ســوورەت، دامانبەزانــدوە، بەڵکــو ئایــەت ئایــەت) تاکــو عەقڵ و دڵتــی پێ بچەســپێنین و بەشــێنەیی و بەڕێکیی خوێندوومانەتــەوە.

ب- هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴾ الإسراء: ١٠٦.

واتــە: ئەمــە قورئانێکــە، بەش بەشــمان کــردوە، تاکو بەشــێنەیی بەســەر خەڵکیــدا بیخوێنیــەوە و پلــە پلە دامــان بەزاندوە.

(إنــزال) لــە زمــانی عەرەبییدا بۆ شــتێکە کــە یەکجاربێ، بــەڵام (تنزيل) (نــزّل، يُنَــزِّل، تنزيلاً) بۆ شــتێکە بــەش بەش و پچــڕ پچڕبێت.

(إبــن عطيــة) لە تەفســیرە ناودارەکەی خۆیدا (المحرَّر الوجيز في تفســير كتــاب اللــه العزيــز)[1] دەڵــێ: (والإِســتدلال بهــذه الآيــة إنمــا هــو في قولــه: لتقــرأه عــلى الناس عــلى مكث).

ئنجــا دەڵــێ: (هــذا كان لمّا أراد الله تعــالى إِنزالَه بأسـباب تقع في الأرض مــن أقوال وأفعــال في أزمان محــدودة معينة).

لە ڕوونکردنەوەی ئەو ڕستە قورئانییەدا کە دەفەرموێ:

﴿ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ ﴾ الإسراء: ١٠٦.

بۆ ئەوەی بەشــێنەیی بەســەر خەڵکیدا بیخوێنیەوە، دەڵێ: ئەمە کاتێک بــووە کــە خــوای بــەرز ویســتی دایبەزێنــێ بــە هــۆی چەنــد هۆکارێکــەوە کە لەســەر زەوی ڕوو دەدەن، لــە قســان و، لــە کــردەوان و لــە کاتــە دیارییکراوە سنووردارەکاندا.

(١)- ج٩ ص٢١٦.

هەڵبەتە ڕایەکی زانایان هەیە کە پاڵی دەدەنە لای (إبن عباس)، وەک (إبن جرير الطبري) لە تەفسیرە ناودارەکەی خۆی (جامع البيان) دا[١] هێناویەتی و سەنەدەکەشی ڕاستە، هەروەها (أبو عبيد) لە (فضائل القرءان) لاپەڕە (٣٦٧)دا هێناویەتی، دەڵێ: (أنزل القرآن جملة واحدة إلى السماء الدنيا في ليلة القدر، ثم نزل بعد ذلك في عشرين سنة، وقرأ: (وقرآناً فرقناه لتقرأه على الناس على مكث ونزّلناه تنزيلاً). قال أبوعبيد: لاينبغي أن تكون على هذا التفسير إلا بالتشديد، فرّقناه، (وقرءاناً فرّقناه، لتقرأه على الناس على مكث).

دیارە ئەم خوێندنەوەیە: (وقرءاناً فرّقناه) واتە: بە گیرە (شدّة) لە (علي و إبن عباس و إبن مسعود و أبي بن كعب) خوا لە هەر چواریان ڕازی بێ و، لە کۆمەڵێک لە زانایانی شوێنکەوتوانی هاوەڵانیشەوە، گێڕدراوەتەوە، هەروەک (إبن الجوزي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (زاد المسير في علم التفسير)[٢] هەروەها (إبن عطية)ش لە تەفسیرەکەی خۆی (المحرر الوجيز)دا[٣] هێناویەتی.

واتە: (إبن جرير) لە (إبن عباس)ەوە - خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ - دەیهێنێ، هەروەها (أبو عبيد)یش لە (فضائل القرءان)دا، هەر لەوەوە دەڵێ: قورئان هەمووی یەک جار دابەزیوە بۆ ئاسمانی نزیکتر لە ئێمە، (السماء الدنيا واتە: ئاسمانی نزیکتر لە ئێمە)، لە شەوی قەدردا، (سەرەتای دەستپێکی هاتنی قورئان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) دوای ئەوە لە ماوەی بیست ساڵاندا، (بۆ نزیک خستنەوە بووە، ئەگەر نا بیست و سێ ساڵ بووە)، هەموو

(١)- ج١٥ ص١٧٨.
(٢)- ج٥ ص٩٦.
(٣)- ج٩ ص٢١٥.

قورئـان دابەزیـوە، ئنجـا ئەبـو عوبەیـد گوتوویەتیـی: دەبـێ وشـەی: (فرَّقناه) هـەر بەگیـرەدار (مُشَـدَّد) بخوێندرێتـەوە، بـۆ ئـەوەی دەلالـەت لەسـەر ئـەوە بـکات کـە قورئـان بـەش بـەش و پچـڕ پچـڕ دابەزیـوە.

لێـرەدا پرسـیارێک دروسـت دەبـێ: باشـە خـوا (سُـبحانه وتعـالى) لـە سـوورەتی (البقـرة)دا دەفەرمـوێ:

﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾ البقرة: ١٨٥.

هەروەها لە سوورەتی (الدخان)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ الدخان: ٣.

دیسان لە سوورەتی (القدر)یشدا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ القدر: ١.

لـە هـەر سـێ شـوێنەکەدا، وشـەی (إنـزال) یانـی: دابەزانـدن بەیـەک جـار بەکارهاتـوە، لـە ئایەتەکـەی سـوورەتی (البقـرة)دا دەفەرمـوێ: مانگـی ڕەمـەزان کـە قورئـانی تێـدا دابەزێـنراوە، ئایەتەکـەی سـوورەتی (الدخـان) دەفەرمـوێ: ئێمـە لـە شـەوێکی بەپێـزدا دامانبەزانـدوە، لـە ئایەتەکـەی (القـدر)دا دەفەرمـوێ: ئێمـە لـە شـەوی قـەدردا، واتـە: شـەوی ئەنـدازە گیریـی، یاخـود شـەوی حورمـەت و ڕێـزدا دامانبەزانـدوە؟!

زانایـان بـۆ پێکـەوە گونجانـدنی ئـەو ئایەتانـە، کـە ئـەوە حەقیقەتێکە قورئـان لـە مـاوەی بیسـت وسـێ سـاڵدا بـۆ سـەر پێغەمبـەری خاتـەم (علیه الصـلاة والسـلام) دابەزیـوە، کەچـی لـەو سـێ ئایەتـە موبارەکـەدا کـە باسـمان کـردن، باسـی ئـەوە کـراوە کـە یـەک جـار دابەزیـوە، بـۆ پێکـەوە گونجاندنـی ئایەتەکانـی زانایـان هەندێکیـان گوتوویانـە: قورئـان بـە دوو جـار دابەزیـوە، ئەمـە لـە عبداللـه ی کـوڕی عەبباسـەوە - خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بێـت - هاتـوە کـە گوتوویـەتی: قورئـان دوو دابەزانـدنی هەیـن.

(التنــزّل الأول مــن اللــوح المحفــوظ إِلى الســماء الدنيــا، وكانــت جملــة واحــدة).

**دابەزینـی یەکـەم**، لـە (اللـوح المحفوظــ)ەوە بـۆ ئاسـمانی نزیکـتر لـە ئێمـە، هەمـووی پێکـەوە دابەزیـوە.

[ والتنــزّل الثــاني مــن الســماء الدنيــا إِلى الأرض عــلى النبــي - (صـلى اللـه عليـه وسـلم) - وفَرْقـاً عـلى الوقائـع].

**دابەزینـی دووەم**، لـە ئاسـمانی نزیکـتر لـە ئێمـەوە بـۆ سـەر زەوی، بـۆ سـەر پێغەمبـەر (صلى اللـه عليـه وسـلم) بـە جیـا جیـا، پچڕ پچڕ دابەزیوە بەپێی ڕووداوەکان.

ئەمــەش ڕایەکــەو زانایــان دەڵێــن: (إبــن عبــاس) خــوا لــە خــۆی و بابـی ڕازی بێـت - کـە قسـەیەکی وا دەکا، لەخـۆوە نەیکـردوە، بێگومـان لـە پێغەمبـەری خاتەمـی (صـلى اللـه عليـه وسـلم) بیسـتوە، چونکـە چۆنیەتیی دابەزینـی قورئـان، شـتێکی پەنهانـەو نەزانـدراوە بـۆ مرۆڤـەکان، مەگـەر لـە ڕێـی وەحییـەوە بزانـرێ.

کەواتــە: ئیبنــو عەببــاس - خــوا لــە خــۆی و بــابی ڕازی بــێ - دیــارە لــە پێغەمبــەری خاتەمــی (صــلى اللــه عليــه وســلم) بیســتوە بــا پاڵیــشی نەدابێتــە لای، چونکــە زانایــان دەڵێــن: هەمــوو ئــەو شــتانەی کــە قســەن دەربــارەی نادیــار، کاتــێ هاوەڵێــک خــوا لێیــان ڕازی بێــت، قســە لەبــارەی نادیــار (غیــب)ەوە دەکات، ئەمــە حوکمــی فەرمــوودەی بەرزکــراوەی (الحديـث المرفـوع)ی هەیـە، واتـە: ئـەو فەرمایشـتەی کـە پـاڵ دەدرێتـە لای پێغەمبـەری خـوا (صـلى اللـه عليـه وسـلم) ئنجـا چ بـەو پێیـە بێـت کـە قورئـان دووجـاران دابەزیبێـت، جارێکیـان لـە شـەوی قـەدر دا، لـە شـەوە بەپێزەکـەدا، لـە مانگـی ڕەمەزانـدا، هەمـووی لـە (اللـوح المحفوظــ)ەوە، یان

لـە زانیاریـی بـێ سـنووری خـواوە، دابەزیـنێ بـۆ ئاسـمانی نزیکـتر لـە ئێمـە، دوایـی لـە مـاوەی بیسـت و سـێ سـاڵدا هەمـووی دابەزیـنێ بـە پێـی ڕووداوەکان بـۆ سـەر دڵـی موبارەکـی پێغەمبـەر (صـلی اللـە علیـە وسـلم) چ ئاوابـێ، چ مەبەسـت لـە دابەزانـدنی لـە شـەوی (قـەدر) دا، دەسـتپێک و سـەرەتای دابەزانـدنی قورئـان بـێ، کـە ئـەو ڕایـەش هـەر هەیـە[1]، بـەڵام دوایـی هەمـووی لـە مـاوەی بیسـت و سـێ سـاڵدا تەواوبووبـێ و دابەزیـبێ، هەرکامێکیـان بـێ، شـتێکی بەڵگـە نەویسـتە و ئاشـکرایە، کـە هەمـوو قورئـان لـە مـاوەی بیسـت و سـێ سـاڵدا دابەزیـوە، بـۆ سـەر دڵـی موبارەکـی پێغەمبـەر (علیـە الصـلاة والسـلام) سـێزدەیان لـە مەککـە و، دە سـاڵ و چەنـد مانگێکیـش لـە مەدینـە.



(١) - بەندە ئەو ڕایە بەڕاستتر دەزانم.

## بڕگەی دووەم: حیکمەتی دابەزینی قورئان بە جیا جیا، چییە؟

بێگومان زۆر حیکمەت لەوەدا هەن: گرنگترینیان ئەم پێنجەن:

**١- یەکێک لە حیکمەتەکان، کە ئایەتەکانی قورئان ئاماژەیان پێ داوە، چەسپاندنی عەقڵ و دڵی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) :**

وەک لە سوورەتی (الفرقان)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴾ الفرقان: ٣٢.

واتە: ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: دەبوایە قورئان هەمووی بەیەکجار دابەزیبایە سەری، خوا دەفەرموێ: (كذلك) یانی: ئاوا دامانبەزاندوە جیا جیا، نەک هەمووی بەیەکجار، بەڵکو بە پچڕ پچڕیی، (لنثبت به فؤادك) وشەی (فؤاد)، لە قورئاندا بە زۆریی بە مانای عەقڵ بەکار هاتوە، بەڵام جار جار بە مانای دڵیش بەکار هاتوە، واتە: بۆ ئەوەی عەقڵ و دڵی تۆی پێ بچەسپێنین، یان لە عەقڵ و دڵتدا بیچەسپێنین و بە ڕێکییش خوێندوومانەتەوە.

کەواتە: بۆ ئەوەی قورئان بە ڕێکیی بخوێنرێتەوەو باش وەخۆبگیرێ لە لایەن پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) بە پلەی یەکەم و دواییش لە لایەن هاوەڵانیەوە، خوا لێیان ڕازی بێ، بۆیە خوا (سُبحانه وتعالى) بەش بەش و پچڕ پچڕ دایبەزاندوە.

هەروەک لە سوورەتی (هود)دا خوا دەفەرموێ:
﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ﴾ هود: ١٢٠.

واتــە: ئێمــە هــەر کام لــە هەواڵــی پێغەمبــەران بەســەر تــۆدا دەخوێنینــەوە، کــە دڵــی تــۆی پــێ دەچەســپێنین، دڵــی تــۆی زیاتــر پــێ دامــەزراو دەکەیــن.

نــەک هــەر سوورەتە لــە کاتێکــدا، بەڵکو جاری وا هەبووە هــەر چەند ئایەتێــک لــە کاتێکــدا، بەڵکــو جــاری وا هەبــووە، بەشــێک لــە ئایەتێــک لــە ڕووداوێکــی دیاریــی کــراودا بــۆ ســەر دڵــی پێغەمبــەری خاتــەم (علیــه الصــلاة والســلام) دابەزیــوە، وەک وێنەیــەک ئــەم دەقــە دێنینــەوە:

(عــن زيــد بــن ثابــت رضي اللــه عنــه أن رســول اللــه (صــلى اللــه عليــه وســلم) أمْــلى عليــه: **(لايســتوي القاعــدون مــن المؤمنــين والمجاهــدون في ســبيل اللــه) قــال: فجــاءه ابــن أم مكتــوم وهــو يُمْليهــا عــليَّ، فقــال يارســول اللــه! لــو أســتطيع الجهــاد جاهــدت، وكان رجــلاً أعمــى، فأنــزل اللــه تبــارك وتعــالى عــلى رســوله (صــلى اللــه عليــه وســلم) وفخــذه عــلى فخــذي، فثقلــت عــليَّ حتــى خِفْــتُ أن تــرضَّ فخــذي، ثــم سُرِّي عنــه فأنــزل اللــه: (غــير أولي الــضرر). أخرجــه البخــاري رقــم ٩٦٧٧ و٤٣١٦. وفي الصَّحيحــين نحــوه مــن حديــث الــبراء بــن عــازب.**

زەیــدی کــوڕی ثابیــت –کــە یەکێــك بــووە لــە نووســەرەوەکانی وەحیــی- خــوا لێــی ڕازی بێــت دەڵــێ: پێغەمبــەر (صــلى اللــه عليــه وســلم) بەســەریدا خوێندمــەوە: [لايســتوي القاعــدون مــن المؤمنيــن والمجاهــدون في ســبيل اللــه]. ســەرەتا ئایەتەکــە ئــاوا دابــەزی، واتــە: بــڕواداارانی دانیشــتوو و تێکۆشــەرانی ڕێــی خــوا یەکســان نیــن، لــەو کاتــەدا عبداللــه ی کــوڕی ئوممــی مەکتــووم هــات بــۆ خزمــەت پێغەمبــەر (صــلى اللــه عليــه وســلم) کــە پێغەمبــەری خــوا (عليــه الصــلاة والســلام)ئایەتەکەی بەســەردا دەخوێندمــەوە، (بــۆ ئــەوەی بینووســێ) گــوتی: ئــەی پێغەمبــەری

خـوا! منیـش ئەگـەر توانیبـام جەنـگ و جیهـاد بکـەم، جەنگم دەکرد، ئـەو پیاوێکـی کوێربـوو، خـوا - تبـارك وتعـالی - دایبەزانـدە سـەر پێغەمبـەری خـوا (علیـه الصـلاة والسـلام) لـە حاڵێکـدا کـە ڕانی لەسـەر ڕانـم بـوو، (ڕانی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) کەوتبـووە سـەر ڕانی زەیـد، ڕەنگـە شـوێنەکە تەسـک بووبـێ، یـان بـۆ ئـەوەی لـە نزیـک یەکـەوە دابنیشـن)، ڕانـم قـورس بـوو هەتـا ترسـام کـە ڕانـم بهـاڕدرێ، بشـکێ لـە بـن ڕانیـدا، دوایـی لێـی لاچـوو (ئـەو حاڵەتـەی کـە بـۆی دروسـت بـوو بـوو، ئـەو حاڵەتـەی جەسـتە قـورس بوونـە) ئیـدی خـوا ئـەم ڕسـتەیەی دابەزانـدە سـەر پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم): [غیـر أولي الـضرر]، واتـە: ڕسـتەکە پێشـێ ئـاوا بـوو: (لایسـتوي القاعـدون مـن المؤمنیـن والمجاهـدون في سـبیل اللـه)، بـڕوادارانی دانیشـتوو لەمـاڵ و تێکۆشـەرانی ڕێـی خـوا یەکسـان نیـن، بـەڵام کـە ئیبنـو ئوممـی مەکتـووم هـات گـوتی: منیـش پێـم خـۆش بـوو جەنـگ و جیهـاد بکـەم بـەڵام ناتوانـم، کوێـرم، خـوا ئـەم ڕسـتەیەی ئـاوا دابەزانـد: [لایسـتوي القاعـدون مـن المؤمنیـن غیـر أولي الـضرر والمجاهـدون في سـبیل اللـه]، بڕوادارانێکـی دانیشـتوو کـە خـاوەن زیـان نیـن، (واتـە: کوێـر نیـن، شـەل نیـن، نەخۆشـێکی وا نیـن کـە نەتوانـن دەربچـن)، ئەوانـە یەکسـان نیـن لەگـەڵ تێکۆشـەرانی ڕێـی خـوادا (سُـبحانه وتعـالی).

کەواتـە: حیکمـەتی یەکەمـی دابەزانـدنی قوڕئـان بـە پچـڕ پچڕیـی، ئەوەیـە کـە دڵ و عەقڵـی پێغەمبـەر (صلـی اللـه علیـه وسـلم) زیاتـر بچەسـپێ.

**٢- حیکمەتی دووەم: بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەی ڕەخنەی بێبڕوایان:**

چونکــە بــەردەوام بێبڕوایــەکان ڕەخنەیــان لــە پێغەمبــەر دەگــرت (علیـه الصـلاة والسـلام) تانەیـان لـێ دەداو تانەیـان لـەو فەرمایشـتەی خـوا دەدا کـە بـۆی دادەبەزێـنرێ، ئنجـا هـەر جارێـک کـە سـوورەتێک هاتـوە، کۆمەڵـە ئایەتێـک هاتـوون، ئـەو وەڵامانـەی خـوای پـەروەردگار بـۆ تانـەو ڕەخنـەی بێبڕوایـەکان دووبـارە بووەتـەوە، وەک فەرمووویـەتی:
﴿ وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾ الفرقان: ٣٣.
واتــە: هیــچ وێنەیەکـت بـۆ ناهێننــەوە، مەگـەر حەقـت بـۆ دێنیــن و ڕوونکردنــەوەی باشــترت بــۆ دێنیــن.
کەواتــە: بــۆ ئــەوەی بــەردەوام بەڵگــەکان بــۆ پێغەمبــەری خاتــەم (صــلی اللــه علیــه وســلم) بێــن بــۆ وەڵامــی ڕەخنــەو تانــەو تەشــەری بێبڕوایــان.

**٣- حیکمەتی سێیەم: بریتییە لە پلە پلەیی لە یاسا داناندا، بۆ ئەوانەی ئەرکدار دەکرێن:**

خــوا - ســبحانه وتعالــی - هەمــوو قورئــانی یەکجــار دانەبەزانــدوە، بەڵکـو قۆنـاغ قۆنـاغ بـە پێـی هـەراش بـوون و گەشـەکردنی بـڕواداران و زۆربـوون و زیـاد بـوونی توانایـان بـۆ وەرگرتنـی ئەرکـە شـەرعییەکان، خوا (سُـبحانه وتعـالی) قورئـانی دیکـەی بـۆ دابەزانـدوون، لێـرەدا ئـەم دەقـەی سـوننەت دێنیــن، تیشــکێکی باشــمان بـۆ دەخاتــە ســەر ئــەو بابەتــە:
(عــن عائشــة - رضي اللــه عنهــا - قالــت: إنمــا نــزل أول مــا نــزل منــه

سـورة مـن المفصـل فيهـا ذكـر الجنـة والنـار، حتـى إِذا ثـاب النـاس إِلى الإِسـلام نـزل الحـلال والحـرام، ولـو نـزل أول نـزل شيء: لا تشربـوا الخمـر! لقالـوا: لا نـدع الخمـر أبـدا، ولـو نـزل لاتزنـوا! لقالـوا: لانَـدعُ الزنـا أبـدا، لقـد نـزل بمكـة عـلى محمـد (صـلى اللـه عليـه وسـلم) واني لجاريـة ألعـب: (بـل السـاعة موعدهـم والسـاعة أدهـى وأمـر) (القمـر آيـة ٤٦) ومـا نـزل سـورة البقـرة والنسـاء إِلاّ وأنـا عنـده) أخرجـه البخـاري رقـم ٤٧٠٧.

دایکـمان خاتـو عائیشـه - خـوا لێـی ڕازی بێـت - دەڵـێ: یەکەمیـن شـتێک کـه لـه قوڕئـان دابـەزی چەند سـووڕەتێک بـوون لە سـووڕەتەکانی موفەسسـەڵ، واته: سـووڕەتە کورتەکان، باسی بەهەشت و، ئاگری دۆزەخیان تێـدا بـوو، هەتـا کاتێک کە خەڵـک بەرەو ئیسـلام گەڕانەوە ئنجـار حەڵاڵ و حـەڕام دابـەزی، ئەگەر یەکەمین شـتێک کە لـە قوڕئان دادەبـەزی، ئەوەبایە فەرمووبای: شـەڕاب مەخۆنـەوە، دەیانگوت: هەرگیز واز لە شـەڕاب خۆریی ناهێنیـن و، ئەگـەر یەکسـەر خوا پێـی فەرمووبان: زینا مەکـەن، دەیان گوت: هەرگیـز واز لـە زینـا ناهێنیـن، (بـەڵام سـەرەتا خـوا (سُـبحانه وتعـالى) باسی بوونناسـی و ئیمان وعەقیدەو بەهەشـت و دۆزەخ و سـزاو پاداشـت و ئەوانەی بـۆ کـردوون، ئنجـا کـە ئیـمان لـە عەقـڵ و دڵیانـدا چەسـپاوە ئنجا وەحـی خوا بەوانـەی فەرمـووە کـە ئیـمان و عەقیـدە لـە دڵیانـدا چەسـپا، ئـەوە حەڵاڵـەو ئـەوە حەڕامـە، ئـەوە چاکەو ئـەوە خراپە.

دوایـی دایکـمان خاتو عائیشـە دەڵـێ) لـە مەککە ئەم ئایەتـە دابەزێنرایە سـەر موحەممـەد (صلـى اللـه علیه وسـلم) لـە حاڵێکـدا من کچێکـی گچکە بـووم یارییـم دەرکـرد، (بـل السـاعة موعدهـم والسـاعة أدهـى وأمـر). بەڵکو ئاخـر زەمـان یـان قیامـەت بەڵێنگەیانـە و، قیامەتیـش قورسـترو تاڵـترە بـۆ ئـەوان، (دایکـمان خاتـو عائیشـە دەڵـێ) سـووڕەتی - البقرة - و - النسـاء - یش

دانەبەزینـە سـەرمان، مەگەر لەحاڵێکـدا کەمن لە لای بـووم، واتە: خاتوخاتو عائیشـەی - خـوای لـێ ڕازی بێ - بـە هاوسـەر گرتبوو).

گومانیـشی تێـدا نیـە کـە پلـە پلەیـی لـە دابەزانـدنی قورئانـدا، کاریگەریـی زۆر گـەورەی هەبـووە لـەوەدا کـە وردە وردە ڕاسـتییەکانی ئیـمان و ئیسـلام لـە عەقـڵ و دڵیانـدا بچەسـپن و، ڕەوشـت و ئاکاریـان بگـۆڕێ و هاوڕەنـگ و هاودەنگـبن لەگـەڵ قورئانـدا.

## ٤- حیکمەتی چوارەم: هەروەها بۆ لەبەر کردنی قورئان و وەخۆگرتنی:

دیسـان ئەو هێواش هێواش دابەزینـە، کاریگەریی زۆر بووە، بەتایبەت بـۆ هاوەڵانـی بەڕێـزی پێغەمبـەری خـوا، وەك ئایەتـی: ﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ ﴾ الإسراء: ١٠٦، ئامـاژەی پێـدەکات.

## ٥- حیکمەتی پێنجەم: جەختکردنەوەی ڕاستیی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) لەوەدا کە قورئان لە لایەن خواوە دابەزێنراوەتە سەری:

چونکە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ النساء: ٨٢.

واتـە: ئەگـەر ئـەم قورئانـە لـە لایـەن جگـە لەخـواوە بوایـە، جیاوازیی و ناکۆکییەکـی زۆریـان تێـدا دەبینی.

قورئانێـک لـە مـاوەی بیسـت و سـێ سـاڵدا دابەزیبێتـە سـەر پێغەمبـەری خاتـەم (علیـە الصـلاة والسـلام) بـەڵام هیـچ شـتێکی تێـدا نەبـێ، لـە سـەرەتای و لـە نێوەڕاسـتی و لـە کۆتایـی دا، لەگـەڵ ئـەوی دیکـەدا تێـک بگیـرێ، بێگومـان ئـەوە بەڵگەیەکـی زۆر مەحکـەم و پتەوە،

لەسەر ئەوە کە ئەم قورئانە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ سەر پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) دابەزێنراوە.

کەواتە: ئەمە بۆ خۆی باشترین وەڵام بووە بۆ ئەوانەی: تۆمەتی شاعیربوون و، کاهین بوون و، جادووگەربوون و شێت بوونیان پاڵداوەتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و تۆمەتی ئەوەیان پاڵدەوەتە لای قورئان، کە ئەمە: قسەی شاعیرانە، قسەی شێتانە، قسەی کاهینانە، هەڵبەستراوە، بەناوی خوای پەروەردگارەوە.

وەک خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَـٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلْ هُوَ ءَايَـٰتٌۢ بَيِّنَـٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: تۆ لەپێش قورئاندا هیچ کتێبێکت نەخوێندوەتەوەو بە دەستی ڕاستیشت کتێبێکت نەنووسیوە، ئەگەر نا ئەوانەی لەسەر ناحەقن دەکەوتنە دوو دڵییەوە، بەڵکو ئەم (قورئان)ە، ئایەتە ڕۆشنەکانە لەلایەن خواوەو، تەنیا ئەوانەی ستەمکارن نکووڵیی دەکەن لە ئایەتەکانی خوا.



## بڕگـەی سـێیـەم: کـێ قورئـانی بـۆ موحەممـەد (صـلی اللـە علیـە وسـلم) هێنـاوە؟!

بێگومان خوا لە زۆر شوێنی قورئاندا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە جیبریل قورئانی بۆ موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دابەزاندوە، وەک لە سوورەتی (الشعراء)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: ئەم قورئانە دابەزاندنی پەروەردگاری جیهانییانە، (الروح الأمین) دایبەزاندۆتە سەر دڵی تۆ، تاکو لە ورياکەرەوان و ترسێنەران بی، بەزمانێکی عەرەبیی ڕۆشن.

هەروەها لە سووڕەتی (النحل)دا فەرموویەتی:

﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ النحل: ﴿١٠٢﴾.

بڵێ (روح القدس) لە پەروەردگارتەوە بە حەق دایبەزاندوە.

هەروەها لە سووڕەتی (النجم)دا خوا دەفەرموێ:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ ﴾ النجم.

واتە: سوێند بە ئەستێرە کە دەکەوێ، یان ئاوا دەبێ، هاوەڵەکەتان نە گومڕا بووە، نە بێمراد بووەو، لە ئارەزووەوە قسە ناکات، بەس سروشە بۆلای سروش دەکرێ، کەسێک کە زۆر بەهێزە فێری کردوە، خاوەنی دیمەنێکی زۆر جوانە، ئنجا ڕێك وەستا (مەبەستیش جیبریلە).

هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ البقرة: ٩٧.

واته: بڵێ هەرکەسێک دوژمنە بۆ جیبریل، ئەوە بە دڵنیاییی جیبریل بە مۆڵەتی خوا دایبەزاندووەتە سەر دڵی تۆ.

ئنجا ئایا جیبریل چۆن و بە چ شێوەیەک قورئانی بۆ پێغەمبەری خاتەم - صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت - دابەزاندوە؟ لە سوورەتی (الشوری)دا خوای موتەعال ڕوونی دەکاتەوە، کە چۆن بە گشتیی وەحیی بۆ پێغەمبەران (علیه الصلاة والسلام) ناردوە:

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ﴾ الشورى: ٥١.

واته: هیچ مرۆڤێک بۆی نیە خوا بیدوێنێ و قسەی لەگەڵ بکا مەگەر بە وەحیی، (واتە: بۆی سروش بکات و بە شێوەی پەنهان بیخاتە دڵ و دەروونیەوە) یاخود لە پشت پەردەوە بیدوێنێ (وەک خوا مووسای دواند یان موحەممەد لە شەوی میعراجدا) یاخود نوێنەرێک بنێرێ، (فریشتەیەک بنێرێ خۆی بەرێتە سەر شێوەی پیاوێک، یاخود بێئەوەی بچێتە سەر شێوەی مرۆڤێک)، ئەوەی خوا دەیەوێ بۆی سروش بکات.

ئنجا لە هەندێک لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) ئەمە ڕوون کراوەتەوە، بۆ وێنە: **(عن الحارث بن هشام - رضي الله عنه - قال: یارسول الله! کیف یأتیك الوحي؟ فقال رسول الله (صلی الله علیه وسلم): أحیاناً یأتیني مثل صلصلة الجرس، وهو أشدّه علي، فینفصم عني وقد وعیت عنه ما قال، وأحیاناً یتمثّل لي المَلَك رجلاً فیکلّمني فأعي ما یقول).**[1]

ئەلحاریث کوڕی هیشام گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (علیه

(١)- رواه البخاري برقم: (٣٤٣) ومسلم برقم: (٢٣٣٣).

الصلاة والسلام) وەحییت چۆن بۆ دێ؟! پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: هەندێک جار وەک دەنگی جەڕەس، دەنگی زەنگوڵە، بۆمدێ، ئەوەیان زۆر لەسەرم قورسە، دوایی کۆتایی وەحییەکە دێ و ئەوەی گوتوویەتی هەمووی وەردەرگرم، هەندێک جاریش فریشتەکە بۆم دەچێتە سەر شێوەی پیاوێک و دەمدوێنێ و، ئەوەی دەیڵێ منیش لێی تێدەگەم.

کە دیارە ئەم حاڵەتی دووەمیان، پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) هێندە لەسەری قورس نەبووە.

پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) جیبریلی لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی وەک فریشتە تەنیا دووجاران بینیوە، وەک لەوبارەوە لە سەحیحی بوخارییدا هاتوە: (مسروق بن الأجدع) لە دایکمان خاتو عائیشە - خوا لێی ڕازی بێت - دەپرسێ، لەبارەی فەرمایشتی خواوە کە دەفەرموێ:
﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴾ التكوير: ٢٣.

واتە: بەدڵنیایی ئەوی دی (پێغەمبەر جیبریلی دی) لە ئاسۆی ڕۆشن دا.

هەروەها کە دەفەرموێ:
﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴾ النجم: ١٣.

واتە: بەدڵنیایی دەبەزینێکی دیکەش ئەوی بینی (پێغەمبەر جیبریلی بینی)

دایکمان خاتو عائیشە دەڵێ: **(أنا أول هذه الأمة سأل عن ذلك رسول الله** (صلى الله عليه وسلم)**، فقال: إنما هو جبريل لم أره على صورته التي خلق عليها غير هاتين المرتين، رأيته منهبطاً من السماء سادّاً عِظَمُ خَلْقه مابين السماء والأرض).**[1]

مەسرووقی کوڕی ئەلئەجدەع یەکێک بووە لە زانایانی تابیعین، لە بارەی قسەی خوای بەرزەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ﴾ واتە: بە دڵنیایی ئەوی بینی لە ئاسۆی ڕووندا،

(١)- أخرجه مسلم برقم: (١٧٧) والترمذي برقم: (٣٠٧٠)، وقال الترمذي حديث حسن صحيح.

هەروەهـا فەرمایشـتی خـوا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ﴾ هەروەهـا جارێکـی دیکـەش، دابەزینێکـی دیکـەش بینـی، لـە خاتـو عائیشـەی پرسـی، (وایزانیـوە کـە مەبەسـت بینینـی خوایـە)، خاتـو عائیشـە - خـوا لێـی ڕازی بـێ - گـوتی: مـن یەکەمـی ئـەم ئۆممەتـەم کـە لەوبـارەوە پرسـیارم لـە پێغەمبـەری خواکـرد، پێغەمبـەری خـوا فەرمـووی: ئـەوە جیبریـل بـوو، ئـەوم لەسـەر شێوەی خـۆی کـە خـوا لەسـەری خوڵقانـدوە، تەنیـا ئـەو دووجـارە بینـی، بینیـم لـە ئاسـمانەوە هاتـە خـوار، مەزنیـی جەسـتەی نێـوان ئاسـمان و زەوی داپۆشـیبوو.

واتە: تەنیا دووجاران پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) جیبریلی لەسەر شێوەی خۆی وەک فریشتەیەک بینیوە، جارەکانی دیکە بۆی هاتۆتە سەر شێوەی پیاوێک.

جارێک لەسەر زەوی بینیویەتی، لەسەرەتادا کە خوا کردوویەتی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەک لە سەحیحی بوخارییدا هاتوە، جای دووەمیش لە ئاسمان بینیویەتی، لە شەوی بەرزبوونەوەو شەو ڕۆیی (الإسراء والمعراج)دا.



# تەوەری سێیەم

## هۆکارەکانی دابەزینی هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان و، چۆنیەتیی زانینی و، سوودەکانی



ئەم تەوەرەش لەچوار بڕگەدا دەخەینەڕوو:

## بڕگەی یەکەم: جۆرەکانی قورئان لەڕووی هۆی دابەزینەوە:

بێگومان قورئان لەو بارەوە کە هۆی هاتنە خواری ئایەتەکانی دیاربێ و هەبێ، یان دیارنەبێ، دووبەشە:

أ. زۆربەی هەرە زۆری قورئان هۆکاری دابەزینی تایبەتیی دیار نیە، دیارە خوا قورئانی بۆ پێغەمبەر (محمد) دابەزاندوە، کە بە بەندەکانی بگەیەنێ، بە جندو مرۆڤ، بە نێرو مێوە، بە وردو درشتەوە، بە ڕەش و سپییەوە، بە عەرەب و غەیری عەرەبەوە، بەڵام ئەوە کە ئەو ئایەتە، یان ئەو کۆمەڵە ئایەتە، یان ئەو سوورەتە، بە بۆنەو هۆکارێکی دیاریی کراوەوە هاتبێ و، لە کتێب و سەرچاوەکاندا بەسەنەدێکی ڕاست بە ئێمە گەیبێ، زۆربەی قورئان بەو شێوەیە نیە، کە ئێمە هۆی هاتنەخواری سوورەتێکی دیارییکراو یان چەند ئایەتێکی دیارییکراو بزانین.

ب. بەڵام کەمینەیەک لە ئایەتەکان هۆکاری هاتنە خواریان دیارە، بەتایبەت قورئانی مەدینەیی، هەڵبەتە هەندێک لە سوورەت و ئایەتەکانی قورئانی مەککەییش، هۆکاری هاتنە خواریان دیارە، بەڵام زۆربەی ئایەتە هۆکاری دابەزین دیارەکان، لە قورئانی مەدینەیین، کە لە چاو قورئانی مەککەیی دەڵێین: زۆر، ئەگەرنا دیسان لە نێو قورئانی مەدینەییشدا، ئەو ئایەتانەی کە هۆکاری هاتنە خواری تایبەتیان هەیە، هەر کەمینەن.

## بڕگەی دووەم: لە چ ڕێیەکەوە دەتوانین هۆی هاتنە خواری ئایەتەکان بزانین؟

بێگومان زانینی هۆی هاتنە خواری ئایەتەکان، یان دەبێت لە ڕێی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بێ، کە پێغەمبەری خوا فەرموو بێ: ئەم سوورەتە یان ئەم ئایەتەم لەو بارەوە دابەزییە سەر، یان لە ڕێی هاوەڵانیەوە خوا لێیان ڕازی بێ.

زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە ئەگەر یەکێک لە هاوەڵان بڵێ: (نزلت هذه الآية في كذا، فهو بمنزلة حديث مرفوع إلى النبي (صلى الله عليه وسلم) وإن لم يذكر فيه النبي).

واتە: ئەگەر یەکێک لە هاوەڵان بڵێ: ئەم ئایەتە لەو بارەوە دابەزیوە، ئەمە وەک فەرموودەی بەرز کراوە (مرفوع) وایە بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) با ناوی پێغەمبەریشی تێدا نەهاتبێ.

چەند نموونەیەك:

**أ- (عن أبي مسعود الأنصاري رضي الله عنه قال: لما أُمِرْنا بالصدقة، كنّا نتحامَلُ، فجاء أبو عقيل بنصف صاع، وجاء إنسان بأكثر منه، فقال المنافقون: إنَّ الله لغني عن صدقة هذا، وما فعل الآخر إلاّ رئاءاً، فنزلت:**

﴿ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ التوبة: ٧٩[1].

ئەبو مەسعوودی ئەنساریی دەڵێ: کە فەرمانمان پێکرا بە ماڵ بەخشین، ئێمە زۆرمان لەخۆمان دەکردو فشارمان بۆ خۆمان دەهێنا،

(١)- أخرجه البخاري برقم: (١٣٤٩-٤٣٩١)، ومسلم برقم: (١٠١٨).

(کەم دەست بوون، بۆ ئەوەی ئەو فەرمانەی خوا جێ بەجێ بکەن)، ئەبو عوقەیل (یەکێک بووە لە هاوەڵان)، نیو ڕبەی هێنا، [ (صاع) چوار مستە، بە کوردیی دەڵێن ڕبە، چوار پێنج کیلۆیەک دەبێ، ئایا جۆ بووە، هەرزن بووە، مێوژ بووە، خورما بووە، نیو ڕبەی هێنا، کە ئەندازەیەکی کەمە]، کەسێکی دیکەش ئەندازەیەکی زۆرتر لەوەی هێنا، مونافیقە دڵنەخۆشەکان، گوتیان: بە دڵنیایی خوا لە خێرو بەخشینی ئەمە، (ئەم نیو ڕبەیە)، بێنیازە، (هیچ نیەچ کەلێنێک ناگرێ)، بەوی دیکەیشیان گوت: ئەمە تەنیا بۆ ڕوودەربایسیی و بەرچاوی خەڵک وایکردوە.

ئەگەر کەمی هێنابایە دەیانگوت: ئەوەندە هیچ کەلێن ناگرێ و خوا نایەوێ و لێی بێنیازە، کەسێکیش زۆری هێنابایە، دەیانگوت: بۆ ڕیابازیی بازیی وا دەکا! خوا (سُبحانه وتعالى) لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ التوبة: ٧٩.

یانی: ئەوانەی کە ڕەخنە دەگرن لە بڕوادارانی بەخشەر، کە سامانەکانیان دەبەخشن و، ئەوانەش کە تەنیا کەمێک شک دەبەن بیبەخشن و زۆر لە خۆیان دەکەن، ڕەخنەیان لێ دەگرن و گاڵتەیان پێ دەکەن (دەڵێن: ئنجا ئەوەندە کەمە چی بوو!) خوا گاڵتەیان پێدەکات و سزایەکی بەئێشیان هەیە.

ب- با هەر لەو بارەوە نموونەیەکی دیکەش بێنینەوە:

**(عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال: سألت أو سُئِلَ رسولُ الله صلى الله علي وسلم، أي الذنب عند الله أكبر؟ قال: أن تجعل لله**

نِداً وهو خلقك، قلت: ثم أي؟ قال: ثم أن تقتل ولدك خشية أن يطعم معك، قلت: ثم أي؟ قال: أن تزاني بحليلة جارك، قال ونزلت هذه الآية تصديقاً لقول رسول الله (صلى الله عليه وسلم):

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴾ الفرقان: ٦٨(١).

عبدالله ی کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پرسیارمکرد، یاخود پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چ گوناحێک لەلای خوا گەورەترە؟ فەرمووی: ئەوە کە هاوتا بۆ خوا دابنێی لە حاڵێکدا ئەو تۆی وەدی هێناوە، گوتم: ئەدی دوای ئەوە، (چ گوناحێک گەورەترە)؟ فەرمووی: ئەوە کە منداڵەکەت بکوژی لە ترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات، گوتم: دوای ئەوە؟ فەرمووی: ئەوە کە لەگەڵ ژنی هاوسێکەتدا زینا بکەی، (عبدالله ) دەڵێ: وەک بەڕاست دانانی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) ئەم ئایەتە دابەزی:

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴾ الفرقان: ٦٨.

واتە: ئەوانەی لەگەڵ خوادا لە پەرستراوی دیکە ناپاڕێنەوەو، ئەو نەفسەی خوا قەدەغەی کردوە نایکوژن، مەگەر بە حەق و، زینا ناکەن و، هەرکەسێک هەر کام لەو گوناحانە بکات، تووشی تاوان و گوناحێکی گەورە بووە.

جـ- هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین:

(عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما أن ناساً من أهل الشرك

(١)- أخرجه البخاري برقم: (٤٤٨٣ و ٥٦٥٥ و ٦٤٦٨ و ٧٠٩٤)، ومسلم برقم: (٨٦).

**كانوا قد قتلوا وأكثروا، و زنوا وأكثروا، فأتوا محمداً** (صلى الله عليه وسلم)، **فقالوا إن الذي تقول وتدعوا إليه لحسن، لو تخبرنا أن لما عَمِلْنا كفارة، فنزل:**

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَ ﴾ الفرقان: ٦٨.

ونزل:

﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِ ﴾ الزمر: ٥٣(١).

عبداللـه ی کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێت: کۆمەڵێک لە ئەوانەی ئەهلی شیرک بوون، (هاوبەش بۆ خوادانەر بوون)، پێشتر زۆریان قەتڵ کردبوون و زۆر، زینایان کردبوو، هاتنە لای موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) گوتیان: ئەوەی تۆ دەیڵێی و خەڵکی بۆ لا بانگ دەکەی، باشە ئەگەر هەواڵمان پێ بدەی ئایا ئەوەی کردوومانە لە ڕابردوودا، سڕانەوەی بۆ هەیە؟ ئیدی خوا (سُبحانه وتعالى) ئەم ئایەتەی سوورەتی (الفرقان)ی دابەزاند، (ئایەتی ٦٨): [ئەوانەی لەگەڵ خوادا لە پەرستراوێکی دیکە ناپاڕێنەوەو ئەو نەفسەی خوا قەدەغەی کردوە نایکوژن، مەگەر بە حەق و زینا ناکەن]. هەروەها خوا، ئایەتی (٥٣)ی سوورەتی (الزمر)،یشی دابەزاند: {بڵێ: ئەی ئەو بەندانەم! کە بەرامبەر بە خۆتان زێدەڕۆییتان کردوە، لەبەزەیی خوا نائومێد مەبن}.

ئەمە چەند وێنەیەک لەوبارەوە کە هەندێک لە ئایەتەکان هۆی هاتنە خواریان هەیە، بەڵام لێرەدا پێویستە ئەو ڕاستییە

---

(١)- أخرجه البخاري (٤٥٣٢)، ومسلم برقم: (١٢٢) .

بزانیـــن کــە زانایـــان بنچینەیەکیـــان دانـــاوە بــۆ ئــەو ئایەتانــەی هــۆی هاتنــە خواریــان هەیــە، ئەویــش ئەوەیــە کــە دەڵێــن:

[ إن خصوص السبب لايمنع شمول المعنى].

یان دەڵێن:

[العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب].

واتــە: تایبەتبــوونی هــۆکار، ڕێ لــە گشــتگیریی واتــا ناگــرێ، یاخــود: جێــی ســەرنج: گشــتیی بوونــی بێژەکەیــە، نــەک تایبەتبــوونی هۆکارەکــە.

زانایــان هەموویــان لەســەر ئــەو بنچینەیــە ڕێککەوتــوون، کــە ئەگــەر هــۆی هاتنــە خــواری ئایەتێــک، ڕووداوێکــی تایبــەت بــوو، ڕەوشــت و ڕەفتارێکــی کەســێکی تایبــەت بــوو، ئەگــەر پیــاوە ئەگــەر ئافرەتــە، ئــەو ئایەتــە موبارەکــە بەڵــێ بــەو هۆیــەوە دابەزیــوە، بــەڵام تایبــەت نیــە بــەوەوە، بەڵکــو ئەویــش و هەمــوو ئەوانــەی دیکەیــش کــە وەک ئــەو دەکــەن، یــان وەک ئەویــان لــێ دەقەومــێ، دەیانگرێتــەوە.

لێرەدا با وێنەیەک بێنینەوە:

**(عـن عبداللـه بـن مسـعود رضي اللـه عنـه أن رجـلاً أصـاب مـن امـرأة قبلـة، فـأتى النبـي (صـلى اللـه عليـه وسـلم)، فذكـر ذلـك لـه قـال: فنزلـت:**

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هــود: ١١٤.

**قـال: فقـال الرَّجـلُ ألي هـذا يـا رسـول اللـه؟! قـال: لِمَـنْ عَمِـلَ بهـا مـن أمتـي. وفي روايـة: فقـال رجـل مـن القـوم: يانبـي اللـه! هـذا لـه خاصـة؟ قـال: بـل للنـاس كافـة).**[1]

عبداللــە ی کــوڕی مەســعوود (خــوا لێــی ڕازی بــێ) دەڵــێ: پیاوێــک

(١) - أخرجه البخاري برقم: (٥٠٣-٤٤١٠)،و مسلم برقم: (٢٧٦٣).

ماچێکی لە ئافرەتێک کردبوو، هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بۆ باسکرد، ئنجا ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزی:
﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هود: ١١٤.

واتە: نوێژ بەرپا بکە هەردوو ئەولاو لای ڕۆژ و چەند بەشێک لە شەو، بە دڵنیاییی چاکەکان خراپەکان لادەبەن، ئەوە بیرخەرەوەیە بۆ یادی خوا کەران.

پیاوەکە گوتی: ئایا ئەمە تەنیا بۆ منە، ئەی پێغەمبەری خوا؟! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بۆ هەرکەسێکە لە ئۆممەتم کە کاری پێبکات، لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: پیاوێک لە خەڵکە کە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە تایبەتە بەوەوە؟ فەرمووی: بەڵکو بۆ تێکڕای خەڵکە.

کەواتە: هۆی دابەزینەکە ڕەفتاری پیاوێکی دیاریکراو بووە، بەڵام حوکمەکەی ئەویش و هەموو ئەوانەی دیکەیش کە وەک ئەو دەکەن، دەگرێتەوە.



## برگەی سێیەم: سوودەکانی زانینی هۆکاری دابەزین:

أ- یەکەمیـن و گەورەتریـن سـوودی بریتییـە لـە پەیبردن بـە حیکمەتی ئـەو یاسـادانانەو، زانینـی ئامانجـەکانی شـەریعەت، کـە چۆن حوکمـەکانی شـەریعەت دادەبـەزن بەپێـی ڕووداوەکان، بەپێـی ئـەو واقیعـە کـە خەڵـک تێیـدا دەژی و ڕەوتی ڕووداوەکان و، ئەو ئامانجانەی کە مرۆڤە ئەرکدارەکان هەیانـن، دەیانهێننە دی.

ب- سـوودێکی دیکـە ئەوەیـە کـە، هـۆی هاتنـە خـوار یارمەتیدەرمـان دەبـێ بۆ ڕاسـت فامکردنـی واتاو مانـای ئایەتەکـە، چونکە هاوکارمـان دەبێ کـە بزانیـن ئەو ئایەتە کـە زیاتـر لەواتایەک هەڵدەگـرێ، کام لـە واتایەکانی مەبەستە؟

لێـرەدا وێنەیـەک دێنینـەوە: دەگێڕنـەوە مـەڕوانی کـوڕی حەکـەم، بـە دەرگاوەنەکـەی کـە نـاوی ڕافیـع بـووە دەڵـێ: بچـۆ بـۆ لای ئیبنـو عەبباس پێـی بڵـێ: ئەگـەر هەرکامێـک لـە ئێمـە کردەوەیـەک کـە دەیـکات، پێـی دڵخۆشـبێ و پێـی خۆشـبێ خەڵـک سـتایشی بـکات، هەرکەسـێ وابـکات، سـزادراوبێ، هەمووەمـان سـزا دەدرێیـن، عبداللـە ی کـوڕی عەبباسـیش دەڵـێ: ئێـوە حەقـی ئـەو ئایەتەتـان چییـە، ئـەم ئایەتـە کـە دەفەرمـوێ:
﴿ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟ ﴾ آل عمران: ١٨٨.

کـە دەفەرمـوێ: ئەوانـەی کـە دڵ خـۆش دەبـن بـەوەی کردوویانـە و حـەز دەکـەن سـتایش بکرێـن بـە شـتێک کـە نەیانکـردوە، دەڵـێ: خـوا (سُـبحانه وتعـالى) لەبـارەی خـاوەن کتێبانـەوە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد، کـە پێغەمبـەر (عليـه الصـلاة والسـلام) لەبـارەی شـتێکەوە پرسـیاری لـێ کـردن ئەوانیـش پەنهانیـان کـرد و شـتێکی دیکەیـان هـەواڵ پێدا، کاتێـک

لەلای چوونە دەر، پێیان وابوو ئەوەی پرسیاری لێکردوون هەواڵیان پێداوەو، بەوەش ستایش دەکرێن، ئنجا بەوەش دڵخۆشبوون کە کردیان، واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیبووی، وەڵامە ڕاستەقینەکەیان لێ شاردەوەو شتێکی دیکەیان پێ گوت، خوا لەبارەی ئەوانەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند![1]

بەڵام وەک کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی (آل عمران)یشدا باسم کردوە، ئەگەر هۆی هاتنە خوارەکەی ئەوەبێ، بێگومان ئێستاش هەر کەسێک کارێکی چاک نەکات و، پێی خۆشبێ ستایش بکرێ لەسەری، بەدڵنیاییی سەرزەنشتێک کە لەم ئایەتە موبارەکەدایە دەیگرێتەوە، چونکە مرۆڤ نابێ پێی خۆشبێ بە شتێک ستایش بکرێ، کە نەیکردوە.



(١)- أخرجه البخاري برقم: (٤٢٩٢)، ومسلم برقم: (٢٧٧٨).

## برگەی چوارەم و کۆتایی: پێویستە لە هۆی هاتنە خوار باش بکۆڵینەوە و تەواو تێیدا بگەینە قەناعەت:

بۆیە ئەو کتێبانەی کە لە سەنەدو چۆنیەتیی گەیاندنی ئەو هۆکاری هاتنە خوارە، بە پێغەمبەر یاخود بە هاوەڵان، دەکۆڵنەوە، پێویستە زۆر چاک چاویان تێدا وردبکەینەوە، چونکە زۆرێک لە کتێبەکان هەرچی کە بیستوویانە و، هەرچی بینویانە لە تەفسیرەکاندا هێناویانە، بەڵام دەبێ لێکۆڵینەوەی ورد لەو بارەوە بکرێ و، تاکو لە شتێک دڵنیا نەبین کە ئەو ئایەتە لەوبارەوە هاتووەتە خوار، ئەو هۆی هاتنە خوارەوەیە پاڵ نەدەینە لای ئەو ئایەتە، جاری واش هەیە، ئایەتێک بە هۆکارێک هاتووەتە خوار، بەڵام دەبێ وردبین کە مەبەستی چییە؟! چەمک و واتای ئایەتەکەش تەنیا تایبەت نەکەین بەو ڕووداوەوە، یان تەنیا بەو شتەوە کە هۆی هاتنە خوارەوەکەی لەسەر هاتوە.



# تەوەری چوارەم

## زانینی مەککەیی و مەدینەیی، لە قورئان دا



**بەڕێزان!**

**ئەم تەوەری چوارەمە لە حەوت بڕگەدا دەخەینەڕوو:**

## بڕگەی یەکەم: پێناسەی قورئانی مەککەیی و مەدینەیی:

### أ- قورئانی مەککەیی:

سادەترین و ڕوونترین پێناسە بۆ قورئانی مەککەیی ئەوەیە کە بگوترێ: مەبەست لە قورئانی مەککەیی، (القرآن المكي) ئەوەیە کە پێش کۆچکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەککەوە بۆ مەدینە دابەزیبێ.

ئنجا کە دابەزیوە با پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) لەو کاتەدا لە مەککەش نەبووبێ و، ئەو قورئانە لە نێو شاری مەککەش دانەبەزیبێ.

### ب- قورئانی مەدینەیی:

پێناسەی قورئانی مەدینەیی (القرآن المدني)یش ئەوەیە کە بگوترێ: ئەو قورئانەیە کە لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی لە مەککەوە بۆ مەدینە دابەزیبێ، ئنجا ئەو قورئانەش چ لەشێوەی چەند سوورەتێک دابێ، چ چەند ئایەتێک، با لە نێو شاری مەدینەش دانەبەزیبێ، هەر مەدینەییە.

هەڵبەتە لە قورئانی مەککەییدا، وەک دوایی باس دەکەین، چەند دەربڕینێک زۆر دووبارە دەبنەوە، وەك: [يا أيها الناس، يا أيها الإنسان، يا بني ادم]، بەڵام [يا أيها الذين آمنوا] تەنیا لە قورئانی مەدینەییدا هاتوە، هەڵبەتە [يا أيها الناس] - یش لە قورئانی مەدینەییدا هاتوە، بەڵام (يا أيها الذين آمنوا) زۆر هاتوە لە قورئانی مەدینەییدا،

ئەمە پێناسەی قورئانی مەککەیی و قورئانی مەدینەیی.

## بڕگـەی دووەم: چۆنیەتیـی زانینـی ئـەوە کـە ئـەو سـوورەتە یـان ئـەو چەنـد ئایەتـە، لـە قورئانـی مەدینەییـن یـان مەککەییـن:

ئەمە بە دوو ڕێیان دەزاندرێ:

**ڕێـی یەکەم:** ئەوەی لـە هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بـێ، گوازرابێتەوە، کـە ئـەوان ئامـادەی دابەزینـی قورئان بـوون و، زانیویانـە ئـەو ئایەتەیان ئەو کۆمەڵـە ئایەتـە، یـان ئـەو سـوورەتە، چۆن دابەزیـوە، لـە چ ڕوداوێـک داو لـە چ حاڵێکـدا؟ زۆر جـاران ئـەو شـوێنەوارانەی لـە هاوەڵانـەوە هاتـوون، بۆمـان دەردەخـەن کە ئەم قورئانـە لە مەککـە دابەزیوەو، ئەمەیـان لە مەدینە دابەزیوە.

هەڵبەتـە جگـە لـە هـاوەڵان خوا لێیـان ڕازی بـێ، هەندێک لـە زانایانی شـوێنکەوتوان (التابعين)یـش ئەوانـەی کـە زۆر شـارەزا بـوون لـە قورئاندا، بەتایبـەت موجاهیـد کـە قوتابی نزیکـی عبدالله ی کوڕی عەبباسـە، هەروەها عیکریمـەو هەندێکـی دیکـە لـە زانایـانی تابیعیـن، ڕەزاو ڕەحمـەتی خـوا لـە هەموویانبـێ، ئەوانیـش کـەم و زۆر بەهرەیـان لـێ وەردەگیرێ.

**ڕێـی دووەم:** بـۆ زانینـی مەککەیـی بـوون و مەدینەیی بـوونی قورئان، بریتییـە لـە کۆششـکردن (إجتهـاد)، ئەویـش ئـەوە کـە مـرۆڤ وردبێتـەوەو ڕامێنـێ، ئایـا تایبەتمەندییـەکانی قورئـانی مەککەیـی لەو سـوورەتەدا هەن، یـان لەو چەنـد ئایەتەدا، یاخـود تایبەتمەندییـەکانی قورئـانی مەدینەیی زیاتر تێـدا هەن؟

لـەوەش دا زانایـان کۆشـش و هەڵهێنجـانی زۆریـان کـردوەو، ئێمـەش لـەو تەفسـیرەی خۆمانـدا[1] هـەر وامانکـردوە.

---

(١)- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

## بڕگـەی سـێیەم: تایبەتمەندییـەکانی قورئـانی مەککەیـی و مەدینەیـی:

### أ- تایبەتمەندییەکانی قورئانی مەککەیی:

بۆ قورئانی مەککەیی دەتوانین کۆمەڵێک تایبەتمەندیی باسبکەین:

**تایبەتمەندیی یەکەم:** بانگەوازکردن بۆ تەنیا خوا پەرستیی و چەسپاندنی پەیامی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد (علیه الصلاة والسلام) و چەسپاندنی بڕوابە ڕۆژی دوایی و، سزای خوا و هەڕەشەی خوا لە بێبڕوایان و خراپەکاران و، موژدەی خواو بەڵێنی خوا بۆ چاکەکاران و، وتوێژو شەڕە قسەکردن لەگەڵ بێبڕوایان و هاوبەش دانەراندا، بە بەڵگە عەقڵییەکان و، بە بەڵگە هێنانەوەی دیاردەو دیمەنە گەردوونییەکان.

**تایبەتمەندیی دووەم:** دانانی چەند بنەمایەکی گشتیی بۆ یاسادانان لە بواری حەڵاڵ و حەڕامداو، جەختکردنەوە لەسەر چەسپاندنی بەهاو ڕەوشتە بەرزەکان وەک: دادگەریی، چاکەکاریی، یەکسانیی و، هەڵوەشاندنەوەی ئەوانە کەدژو پێچەوانەی ئەو بەها بەرزانەن، وەک ستەم و، تاوانباریی و، ڕەوشتە دزێوەکان و ئازاردانی خەڵک.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** گێڕانەوەی بەسەرهات و چیرۆکی پێغەمبەران (علیه الصلاة والسلام) و گەل و نەتەوە پێشووەکان، بەمەبەستی پەند لێ وەرگرتن و، زیاتر دڵ چەسپاندنی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) و بڕواداران.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** سووڕەتە مەککەییەکان و قورئانی مەککەیی، ئایەتەکانیان بڕگەکانیان کورت کورتن و واتایەکانیان زۆر بەهێزو ڕاتەکێنەرو ڕاچڵەکێنەرن.

چونکە بۆ کەسانێک دابەزێندراون کە بێبڕوابوون و کەللە ڕەق و نەسەلەمێن بوون، بۆیە خوا (سُبحانە وتعالی) بەپێی عەقڵییەت و سروشتی خۆیان دواندوونی.

کەسانێکیش کە دەویسترێ هۆشیاربکرێنەوەو ڕابچڵەکێنرێن، دەبێ بە توندیی بدوێندرێن، بەڵام وەک باس دەکەین، قورئانی مەدینەیی، بەشێنەیی و ئارامیی بە هێمنیی دواوە، چونکە لەوێ بنیاتنانی کۆمەڵگاو دامەزراندنی دەوڵەت بووە، کە پێویستیی بە نەفەسی درێژو بە شێنەیی و هێدیی و مەندیی دەکات.

ب- تایبەتمەندییەکانی قورئانی مەدینەیی:

ئەویش دەتوانین چوار تایبەتمەندیی لێ بخەینە ڕوو:

**تاییتمەندیـی یەکـەم:** ڕوونکردنـەوەی پەرستشـەکان و هەڵـس و کەوتـەکان و سـزایەکان و، ئـەو یاسـاو بنەمایانـەی کـە دەوڵەتیـان پـێ بەڕێـوە دەچـێ، سـەرجەم یاسـاکانی ئیسـلام، کـە هـەم تاکـی مسـوڵمان، هەم خێـزانی مسـوڵمان، هـەم کۆمەڵـگای مسـوڵمان و، دەوڵەتێکـی ئیسـلامیی بەڕێوەیـان دەبـاو جێبەجێیـان دەکات.

**تایبەتمەندیـی دووەم:** جەختکردنـەوە لەسـەر بانگکـردنی خـاوەن کتێبـەکان و بـاسی حـاڵ وباڵیـان و، ڕوونکردنـەوەی گومڕایـی و سەرلێشـێواویی و سـەرگەردانییان، چونکـە لـە نێـو کۆمەڵـگای مەدینـەدا جوولەکـەکانی تێـدا هەبـوون و، کەمێـک لـە نەسـڕانییەکانیشی تێـدا هەبـوون، هەروەهـا کەمێـك هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر (مـشرك) و ژمارەیەکی زۆریـش لـە دەغـەڵ و مونافیقـەکان هەبـوون.

**تایبەتمەندیـی سـێیەم:** ڕوونکردنـەوە و پـەردە لەسـەر لادانی مونافیقـەکان و خسـتنە ڕووی سـیفەتەکانیان و حـاڵ و باڵیـان:

چونکـە کاتێـک حاڵـەتی نیفـاق لـە مەدینـە سـەری هەڵـدا، کـە

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و مسوڵمانان دەسەڵاتیان ڕانا بەسەر مەدینەو دەوروبەریدا، ئەگەر نا پێشتر عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول و ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە لەگەڵی دابوون، هەر ئەهلی شیرک بوون و نەیاندەشاردەوە کە بڕوایان نەهێناوە، بەڵام دوایی کە تەماشایان کرد کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی بەهێزو پێز بووە، بەرژەوەندیی خۆیان لەوەدا بینی، ئەوانیش خۆیان لەگەڵ مسوڵماناندا هاودەنگ و هاوڕەنگ بکەن بە ڕواڵەت، هەرچەندە لە دڵیشەوە هەر بێبڕوابوون و قەناعەتیان نەبوو.

### تایبەتمەندیی چوارەم بۆ قورئانی مەدینەیی:

بەپێچەوانەی قورئانی مەککەییەوە، ئایەتە مەدینەییەکان درێژن و نەفەسێکی هێمنتریان هەیە، چونکە ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانی ئیسلام و یاساکانی و چەسپاندنی یاساکان، بێگومان شێوازێکی دیکە دەخوازێ، غەیری شێوازی قورئانی مەککەیی کە مەبەست لە قورئانی مەککەیی ڕاتەکاندن و ڕاچڵەکاندن و بێدارکردنەوەی مرۆڤە هاویەش بۆ خوا دانەرو غەیری خوا پەرستەکان بووە.



## بڕگەی چوارەم: نیشانە جیاکەرەوەکانی مەککەیی و مەدینەیی لە قورئاندا:

چۆن دەتوانین سوورەتێک یا چەند ئایەتێک بزانین، ئایا مەککەیین یان مەدینەیین؟!

### أ. نیشانە جیاکەرەوەکانی قورئانی مەککەیی:

دەتوانین بڵێین: قورئانی مەککەیی بە شەش نیشانان جیا دەکرێتەوە:

**نیشانەی یەکەم:** هەر سوورەتێک سەجدەی تێدا هەبێ، ئەوە سوورەتێکی مەککەییە، لە نێویاندا سوورەتی - الحج - کە دوو سەجدەی تێدان، بەڕای زۆرێک لەزانایان،

**نیشانەی دووەم:** هەر سوورەتێک بێژەی (كلاّ)ی تێدا هەبێ، ئەوە مەککەییە، چونکە ئەم وشەیە (كلمة ردع و زجر وإبطال) بۆ تێوە خوڕین و پاڵپێوەنان و هەڵوەشاندنەوەیە، ئەمەش زیاتر لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا ئەو شێوە دواندنە، بەکارهێندراوە.

**نیشانەی سێیەم:** هەر سوورەتێک (يا أيها الناس)ی تێدا هەبێ و (يا أيها الذين آمنوا)ی تێدا نەبێ، ئەویش مەککەییە، چونکە بێگومان کۆمەڵێک لە سوورەتەکان (يا أيها الناس)یان تێدا هەیە و مەدینەییشن، چونکە (يا أيهالذين آمنوا)یشیان تێدایە، وەک سوورەتی (النساء).

عبداللە ی کوڕی مەسعوود لەوبارەوە گوتوویەتی: (قرأنا المفصَّل

حججاً ونحن بمكة ليس فيها: يا أيها الذين آمنوا)[١].

واتە: ساڵانێک سوورەتە کورتەکانمان خوێندن و ئێمە لە مەککە بووین، کە هیچ کامیان (یا أیها الذین آمنوا)یان تێدا نەبوو.

**نیشانەی چوارەم:** بۆ قورئانی مەککەیی: هەر سوورەتێک بەسەرهاتی پێغەمبەران (علیه الصلاة والسلام) و باس و خواسی نەتەوەو کۆمەڵگا پێشووەکانی تێدا هەبێ، جگە لە خاوەن کتێبان، ئەوە مەککەییە.

(عروة بن الزبیر) کە یەکێکە لە زانایانی جیلی دوای هاوەڵان (تابعین) گوتوویەتی: (ما کان من ذکر الأمم والقرون والعذاب، فإنه أنزل بمکة).

هەرچی باسی کۆمەڵگاکان و سەدەکان و سزادانی خوای تێدا هەبێ، ئەوە لە مەککە دابەزێنراوە.

(وفي رواية: إني لأعلم ما أنزل من القرآن بمكة، وما أنزل بالمدينة، فأمّا ما أنزل بمكة، فضرب الأمثال وذكر القرون، وأما مانزل بالمدينة فالفرائض والحدود والجهاد)[٢].

عوروەی کوڕی زوبەیر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ دەڵێ: من ئەو قورئانەی کە لە مەککە دابەزیوەو، ئەو قورئانەی کەلە مەدینە دابەزیوە، دەزانم، ئەوەی کە لە مەککە دابەزیوە، وێنە هێنانەوە و باسی سەدەکانە. ئەوەی لە مەدینەش دابەزیوە، باسی فەرزەکان و سنوورەکان و جەنگ و جیهادە.

**نیشانەی پێنجەمی قورئانی مەککەیی:** هەر سوورەتێك بەسەرهاتی ئادەم و ئیبلیسی تێدا هەبێ، هەموویان مەککەیین، بێجگە لە سوورەتی (البقرة) کە لەوێدا بەسەرهاتی ئادەم و ئیبلیس هاتوە، بەڵام مەدینەییشە.

**نیشانەی شەشەم:** هەموو ئەو سوورەتانەی کە بە پیتە پچڕ پچڕەکان

---

(١)- أخرجه ابن أبي شيبة (٣٠١٣٤)، وإسناده صحيح.

(٢)- أخرجه أبو عبيد في االفضائل ص٣٦٧، و ابن أبي شيبة في المصنف، برقم: (٣٠١٣١)، برقم: (٣٠١٤٠).

دەستپێدەکەن (الحروف المقطعة) هەموویان مەککەیین، بێجگە لە هەردووك سوورەتی (البقرة) و (آل عمران).

بە تەئکید دەگونجێ نیشانەی دیکەیش باس بکرێن، بۆ وێنە: ئەو سوورەتانەی باسی بوونناسیی و ناساندنی خوا (سُبحانه وتعالى) لە میانی سیفەتەکانیداو، کردەوەکانیدا بە مرۆڤەکان دەکەن، ئەو سوورەتانە بەتەئکید مەککەیین، هەڵبەتە جارجارێکش لە سوورەتە مەدینەییەکانیشدا ئەوە هاتوە بەڵام بە کەمیی.

ب. نیشانە جیاکەرەوەکانی قورئانی مەدینەیی:

ئنجا با بێینە سەر نیشانەکانی قورئانی مەدینەیی، کە لەوبارەوە سێ نیشانە باسکراون:

**نیشانەی یەکەم:** هەر سوورەتێک باسی فەرزێک، یاخود یاساو سنوورێک، یان سزایەکی تێدا هەبێ، ئەوە مەدینەییە، وەک (عروة بن الزبير) گوتوویەتی: [ماكان من حَدٍّ وفريضة، فإنه أنزل بالمدينة].

واتە: هەرچی سزابێ یاخود فەرزێک بێ، ئەوە لە مەدینە دابەزێنراوە.

**نیشانەی دووەم:** هەر سوورەتێک باسی مونافیقەکانی تێدا هەبێ، بێجگە لە سوورەتی (العنكبوت) ئەوە مەدینەییە، لە قورئانی مەککەیی دا تەنیا لە سوورەتی (العنكبوت)دا خوا باسی مونافیقەکانی کردوە، لە ئایەتی (١١)دا کە دەفەرموێ:

﴿ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴾ العنكبوت: ١١.

واتە: بەدڵنیایی خوا ئەوانە کە بڕوایان هێناوە و، ئەوانەش کە مونافیقن دەیانناسێ.

**نیشـانەی سـێیەم:** هـەر سـووڕەتێک شـەڕە قسـەو مشـت ومـڕی لەگـەڵ خـاوەن کتێبـان تێدابـێ، مەدینەییـە، بـۆ نموونـە:

١- ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴾ آل عمران: ٦٤

٢- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾ النساء: ٤٧

بـەڵام بێگومـان ئـەم نیشـانانە لـە ئەنجامـی تێوەڕامانـدا، زانـدراون و دەزاندرێـن و، دەشـگونجێ هـەم قوڕئـانی مەککەیـی نیشـانەی دیکـەی تێـدا دابندرێـن و، هـەم قوڕئـانی مەدینەییـش.



## بڕگـەی پێنجـەم: ئایـا زانینـی مەککەیـی بـوون و مەدینەیـی بـوونی قورئـان، سـوودی چییـە؟

دەتوانین سێ سوودی گشتیی بخەینە ڕوو:

**سـوودی یەکـەم: زانیـن و لەیـەك جیاکردنـەوەی ناسیخ و مەنسـووخ (الناسـخ والمنسـوخ):**

کـە ئێمـە دوایـی باسـێک لەبـارەی ناسـیخ و مەنسـووخەوە دەکەیـن، هـەر لـەم بابەتـەدا، لێـک جیاکردنـەوەی ناسـیخ و مەنسـووخ بـە چەمکـی فـراوانی کـە هـاوەڵان بەکاریـان هێناوە، کە ئەوان وشـەی نەسـخیان بـە مانای تایبەتکردنی گشـتیی (تخصیـص العام) و بەنددارکردنی ڕەهـا (تقیید المطلق) و ڕوونکردنـەوەی کـورت (تبیین المجمـل) و پلە پلەیی (التـدرّج)، بەو واتایانەش وشـەی نەسـخیان بـەکار هێنـاوە، ئنجـا ئێمـە کـە بزانیـن ئـەو ئایەتانـە، ئـەو سـووڕەتانە، مەککەیین و ئەوانـەی دیکە مەدینەیین، ئـەوە یارمەتییمان دەدات بـۆ زانینـی ئـەو مەسـەلەیە.

**سـوودی دووەم: زانینـی مەککەیـی بـوون و مەدینەیـی بـوونی قورئـان، یارمەتییـمان دەدا بـۆ چاکـتر لـێ تێگەیشـتن لـە قورئان:**

چونکـە ئـەو قورئانـەی کە لـە مەککە دابەزیـوە، ئەوێ واقیعێـک بووە، هـەل و مەرجێـک و کۆمەڵگایـەک بـووە، کە مسـوڵمانان تێیدا چەوسـێنراوەو بـێ دەسـتەڵات بـوون، بۆیـە قورئـانی مەککەیـی ڕەچاوی بێهێزیـی و بـێ دەسـتەڵاتیی بـڕواداران کـردوە، هەروەها سەرکێشـیی و لەخـوا یاخیی بوونی حوکمڕانانێـک، کە بەسـەر ئـەو کۆمەڵگایەدا زاڵبـوون، بەپێچەوانەی قورئانی مەدینەییـەوە، لـە مەدینە مسـوڵمانان خـاوەنی قەوارەی سیاسـیی خۆیـان بوون و، خـاوەنی دەسترۆیشـتووێتیی بوون و خاوەنی بەرزیی و باڵا دەسـتیی بوون.

**سـوودی سـێیەم: ئێمـە لـە ئەنجامـی چـاک پەیـبردن بـەوە کـە ئـەو سـوورەتە یـان ئـەو چەنـد ئایەتـە، مەککەییـن یـان مەدینەییـن، هاوکاریمان دەکات بـۆ زیاتـر دەرککـردنی قۆناغـەکانی سـیرەو ژیـانی پێغەمبـەر (علیـه الصلاة والسـلام) لـە بانگەوازکـردنی و لـە گەیانـدنی پەیامـی خـواداو، لـە چەسـپاندنی ئاییـن و بەرنامـەی خـوای پـەروەردگاردا:**

کـە ئێمـەش جارێکـی دیکـە شـوێنپێی پێغەمبـەری خاتـەم (علیـه الصـلاة والسـلام) هەڵبگریـن لـە بـەر ڕۆشـنایی ئایەتـەکانی قورئـانی مەککەیـی و مەدینەییـداو، ئێمـەش وەک پێغەمبـەری خـوا (علیـه الصلاة والسـلام) سـەرنج بدەیـن ئایـا ئـەو هـەل و مەرجە کـە تێیدایـن، دەشـوبهێتە قۆناغـی مەککـەوە، یاخـود زیاتـر دەشـوبهێتە قۆناغـی مەدینـەوە؟ لەبـەر ڕۆشـنایی ئایەتـەکانی مەککەیـی و مەدینەییـدا، ئـەوە زۆر یارمەتییدەرمـان دەبـێ کـە هەنـگاوی پـڕ بـە پێسـت بنێیـن و، هەڵـس و کـەوتی لێزانانـەو دانایانـە بکەیـن.



## بڕگەی شەشەم: سەر ژمێرکردنی سوورەتە مەککەییەکان و سوورەتە مەدینەییەکان:

بەگشتیی سوورەتە مەککەییەکان، حەفتاو پێنج (٧٥) سوورەتن، بە مسۆگەریی، لەگەڵ چوارده (١٤) سوورەتیشدا کە ڕاجیاییان لەسەرە، کەواتە: حەفتاو پێنج کۆ چوارده، دەبن بە هەشتاو نۆ (٧٥+١٤=٨٩)، سوورەتە مەدینەییەکانیش بیست و دوو (٢٢)یان بە مسۆگەریی مەدینەیین، سێش مشت و مڕیان لەسەرە، کەواتە: بیست و دوو کۆ سێ، دەکا بیست و پێنج (٢٢+٣=٢٥).

ئنجا بیست و پێنج سوورەتی مەدینەیی، لەگەڵ هەشتاو نۆ سوورەتی مەککەیی، هەموویان دەکەنە سەدو چوارده (٨٩+٢٥=١١٤) سوورەت، ئێمە ئەو حەفتاو پێنج سوورەتە مەککەییە، ناوی هەموویان دێنین، هەروەها چوارده سوورەتەکەی دیکەش کە مەککەیی بوونیان زاڵترە، حەفتاو پێنجەکە ئەمانەن:

**١- الأنعام، ٢-الأعراف، ٣-يونس، ٤-هود، ٥-يوسف، ٦-إبراهيم، ٧-الحجر، ٨-النحل، ٩-الإسراء، ١٠-الكهف، ١١-مريم، ١٢-طه، ١٣-الأنبياء، ١٤-المؤمنون، ١٥-الفرقان، ١٦-الشعراء، ١٧-النمل، ١٨-القصص، ١٩-العنكبوت، ٢٠-الروم، ٢١-لوقمان، ٢٢-السجدة، ٢٣-سبأ، ٢٤-فاطر، ٢٥-يس، ٢٦-الصافات، ٢٧-ص، ٢٨-الزمر، ٢٩-غافر، ٣٠-فصلت، ٣١-الشورى، ٣٢-الزخرف، ٣٣-الدخان، ٣٤-الجاثية، ٣٥-الأحقاف، ٣٦-ق، ٣٧-الذاريات، ٣٨-الطور، ٣٩- النجم، ٤٠- القمر، ٤١- الملك، ٤٢- القلم، ٤٣- الحاقة، ٤٤-المعارج، ٤٥- نوح، ٤٦- الجن، ٤٧- المزمل، ٤٨- المدثر، ٤٩- القيامة، ٥٠-المرسلات، ٥١- النبأ، ٥٢- النازعات، ٥٣- عبس، ٥٤- التكوير، ٥٥- الإنفطار،**

**٥٦- الإنشقاق، ٥٧- البروج، ٥٨- الطارق، ٥٩- الأعلى، ٦٠- الغاشية، ٦١- الفجر، ٦٢- البلد، ٦٣- الشمس، ٦٤- الليل، ٦٥- الضحي، ٦٦- الشرح، ٦٧- التين، ٦٨- العلق، ٦٩- القدر، ٧٠- القارعة، ٧١- الهمزة، ٧٢- الفيل، ٧٣- قريش، ٧٤- الكافرون، ٧٥- المسد.**

ئەم حەفتاو پێنجە ڕاجیاییەكی وا لەسەر مەككەیی بوونیان نیە، ئەو چواردە سووڕەتەش كە ڕاجیایی لەبارەیانەوە هەیە، بەڵام ڕای زاڵتر ئەوەیە كە مەككەیین، ئەمانەن، كە لەگەڵ ڕیز بەندیی ئەوانی دیكەدا دەیانژمێرین:

**٧٦- الفاتحة، ٧٧- الرعد، ٧٨- الحج، ٧٩- الرحمن، ٨٠- الواقعة، ٨١- التغابن، ٨٢- الإنسان، ٨٣- الزلزلة، ٨٤- العاديات، ٨٥- التكاثر، ٨٦- العصر، ٨٧- الماعون، ٨٨- الكوثر، ٨٩- الإخلاص.**

سووڕەتە مەدینەییەكان، بیست و دوویان بە مسۆگەریی ڕاجیاییەكی وایان لەسەر نیە:

**١- البقرة، ٢- آل عمران، ٣- النساء، ٤- المائدة، ٥- الأنفال، ٦- التوبة، ٧- النور، ٨- الأحزاب، ٩- محمد، ١٠- الفتح، ١١- الحجرات، ١٢- الحديد، ١٣- المجادلة، ١٤- الحشر، ١٥- الممتحنة، ١٦- الصف، ١٧- الجمعة، ١٨- المنافقون، ١٩- الطلاق، ٢٠- التحريم، ٢١- البينة، ٢٢- النصر.**

ئەم سێیەش تۆزێك ڕا جیاییان لەسەرە، بەڵام ڕای زاڵتر ئەوەیە كە مەدینەیین:

**٢٣- المطففين، ٢٤- الفلق، ٢٥- الناس.**

## بڕگەی حەوتەم وکۆتایی:
## ئایەتانێکی مەدینەیی لە سوورەتانێکی مەککەییدا:

بەڕای هەندێ لە زانایان، هەندێک لە ئایەتە مەدینەییەکان لە سوورەتە مەککەییەکاندا هەن، بۆ وێنە: ئەم دوازدە (١٢) شوێنە بە پێی لێکۆڵینەوەی نووسەری کتێبی: (المقدمات الأساسية في علوم القرآن) دەڵێ: زۆر لێمکۆڵیوەتەوە کە ئەم دوازدە (١٢) ئایەتە ئایەتی مەدینەیین، بەڵام لە سوورەتی مەککەییدان:

١- شوێنی یەکەم لە سوورەتی: (هود)دا:

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هود: ١١٤.

ئەو بە مەدینەیی دادەنێ، هەڵبەتە من لەگەڵ ڕایەکانیدا نیم، بەڵام وەک بەرچاو ڕوونییەک هەر دەیانهێنم.

٢- شوێنی دووەم: لە سوورەتی (النحل)دا:

﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ﴾ النحل: ١٢٦.

٣- شوێنی سێیەم: لە سوورەتی (الإسراء)دا:

﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾ الإسراء.

٤- شوێنی چوارەم: لە سوورەتی (الحج)دا ئایەتی ژمارە (١١):

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴾ الحج: ١١.

٥- شوێنی پێنجەم: هەر لە سوورەتی (الحج)دا -١٩، ٢٠، ٢١-:

﴿ هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتۡ لَهُمۡ ثِيَابٞ مِّن نَّارٖ يُصَبُّ مِن فَوۡقِ رُءُوسِهِمُ ٱلۡحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصۡهَرُ بِهِۦ مَا فِي بُطُونِهِمۡ وَٱلۡجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنۡ حَدِيدٖ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ الحـج: ﴿١٩﴾ - ﴿٢٢﴾.

٦- شوێنی شەشەم: هەر لە سوورەتی (الحج)دا -٣٩، ٤٠-:

﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾ الحـج: ﴿٣٩﴾ _ ﴿٤٠﴾.

هەڵبەتـە ئێمـە لـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الحـج)دا ڕوونمـان کردوەتـەوە کـە لەڕاسـتییدا هیـچ کام لەوانـە پێویسـت نـاکات بڵێیـن: مەدینەییـن، بـەڵام دیارە نووسـەر پشـتی بـە هەندێ لـەو ڕیوایەتانە بەسـتوە کـە دەڵێـن: ئـەم ئایەتانـە لـە مەدینـە دابەزیـون و، دوایـی خراونـە گـەڵ ئەو سـوورەتانەی کـە پێشـتر لـە مەککـە دابەزیـون.

٧- شوێنی حەوتەم لە سوورەتی (یس)دا:

﴿ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ﴾ یس: ﴿١٢﴾.

کـە مـن پێـم وایە هیـچ پاسـاوێک نیە بڵێیـن: ئـەم ئایەتـە، ئایەتێکە لە مەدینـە دابەزیـوە، چونکە سـوورەتی (یس) خـۆی سـوورەتێکی مەککەییە.

٨- شوێنی هەشتەم: لە سوورەتی (الزمر)دا -٥٣_٥٥-:

﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن

رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ الزمر: ٥٣ - ٥٥.

گوایە ئەوانە مەدینەیین.

٩- شوێنی نۆیەم: هەر لە سوورەتی (الزمر) -٦٧-:

﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ الزمر: ٦٧.

کە بە ڕای من هیچ پاساوێك نیە بۆ بە مەدینەیی دانانی ئەم ئایەتەو سێ ئایەتەکەی پێشێش.

١٠- شوێنی دەیەم: لە سوورەتی (الشوری)دا ئایەتی ژمارە (٢٧):

﴿وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ﴾ الشوری: ٢٧.

ئەم ئایەتەش تەواو گونجاوە لەگەڵ ئایەتەکانی سوورەتی (الشوری)داو پێویست ناکا، بە مەدینەیی دابنرێ، مەگەر ڕیوایەتێکی ناچارکەر هەبێ، ئەوە شتێکی دیکەیە.

١١- شوێنی یازدەیەم: لە سوورەتی (الأحقاف)دا ئایەتی ژمارە (١٠):

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ الأحقاف: ١٠.

ئەویش گوایە ئایەتێکی مەدینەییەو، دوایی خراوەتە نێو سوورەتی (الأحقاف)ەوە.

١٢- شوێنی دوازدەیەم: لەسوورەتی (التغابن)دا ئایەتی (١٤):

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُوا۟ وَتَصْفَحُوا۟ وَتَغْفِرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ التغابن: ١٤.

سوورەتی (التغابن) مەککەییەو گوایە ئەم ئایەتە مەدینەییە.

هەروەها بۆ هاتنی ئایەتێکی مەککەییش لە سوورەتێکی مەدینەییدا، یەک نموونەی بۆ هێناوەتەوە، لە سوورەتی (الحديد)دا، کە بریتییە لە ئایەتی ژمارە (١٦):

﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ الحديد: ١٦

کە کاتی خۆی ئێمە تەفسیرمان کردوە لە سوورەتی (الحديد)داو، پێم وایە زۆربەی هەرە زۆری ئەو ئایەتانە کە ئەو پێی وایە لە مەدینە دابەزیون و، دوایی خراونە نێو سوورەتە مەککەییەکانەوە، هەروەها ئەم ئایەتەش کە گوایە لە مەککە دابەزیوەو، دوایی خراوەتە نێو سوورەتی (الحديد)ەوە کە مەدینەییە، پێم وایە هیچ کام لەوانە بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوە لەسەری نیە، هەڵبەتە ناشڵێم: لە قورئانی مەککەیی‌دا، هیچ ئایەتێک نیە کە لە مەدینە دابەزیبێ و دوایی خرابێتە گەڵی، هەروەها ناڵێم: هیچ ئایەتێک نیە کە لە مەککە هاتبێ، دوایی خرابێتە گەڵ سوورەتی مەدینەیی، بەڵام من پێم وایە ئەو نموونانەی هێندراونەوە، بە پێی ئەوە کە من هەموو قورئانم تەفسیر کردوە، هیچ کامیان بەڵگەو پاساوێکی وایان لەسەر نیە بۆ ئیسپاتی ئەو دەعوایە.



زانایان لەو بارەوە زۆر مشت ومڕیان کردوە، ئایا دەستپێکی دابەزینی قورئان چ ئایەتێک بووە؟ یاخود کام ئایاتانە بوون لە چ سوورەتێک؟ هەروەها کۆتا ئایەت کە لە قورئان دابەزیوە، یان کۆتا سوورەت، کامە بووە؟ لەو بارەوە زانایان قسەوباسی زۆریان کردوەو ئێمەش هەر بەکورتیی دەڵێین:

## أ. سەرەتای دابەزینی قورئان:

زانایان لەوبارەوە دوو ڕایان هەن:

**١- ڕای یەکەمیان کە بێگومان بەهێزترەو، بە بۆچوونی من هەر ئەوە بەهێزە، ئەوەیە کە سەرەتای دابەزیی قورئان، ئەو پێنج ئایەتەی سەرەتای سوورەتی (العلق)ن:**

کە ئاوا دەست پێدەکەن:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥﴾ العلق.

لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

**(قالت عائشة رضي الله عنها، أول ما بديء به رسولُ الله** (صلى الله عليه وسلم) **من الوحي: الرؤيا الصالحة في النوم، فكان لا يرى رؤيا إلا جاءَتْ مثل فلق الصبح، ثم حُبِّب إليه الخلاء، وكان يخْلو بغار حراء، يتحنث فيه - وهو التعبّد - اللّيالي ذوات العدد، قبل أن ينزع إلى أهله ويتزوّد لذلك، ثم يرجع إلى خديجة فيتزود لمثلها، حتى جاءه الحق وهو في غار حراء، فجاءه المَلَكُ فقال: اقرأ، قال: ما أنا بقاريء،**

**قال: فأخذني فغطَّني حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني فقال: اقرأ، قلت: ما أنا بقارىء، فأخذني فغطَّني الثانية حتى بلغ مني الجهد، ثم أرسلني، فقال: اقرأ، فقلت: ما أنا بقاريء، فأخذني فغطَّني الثالثة، فأرسلني فقال: (اقرأ باسم ربك الذي خلق، خلق الإنسان من علق، اقرأ وربك الأكرم، الذي علَّم بالقلم، علم الإنسان مالم يعلم). فرجع بها رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يرجف فؤاده، فدخل على خديجة بنت خويلد رضي الله عنها فقال: زمِّلوني زمِّلوني).**[1]

دایکمان خاتو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سەرەتای دەستپێکردنی هاتنی وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ئەوە بوو کە خەونی چاکی دەبینی، لە خەودا و، هەموویان وەک سپێدەی بەرە بەیان ڕاست دەردەچوون، دوایی تەنیایی و گۆشەنشینیی (خەڵوەتکێشانیی) لەلا خۆشەویست کرا، کە دەچووە ئەشکەوتی حیراوە، بە تەنیا لەوێ دەبوو، لەوێدا شەوانی زۆر پەرستشی دەکرد، بەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خێزانی و توێشوو لەگەڵ خۆی بەرێتەوەو دوایی بگەڕێتەوە بۆ لای خەدیجە و، دووبارە توێشوو لەگەڵ خۆی بەرێتەوە وەک پێشێ، هەتا لە کاتێکدا کە لە ئەشکەوتی حیرادا بوو، حەقی بۆ هات، فریشتە بۆ لای هات، پێیگوت: بخوێنە، گوتی: من خوێندەوار نیم، (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ:) گرتمی و بەخۆیەوە گوشیم تاکو تینم گەیشتێ، دوایی بەریدام و فەرمووی: بخوێنە، گوتم: خوێندەوار نیم، دووبارە (بۆجاری دووەم) گرتمی و بەخۆیەوە گوشیم، تاکو تینم گەیشتێ، دوایی بەریدام و فەرمووی: بخوێنە، گوتم: خوێندەوار نیم، بۆ جاری سێیەم گرتمی بە خۆیەوە گوشیم، دوایی بەریدام و گوتی: [إقرأ

(١) - أخرجه البخاري برقم: (٤٦٧٠و٤٦٧٢ و ٤٦٧٤ و ٦٥٨١)،ومسلم برقم: (١٦٠).

باسـم ربـك الـذي خلق. خلـق الإنسـان مـن علـق. إقـرأ وربـك الأكـرم. الذي علّـم بالقلـم. علّـم الإنسـان مـالم يعلم] پێغەمبـەر (صلى اللـه عليه وسـلم) بەو ئایەتانـەوە گەڕایـەوە، کـە دڵـی دەلـەرزی و چـووە لای خەدیجـە خـوا لێـی ڕازی بێـت پێـی گـوت: دامپۆشـن، دامپۆشـن.

ئەمـە ڕای یەکەمـە لەبـارەی یەکەمیـن ئایەتانێـک کـە لـە قورئـان دابەزیـون.

**٢- ڕای دووەم: ئەوەیە کە سەرەتای سووڕەتی (المدثر) دابەزیوە، وەک لەم دەقەدا هاتوە:**

**(قال يحيى بن كثير: سألت أبا سلمة: أي القرآن أُنزل أول؟ فقال: يا أيها المدثر، فقلت: أُنبئت أنه (إقرأ باسم ربك الذي خلق)، فقال أبو سلمة: سألت جابر بن عبدالله، أي القرآن أنزل أول؟ فقال: يا أيها المدثر، فقلت: أنبئت أنه اقرأ باسم ربك، فقال ألا أُخبرك إلاّ ما قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): جاورت بحراء فلما قضيت جواري هبطت، فاستبطنت الوادي فنوديت، فنظرت أمامي وخلفي وعن يميني وعن شمالي، فإذا هو جالس على عرش بين السماء والأرض، فأتيت خديجة، فقلت: دثروني، وصُبُّوا عليَّ ماءاً بارداً، وأُنزل عليّ: يا أيها المدثر قم فأنذر. وربك فكبر).**[1]

واتە: (يحيى بن كثير) گوتوویەتی: لە (أباسلمة)م پرسی : کام لەقورئان سەرەتا دابەزیوە؟ گوتی: (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١).

گوتم: هەواڵم پێدراوە کە ( ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ )ە!

(أبو سلمة) گوتی: لە (جابر بن عبدالله)م پرسی کام قورئان سەرەتا دابەزیوە؟.

(١) - أخرجه البخاري برقم: (٤٦٣٨و٤٦٤٠)،ومسلم برقم: (١٤٤).

گوتی ( يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ ) .

گوتم: هەواڵم پێدراوە کە (ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝١ )ە.!

گوتی: ئایا هەواڵت پێبدەم بەوەی پێغەمبەری خوا فەرموویەتی؟

پێغەمبەری خوا فەرمووی: لەئەشکەوتی حیرِا دا خەڵوەتم کێشا، کاتێک خەڵوەکەم تەواوکرد دابەزیم چوومە نێو شیوەکە یەکسەر بانگکرام! منیش تەماشای پێشەوەم و دواوەم و لای ڕاست و لای چەپم کرد ، یەکسەر بینیم لەسەر تەختێک لەنێوان ئاسمان و زەویدا (جیبریلی دیوە) .

ئیدی گەڕامەوە لای خەدیجە و گوتم: دامپۆشن و ئاوێکی ساردم پێداکەن، (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ ) یش بۆ دابەزی.

بەڵام بێگومان ئەم دوو دەقە تێک ناگیرێن، چونکە هی پێشێ ئەوەی دایکمان خاتو عائیشە دەڵێ: ئەوە دەستپێک و سەرەتای دەستپێکردنی هاتنی وەحیی بووە، بەڵام ئەوەی جابیری کوڕی عبداللە خوا لێی ڕازیبێت، لە قۆناغێکی دواتردا بووە، دوای ئەوە بووە کە پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام) لە قۆناغێکی دواتردا جیبریل خۆی پێشان داوە، وەک لەم دەقەدا دەبینرێ، کە پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام) فەرموویەتی:

**بينا أنا أمشي إِذْ سمعت صوتاً من السماء، فرفعت بصري فإِذا الملك الذي جاءني بحراء جالس على كرسي بين السماء والأرض، فَرُعِبْتُ منه فرجعت، فقلت: زمِّلوني، فأنزل الله تعالى: يا أيها المدثر. قم فأنذر... إلى قوله والرجز فاهجر) -المدثر ١-٥.**

**ثم حَمِيَ الوحيُ وتتابع).**[١]

(١)- البخاري برقم: (٣٦٠٦ و ٤٦٤١ و ٤٦٤٢ و ٤٦٧١ و ٥٨٦٠)، ومسلم برقم: (١٦١).

دەفەرموێ: لە کاتێکدا دەڕۆیشتم، دەنگێکم لە ئاسمان بیست، کە سەرم بەرزکردەوە، ئەو فریشتەیەی کە لە (حیراء) هات بۆ لام، لەسەر کورسییەک لە نێوان ئاسمان و زەویدا دانیشتبوو، منیش لێی ترسام و گەڕامەوە و گوتم: داملپۆشن، داملپۆشن، خوای بەرزیش (یاأیها المدثر) تاکو (والرجز فاهجر)ی دابەزاند و، وەحیی گەرم بوو و بەردەوام بوو.

کەواتە: پێش دابەزینی ئەم سووڕەتە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: ئەو فریشتەیەی لە (حیراء) هاتە لام، واتە: لە ئەشکەوتی (حیراء) هاتۆتە لای و پێنج، ئایەتەکەی سەرەتای سووڕەتی عەلەقی پێداون و دواتر سووڕەتی (المدثر) دابەزیوە.

**ب- لەبارەی کۆتا قورئانێک کە دابەزیوە:**

زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە موبارەکەی ژمارە (٢٨١)ی (البقرة)یە کە دەفەرموێ:

﴿ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ البقرة: ٢٨١.

واتە: پارێز لە ڕۆژێک بکەن کە تێیدا دەگێڕدرێنەوە بۆ لای خوا، دوایی هەرکەسە چی کردوە، پڕ بە پێست سزاو پاداشتی دەدرێتەوە، بێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ.

وەك لەم دەقەدا هاتوە: {عن ابن عباس رضي للە عنهما قال: آخر شيء نزل من القرآن: (واتقوا يوماً تُرجعون فيه إلى اللـه)}. [١]

عبداللە ی کوڕی عەبباس دەڵێ: کۆتا شتێک کە لە قورئان دابەزی، ئەم ئایەتە موبارەکەیە: (واتقوا يوماً تُرجعون فيه إلى اللـه).

هەروەها هەر لە عبداللە ی کوڕی عەبباسەوە هاتوە، لە

(١)- النسائي في التفسير برقم: (٧٧ و ٧٨)، وابن جرير برقم: (٦٣١١)، والطبراني في الكبير -ج١، ص٣٧١..

ڕیوایەتێکی دیکەدا کە گوتوویەتی:

(آخر آية نزلت على النبي آية الربا). [١]

بەڵام بێگومان ئەو ئایەتەی ژمارە (٢٨١)، هەر تەواو کەری ئەو ئایەتانەیە کە لەبارەی ڕیباوە هاتوون.

هەڵبەتە لەو بارەوە شتی دیکەش هاتوە، بەڵام ئەوەی گوتمان، لە هەمووی بەڵگەدارترو بەهێزترە، ئەوە بە نسبەت کۆتا ئایەتەوە، بە نسبەت کۆتا سووڕەتەوە، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە کۆتا سووڕەت سووڕەتی: (النصر)ە، کە دابەزیوە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) - وەك لەم دەقەدا دیارە:

(عن عبيدالله بن عبدالله بن عتبة قال: قال لي ابن عباس: تعلم آخر سورة نزلت من القرآن، نَزلتْ جميعاً؟! قلت نعم، نزلت: إِذا جاء نصر الله والفتح. النصر ١، قال صدقت.) أخرجه مسلم ٣٠٢٤.

عوبەیدوڵڵای کوڕی عبدالله ی کوڕی عوتبە دەڵێ: ئیبنو عەبباس پێیگوتم: دەزانی کۆتا سووڕەت، کە هەمووی پێکەوە دابەزیوە، کامەیە؟

گوتم بەڵێ (إذا جاء نصر الله والفتح).

گوتی: ڕاست دەکەی.

کەواتە: وەک ئایەت، ئایەتی ژمارە (٢٨٢)ی سووڕەتی (البقرة)یە، وەک سووڕەتیش، -وەک عبدالله ی کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ گوتوویەتی- واتە: بۆچوونی ئەوە، بریتییە لە سووڕەتی [النصر].

لێرەش دا کۆتایی بە تەوەری پێنجەمی ئەم بابەتە دێنین.

(١) - البخاري برقم: (٤٢٧٠).

# تەوەری شەشەم

# دابەزینی قورئان لەسەر حەوت پیتان

# ( إنزال القرآن على سبعة أحرف)



**بەڕێزان!**

لەبـارەی دابەزێنـدرانی قورئانـەوە لەسـەر حـەوت پیتـان، کـە دەقـی فەرمووده‌کـە ئـاوا هاتـوە: (عـلى سـبعة أحـرف) فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەر (صـلى اللــه عليــه وسـلم) لــەو بــارەوە زۆرن و هەندێکیــان گوتوویانــە: فەرمــوودەکان گەیشــتوونە ڕاددەی تەواتور[التواتــر]، ئێمــەش دوو لــەو فەرموودانــە دێنیــن، وەك نموونــە:

**یەکەمیـان: ( عـن عمـر بـن الخطـاب رضي الله عنه، قال سـمعت هشـام بـن حكيـم بـن حـزام يقرأ سـورة الفرقان عـلى غير ما أقرأهـا، وكان رسـول الله** (صـلى اللــه عليــه وسـلم) **أقرأنيهـا، فكـدت أن أعجـل عليـه، ثـم أَمْهَلْتُه حتى انـصرف، ثـم لَبَّبْتُـهُ بردائِه فجئت به رسـولَ اللـه** (صلى الله عليه وسـلم) **فقلت: يـا رسـول اللـه! إِني سـمعت هـذا يقـرأ سـورة الفرقـان على غـير مـا أقرأتنيها، فقـال رسـول اللـه** (صـلى اللـه عليـه وسـلم)**: أَرسِـلْهُ، اقرأ، فقـرأ القـرأءة التي سـمعته يقـرأ، فقال رسـول الله** (صلى اللـه عليه وسـلم)**: هكذا أُنزلَـتْ، ثم قال لي اقـرأ، فقـرأت، فقـال: هكـذا أنزلـت، إن هذا القـرآن أنزلت على سَـبعة أحرف، فاقـرءوا مـا تيـسَّر منـه ). أخرجـه البخـاري برقـم: ٢٢٨٧ و ٤٧٠٦ و ٤٧٥٤ و٧١٠١١ ومسـلم برقم: ٨١٨.**

واتــە: عومــەری کــوڕی خەتتــاب خــوا لێــی ڕازی بــێ، دەڵــێ گوێــم لــە هیشــامی کــوڕی حەکیمــی کــوڕی حیــزام بــوو، ســوورەتی (الفرقــان)ی دەخوێنــد، بەشــێوەیەکی جیــاواز لــەوەی کــە مــن دەمخوێنــد، پێغەمبــەری خــواش (صـلى اللــه عليــه وسـلم) ســوورەتی (الفرقــان)ی بــە مــن خوێندبوو، فێــری کردبــووم، خەریــک بــوو پەلــەی لــێ بکــەم، (دیــارە ئــەو لــە نوێــژدا بــووە،) دوایــی لێــی گــەڕام تاکــو لــێ بــووەوە، پاشــان کراســەکەی خۆیــم

لـە مـل ئالاندو هێنام بۆ لای پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! گوێم لەمە بوو سوورەتی (الفرقان) ی دەخوێند، جیاواز لەوەی کە تۆ پێت خوێندووم و فێرت کردووم، پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام فەرمووی بەریبدە، بخوێنە! ئنجا بە هەمان شێوەی خوێند کە لێم بیستبوو، پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام) فەرمووی: بەو شێوەیە دابەزیوە، پاشان بە منیشی گوت: بخوێنە! منیش خوێندم، (دیارە ئەویش بە شێوەی خۆی خوێندوویەتی،) فەرمووی: بەم شێوەیە دابەزیوە، دوایی فەرمووی: ئەم قورئانە لەسەر حەوت پیتان دابەزیوە، بەو شێوەیە کە بۆتان سێنایە بیخوێنن.

**دووەمیان:** با فەرموودەیەکی دیکەش هەر لەو بارەوە بێنین، تاکو بەرچاومان ڕۆشنتربێ:

**(عن أبي بن كعب رضي الله عنه قال: كنت في المسجد فدخل رجلٌ يصلِّي، فقرأ قرآءة أنكرتها عليه، ثم دخل آخر، فقرأ قرآءة سوى قراءة صاحبه، فلما قضينا الصلاة، دخلنا جميعاً على رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، فقلت: إن هذا قرأ قراءة أنكرتها عليه، ودخل آخر، فقرأ سوى قراءة صاحبه، فأمرهما رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم)، فقرءا فَحَسَّنَ النبيُّ (صلى الله عليه وسلم) شَأْنَهما، فسقط في نفسي من التكذيب، ولا إِذْ كنت في الجاهلية، فلما رأى رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) ما قد غشيني، ضرب في صدري، فَضِفْتُ عَرَقاً وكأنَّما أنظر إلى الله عزوجل فَرَقاً، فقال لي: يا أُبَيَّ، أُرْسِلَ إِلَيَّ أن اقرأ القرآن على حرف، فَرَدَدْتُ إِليه أن هَوِّن على أمتي، فردَّ إِلي ثانية: أقرأه على حرفين، رددت إِليه أن هوِّن على أمتي، فردَّ إِلي ثالثة: اقرأه على سبعة أحرف،**

**فلك بكل ردة رددتكها، مسألة تسألنيها، فقلت أللّهم اغفر لأمتي، اللهم اغفر لأمتي، وأخَّرت الثالثة ليوم يرغب إليَّ الخَلْقُ كلهم حتى إبراهيم (صلى الله عليه وسلم)). رواه مسلم برقم ٨٢٠.**

ئوبەی کوڕی کەعب خوا لێی ڕازی بێ، (کە یەکێکە لەو چوارکەسانەی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: قورئانیان لێ وەربگرن.) دەڵێ: لە مزگەوت بووم، پیاوێک هات نوێژی کرد، قورئانی خوێند، قورئان خوێندنێک کە من پێی نا ئاشنا بووم، دوایی یەکێکی دیکە هات، (دیارە هەر هەمان سووڕەتی خوێندوە،) جیا لە خوێندنی هاوەڵەکەی، (دیسان بەویش ئاشنا نەبووە،) کاتێک نوێژمان تەواوکرد، هەرسێکمان چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) گوتم: ئەم پیاوە قورئان خوێندنێکی خوێندوە، کە من پێی نا ئاشنام، دوایی یەکێکی دیکە هات جیا لە خوێندنی هاوەڵەکەی خوێندوویەتی، پێغەمبەری خواش (علیه الصلاة والسلام) فەرمانی پێیکردن ئەوانیش قورئانیان خوێند، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) قورئان خوێندنەکەیانی بەچاک دانا، ئوبەی دەڵێ: حاڵەتێک و خەیاڵێک لە بەدرۆ دانان کەوتە دڵم، کە لەسەردەمی نەفامییشدا وا نەبووم، (کەوتۆتە نێو جۆرێک لە دوو دڵیی و سەرسامیی،) کاتێک پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ئەو حاڵەتەی بینی تووشم بووە، دەستێکی لە سینگم دا، هەموو لەشم وەسەر ئارەق گەڕا، وەک تەماشای خوا بکەم - عزوجل- ئەوەندە سام و هەیبەت دایگرتم، دوایی پێی فەرمووم: ئەی ئوبەی! ئەم قورئانە بۆ لای من نێردرا کە لە سەر پیتێک، بیخوێنم، [کە دوایی واتای (حرف) ئێمە قسەی لێ دەکەین]، منیش ئەوەم ڕەتکردەوە، داوامکرد

کـە لەسـەر ئۆممەتەکـەم ئاسـان بـکات، (هـەر لەسـەر ئـەو حاڵەتـە بـە تەنـێ بۆیـان ناخوێنـدرێ،) دوایـی بـۆ جـاری دووەم پێمگوتـرا: لەسـەر دوو حەرفـان بیخوێنـن، دووبـارە گوتـم لەسـەر ئۆممەتەکـەم ئاسـان بکـە، ئنجـار بـۆ جـاری سێیەم پێـم گوتـرا: لەسـەر حـەوت پیتـان بیخوێنـەو، بـۆ هـەر جارێکیـش کـە تـۆم گێڕاوەتـەوە، بـۆت هەیـە داوایەکـم لـێ بکـەی، منیـش گوتـم: ئـەی خوایـە! لـە ئۆممەتـم ببـوورە، ئـەی خوایـە! لـە ئۆممەتـم ببـوورە، جـاری سێیەمم، (دوعـای سێیەمم) هەڵگـرت بـۆ ئـەو ڕۆژەی کـە هەمـوو دورستکراوەکان ئارەزوومەنـد دەبـن بـۆ لای مـن، کـە داوایـان بـۆ بکـەم، تەنانـەت ئیبراهیمیـش صـەڵات و سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ.

ئەمـە ئـەو دوو فەرموودەیـە لەبـارەی ئـەوەوە ،کـە قورئـان لەسـەر حـەوت پیتـان دابەزیـوە.

زانایـان لەبـارەی ئـەوەوە کـە وشـەی حـەرف [حـرف] یـانی چـی؟ زۆر دواون، بۆوێنـە: (السـيوطي) لـە کتێبـە ناودارەکـەی خـۆی (الإتقـان في علـوم القـرآن)دا[1] گوتوویەتـی:

(الحـرف لغـةً: حـرف الهجـاء، ويُطْلَـقُ عـلى الكلمـة، وعـلى المعنـى، وعـلى الجهـة).

واتـە: حـەرف لـە ڕووی زمانەوانییـەوە بریتییـە لـە پیتـەکانی قسـەکردن (حـروف الهجـاء : ألـف، بـاء، تـاء، جيـم، تاکـو کۆتایـی) ئنجـا وێـڕای ئـەوە کـە بـە پیتـەکان دەگوتـرێ: بـەو بیسـت و هەشـت پیتـەی زمـانی عەرەبییـان لـێ پێکـدێ، بـە هەمـان شـێوە وشـەی حـەرف بـۆ وشـەش بـەکاردێ، هەروەهـا بـۆ مانـاش بـەکاردێ، هەروەهـا بـۆ لایەکیـش بـەکاردێ، (لایەکـی شـتێک).

(١) - ج١ ص٤٥.

ئنجا ئایا مەبەست لەوە چییە، کە پێغەمبەری خوا صەڵات و سەلامی خوای لەسەربێ، لەو فەرموودەیەدا کە هێنامانەوەو فەرموودەی دیکەیش لەو بارەوە زۆرن، دەفەرمویّ: قورئانم لەسەر حەوت پیتان بۆ دابەزێنراوە، ئایا مەبەست لەوە چییە؟! زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوون، سێ ڕایان لەهەموان ویچووترن:

**١- ڕای یەکەم:** یەکێک لە زانایان دەڵێ:

(هي وجوه قرائية منزَّلة متعدِّدة متغيرة في الكلمة القرآنية الواحدة، ضمن نوع واحد من أنواع التغاير)[1].

واتە: بریتین لە ڕووەکانی قورئان خوێندن کە دابەزێندراون، جۆراو جۆرن، لێک جیان لەیەک وشەی قورئانییدا، بەڵام لە نێو یەک جۆر لە جۆرەکانی گۆڕانکارییدا.

لەوانەیە تەعبیرەکەی زۆر ڕێک و ڕوون نەبێت، مەبەستی ئەوەیە ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر یەک وشەدا دێن، لە حاڵێکدا کە لە سیاقێکی دیارییکراودا دەخوێندرێ.

**٢- ڕای دووەم:** کە ئەمە ڕای (د.عبدالله بن يوسف الجديع)ە، لە کتێبەکەی خۆی (المقدمات الأساسية في علوم القرآن)دا[2] دەڵێ:

(هي سبع لغات للمعنى الواحد).

واتە: بریتییە لە حەوت لەهجە، حەوت زار بۆ یەک مانا، یان: حەوت وشە کە هەموویان یەک مانایان مەبەستە.

وەک: (هلم، تعال، أقبل).

بەڵام من ئەو ڕایەم پێ ڕایەکی بێ هێزە.

**٣- ڕای سێیەم:** کە من زیاتر ئەو ڕایەم بەدڵە و زۆربەی زانایان

(١) - المحرَّر في علوم القرآن، د. مساعد بن سليمان بن ناصر الطيَّار، ص٩٢.
(٢) - ص٧٧.

لەسەری ڕێک کەوتوون، ئەویش ئەو ڕایەیە کە یەکەم جار (أبو الفضل الرازي) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (اللوائح)دا هێناویەتی، کە دەڵێ: (الكلام لايخرج عن سبعة أحرف في الإختلاف، أولاً: اختلاف الأسماء من حيث مفرد وتثنية وجمع وتذكير وتأنيث، ثانياً: إختلاف تصريف الأفعال من ماضي و مضارع وأمر. ثالثاً: إختلاف وجوه الإعراب، رابعا: الإختلاف بالنقص والزيادة، خامساً: الإختلاف بالتقديم والتأخير، سادساً: الإختلاف بالإبدال، سابعاً: إختلاف اللغات).

واتە: هەر قسەیەک لە حەوت جۆر لە جیاوازیی بەدەر نیە.

**یەك:** یان جیاوازییەکە لە ناوەکاندایە، لەو ڕووەوە کە تاک بن، یان دوان بن، یان کۆبن، یان بە نێرینە هاتبن، یان بە مێینە.

**دوو:** جیاوازیی لە گۆڕینی کردارەکاندا لە ڕابردووەوە بۆ ئێستاو بۆ فەرمان.

**سێ:** جیاوازیی لە ڕووەکانی ئیعڕابدا.

**چوار:** جیاوازیی لە کەم و زیادییدا (پیتێک لەوێ زیادە پیتێک لەوێ کەمە،).

**پێنج:** جیاوازیی لە پێشخستن و دواخستندا.

**شەش:** جیاوازیی لە گۆڕیندا.

**حەوت:** جیاوازیی لە زمانەکاندا.

(مەبەستی پێ زارەکان (اللهجات)ە ).

ئەم ڕایە (الزرقاني) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (مناهل العرفان في علوم القرآن)دا هەڵیبژاردوە[1]، هەروەها هەر ئەو ڕایە: دکتۆر صبحي الصالح لە کتێبی (مباحث في علوم القرآن)دا پەسەندی کردوە[2]، بەڵام

(١) - ج١ ص١٤٨.
(٢) - ص١٠٩-١١٣، ط١١/١٩٧٩م.

ڕەخنەی گرتوە لە جیاوازیی گۆڕینی کردارەکان (ماضي و مضارع و أمر)، لەوەدا کە بکرێ بە ڕوویەکی تایبەت، لە حاڵێکیشدا کە هەر دەچێتەوە نێو ئیعراب، قسەکەشی جوانە، ئنجا لە شوێنی ئەو، ڕووی حەوتی داناوە، کە بریتییە لە (اختلاف اللهجات) جیاوازیی لەهجەکان، زارەکان.

شایانی باسە: (ابن الجزري) لە کتێبە ناودارەکەی خۆیدا (النشر في القراءات العشر)[1]، لە بیست وپێنج (٢٥) لاپەڕەدا لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە، کە دابەزینی قورئانە لەسەر حەوت پیتان، قسەی کردوەو ئەوەی هەڵیانبژارد، ئەویش زیاتر ئەو ڕایەی تەبەننیی کردوە، کە مەبەست لە دابەزینی قورئان لەسەر حەوت پیتان، ئەوەیە خوای بەرزی مەزن و کارزان و میهرەبان، ئەم قورئانەی وا هەڵخستوە، کە جاری وا هەیە وشەیەکی بەچەند جۆرێک بخوێندرێتەوە، کە دوایی ئێمە لە کاتی باسکردنی خوێندنەوەکاندا، لەو بارەوە قسە دەکەین.

هەروەها ڕێنووسی قورئانیش، ئەو ئیملایەی قورئانی پێ نووسراوە، یارمەتییدەرە بۆ ئەوە کە بەچەند جۆرێک بخوێنرێتەوە، وەك: (يقولون، تقولون) (يَقْتل، تَقْتُل، يُقْتَل) هەروەها گەلێک وشەی دیکەی بەو جۆرە هەن، کە ڕێنووسەکە بۆ خۆی ڕێگا دەدا، بە زیاتر لە جۆرێک بخوێندرێتەوە، ئنجا دەبێ بزانین -وەک دوایی باسی دەکەین- کە کاتی خۆی قورئان ڕێک وێنەی وشەکە نووسراوە، دواتر خاڵیان داناون، لە جیاتی فەتحە، خاڵێک، لەجیاتی کەسرە، خاڵێک، لە جیاتی ضەممە، خاڵێک دواتریش کردیان بە سەرو ژێرو بۆر (الفتحة

(١) - النشر في القراءات العشر-للإمام الحافظ أبي الخير محمد بن محمد الدمشقي الشهير بابن الجزري المتوفي ٨٣٣ الهجرية- طبعة المكتبة العصرية- طبعة ٢٠١٣ اعتنى به نجيب الماجدي- ص٢٢-٤٧.

والكسرة والضمَّة)، هەروەها گیرە (شدَّة)یان دانا، ئەوانە دوایی دانران، ئەگەرنا لە ئەسڵدا ڕێک وشەکە خۆی چۆنە ئاوا نووسرابوو، ئەوەش ڕێگای داوە بەچەند جۆرێک بخوێندرێتەوە.

بۆیە مانای ڕوون و ڕاستی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) ئەوەیە: کە خوا قورئانی دابەزاندوە، کە هەندێک لە وشەکانی یان بەگشتیی، بە حەوت جۆر دەخوێندرێتەوە، لەگەڵ حەوت جۆرە جیاوازییدا کە باسمانکردن، کە جیاوازییەکان جاری وا هەیە لە ناوەکاندایە، لە شوێنێک بەتاک، لە شوێنێک بە کۆ، یاخود بە دوان (مثنَّى)، هەروەها بە حاڵەتی مێینە یان نێرینە، هەروەها لە ڕووی ئیعڕابەوە، جاری وا هەیە بە بۆر (ضمة) دەخوێندرێتەوە، جاری وا هەیە بەسەر (فتحة) دەخوێندرێتەوە، دیسان لە ڕووی کەمیی و زیادیی هەندێک لە پیتەکان و، لە ڕووی پێشکەوتن و دوا کەوتن و، لەڕووی گۆڕین و، لەڕووی جیاوازیی زاراوەکان (لهجات)ەوە.

زانایان لەو بارەوە زۆریان قسە کردوە، بەڵام ئەو ڕایەی هەڵمانبژارد لەگەڵ دەقی فەرمایشتەکانیشدا باشتر دەگونجێ، کە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) عومەری کوڕی خەتتاب و هیشامی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزام، هەروەها دواتر ئوبەی کوڕی کەعب و دوو هاوەڵەکەی، قورئانی پێ خوێندوون، هەرکامێکیان جیاواز لەوی دیکەی خوێندوە، بە تەئکید هەموو وشەکانیان جیا نەبوون لەیەکدی، بەڵکو لە هێندێک وشاندا جیابوون لەیەکدی، پێغەمبەریش (عليه الصلاة والسلام) بۆ هەموویانی فەرمووە ئاوا دابەزیوە، یان: چاکت خوێند، مانای وایە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بۆ هاوەڵانی بەڕێزی بۆ یەکێکیان ئاوای پێ خوێندوەو، بۆ یەکێکیان بەجۆرێکی

دیکەو، بۆ یەکێکیان بە جۆرێکی دیکە، بەڵام کۆی جیاوازیی خوێندنەوەکان، لە حەوت جۆرن تێناپەڕن، ئەو ڕایە لە هەموو ڕایەکان پەسەندترە.

ئنجا هەندێک ڕای دیکەش هەن هەر لەو بارەوە، کە من بەبێ هێزیان دەزانم بۆ وێنە:

أ- کە مەبەست پێیان حەوت زار (لهجة) بێ، وەك: (قریش و هذیل و ثقیف و تمیم و یمن) و غەیری ئەوانەش.

ب- هەندێکی دیکە گوتوویانە: حەوت جۆر واتا، وەك: ١-فەرمان و ٢-قەدەغەو ٣-حەڵاڵ و ٤-حەڕام و ٥-موحکەم و ٦-موتەشابیهو ٧-پەندەکان(أمثال).

ج- هەندێکیش گوتوویانە: ئەوەیە کە حەوت وشە هاتبن، بەڵام یەک واتایان هەبێ، بەڵام ئەوەی گوتمان و ئەو ڕایەی هەڵمانبژارد، زیاتر لەگەڵ دەقی فەرمایشتەکاندا دێتەوە.

ئنجا شایانی باسە: ئەو ڕایەی هەڵمانبژارد هەر کام لە: ١-(إبن قتیبة) لە (تأویل مشكل القرآن)دا[1]، هەروەها هەردوو نووسەری (معجم القرآت القرآنیة) ،(دكتور أحمد مختار عمر) و (دكتور عبدالعال سالم مكرم)[2] ئەوانیش هەر شێوەی ئەو ڕایەی کە گوتمان پەسەندیان کردوە، لە مانای ئەو حەوت پیتانەدا ،کە قورئانیان لەسەر دابەزیوە.

(١) - ص٢٨.
(٢) - ج١ ص٦٨،٦٧- ط٢/١٩٨٨م.

**بەڕێزان!**

خوا (سُبحانه وتعالى) ئەم کۆتا فەرمایشتەی خۆی کە دایبەزاندوە، خۆی پاراستنەکەی و بەسەلامەتیی هێشتنەوەی، وە ئەستۆ گرتوە.

١- وەک لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ الحجر: ٩.

واتە: ئێمە خۆمان ذیکرمان دابەزاندوەو، هەر خۆشمان پارێزەرینی.

لە حاڵێکدا کە بۆ کتێبەکانی دیکە، لە سووڕەتی (المائدة)دا خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَ﴾ المائدة: ٤٤.

واتە: ئێمە تەوڕاتمان دابەزاندوە، ڕێنمایی و ڕووناکیی تێدایە، ئەو پێغەمبەرانەی بۆ خوا مل کەچ بوون، حوکمیان پێ بەسەر ئەوانەدا کردوە کە گەڕاونەوە بۆ لای خوا، (واتە: جوولەکەکان).

هەروەها ڕەببانییەکان و حەبرەکان، { (ربَّانيون) بریتی بوون لەو زانایانەی کە سەرپەرشتیی خەڵکیان کردوەو،(أحبار)یش کۆی (حَبْر) ە،کە بریتی بووە لە زانایەک شارەزابێ لە کتێبی خوادا، یانی: زانایانی سەرپەرشتییکارو زانایانی دیکەیش حوکمیان بە تەوڕات، کردوە} بە هۆی ئەوەوە کە پاراستنی کتێبی خوایان پێ سپێردرابوو.

[ ٱسۡتُحۡفِظُواْ ] أي: [وكِّل إليهم حفظُ كتاب الله] پاراستنی کتێبی خوایان عاید کرابوو، پێ سپێردرابوو، [وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَ] هەروەها

لەسەر ئەو کتێبەش چاودێر بوون، بەسەر یەوە چاودێر بوون و پاراستنی کتێبەکە عایدی ئەوان کرا، بەڵێ بە نسبەت کتێبە پێشووەکانەوە، خوا عایدی مرۆڤەکانی کردوون و عایدی زانایانی کردوون، کە بیانپارێزن، هەڵبەتە شتێک عایدی مرۆڤان بکرێ، لەقەدەر مرۆڤان دەپارێزرێ، بەڵام خوا (سُبحانە وتعالى) کۆتا فەرمایشتی خۆی کە قورئانە، بۆ خۆی پاراستوویەتی، وەک دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ الحجر: ٩.

ئێمە خۆمان ذیکرمان دابەزاندوەو، خۆیشمان پارێزەرینی.

٢- هەروەها لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ٤١ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ٤٢ ﴾ فصلت.

واتە: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان بە زیکر کاتێک بۆیان هات، لە حاڵێکیشدا کە کتێبێکی باڵا دەست و زاڵە، پووچیی و هەڵە ڕووی تێ ناکات، نە لە پێشیەوە نە لە دوایەوە، (واتە: لە هیچ لایەکەوە پووچیی و هەڵە ڕووی تێ ناکا،) دابەزێندراوە لەلایەن خوایەکی کار بەجێی ستایشکراوەوە.

٣- لە سوورەتی (الحاقة)ش دا، خوا (سُبحانە وتعالى) ڕایدەگەیەنێ کە تەنانەت ئەگەر پێغەمبەری خاتەمیش صلى الله علیه وسلم بە جۆرێک لە جۆرەکان دەستکاریی قورئانی کردبایەو شتێکی لێ گۆڕیبایە، خوا زۆر بەتوندیی سزای دەدا، وەک دەفەرموێ:

﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ٤٤ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ٤٥ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ٤٦ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ٤٧ ﴾ الحاقة.

واتە: ئەگەر هەندێک قسەی بە ناوی ئێمەوە هەڵبەستبان، ئێمە دەستی ڕاستیمان دەگرت، دوایی ڕەگی گەردنیمان دەبڕی و، هیچ کام لە ئێوەش

نەتاندەتـوانی کـە ببنە پـەردەو نێـوان و ڕێگرمان.

کەواتـە: خـوای بـەرزی مـەزن لـە پێغەمبـەری خاتەمیـشی (علیـه الصـلاة والسـلام) قبـوولّ نەکـردوە کـە دەسـتکاریی قورئـان بـکات و دەسـتی تێوەربـدات و، وشـەیەک یـان ڕسـتەیەک یـان ئایەتێکـی لـێ بگـۆڕێ.

با لەو بارەوە ئەم شوێنەوارەش بێنین:

٤- (عـن نافـع مـولى عبداللـه بـن عمـر رضي اللـه عنهـما قـال: خطـب الحجـاج ، يعنـي الثقفـي، فقـال إِنَّ ابـن الزبـير، يعنـي عبداللـه، يُبَـدِّل كلامَ اللـه تعـالى، فقـال ابـن عمـر رضي اللـه عنهـما: كَـذَبَ الحَجّـاج إن ابـن الزُّبـير لايبـدِّل كلام اللـه تعـالى ولايسـتطيع ذلـك.) أثـر صحيـح أخرجـه البيهقـي في الأسـماء والصفـات، رقـم ٥٢٨ وإِسـناده صحيـح.

واتـە: نافیـع، خزمەتـکاری عبداللـە ی کـوڕی عومـەر خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ دەڵـێ: حەججاجـی ثەقەفیـی وتاریـدا، گـوتی: کـوڕی زوبەیـر، (عبداللـە ی کـوڕی زوبەیـر) فەرمایشـتی خـوای بـەرز دەگـۆڕێ، عبداللـە ی کـوڕی عومەریـش، خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ، گـوتی: حەججـاج درۆ دەکا، کـوڕی زوبەیـر ناتوانـێ فەرمایشـتی خـوای بـەرز بگـۆڕێ و، ئەوەیـشی بـۆ ناکـرێ.

بێگومـان ئـەوەش کـە خـوا (سُـبحانه وتعالى) کۆتـا فەرمایشـتی خۆی پاراسـتوە لـە گـۆڕان، حیکمەتەکـەی ئەوەیـە ئەگـەر کۆتـا فەرمایشـتی خـوا گۆڕڕابایـە، کـێ ڕاسـتی کردبایـەوە؟ ئێسـتا کـە کتێبـی خـاوەن کتێبـان دەسـتکارییکراون و، گـۆڕدراون و هەندێـک شـتیان تێدا لەبیـر کـراوە، کـە خـوا (سُـبحانه وتعـالى) ئـەو تەعبیرانـەی بـۆ بەکارهێنـاون، وەک دەفەرمـوێ:

١- ﴿فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ﴾ المائدة: ١٤.

واتە: بەشێک لەوەی پێی ئامۆژگاریی کرابوون، لەبیریان چوو.

یان دەفەرموێ:

٢- ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ النساء: ٤٦.

واتە: وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەن.

بەڵێ کە کتێبی خاوەن کتێبان گۆڕدراون، بەتایبەت تەورات و ئینجیل، خوا (سُبحانه وتعالى) لەم کتێبی کۆتاییەی خۆیدا، هەر شوێنێک کە بە پێویستی زانیبێ، ڕاستی کردوەتەوە، وەک لە سووڕەتی (النمل)دا خوا - سبحانه وتعالى - دەفەرموێ:

﴿إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ٧٦ وَإِنَّهُۥ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ٧٧﴾ النمل.

واتە: بە دڵنیایی ئەم قورئانە بەسەر وەچەی ئیسرائیلدا دەخوێنێتەوە، زۆربەی ئەوەی تێیدا دەکەونە ڕا جیاییەوەو، ئەم قورئانە ڕاستەڕێ کەرو بەزەییە بۆ بڕواداران.

ئنجا ئایا بۆچی خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ: زۆربەی ئەوەی جوولەکە تێیدا کەوتوونە کێشەو ڕا جیایی، بەسەریاندا دەخوێنێتەوەو حەق و ڕاست چۆنە، ئاوا بۆیان ڕوون دەکاتەوە و بۆچی نافەرموێ: هەمووی؟! چونکە خوا (سُبحانه وتعالى) هەموو ئەو شتانەی کە خاوەن کتێبەکان تێیان دا کەوتوونە ڕا جیایی و مشت و مڕەوە، بە پێویستیی زانیوە بۆیان ڕوون بکاتەوە، حەق لە کوێیەو ناحەق لە کوێیە؟! ئنجا ئەوەی کە قورئان لێی بێ دەنگ بووەو بە پێویستی نەزانیوە، باسی بکات، لەبەر ئەوەیە کارێک لە کارەکانی دینداریی کارە بنەڕەتەکانی دینداریی پێیەوە

پەیوەست نەبووە، بۆیە خوا (سُبحانه وتعالی) کۆتا فەرمایشتی خۆی پێ قەڕەباڵغ نەکردوە.

پوختەی قسان بەنسبەت ئەم تەوەری حەوتەمەوە، ئەوەیە کە خوا (سُبحانه وتعالی) فەرمایشتەکەی خۆی پاراستوەو هۆکارەکانی پاراستنی فەرمایشتی خۆی بۆ ڕەخساندوون، کە دوایی باس دەکەین، چۆن قورئان کۆکراوەتەوەو، چۆن لە نێو دوو بەرگدا بەشێوەی موسحەفێک کە موسوڵمانان هەموویان لەسەری یەکدەنگن، پارێزراوە، خواش (سُبحانه وتعالی) کە کارێک دەکا هۆکارەکانی بۆ ساز دەکا، [إذا أراد الله شيئاً هيَّأ لَهُ أَسبابَهُ]، خوا کاتێک بیەوێ شتێک بکا، هۆکارەکانی بۆ دەڕەخسێنێ، کە دەفەرموێ: ئێمە ذیکرمان دابەزاندوەو خۆیشمان پارێزەرینی، خوا - سبحانه تعالی - فریشتان دانابەزێنێ نەهێڵێ خەڵک دەستکاریی قورئان بکات، بەڵکو هەر ئەو هۆکارانەی کە مرۆڤەکان بەکاریان دێنن، وەک: لەبەرکردن، نووسین، تۆمارکردن، پاراستن، هەر لە میانی ئەو هۆکارانەداو، لە میانی ویستی مرۆڤەکاندا، فەرمایشتەکەی خۆی پاراستوەو نەیهێشتوە هیچ دەستکاریی بکرێ و، هیچ کەم و کوڕیی و نارێکییەک ڕووی تێبکات، وەک فەرموویەتی:

﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ﴾ فصلت: ٤٢.

واتە: ناحەقیی ڕووی تێناکات نە لەپێشیەوە، نە لە دوایەوە.

واتە: لە هیچ لایەکەوە ناحەقیی و شتی پووچ و نارێک، ڕوو لە کۆتا فەرمایشتی خوای پەروەردگار ناکات.

**بەڕێزان!**

ئـەم قورئانـەی کـە ئێستا لەبەردەستی ئێمەدایـە، لـە دووتوێـی موسـحەفێکدا، کـە خـوا (سُبحانه وتعالى) وەک پێشتریش گوتمان لـە تـەوەری یەکەمدا،ئـەم پێنـج نـاوەی بـۆ بەکارهێنـاون:

**یەکەم: القرآن،** واتـە: خوێندراوە.

**دوو: الکتـاب،** واتە: نووسراوە.

**سـێ: الذکر،** واتە: بیرخەرەوە.

**چوار: الفرقان،** واتـە: جیاکەرەوە.

**پێنجەمیـش: کلام اللـه،** واتە: فەرمایشـتی خوا.

کەواتـە: یەکێـک لـە نـاوەکانی قورئـان، بریتییـە لـە (الکتـاب) نـووسراوە، بۆیـە خـوا (سُـبحانه وتعـالى) ئـەم قورئانـەی بـە دوو شـێوە بـۆ کۆکردووینـەوە و پاراسـتوویەتی:

**یەکـەم:** شـێوەی خوێندرانەوە (القراءة).

**دووەم:** شـێوەی نووسرانەوە (الکتابة).

ئنجـا ئێمـە لـەم تـەوەر دا باسـی کۆکردنـەوەی قورئـان دەکەیـن، کـە قورئـان چـۆن کۆکراوتـەوە و پارێـزراوەو نووسراوەتەوە،هـەم لـە سـینەکاندا، هـەم لـە لاپەڕەکانـدا، هـەم لـە دووتوێـی موسـحەفێکدا.

## کۆکردنەوەی قورئان لە سێ قۆناغدا:

**قۆناغی یەکەم:** لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) .

**قۆناغـی دووەم:** لـە ڕۆژگاری ئەبوبەکـردا - (خـوا لێـی ڕازی بـێ) - جێنشـینی یەکەمـی پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) .

**قۆناغـی سـێیەم:** لـە ڕۆژگاری عوثمانـدا - (خـوا لێـی ڕازی بـێ) - سـێیەمین جێنشـینی پێغەمبـەری خاتـەم (صـەڵات و سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ).

کتێبەکانـی کـە لەبـارەی زانسـتەکانی قورئانـەوە دەدوێـن، هەموویان کـەم و زۆر باسـی چۆنیـەتی کۆکردنـەوەی قورئانیـان کـردوە، بـەڵام مـن بـە پلـەی یەکـەم لـەم سـەرچاوەیەوە دەیهێنـم: (معجـم القـراءآت القرآنيـة مـع مقدمـة في القـرآءات وأشـهر القراء)،(دكتـور أحمـد مختـار عمـر) و (دكتـور عبـدالآل سـالم مكـرم)[١]، کـە گوتوویەتـی:

(ابـن حـزم الأندلـسي) لـە کتێبـی (الفصـل مـن الملـل والأهـواء والنحـل)دا گوتوویەتـی:

قورئـانی کەریـم، تۆمارێکـە لـە موسـحەفێکدا، دوایـی دەڵـێ: [ينقلـه أهـل المـشرق والمغـرب مـن أمثالهـم جيـلاً جيـلاً، لا يختلـف فيهـم مؤمـن ولا كافـرٌ منصـف، لايشـكّون ولايختلفـون بـأن محمـداً ابـن عبداللـه ابـن عبدالمطلـب أتى بـه، وأخـبر أن اللـه أوحـى بـه إليـه، وأنَّ مـن اتَّبعـه أخـذه عنـه كذلـك، ثـم أُخِـذَ عـن أولئـك، حتـى وصـل إلينـا ][٢].

واتـە: ئـەم قورئانـە خەڵکـی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا لـە هاووێنـەکانی

---

(١) - ج١ ص١-٧ (توثيق النصّ القرآني ومراحلُهُ)، ط٢/١٤٠٨ هـ-١٩٨٨م.

(٢) - ج٢ ص٨٦.

خۆیانـەوە گواسـتوویانەتەوە جیـل لـە دوای جیـل، کـە نەبـڕوادار و نـە کافرێکـی بـە ویژدانیـش تێیـدا دوو دڵییـان نەبـووەو ڕا جییـان نەبـووە کـە موحەممـەدی کـوڕی عبداللـە ی کـوڕی عەبدولموطەڵیـب ئـەم قورئانـەی لـە خـواوە هێنـاوە و، هەواڵـی داوە کـە خـوا - عزوجـل - بـۆ لای سروشـیکردوە، هەروەهـا ئـەوەی شـوێنی کەوتـوە بـە هەمـان شـێوە، دوایـی لەوانـەی پێشـیەوە ئـەوانی دوای ئـەوان، وەریـان گرتـوە تاکو گەیشـتووەتە ئێمـە.

ئنجا با باسی ئەو سێ قۆناغە بکەین:

## قۆناغی یەکەم: دیکۆمێنتکردن و نووسران و تۆمارکرانی قورئان لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا -صلی الله علیە وسلم-:

ئەم قۆناغەش لە پێنج هەنگاوان پێکهاتوە:

**هەنگاوی یەکەم:** قورئان بەش بەش و پچڕ پچڕ هاتۆتە خوارێ (نزول القرآن منجّماً).

پێشـتر باسـمانکرد یەکێـک لـە حیکمەتـەکانی ئـەوە کـە قورئـان بەش بـەش هاتۆتـە خـوار، نـەک هەمـووی بەسـەر یەکـەوەو پێکـەوە، ئەوەیـە کـە بـاش دێکۆمێنـت و تۆمـار بکـرێ و لەبـەر بکـرێ، بنووسرێتـەوەو بپارێـزرێ.

(شـهاب الديـن القسـطلاني) لـە کتێبەکـەی خـۆی (لطائـف الإشـارات لفنـون القـراءآت)دا[1] دەڵێ:

(وفي إنـزال القـرآن الكريـم مفرَّقـاً وجـوه مـن الحكمـة، منهـا: تسـهيل

---

(١) - ص٢٤.

حفظـه، وتكريـر لفظـه، لأنـه لـو نـزل جملـة واحـدة عـلى أمـة أميـة لايقـرأ غالبهـم ولا يكتـب، لَشَـقَّ عليهـم حِفْظُـهُ، وثَقُـلَ عليهـم لفظـه، كـما أشـار إلى ذلـك (سُـبحانه وتعـالى) بقولـه رداً عـلى الكفـار:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ﴾ الفرقـــان: ٣٢.

أي لُنَقـوِّي بتفريقـه فـؤادَك حتـى تعيـه وتحفظـه، لأن المتلقِّـنَ إنما يقوى قَلْبـهُ عـلى حفظ العلم شـيئاً بعـد شيءٍ ، وجزءاً بعـد جزءٍ، ولو ألقـي عليه جملة واحـدة، عجز عنـه حفظه.)

واتـە: لـە دابەزێنـدرانی قورئـانی بەڕێـزدا، جیـا جیـاو بـە بڵاویـی، چەنـد ڕوویەكـی حیكمـەتی تێـدا هـەن (ئێمـە لێـرەدا بـەس یەكیـان دێنیـن.)

یەكێكیـان بریتییـە لـە ئاسـانكردنی لەبەركـردنی و دووبـارە كردنەوەی بێـژەكانی، چونكـە ئەگـەر هەمـووی پێكـەوە دابەزیبایـە بـۆ سـەر خەڵكێـك كـە نەخوێنـدەوارن و زۆربەیـان ناخوێننـەوە و نانووسـن، پاراسـتنی ئـەو كتێبەیـان لەسـەر قـورس دەبـوو، بێژەكـەی لەسـەریان گـران دەبـوو، وەك خـوا (سُـبحانه وتعـالى) ئامـاژەی بـەوە داوە كـە بەرپەرچـی كافـرەكانی داوەتـەوەو فەرموویـەتی:

ئەوانـەی بێبـڕوان گوتیـان: دەبوایـە قورئـانی هەمـوو پێكـەوە دابەزیبایـە سـەر (خـوا دەفەرمـوێ:) بـەو شـێوەیە دامانبەزانـدوە تاكـو عەقـڵ و دڵتـی پـێ بەهێـز بكەیـن.

واتـە: عەقـڵ و دڵـی تـۆی پـێ بەهێـز بكەیـن، تاكـو تێـی بـگات و لـە بـەری بـكات، چونكـە كەسـێك كـە زانسـتێك وەردەگـرێ، دڵـی لەسـەر پاراسـتنی ئـەو زانسـتە بەهێـز دەبـێ، ئەگـەر پـێ بـە پـێ بـێ، بـە پلـە

پلـە ئـەو زانسـتە وەربگـرێ، بـەش بـەش، بـەڵام ئەگـەر هەمـووی پێکـەوە بخرێتـە سـەری، لـە هەڵگرتنـی و لـە وەرگرتنیـدا بـێ توانـا دەبـێ.

کەواتـە: ئەمـە هەنـگاوی یەکەمـی دیکۆمێنتکـردن و تۆمارکـردنی قورئانـە لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەردا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) کـە بـەش بـەش دابەزیـوە.



## هەنگاوی دووەم: نووسرانەوەی لەکاتی دابەزێنرانیدا ( كتابته حين نزوله ):

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر بە وردیی لەگەڵ نووسرانی قورئان و نووسینەوەی و تۆمارکردنیدا، مامەڵەی کردووەو زۆر سوور بووە لەسەر ئەوە، کە هەر بەشێک لە قورئان بۆی دادەبەزێ، بە وردیی بنووسرێتەوە لە مەککە، هەروەها لە مەدینەش، هەڵبەتە کە دەنووسرایەوە، لەسەر پێست و لەسەر تەختەی دار خورماو ئەو شتانەی کە کاتی خۆی شتیان لەسەر نووسراوە، لەسەریان نووسراوەتەوە.

(ابن الجزري) لە کتێبەکەی خۆیدا: (النشر في القراءات العشر) [1] دەڵێ: [وتلقَّوه من النبيِّ (صلى الله عليه وسلم) حَرْفاً حرفاً لم يهملوا منه حركة ولا سكوناً ولا إثباتاً ولا حَذْفا، ولا دخل عليهم في شيء من شكٌّ ولا وهْمٌ].

واتە: هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، پیت پیت، لە پێغەمبەریان وەرگرتووە، هیچ حەرەکەیەک (واتە: سەرێک، بۆرێک، ژێرێک،) هەروەها هیچ زەنەیەکیان لێ پشتگوێ نەخستوە، هەروەها پیتێک کە لە شوێنی خۆی چەسپابێ، یاخود شتێک کە قرتابێ، پشتگوێیان نەخستوەو، هیچ دوو دڵییەک و هیچ وەهمێکیان بۆ دروست نەبووە لە بارەی قورئانەوە.

ئنجا پێغەمبەری خاتەم صەڵات و سەلامی خوای لەسەربێ، هێندە سوور بووە لەسەر ئەوەی کە قورئان چاک تۆماربکرێ و بپارێزرێ،

---

(١) - ج١ ص٦.

کە ڕێگریی کردوە لە هاوەڵانی جگە لە قورئان بنووسنەوە، ڕێگریی کردوە کە فەرموودەکانی بنووسنەوە، فەرموویەتی: [ لاتكتبوا عنِّي شيئاً غير القرآن، فَمَنْ كتب عنِّي شيئاً غير القرآن، فَلْيَمْحُهُ].(١)

فەرموویەتی: هیچ شتێک جگە لە قورئان لە منەوە مەنووسن، هەرکەسێک شتێکی غەیری قورئانی نووسیوە، با بیسڕێتەوە.

بۆ ئەوەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ نەبن.

لەو بارەوە کە خوا قورئانی چۆن دابەزاندووەو پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لەبەری کردووەو بە هاوەڵانی لەبەر کردووەو، هەر بەو شێوەیەش نووسراوەتەوەو تۆمارکراوە، لەو بارەوە گێڕدراوە زۆرن ئێمە یەکێک لەو گێڕدراوانە دێنین:

(عن أنس بن مالك رضي الله عنه قال: كان رجلٌ نصرانياً فأسلم، وقرأ البقرة وآل عمران، فكان يكتب للنبي (صلى الله عليه وسلم)، فعاد نصرانياً، فكان يقول: مايدري محمد إلاَّ ما كتبت له، فأماته الله فدفنوه، فأصبحِ وقد لَفَظَتْهُ الأرض، فقالوا: هذا فعل محمد وأصحابه، لما هرب منهم، نبشوا عن صاحبنا فألقوه، فحفروا له فأعمقوا، فأصبح وقد لفظته الأرض، فقالوا: هذا فعل محمد وأصحابه، نبشوا عن صاحبنا لما هرب منهم، فألقوه، فحفروا له وأعمقوا له في الأرض ما استطاعوا، فأصبح قد لفظته الأرض، فعلموا أنه ليس من الناس، فألقوه)(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک: دەڵێ پیاوێکی نەسڕانیی هەبوو، مسوڵمان بوو، سووڕەتی (البقرة) و (آل عمران)ی خوێندو بۆ پێغەمبەری

(١) - أحمد في مسنده برقم: (١٠٩٨٥ و ١١٠٨٧ و ١١١٥٨ و ١١٣٤٤ و ١١٥٣٦). و مسلم برقم: (١٠٠٤) والنسائي في الكبرى برقم: (٨٠٠٨).
(٢)- البخاري برقم: (٣٤٢١) و مسلم برقم: (٢٧٨١).

خـوای ده‌نووسـیه‌وه (قورئانی بـۆ ده‌نووسـیه‌وه،) دوایی بووه‌وه به نه‌سـڕانیی، دوایـی ده‌یگـوت: موحه‌ممـه‌د نازانـێ جگـه لـه‌وه‌ی کـه مـن بـۆم ده‌نووسـی! خـواش (سُـبحانه وتعـالى) مرانـدی و کـه‌س و کاری شـاردیانه‌وه، بـه‌ڵام بـۆ به‌یانیـی زه‌وی فڕێـی دابـوو، (هه‌ڵیدابـووه‌وه ده‌رێ،) گوتیـان: ئـه‌وه کرده‌وه‌ی موحه‌ممـه‌دو هاوه‌ڵه‌کانیه‌تی کاتێک ڕایکردوه‌و لێیان هه‌ڵگه‌ڕاوه‌ته‌وه، گۆڕی هاوه‌ڵه‌که‌مانیـان هه‌ڵداوه‌تـه‌وه‌و فڕێیـان داوه، ئنجـا گۆڕێکیـان بـۆ هه‌ڵقه‌نـد قووڵـتر لـه‌وه‌ی پێشـێ، بـه‌ڵام بـۆ به‌یانیـی دووبـاره زه‌وی فڕێـی دابـووه‌وه، (ده‌ری هاویشـتبوو)، گوتیـان: ئـه‌وه کـرده‌وه‌ی موحه‌ممـه‌دو هاوه‌ڵه‌کانیـه‌تی، هاوه‌ڵه‌کـه‌ی ئێمه‌یـان ده‌رهێناوه‌تـه‌وه لـه گـۆڕ، کاتێـک لـه‌وان ڕایکـردوه‌و، فڕێیانداوه‌تـه ده‌رێ! ئنجـا بـۆ جاری سـێیه‌م گۆڕیان بـۆ هه‌ڵقه‌نـد و ئه‌وه‌نده‌ی توانییـان گۆڕه‌که‌یان قووڵکـرد، به‌ڵام بۆ به‌یانیی دووبـاره زه‌وی هه‌ڵیدابووه‌وه ده‌رێ، زانییـان کـه ئه‌وه له لایه‌ن خه‌ڵکـه‌وه نیه، بۆیه فڕێیاندایه شـوێنێکه‌وه.

چونکـه گوتیـان: هه‌رچه‌نـده بینێژیـن و هه‌رچـی زه‌وی بـۆ قووڵبکه‌یـن، هـه‌ر ده‌رده‌هاوێژرێتـه‌وه، کـه بێگومان ئه‌مه سـزای که‌سـێک بـووه پێی وابێ ده‌توانـێ فه‌رمایشـتی خـوا بگـۆڕێ، له‌حاڵێکـدا کـه خـوا به‌ڵێنـی داوه، کۆتـا فه‌رمایشـتی خـۆی ده‌پارێـزێ، چونکه ئه‌گه‌ر قورئـان پارێـزراو نه‌بوایه، وه‌ک پێشـتریش گوتمـان، لـه دوای قورئـان هیچ کتێبێکـی دیکه نایـه‌ت، تاکو ئه‌و شـوێنانه‌ی کـه لـه قورئـان دا ده‌سـتکاریی ده‌کرێـن و ده‌گۆڕدرێـن، ڕاسـتیان بکاته‌وه.

## هەنگاوی سێیەم: پێشبڕکێیەکی زۆر هەبووە لەسەر لەبەر کردنی قورئان و زۆر خوێندنەوەی قورئان:

لـەو بـارەوەش زۆر شـت هەیـە باسـبکرێ، بـۆ وێنـە: ئـەم دەقـە کـە پێغەمبـەری خاتـەم (صـلى اللـە عليـە وسـلم) بـە عبداللـە ی کـوڕی عەمری کـوڕی عـاصی فەرمـووە:

(إقـرأ القـرآن في كل شـهر، قـال: قلـت: يانبـي اللـه! إني أطيـق أفضـل مـن ذلـك، قـال: فاقـرأه في كل عشريـن، قـال: قلـت يـا نبـي اللـه! إني أطيق أفضـل مـن ذلـك، قـال: فاقـرأه في كل عـشر، قـال: قلـت يـا نبـي اللـه! إني أطيـق أفضـل مـن ذلـك، قـال: فاقـرأه في كل سـبع ولا تَـزِدْ عـلى ذلـك)[١].

واتـە: قورئـان لەهـەر مانگێکدا بخوێنـە، دەڵێ: گوتم: ئـەی پێغەمبەری خـوا! لـەوە باشـترم لـە توانادایـە، فەرمووی: لـە هەر بیسـت شـەودا بخوێنە، دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە چاکـترم پێدەکـرێ، فەرمـووی: لـە هـەر دە شـەوێک دا بیخوێنـە، دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە چاکـترم پێدەکـرێ، فەرمـووی: لەهـەر حـەوت شـەوێک دا بیخوێنـە و لـەوە زیـاد مەکـە.

هەروەها پێغەمبەری - (صلى الله عليه وسلم) - فەرموویەتی:

(لَم يفقه مَن قرأ القرآن في أقلَّ من ثلاث)[٢].

واتـە: هەرکـەس لەمـاوەی کەمـتر لەسـێ شـەوان دا قورئـان بخوێنـێ، لێـی تێنـاگات.

هەندێـک لـە هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، پێغەمبـەر (عليـە

(١) - البخاري: ٤٧٦٦ و ٤٧٦٧ ومسلم: ١١٥٩.

(٢) - أخرجه ابن شيبة: ٨٥٧٣ ، وأحمد: ٦٨٤ ، وأبوداود: ١٣٩٤ ،والترمذي: ٢٩٤٩ ، والنسائي في (فضائل القرآن) : ٩٢ ، وابن ماجه: ١٣٤٧، وإسناد صحيح.

الصلاة والسلام) بە دیارییکراوی ناوی هێناون، کە زۆر شارەزابوون لە قورئاندا وەک لە سەحیحی بوخاریی و موسلیم دا هاتووە:

(عن عبدالله بن عمرو بن العاص قال: سمعت النبي (صلى الله عليه وسلم) يقول: خذوا القرءان من أربعة، من عبدالله بن مسعود، وسالم، ومعاذ، وأبي بن كعب. رضي الله عنهم).[١]

واتە: قورئان لە چوار کەسان وەربگرن: (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) و (سالم) (مولى أبي حذيفة) و (معاذ بن جبل) و (أبي بن كعب).

کە دیارە ئەم چوارەش دوویان لە کۆچکەراتن، عبدالله ی کوڕی مەسعوودو سالیم، دوانیشیان لە پشتیوانانن، کە بریتیین لە موعاز و ئوبەی کوڕی کەعب.

هەڵبەتە هاوەڵان تەنیا پیاوانیان نا، بەڵکو ئافرەتانیش، پێشبڕکێیان کردوە لەوەدا کە قورئان زۆر لەبەربکەن و تێیدا شارەزابن، لەوانە: هەرکام لە خاتو حەفصەو خاتو عائیشە - خوا لێیان ڕازی بێت - هەردوو هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموو قورئانیان لەبەر بووە، هەروەها ئافرەتانی دیکەش هەبوون، کە قورئانیان هەموو لەبەر بووە.




(١) - أخرجه البخاري: ٣٥٤٨، مسلم: ٢٤٦٤.

**هەنگاوی چوارەم:** کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا - خوا لێیان ڕازی بێت - ئەوەی لەبەریان کردوە لە قورئان، دوایی بۆ پێغەمبەریان خوێندۆتەوە:

لەو بارەوەش ڕیوایەت زۆرن، بۆ وێنە:

[عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: قال لي رسول الله (صلى الله عليه وسلم): إقرأ علي، ففتحت سورة النساء، فلما بلغْتُ (فكيف إذا جئنا من كل أمة بشهيد وجئنا بك على هؤلاء شهيداً،) رأيت عينيه تذرفان من الدمع، فقال حسبك الآن][1].

عبداللە ی کوڕی مەسعوود دەڵێ: پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی قورئانم بەسەردا بخوێنە، منیش دەستم بە سووڕەتی (النساء) کرد تاکو گەیشتمە ئەو شوێنە: [ فكيف إذا جئنا من كل أمة بشهيد وجئنا بك على هؤلاء شهيداً يومئذ يودُّ الذين كفروا وعصوا الرسول لو تُسَوَّى بهم الأرض ولا يكتمون الله حديثاً]، ئیدی پێغەمبەر - عليه الصلاة والسلام فەرمووی: ئەوەندەت بەسە، تەماشام کرد چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهات.

ئەمەش هەنگاوی چوارەم لە تۆمارکردنی قورئان و دێکۆمێنتکردنی لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا، کە هاوەڵان ئەوەی لەبەریان کردوە، بۆ پێغەمبەری خوایان خوێندووەتەوە، تاکو ئەگەر هەڵەیەک، کەم و کوڕییەکیان تێدا کردبێ، بۆیان ڕاستبکاتەوە.

(١) - البخاري: ٤٣٠٦، ومسلم: ٨٠٠.

**هەنگاوی پێنجەم و کۆتایی:** جیبریل هەموو ساڵێک لە مانگی ڕەمەزاندا قورئانی لەگەڵ پێغەمبەری خاتەمدا دەورکردوەتەوەو پێیدا چووەتەوە:

(قال مسروق عن عائشة عن فاطمة - رضي الله عنها - أسرَّ النبيُّ - (صلى الله عليه وسلم) - إليَّ أنَّ جبيرل كان يعارضني بالقرآن كل سنة، وأنه عارضني العام مرتين، ولا أراه إلاَّ حضور أجلي. رواه البخاري)[1].

مەسرووق لە دایکمان خاتو عائیشەو، دایکمان خاتو عائیشەش لە فاتیمەی کچی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) خوا لێیان ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە کە فاتیمە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) بە پەنهانیی، بە پەنامەکیی پێیگوتم: جیبریل هەموو ساڵێ لە مانگی ڕەمەزاندا جارێک قورئانی لەگەڵ دەور دەکردمەوە، بەڵام ئەمساڵ دوو جاران لەگەڵم بەقورئاندا چووەوە، پێم وایە ئەمە نیشانەی ئەوەیە کاتی مردنم و کۆتایی ژیانم هاتوە.



(١) -البخاري: ٥٩٢٨، ومسلم: ٢٤٥٠.

## قۆناغی دووەم: کۆکردنەوەی قورئان لە ڕۆژگاری ئەبوبەکردا - (خوا لێی ڕازی بێ):

سـەرەتا دەڵێیـن: نووسـەرەوانی قورئـان، لـە هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، گەیشـتوونە چـل و دوو (٤٢) کـەس، واتـە: پێغەمبـەری خـوا (علیـه الصـلاة والسـلام) چـل و دوو (٤٢) کـەس لـە هـاوەڵانی فەرمـان پێکـردوون کـە قورئـانی بـۆ بنووسـنەوە، کـە لـە نێویانـدا، هـەر پێنـج جێنیشـنەکانی پێغەمبـەر هەبـوون واتـە: ئەبوبەکـرو عومـەرو عوثمـان و عـەلی و حەسـەنی کـوڕی عەلـی، هەروەهـا (زبیـر بـن العـوام) و (سـعید بـن العـاص) و (أبي بـن کعـب) و (زیـد بـن الثابـت) ئەوانـە هەموویـان لـە نێـو ئـەو چـل و دوو کەسـەدا بـوون و لـە، پێشـەوەی ئـەو (٤٢) کەسـە بـوون[1].

ئنجـا بـا بـۆ چۆنیـەتی کۆکردنـەوەی قورئـان لـە ڕۆژگاری ئەبوبەکـردا خـوا لێـی ڕازی بـێ، یەکەمیـن جێنشـینی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) تەماشـای ئـەم دەقـە بکەیـن:

(عـن زیـد بـن الثابـت رضي اللـه عنـه قـال: أرسـل إليَّ أبوبكـر مقتـل أهـل اليمامـة، فـإذا عمـر بـن الخطـاب عنده، قـال أبوبكـر رضي اللـه عنـه: إنَّ عمـر أتـاني فقـال: إن القتـل قـد اسـتحرَّ يـوم اليمامـة بقـراء القـرآن، وإني أرى أن تأمـر بجمـع القـرآن، قلـت لعمـر: كيـف تفعـل شـيئاً لم يفعلـه رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم)؟ قـال عمـر: هـذا واللـه خـيرٌ، فلـم

---

(١) - حقائق و شبهات حول القرآن الكريم، د.محمد عمارة، ص ٣١ - ٤٣.
كەناوی هەر چل و دوو (٤٢) یان هێناوە و (٢٨) یان کە پسپۆڕو نووسەری بەردەوام بوون ، کورتەیەک لەژیانی نووسیون.

يزل عمر يراجعني حتى شرح الله صدري لذلك، ورأيت في ذلك الذي رأى عمر، قال زيد: قال أبوبكر: إنك رجل شاب عاقل لا نَتَّهمك، وقد كنت تكتب الوحي لرسول الله (صلى الله عليه وسلم)، فَتَتَبَّع القرآن فاجمعه، فوالله لو كلَّفوني نقل جبل من الجبال، ما كان أثقل عليَّ مما أمرني به من جمع القرآن، قلت: كيف تفعلون شيئاً لم يفعله رسول الله - (صلى الله عليه وسلم)؟ قال: هو والله خير، فلم يزل أبوبكر يراجعني حتى شرح الله صدري، للذي شرح له صدر أبي بكر وعمر رضي الله عنهما، فتتبعت القرآن أجمعه من العُسُب واللخاف، وصدور الرجال، حتى وجدت آخر سورة التوبة مع أبي خزيمة الأنصاري لم أجدْها مع أحد غيره: (لقد جاءكم رسول من أنفسكم عزيز عليه ما عنتم حريص عليكم بالمؤمنين رؤف رحيم)، حتى خاتمة البراءة، (التوبة آية ١٢٨ - ١٢٩.) فكانت الصحف عند أبي بكر حتى توفّاه الله، ثم عند عمر حياته، ثم عند حفصة بنت عمر رضي الله عنهم)[١].

واتە: زەیدی كوڕی ثابیت، -كە دواتر عوثمان (خوا لێی ڕازی بێ)، لە ڕۆژگاری خۆیدا دەیكا بە بەرپرسی ئەو لیژنەیەی كە هەموو سووڕەتەكانی قورئان لە، دوو بەرگدا كۆ دەكەنەوە-، دەڵێ: ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێ)، دوای كوشتاری یەمامە، (واتە: لە شەڕی هەڵگەڕاوەكاندا) لەدوای ناردم، كە چووم عومەری كوڕی خەتتاب لەلای بوو، ئەبوبەكر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: عومەر هاتوە بۆلام، پێیگوتووم: كوشتن لە ڕۆژی یەمامەدا زۆر بووە لە قورئان خوێنەكاندا، (قورئان خوێنەكان سەری ڕم بوون لە سوپای ئیسلامداو لەپێشی پێشەوە بوون،) بۆیە من پێم وایە فەرمان بكەی

(١) - (تخريج) ەكەی لە كۆتایی ماناكردنەكەیدا هێنراوە.

بە کۆکردنەوەی قورئان، (واتە: لە دووتوێی دوو بەرگدا، ئەگەر نا قورئان هەر هەبووە،) ئەبوبەکر دەڵێ: منیش بە عومەرم گوت: چۆن شتێک دەکەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیکردبێ؟! عومەریش گوتی: بەخوا ئەوە شتێکی باشە، ئیدی عومەر لەو بارەوە هەر قسەی لەگەڵدا کردم، تاکو خوا سینەمی گوشادکرد، بۆ ئەو کارەو لەو بارەوە هاتمە سەر ڕای عومەر، زەید دەڵێ: ئەبوبەکر پێی گوتم: تۆش پیاوێکی گەنجی عاقڵی و، ئێمە تۆ بە تۆمەتبار دانانێین، کاتی خۆیشی وەحییت لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نووسیوە، بۆیە شوێن قورئان بکەوە و هەمووی کۆبکەوە، لە دوو توێی دوو بەرگدا، دەڵێ: سوێند بەخوا ئەگەر پێیانسپاردبامایە چیایەک لە چیاکان بگوازمەوە، هێندە لەسەرم قورس نەبوو، لەوەی فەرمانیان پێکردم قورئان لە دوو توێی دوو بەرگدا کۆبکەمەوە، گوتم: چۆن شتێک دەکەن کە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) نەیکردوە؟! ئەبوبەکر گوتی: بەخوا ئەوە شتێکی باشە، ئیدی ئەبوبەکر هەر وتوێژی لەگەڵدا کردم، تاکو خوا سینەمی گوشاد کرد بۆ ئەوەی سینەی ئەبوبەکرو عومەری بۆ گوشاد کردبوو، (هەمان قەناعەتم پەیدا بوو،) بۆیە من بەدوای قورئان کەوتم کۆمدەکردەوە لەوەی کە نووسرابووەوە لەسەر تەختەی دار خورما، هەروەها لەسەر بەردی سپیی، (کاتی خۆی ئەو شتانەی کە نووسیویانن، لەسەر ئەو شتانەیان نووسیون،) هەروەها ئەوەی کە لە سینەی پیاواندا هەبوو، هەتا کۆتایی سووڕەتی تەوبەم تەنیا لە لای ئەبی خوزەیمەی ئەنساریی بینی، (واتە: بە لەبەر کراویی تەنیا لە لای ئەوم بینی):

﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم

بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ التوبـة.

ئیـدی کۆمکـردەوە لـە پـەڕەکان دا، لـە دوو توێـی دوو بەرگـداو، پـەڕەکان لـەلای ئەبوبەکربـوون تاکـو خـوا (سُـبحانە وتعـالی) ئـەوی بـردەوە، (مرانـدی)، دوایـی لـەلای عومـەر بـوون تاکـو لـە ژیانـدا بـوو، دواییـش لـە لای حەفسـەی کچـی عومـەر بـوون، خـوا لێیـان ڕازی بـێ.[١]

کەواتـە: لـە ڕۆژگاری ئەبوبەکـری سـیددیقدا (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، زەیـدی کـوڕی سـابیت ئەرکـدار کـراوە، کـە قوڕئـان هەمـووی کۆبکاتەوەو بیخاتـە دوو توێـی دوو بەرگـەوە.

شـایانی باسـە: زەیـدی کـوڕی کـوڕی سـابیت، بەم شـێوەیە نەخشـەی دانـا بـۆ کۆکردنـەوەی قوڕئان:

یەکـەم: وەک لـە (معجـم القـرآت القرآنيـة)دا[٢] هاتوە، [لايقبـل من أحد شـيئاً حتـى يشـهد لـه شـاهدان]، هیـچ شـتێکی لـە هیچکـەس وەرنەدەگرت، تاکـو دوو شـایەد شـایەدییان بـۆ نەدابایـە، شـایەدی دادگـەر، کـە ئەوانیـش ئەوەیـان بیسـتوەو ، ئـەو سـوورەتە یـان ئـەو چەنـد ئایەتەیـان لەبـەرن. ئەمـە (السـيوطي) لـە (الإتقـان)دا هێناویـەتی[٣].

واتـە: جگـە لـەوەی کـە زەیـد بۆ خـۆی هەمـوو قوڕئـانی لەبـەر بووەو ژمارەیەکـی زۆر لـە هاوەڵان لەبەریان بووە خوا لێیـان ڕازی بێ، بەڵام ئەگەر

(١) - البخاري برقم: (٤٤٠٢ و ٤٧٠١ و ٤٧٠٣ و ٦٧٦٨ و ٦٠١٨٩)، والطياليسي برقم: (٣)، وأحمد برقم: (٥٧)،أبوعبيد في الفضائل ص٢٨١، والترمذي برقم: (٣١٠٣) والنسائي في الكبرى برقم: (٧١٩٥) وأبويعلى في مسنده برقم: (٦٣ و٦٤ و ٦٥ و ٩١) والبزار برقم: (٣١) وأبوبكر المروزي في مسند أبي بكر برقم: (٤٥) والطبراني في الكبير ج٥، ص(١٨٠ – ١٨٥) وابن حبان برقم: (٤٥٠٦) والبيهقي في الكبرى ج،٢، (٤١).

(٢) - ج١ ص١٠، ١١.

(٣)- ج١ ص٥٨ .

ویستبای، ئایەتێک یان چەند ئایەتێک لەکەسێک وەربگرێ، دەبوایە، دوو کەس شایەدییان دابایە، کە ئێمەش ئەو ئایەتە یان ئەو ئەندازەیەمان لەبەرە.

**دووەم:** زەید (خوا لێی ڕازی بێ)، وێڕای لەبەر بوون و پارێزرانی ئەو قورئانە لە سینەی پیاواندا، دەبوایە بە نووسراوییش هەبێت، واتە: تەنیا ئیکتیفای بەوە نەکردوە کە کۆمەڵە خەڵکێک ئەو چەند ئایەتە، یان ئەو سوورەتەیان لەبەرە، بەڵکو دەبوایە بە نووسراویش هەبێت.

ئنجا (ابن حجر العسقلاني) وەک (السيوطي) لێی نەقڵ کردوە دەڵێ:

[ المراد بالشاهدين: الحفظ والكتاب. ]

مەبەست لە دوو شایەدان ئەوەبووە، کە هەم لەبەرکراوبێ، هەم نووسراوبێ.

**سێیەم:** زەید تەنیا بە نووسراویی ئیکتیفای نەدەکرد، بەڵکو دەبوایە لەبەریشبیێ، هەر وەک تەنیا بە لەبەر کراوییش ئیکتیفای نەدەکرد، دەبوایە نووسراویشبێ.

بێگومان ئەمەش بۆ زیاتر دووربینیی کردن، لەوەدا کە خوا (سُبحانە وتعالى) ئەم قورئانە موبارەکەی چۆن دابەزاندوە، بەو شێوەیە کۆی بکاتەوە.



## قۆناغی سێیەم: دیکۆمێنتکردن و تۆمارکردنی قورئان و کۆکرانەوەی لە ڕۆژگاری عوثماندا (خوا لێی ڕازی بێ):

ئەمە دوا قۆناغی کۆکرانەوەی قورئانە، کە دوایی تێکڕای خەڵک لەسەر یەک موسحەف کە ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە، کۆبوونەوەو یەکدەنگ بوون.

بۆ ئەمیش، با ئەم دەقە بێنین:

(عن أنس بن مالك رضي الله عنه، أن حذيفة بن اليمان قدم على عثمان وكان يُغازي أهلَ الشام في فتح أرمينيا وآذربايجان مع أهل العراق، فأفزع حذيفةَ اختلافٌ في القراءة، فقال حذيفة لعثمان: يا أمير المؤنين! أدركْ هذه الأمة قبل أن يختلفوا في الكتاب اختلاف اليهود والنصارى، فأرسل عثمان إلى حفصة أن أرسلي إلينا بالصحف ننسخها في المصاحف ثم نردُّها إليك، فأرسل بها حفصة إلى عثمان، فأمر زيد بن الثابت وعبدالله بن الزبير وسعيد بن العاص وعبدالرحمن بن الحارث بن هشام، فنسخوها في المصاحف، وقال عثمان للرهط القريشيين الثلاثة: إذا اختلفتم أنتم و زيد بن الثابت في شيء من القرءان، -وفي رواية في عربية من عربية القرآن- فاكتبوه بلسان قريش، فإنَّما نزل بلسانهم، ففعلوا، حتى إذا نسخوا الصحف في المصاحف، ردَّ عثمانُ الصحف إلى حفصة، وأرسل إلى كل أفق بمصحف مما نسخوا، وأمر بما سواه من القرآن في كل صحيفة أو مصحف، أن يُحْرَق)[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ:

---

(١) - البخاري برقم: (٣٣١٥ و ٤٦٩٩ و ٤٧٠٢).

حوزەیفەی کوڕی یەمان (خوا لێی ڕازی بێ)ت، هاتە لای عوسمان لە حاڵێکدا کە لەگەڵ خەڵکی شامدا، دەچوو بۆ جەنگ بۆ ئازادکردنی ئیرمینیاو، لەگەڵ خەڵکی عێراقدا دەچوو بۆ ئازادکردنی ئازەربایجان، ڕا جیایی هاوەڵان یان مسوڵمانان لە قورئان خوێندندا، حوزەیفەی ترساند، بۆیە حوزەیفە بە عوسمانی گوت: فەرماندەی بڕواداران! فریای ئەو ئۆممەتە بکەوە، بەرلەوەی کە لە بارەی کتێبەکەیانەوە ڕا جیاییان ببێ، وەک ڕا جیایی جوولەکەو نەسڕانییەکان.

عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ)، ناردی بۆلای خاتو حەفصە کە ئەو لاپەڕانەی لەلاتن (کە زەیدی کوڕی سابیت هەموو قورئانی تێدا کۆکردوونەوە،) بۆمان بنێرە، چەند نوسخەیەکیان لەبەر دەگرینەوە و دوایی پەڕەکانت بۆ دەنێرینەوە، خاتو حەفصەش پەڕەکانی بۆ عوسمان ناردن، ئەویش فەرمانی کرد بە زەیدی کوڕی سابیت و (عبدالله) کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی عاص و (عبدالرحمن) کوڕی (حارث) کوڕی (هشام)، (واتە: لیژنەیەکی چوارکەسیی پێکهێناو زەیدیشی کرد بە بەرپرسیان) .

عوسمان بە سێ کەسە قورەیشییەکەی گوت: (زەیدی کوڕی سابیت لە پشتیوانانەو مەدینەییە، سێیەکەی دیکە: عبدالله بن الزبیر، سعید بن العاص، عبدالرحمن بن حارث بن هشام، هەرسێکیان مەککەیین و قورەیشیین، ئنجا عوسمان بە سێ قورەیشییەکانی گوت:) هەرکات ئێوە هەرسێکتان لەگەڵ زەیددا کەوتنە ڕا جیایی لە شتێک لە قورئاندا، (چۆن دەنووسرێ؟ چۆن دەگوترێ:؟) لە ڕیوایەتێکدا: لە عەرەبیی بوونی قورئاندا، بە زاری قورەیش بینووسن، چونکە زیاتر بە لەهجەی قورەیش دابەزیوە، ئەوانیش وایانکرد، هەتا کاتێک کە پەڕەکانیان لە چەند موسحەفێکدا نووسینەوە، عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ)، پەڕەکانی بۆ خاتو حەفصە گێڕانەوەو، بۆ هەر ئاسۆیەک، لەو موسحفانەی کە نووسیبوویاننەوە، موسحەفێکی بۆ ناردن و

فەرمانی کرد: هەموو ئەو قورئانەی دیکە کە کۆکرابووەوە لەچەند پەڕێکدا، لە موسحەفێکدا، بسووترێنرێن، (بۆ ئەوەی مسوڵمانان تەنیا ئەو موسحەفەیان لەبەر دەستدابێ کە ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدایە).

ئنجا کە دەگوترێ: (موسحەفی عوثمان) واتە: لە ڕۆژگاری ئەودا کۆکراوەتەوە، ئەگەر نا قورئان هەر فەرمایشتی خوایە و، پێغەمبەریش صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، هەر بە فەرمانی خوا ئەم قورئانەی بەو شێوەیە کۆکردۆتەوە.

لێرەدا پێویست دەکات دوومەسەلان ڕوون بکەینەوە:

**یەکەم:** بۆچی ئەبوبەکر، (خوا لێی ڕازی بێ)، موسحەفەکەی تەسلیمی عومەرکردوە، بەڵام عومەر، خوا لێی ڕازیبێ، موسحەفەکەی تەسلیمی عوثمان نەکردوە، بەڵکو لەلای خاتو حەفصەی کچی دایناوە؟

وەڵامەکەی هەر ئەوەیە: کە ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێ، پێشنیاری کردوە بۆ مسوڵمانان، کە لەدوای خۆی، عومەر جێنشین بێ، ئەوانیش پێشنیارەکەی ئەبوبەکریان وەرگرتوە، بۆیە موسحەفەکەیشی تەسلیم کردوە. بە دڵنیایی خوای پەروەردگار بەرچاو ڕوونی کردوەو حاڵیی کردوە کە لەدوای ئەو، پێشنیارەکەی قبووڵ دەکرێ و، عومەر دەبێتە جێنشینی مسوڵمانان، بەڵام عومەر خوا لێی ڕازی، بێ، دڵنیا نەبووە کە لە دوای خۆی کێ دەبێتە جێنشین: ئایا عوثمان دەبێ، یان عەلی دەبێ، یان کێ دەبێ؟ بۆیە موسحەفەکە هەر لەلای خاتو حەفصەی کچی ماوەتەوە.

**دووەم:** پرسیارێکی دیکە دەکرێ: بۆچی ئەبوبەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ هەمان شت کە عوثمان کردی، بۆچی ئەوان لە ڕۆژگاری خۆیاندا نەیانکرد، تاکو لەسەر دەمی ئەوانەوە، خەڵک لەسەر یەک موسحەف کۆبن؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە لەسەر دەمی ئەبوبەکرو عومەردا خوا لێیان

ڕازی بـێ، هـاوەڵان هـەر لـە مەککـەو لـە مەدینـە بـوون و بەشـارەکاندا بـڵاو نەبووبـوون، بۆیـە هەموویشـیان هـەر بەوشـێوانە کـە پێغەمبـەری خـوا (علیـه الصـلاة والسـلام) فێری کردبوون، قورئانیـان دەخوێند، بەڵام دوایی لەسـەردەمی عوسـماندا خـوا لێـی ڕازی بـێ، کـە عوسـمان سیاسـەتەکەی زیاتـر بـەلای چاوپۆشـیی و نەرمییـدا بـوو و ، هەندێـک لەوانـەی ناحـەزی بـوون، دوایـی ئـەو خاڵەیـان لە عوسـمان خـوا لێـی ڕازی بێ، قۆسـتۆتەوەو بەهـرەی خراپیان لـێ وەرگرتـوە، عوسـمان مۆڵـەتی داوە هـاوەڵان بەشـارەکاندا بڵاوبـن.

بۆیـە هەرکامێـک لـە هـاوەڵان بـە تایبـەت ئەوانەیـان، کـە زیاتـر ناویـان بـەدەرەوە بـووەو، کەسایەتییان بەهێزتر بـووە، خەڵکیان لـێ ئاڵاوەو، ئەوانەیـان کـە زیاتـر شـارەزای قورئـان بـوون، قورئانیـان فێـری خەڵـک کـردوە، ئنجـا بۆیـە حوزەیفـەی کـوڕی یەمان کـە بینیویـەتی ڕا جیایـی هەیە لـە چۆنیەتیـی خوێنـدنی قورئـان دا، چـووە بـە عوسـمانی گوتـوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) و بـۆ وی پێشـنیاری کردو، سـەرەنجام عوسـمانیش پێشـنیارەکەی حوزەیفـەی کـوڕی یەمـانی جێ بەجـێ کـردوە.

واتـە: لەسـەردەمی عوسـماندا خـوا لێـی ڕازی بـێ، پاڵنـەرو هانـدەر هەبـووە بـۆ ئـەوەی دەسـت بجووڵێنـن، لـەوەدا کـە ئـەو موسـحەفەی کاتی خـۆی زەیـدی کـوڕی سـابیت کۆیکردۆتـەوە، لـە دوو توێـی دوو بەرگـدا، عوسـمان خـوا لێـێ ڕازی بـێ لیژنەیەکی چـوار قۆڵیـی دروسـتکردوە، تاکـو زیاتـر وردبنـەوە لـە ڕێنـووسی قورئانـداو، داکۆکییشـی کـردوە لـەوەدا، کـە ئەگـەر کەوتنـە ڕا جیایـی، بـا زیاتـر بـە زاری قورەیش بنووسرێ، وشـەیەک کـە بەچەنـد جۆرێـک بگوتـرێ، کامەیـان زیاتـر قورەیـش بـەکاری هێنـاوە، بـا بـەو شـێوەیە بنـووسرێ، چونکە قورئـان زیاتـر بـەزار (لَهْجة)ی قورەیش دابەزیـوە.

ئێمە لێرەدا دێینە کۆتایی ئەم تەوەری هەشتەم و،خوا پشتیوانبێ لە تەوەری نۆیەمدا، جارێکی دیکە باسی ئەم بابەتە دەکەینەوە، بەڵام لە تەوەری نۆیەم دا، هەڵوێستی هاوەڵان لە کۆکردنەوەی عوسماندا بۆ قورئان، کە عوسمان لیژنەیەکی چوار قۆڵیی پێک هێناوەو، هەموو سووڕەتەکانی قورئانی خستوونە نێوان دوو بەرگەوە، کە پێشتر بەو شێوەیە نەبووە، ئایا هەڵوێستی لەوبارەوە هاوەڵان چی بووە؟ خوا پشتیوانبێ لە تەوەری نۆیەمی داهاتوودا، قسە لەو بابەتەوە دەکەین.



# تەوەری نۆیەم

## هەڵوێستی هاوەڵان لە کۆکردنەوەی قورئان، لەلایەن عوثمانەوە خوا لێی ڕازیبێ



**بەڕێزان!**

پێشتر باسی کۆکردنەوەی قورئانمان کرد، کە قورئان جاری یەکەم هەر لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەمدا (صلی الله علیه وسلم) کۆکراوەتەوەو، بۆ جاری دووەم لە ڕۆژگاری ئەبوبەکردا لە نێو دووتوێی موسحەفێکدا پەڕەکان کۆکراونەوە، دوای ئەوەی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) بۆی پێشنیارکرد، ئەویش زەیدی کوڕی سابیتی ڕاسپارد، ئنجا قۆناغی سێیەمی کۆکردنەوەی قورئان، لە ڕۆژگاری عوسماندا بوو، دوای ئەوەی حوزەیفەی کوڕی یەمان لە جەنگ و جیهاد گەڕایەوە و، مەترسیی ئەوەی خستە بەر دەمی عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، کە بەرلەوەی مسوڵمانانیش وەک چۆن خاوەن کتێبە پێشووەکان کە لە کتێبەکانی خۆیاندا کەوتوونە ڕا جیایی، لەبارەی قورئانەوەو چۆنیەتیی خوێندنەوەیەوە، بکەونە ڕا جیایی، وا باشە قورئان هەمووی لە دوو توێی دوو بەرگدا، وەک موسحەفێک کۆبێت و، بەڕێنووسێک کە لەو کاتەدا، باوبووە پێی بنووسرێ.

ئنجا ئایا هەڵوێستی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ لەوبارەوە، چۆن بوو؟

چونکە هەندێک لەوانەی بەناحەق دەیانەوێ تانە لە قورئان بدەن و، لە کۆکردنەوەی قورئان و پارێزراویی قورئان بدەن، باسی هەندێک شت دەکەن کە لەو ڕۆژگارەدا بوون، کە ئێمە دوایی باسیان دەکەین، دەیانەوێ بیانکەنە بیانووی ئەوەی گوایە: لە قورئانیشدا ڕا جیایی و کێشەو مشت و مڕ لەنێوان هاوەڵاندا خوا لێیان ڕازی بێ، هەبووە.

بەڵام ئەوە ڕاست نیە، بەڵێ ڕەنگە یەکێک لە هاوەڵان لەبارەی سوورەتێکەوە، کە وایزانیبێ وەک پاڕانەوەیەو، خوا بۆ پێغەمبەری

دابەزانــدوە، بەتایبــەت (المعوِّذتــین) ســوورەتی (الفلــق) و ســوورەتی (النــاس) كــە ئیبنــو مەســعوود ڕایەكــی وای هەبــووە، یــان هاوەڵێــك ڕســتەیەكی بەجۆرێــك خوێندبــێ، كاتی خــۆی پێغەمبــەری خاتــەم (صلى الله علیه وسلم) وای فێــر كردبــێ، كــە بــۆی ئاســانە، بــە پێــی زار (لهجــة) ی ئــەو، یــان ئــەو لــە مێشــكیدا گۆڕابــێ، گرنــگ ئەوەیــە دوایــی هەمــوو هــاوەڵان لەســەر ئــەم موســحەفە یەكدەنــگ بــوون، كــە ئێســتا لەبەردەستی ئێمەیــە، كــە هەمــوو جــارێ دەنــووسرێ: (بالرسم العثماني) بەپێــی ڕێنــوس و ئیمــلای عوســمان (خــوا لێــی ڕازی بــێ)، واتــە: لــە ڕۆژگاری ئــەودا، ئەگەرنــا ئــەو ڕێنووســەكەی دانەنــاوە.

ئنجــا ئــەوەی شــتێكی بــاوەو ئاشــكرایە، ئەوەیــە كــە هــاوەڵان خــوا لێیــان ڕازی بێ بەگشــتیی ئــەو كارەی عوســمانیان نەك هەر پەســەندكردوە، بەڵكــو بــە پێویستیشــیان زانیــوەو، بە بــێ هــەڵاواردن هەموویــان یەكدەنگ بــوون لەســەر ئــەوە، لــەو بــارەوە دەتوانیــن دوو گێــڕراوە بێنیــن:

**١- (عــن مصعــب بــن ســعد بــن أبي وقــاص قــال: أدركــت أصحــاب رســول اللــه (صلى اللــه عليــه وســلم) متوافريــن، فــما رأيــت أحــداً منهــم عــاب مــا صنــع عثــمان رضي اللــه عنــه في المصاحــف) (١).**

واتــە: موســعەبی كــوڕی ســەعدی كــوڕی ئەبــی وەققــاس خــوا لــە خــۆی و بابــی ڕازی بــێ، دەڵــێ: هــاوەڵانی پێغەمبــەری خــوام (صلى الله علیه وسلم) بــە زۆریــی بینیــن، هیچكامێكیانــم نەبینــی ڕەخنــە بگــرێ لــەوەی كــە عوســمان كردوویــەتی لەبــارەی موســحەفەكانەوە.

كــە وەك پێشــتر باســمانكرد ئــەو پەڕانــەی لــە لای دایكــمان خاتــو حەفصــە بــوون، خــوا لێــی ڕازی بــێ، كــە كچــی عومــەری كــوڕی خەتتــاب

(١) - أثر صحيح أخرجه عمر بن شيبة في تأريخ المدينة، ج ٣ ص ١٠٠٤، إسناده صحيح.

و هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە، کە دوای ئەوە لە ڕۆژگاری ئەبوبەکردا، ئەو پەڕانە کۆکرانەوە لەلای ئەبوبەکر بوون، دوای کۆچی دوایی ئەویش، چوونە لای عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) و، دوای کۆچی دوایی ئەویش، چوونە لای خاتو حەفصە، چونکە جارێ دیار نەبوو کێ دەبێ بە جێنشین، لەبەر ئەوەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ شەش کەسی پێشنیار کردبوون، ئنجا دوایی کە عوسمان پەڕەکانی لە حەفصە وەرگرتن و چەند نوسخەیەک، هەندێک دەڵێن: چوار، هەندێک دەڵێن: شەش، هەندێک دەڵێن: هەشت، لەو لاپەڕانەی گرتنەوە، لە دوو توێی دوو بەرگدا، واتە: ئەو موصحەفەی ئێستا و، ناردنی بۆ شارە گەورەکانی ئیسلام، لە ڕۆژگاری خۆیدا.

٢- هەروەها لە عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبیش خوا لێی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە، کە ئەویش ئەوەی عوسمان کردوویەتی، پەسەندی کردووەو بەکارێکی باشی زانیوە، وەك لەم دەقەدا دەبینرێ:

**(روى أبو بكر بن أبي داود في المصاحف ص ٢٣، من طريق شعبة بن الحجاج عن علقمة بن مرثد عن من سمع سويد بن غَفَلة يقول: سمعت علياً رضي الله عنه يقول: رحم الله عثمان لو وُلِّيتُ لفعلتُ ما فعل في المصاحف) (١).**

بەپێی ئەو زنجیرەیەی هاتوە سوەیدی کوڕی غەفەلە دەڵێ: گوێم لە عەلی بوو خوا لێی ڕازی بێ دەیگوت: خوا بەزەیی بە عوسماندا بێ، ئەگەر منیش ئەو کاتە سەرپەرشتیی مسوڵمانانم بکردایە، ئەو چی کرد، منیش هەروام دەکرد لەبارەی موصحەفەکانەوە.

(١)- ونحوه روى أبو عبيد في الفضائل ص ٢٨٤ و ٢٨٥ من طريق شعبة، قلت وإسناده منقطع لا علة له غير ذلك، وروي عن عمر بن شيبة من تأريخ مدينة ج٣ ص ١٩٤ و ١٩٥ وابن أبي داود ص ٢٢ و٢٣ موصولاً ضمن حديث فيه طول بسند ضعيف فيه محمد بن أبان بن صالح قريشي وهو ضعيف الحديث.

ئەوە بە نسبەت هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، بەنسبەت ئەهلی ئیسلامەوەش، واتە: جیلەکانی دیکە هەموویان، بێگومان ئەوەی کە عوسمان کردوویەتی، بە خەسڵەتێکی بەرزو سیفەتێکی زۆر چاک و دەستکەوتێکی زۆر گەورەیان بۆ عوسمان لەقەڵەم داوەو، بێگومان کە هەر واشە، چونکە ئەو بەڵێنەی کە خوا داویەتی:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ الحجر: ٩.

واتە: ئێمە خۆمان دابەزێنەری زیکرین و، خۆیشمان پارێزەرینی، خۆمان دامان بەزاندوە، خۆشمان پارێزەرینی.

بێگومان ویستی خوای پەروەردگار، لەمیانی کردەوەی مرۆڤەکاندا جێ بەجێ دەبێ، کەواتە: ئەوەی عوسمان کردوویەتی خوا لێی ڕازی بێ، هەر ئەوەیە کە خوا (سُبحانه وتعالى) گفت و بەڵێنی داوە.



## شیکردنەوەیەك لەبارەی هەڵوێستەكەی عبدالله ی كوڕی مەسعوودەوە، خوا لێی ڕازی بێ:

بێگومان عبدالله ی كوڕی مەسعوود پێگەیەكی دیاری هەیە، هەم لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هەم لە نێو هاوەڵاندا، بەتایبەت لەبارەی قورئانەوە و شارەزایی لە قورئاندا، بەڵام عبدالله ی كوڕی مەسعود، سێ گلەیی لە عوسمان، هەبوون:

**گلەیی یەكەم:** ئەوە بووە كە عوسمان زەیدی كوڕی سابیتی كردوە بە سەرپەرشتیاری ئەو لیژنە چوار قۆڵییەی ، دایناوە بۆ ئەوەی قورئان لە دوو تووێی دوو بەرگدا كۆ بكەنەوە.

لەو بارەوە چەند شتێک لە عبدالله خوا لێی ڕازی بێ گێردراونەوە، بۆ وێنە:

(على قراءة مَنْ تأمروني أقرأ! لقد قرأتُ على رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بضعاً وسبعين سورة، وإن زيداً لصاحب ذؤابتين يلعب مع الصبيان. وفي رواية أبي وائل شقيق بن سلمة الأسدي، قال: لما أمر عثمان رضي الله عنه في المصاحف بما أمر به، قام عبدالله بن مسعود خطيباً قال: أتأمروني أن أقرأ على قراءة زيد بن ثابت، فوالذي نفسي بيده لقد أخذت من في رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بضعاً وسبعين سورة، وزيد بن ثابت عند ذلك يلعب مع الغلمان، ثم استحيا مما قال، فقال: وما أنا بخيرهم ثم نزل، قال شقيق: فقعدتُ في الحلق التي فيها أصحاب رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وغيرهم، فما سمعت أحداً ردَّ ما قال)[1].

(١)- أخرج الرواية الأولى منه النسائي برقم: ٥٠٦٣ من طريق هبيرة بن يريم عن ابن مسعود قلت: وإسناده صحيح، وأخرج الرواية الثانية الطحاوي في شرح المشكل برقم: ٥٥٩٥، من طريق عبدالواحد

عبداللـه ی کـوڕی مەسعوود - (خـوا لێـی ڕازی بـێ) - گوتوویـەتی: دەتانـەوێ بـە پێـی خوێندنـەوەی کـێ بخوێنمـەوە؟ مـن حەفتـاو ئەوەنـدە سـوورەتەم بەسـەر پێغەمبـەری خـوادا خوێندوونـەوە، کـە لـەو کاتـەدا زەیـدی کـوڕی سـابیت خـاوەنی دوو کەزیـان بـوو، لەگـەڵ منـداڵان دا یاریـی دەکـرد، (منـداڵ قژیـان درێـژ کـردوە، یانـی: گچکـە بـووە).

ڕیوایەتێکـی دیکـە لـە ئەبـی وائیلـی شـەقیق بنـو سـەلەمە ئەلئەسـەدیی هاتـوە دەڵـێ: کاتێـک عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)ت لەبـارەی موسحەفانەوە ئـەو فەرمانـەی کـرد کـە کـردی، عبداللـە ی کـوڕی مەسعوود لەمزگـەوت وتـاری دا، گـوتی: دەتانـەوێ بـە پێـی خوێندنـەوەی زەیـدی کـوڕی سـابیت بخوێنمـەوە، سـوێند بـەوەی گیـانی منـی بەدەستە، مـن لـە زاری پێغەمبـەری خـواوە (علیـه الصـلاة والسـلام) حەفتـاو ئەوەنـدە سـوورەتەم وەرگرتـوون.

لـەو کاتـەدا زەیـدی کـوڕی سـابیت لەگـەڵ منـداڵان گەمـەو یاریـی دەکـرد، دوایـی شـەرمی کـرد لـەوەی گـوتی و گـوتی: منیـش لـەوان چاکـتر نیـم، دوایـی دابـەزی لـەو دوانگەیـەی، کـە وتـاری لەسـەر دا.

شـەقیق دەڵـێ: منیـش لـە هەمـوو ئـەو بازنانـەدا دانیشـتم، کـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوای (صـلی اللـه علیـه وسـلم) تێـدا بـوون و غەیـری ئەوانیـش، گوێـم لـە هیچکـەس نەبـوو بەرپەرچـی بداتـەوە.

لێـرەدا بێگومـان عبداللـە ی کـوڕی مەسعوود کـە ئەویـش مرۆڤـە، خـۆی بـە شایسـتەتر زانیـوە ببێتـە بەرپـرسی ئـەو لیژنـە چـوار قۆڵییـە، بـەڵام عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بێگومـان هـەر ڕای خۆیـشی نەبـووە، ڕاوێـژی کـردوە، بـە هـاوەڵان، پاشـان تەماشـاشی کـردوە لـە

بن زياد: حدثنا سليمان أعمش عن شقيق به، قلت: إسناده صحيح، وأصله في الصحيحين، رواه البخاري برقم: (٤٧١٤)،ومسلم برقم: (٢٤٦٢) من طريقين آخرين عن الأعمش ونحوه.

ڕۆژگاری خۆیـدا ئەبوبەکریـش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، داوای لـە زەیـدی کـوڕی سـابیت کـردوە کـە قورئـان لـە پەڕەکانـدا کۆبکاتـەوە، کـە دوایـی لـەلای ئـەو بـوون و، دوایـی لـەلای عومـەر بـوون و، دوایـی لـەلای خاتـو حەفصـەی کچـی عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ بـوون.

ئنجـا عبداللـە ی کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێت کە گوتوویەتی: بـە خوێندنـەوەی کـێ بخوێنـم! هەڵبەتە خوێندنەوەکـە، هی زەید نەبـووە، زەید کۆیکردۆتـەوە، کارەکـەی تەنیـا ئەوەبـووە سەرپەرشتیی ئـەو لیژنەیـەی کـردوەو بـە تەنیـاش نەبـووە، بەڵکـو لیژنەیەکـی چـوار قۆڵیـی بـوون، بەڵام بەهەرحـاڵ ئـەو قسـەکەی وا کـردوە، خـوا لـە هەموویـان ڕازی بێ.

زانایـان دەڵێـن: دوو هـۆکار بـوون بـۆ ئـەوە کـە عبداللـە ی کـوڕی مەسـعوود پێـی ناخۆشـبێ، کـە ئـەو نەکراوەتـە بەرپرسـی ئـەو لیژنەیـە:

**یەکـەم:** ئـەوە بـووە کـە خـۆی زانیویـەتی چەنـد شـارەزایە لـە قورئان، کـە پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) شـایەدیی بـۆ داوە، بـا لـەو بـارەوە ئـەم دەقـە بێنیـن:

**(عـن علقمـة بـن قيـس النخعـي قـال: جـاء رجـل إلى عمـر رضي اللـه عنـه وهـو بعرفـات، فقـال: جئتـك مـن الكوفـة وتركـت بهـا رجـلاً يُمْـلي المصاحـف عـن ظهـر قلبـه، قـال فَغَضِـبَ عمـر وانتفـخ حتـى كاد يمـلأ مابـين شـعبتي الرَّحْـل، وقـال: ويحـك مـن هـو؟ قـال عبداللـه بـن مسـعود، قـال فواللـه مـازال يَطْفأ ويذهـب عنـه الغضـب، حتـى عـاد إلى حالـه التـي كان عليهـا، ثـم قـال: واللـه مـا أعلـم مـن النـاس هـو أحـق بذلك منـه، وسـأخبركم عـن ذلـك، كان رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم)، يسـمر عنـد أبي بكـر الليلـة في الأمـر مـن أمـور المسـلمين، و أنـه سـمر عنـده ذات ليلـة وأنـا معـه، فلـما دخـل المسـجد، إذا رجـل قائـم يصـلّي فقـام رسـول اللـه (صـلى**

الله عليه وسلم) **يستمع قراءته، فما كدْنا نعرف الرجل ،قال رسول الله** (صلى الله عليه وسلم)**: مَنْ سرَّه أن يقرأ القرآن رَطْباً كما أنزل، فليقرأه على قراءة ابن أم عبد)**[1].

عەلقەمەی کوڕی قەیسی نەخەعیی دەڵێ: پیاوک هاتە لای عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) کە لە عەرەفات بوو، (لە حەج بوو) گوتی: لە کووفەوە هاتووم، پیاوێکم بینی لە کووفە موصحەفی لەبەر دەخوێندەوە بۆ خەڵک، عومەر خوا لێی ڕازی بێ تووڕە بوو، ئاوسا تاکو خەریک بوو سەر وڵاخەکە پڕبکات، (واتە: زۆر پەست بوو،) دوایی گوتی: بێ قەزابی ئەو کابرایە کێیە کە قورئان ئاوا لەبەر دەخوێنێتەوە؟ گوتی: عبداللە ی کوڕی مەسعوودە، دەڵێ: بە خوا تورەییەکەی نەما، تووڕەییەکەی نەما، تاکو هاتەوە حاڵەتی ئاسایی پێشێی، دوایی گوتی: بەخوا هیچ کەس ناناسم، لە خەڵکی بەوە کە قورئان لەبەر بخوێنێتەوە، شایستەتر بێ لە عبداللە ی کوڕی مەسعوود، لەو بارەوە هەواڵتان پێ دەدەم، ئنجا شتێکی گێڕایەوە گوتی: پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) جاری وابوو شەو لەلای ئەبوبەکر دەمایەوە، ڕاوێژیان دەکرد لەبارەی کاروباری مسوڵمانان، شەوێک لەلای مایەوە، منیش لەگەڵی دا بووم، کاتێک چووە مزگەوت پیاوێکی بەپێوە بینی، نوێژی دەکرد، پێغەمبەری خوا عليه الصلاة والسلام گوێی بۆ قورئانخوێندنەکەی گرت، ئێمە خەریک بوو نەزانین کێیە! هەتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

---

(١) - أحمد برقم: (١٧٥)، والنسائي في الكبرى برقم: (٨٢٥٧)، وابن خزيمة في صحيحه برقم: (١١٥٦)، ويعقوب بن سفيان في المعرفة ج٢، ص٥٣٠ و ٥٣٩، والطحاوي في المشكل برقم: (٥٥٩٢ – ٥٥٩٣)،والطبراني في الكبير برقم: (٢١٩٣)، وأبونعيم في الحلية برقم: (٣٣٧٦)، والبيهقي في الكبرى، وإسناده صحيح.

فەرمووی: هەرکەسێک حەزدەکا قورئان بخوێنێ بە تەڕو تازەیی وەک چۆن دابەزیوە، با بەپێی خوێندنەوەی (ابن أم عبد) (ئەوەش نازناوێکی عبدالله ی کوڕی مەسعوود بووە) بیخوێنێ.

**دووەم:** خاڵێکی دیکە کە عبدالله ی کوڕی مەسعوود لە خۆیدا بینیوە، ئەوەیە کە پێداچوونەوەی قورئانی کۆتایی، عبدالله ی کوڕی مەسعوود ئامادەی بووە، لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

**(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: أي القراءتين تعدُّون أوَّل؟ قالوا: قراءة عبدالله، قال: لا بل هي الآخرة، وفي رواية: قراءتنا القراءة الأولى، وقراءة عبدالله القراءة الأخيرة، كان يعرض القرآن على رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في كلِّ عام مرة، فلما كان العام الذي قبض فيه، عُرِضَ عليه مرتين فشهده عبدالله، فعلم ما نسخ منه وما بُدِّل[1].**

عبدالله ی کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازیبێ گوتوویەتی: کام لە دوو خوێندنەوەکان پێتان وایە یەکەمە؟ گوتیان: خوێندنەوەی عبدالله ، گوتی: نا، بەڵکو هی ئەو خوێندنەوەی کۆتاییە، لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: خوێندنەوەی ئێمە خوێندنەوەی یەکەمە و خوێندنەوەی عبدالله ی کوڕی مەسعوود خوێندنەوەی کۆتاییە، قورئان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (عليه الصلاة والسلام) هەموو ساڵێ جارێک دەور کراوەتەوە، ئەو ساڵەی کە تێید کۆچی دوایی کرد، دوو جاران دەورکرایەوە (لەلایەن جیبریلەوە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) و عبدالله ی کوڕی مەسعوودیش ئامادەبوو، زانی چی لێ لابراوەو چی لێ گۆڕدراوە.

---

(١)- حديث صحيح رواه أحمد برقم ٣٤٢٢، وابن أبي شيبة ٣٠٢٧٩، وابن سعد في الطبقات ج٢ ص ٣٤٢، والبخاري في خلق أفعال العباد برقم ٣٨٢، والنسائي في الكبرى برقم ٧١٩٤ و ٨٢٥٨، وأبو يعلى برقم ٢٥٦٢، والطحاوي في شرح المعاني ج١ ص ٥٦، وشرح المشكل ٢٨٦ و٥٥٩٠، وابن عساكر في تأريخه ٣٣١٤٠. والرواية الأولى لأبي يعلى، قلت: وإسناده صحيح، وأخرجه أحمد برقم: ٢٤٩٤و٢٩٩٩ والطحاوي في المشكل برقم ٢٨٧. قلت: وهذه متابعة صالحة.

هەڵبەتە ئەوە بۆچونی عبداللە ی کوڕی عەبباسە خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ.

ئەمە گلەیی یەکەمی عبداللە ی کوڕی مەسعوود لە عوسمان، کە نەیکردوە بە بەرپرسی ئەو لیژنەیە، هەڵبەتە دوایی باس دەکەین، بۆچی زەیدی کوڕی سابیت کراوە بە بەرپرسی ئەو لیژنەیە.

**گلەیی دووەم:** ڕەخنەی دووەمی عبداللە ی کوڕی مەسعوود لە عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەوە بووە کە پێی ناخۆش بووە (المعوذتین) سوورەتی (الفلق) و سوورەتی (الناس) بە دوو سوورەتی قورئان دابنرێن.

**(عن عبدالرحمن بن يزيد قال: رأيت عبدالله يحكُّ المعوِّذتين ويقول: لِمَ تزيدون ما ليس فيه؟ وفي رواية: قال: لا تخلط فيه ماليس منه. وفي رواية عنه: أنه كان يحكُّ المعوِّذتين من المصحف يقول: ليستا من كتاب الله)**[1].

(عبدالرحمن)ی کوڕی یەزید دەڵێ: عبداللە ی کوڕی مەسعوودم دەبینی (معوِّذتین)ی دەکڕاندن لە موصحەف و دەیسڕینەوە، دەیگوت: بۆچی شتێک لە قورئان زیاد دەکەن کە بەشێک نیە لێی؟ لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە، دەیگوت: شتێک لەگەڵ قورئان تێکەڵ مەکەن، کە بەشێک نیە لێی، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە: (معوِّذتین) ی لە موصحەف کڕاندوون و گوتوویەتی: ئەم دوانە لە کتێبی خوا نین.

(١)- أثر صحيح برواياته الثلاث، أخرجه الطبراني في الكبير ج٩ ص٢٦٨، بالرِّواية الأولى، وابن أبي شيبة رقم ٣٠١٩٦، والطبراني كذلك بالرِّواية الثانية، وعبدالله بن أحمد في زوائد المسند ص١٢٩ و ١٣٠، والطبراني بالرَّواية الثالثة، قلت: أسانيدهم صحاح. وأخرجه عمر بن أبي شيبة في تأريخ المدينة ج٣ ص١٠١٠ و ١٠١١ من طريق عبدالرحمن بن يزيد، قال: رأيت ابن مسعود رضي الله عنه يحك المعوذتين من المصحف يقول: لا يحل قراءة ما ليس منه، قلت: وإسناده صحيح.

هەڵبەتــە عبداللــە ی کــوڕی مەســعوود نکووڵیــی لــەوە نەکــردوە کــە (معوِّذتــین) لەلایــەن خــوای پــەروەردگارەوە بــۆ پێغەمبــەر دابەزیــون، بــەڵام وەک لــە ڕیوایــەتی دیکــەدا هاتــوە، پێــی وابــووە: ئەوانــە دوو دوعــا بــوون بــۆ بەتاڵکردنــەوەی ئــەو جــادووەی لێیکــراوە، یــان دوو دوعــا بــوون بــۆ پێغەمبــەر (صــلى اللــه عليــه وســلم)، بــەڵام دوو ســوورەت نیــن، ئــەو ڕەخنەیــەشی هەبــووە، بــەڵام بێگومــان عبداللــە ی کــوڕی مەســعوود (خــوا لێــی ڕازی بــێ) لــەوەدا نەیپێــکاوە، چونکــە دوایــی ئێمــە لــەو بــارەوە بــاس دەکەیــن، کــە یەکدەنگیــی هــاوەڵان لەســەر ئەوەیــە کــە ئــەو دوو ســوورەتە موبارەکــە: ســوورەتی (فەلــەق) و ســوورەتی (نــاس)، دوو ســوورەتن لــە ئەو (١١٤) ســوورەتەی خــوا بــۆ پێغەمبــەری کۆتایــی (عليــه الصــلاة والســلام) دایبەزانــدوون.

**گلەیــی ســێیەم:** ڕەخنــەی ســێیەمی عبداللــە ی کــوڕی مەســعوود لــە عوســمان خــوا لێیــان ڕازی بــێ، ئــەوە بــووە کــە نکووڵیــی کــردوە لــەوە کــە عوســمان فەرمــانی کــردوە، هەمــوو کۆکردنــەوەکانی دیکــەی قورئــان، غەیــری ئــەوەی بــە سەرپەرشــتیی ئــەو لیژنــە چــوار قۆڵییــەی کــە دایناوە، کــە زەیــدی کــوڕی ســابیت بەرپرســی لیژنەکــە بــووە، هەمــوو ئــەوانی دیکــە بســووتێندرێن.

لــەو بــارەوە چەنــد شــتێک گێڕدراونــەوە بــە ســەنەدێکی ڕاســت، دوانیــان بەنموونــە دێنیــن:

یەکــەم: (**عــن خُبَــير بــن مالــك الهمــداني قــال: أمــر بالمصاحــف أن تُغَــيَّر، قــال: قــال ابــن مســعود: مــن اســتطاع منكــم أن يَغُــلَّ صُحُفَــه فَلْيَغُلَّــهُ، فإنــه مــن غــلَّ شــيئاً جــاء بــه يــوم القيامــة، قــال: ثــم قــال: قــرأت مــن فــم رســول اللــه** (صــلى اللــه عليــه وســلم) **ســبعين ســورة، أفأتــرك مــا أخــذت**

**مـن في رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم)؟)**[١].

خوبەیـر کـوڕی مالیکـی هەمـدانی دەڵـێ: کاتێـک فەرمـان کـرا موصحەفـەکان، بگۆڕدرێـن، (واتـە: ئەوانـەی قورئانیـان بـۆ خۆیـان نووسـیبووەوە، بگۆڕدرێـن و هەموویـان لەسـەر ئـەو موصحەفـە کۆبنـەوە کـە لیژنـەی چـوار قۆڵیـی دایناوە،) عبداللـه ی کـوڕی مەسـعوود گـوتی: هەرکامێکتـان دەتوانـێ موسـحەفەکەی خـۆی لەمـلی خـۆی قایمـکات، با وا بکات، چونکە هەرکەسـێک شـتێکی لەملدابـێ، ڕۆژی قیامەت لەگەڵ خۆی دا دەیهێنـێ، دوایـی گـوتی: مـن حەفتـا سـوورەتم لـەزاری پێغەمبـەر (صلی اللـه علیـه وسـلم) خوێندوونـەوە، ئایا ئـەوەی لە دەمـی پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسـلم) وەرمگرتـوە، وازی لـێ بێنـم؟!

کە بە بۆچوونی من ئەوەش زێدە ڕۆییەک بووە لە لایەن عبدالله ی کوڕی مەسعوودەوە، چونکە کەس نەیگوتوە: ئەو حەفتا سوورەتە واز لێبێنە، بەڵکو گوتراوە: ئەو حەفتا سوورەتەو جگە لەوەش، هەر سەدو چواردە سوورەتەکە، کە بەسەرپەرشتیی لیژنەیەکی چوار قۆڵیی و زۆەبەی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ کۆکراوەتەوە، بۆ ئەوەی هەموویان لەسەری یەک دەنگبن، چونکە هەندێک لە هاوەڵان بوون کە چەند وشەیەکی زیادیان لە بارەی ئایەتێکەوە نووسیون، وەک تەفسیرو لێکدانەوەی خۆیان، یان شتێکیان کە لە پێغەمبەر بیستوە لەبارەی ئایەتێکەوە، ئەویشیان نووسیوە، کە ئەوەش دەکاتە جیاوازیی لە خوێندنەوەکاندا، ڕەنگە هەندێکیان تەفسیرو لێکدانەوەی وشەیەک، یان ئەوەی کە لە پێغەمبەریان بیستوە، دوایی لەگەڵ ئایەتەکان لێیان تێکەڵ بووبێ، بەڵام ئەو لیژنە چوار قۆڵییە هەر سوورەتێک هەموویان هێناوە و، زیادەکانیان لابردوون.

---

(١)- حديث صالح الإسناد، أخرجه أحمد برقم: ٣١٢٩ و عمر بن شيبة في تأريخ المدينة ج٣ ص ١٠٠٦، والطبراني في الكبير ج٩ ص٧٠ ، وابن أبي داود ص١٥، وابن عساكر ٣٣ و ١٣٩.

**دووەم:** هەر لەبارەی هەڵوێستی عبدالله ی کوڕی مەسعوودەوە، کە نکووڵیی کردوە لەوە کە عوسمان موسحەفەکانی سووتاندوون، با ئەم دەقەش بێنین:

**(عن أبي ميسرة عمرو بن شرحبيل قال: أتى علي رجلٌ وأنا أُصلِّي فقال: ثكلتك أمك، ألا أراك تصلِّي وقد أمر بكتاب الله أن يُمَزَّق كلَّ ممزَّق، قال: فتجوَّزت في صلاتي، وكنت أُحْبَسُ، فدخلتُ الدار ولم أُحْبَسْ، فرقيتُ ولم أُحْبَسْ، فإذا أنا بالأشعري، وحذيفة وابن مسعود يتقاولان، وحذيفة يقول لابن مسعودٍ: إدفع إليهم هذا المصحف، قال: والله لا أدفعه إليهم، أقرأني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بضعاً وسبعين سورة ثم أَدفَعُهُ إليهم؟ والله لا أدفعه إليهم)**[1].

واتە: ئەبو مەیسەرە عەمری کوڕی شورەحبیل دەڵێ: پیاوێک بەسەرمدا هات کە من نوێژم دەکرد، گوتی: دایکت سنگت بۆ بکوتێ، دەبینم نوێژێ دەکەی، کەچی فەرمانکراوە کتێبی خوا بدڕێندرێ، بە هەموو شێوەیەک بدڕێندرێ! دەڵێ: نوێژەکەم کورت کردەوەو من لەوانە بووم کە ڕابگیرێم، (واتە: یەکسەر مۆڵەت نەدرێم بچمە ژوور) بەڵام چوومە ماڵەکەو ڕانەگیرام، دوایی سەرکەوتم، (دیارە باڵەخانە بووە،) دیسان ڕانەگیرام، لەوێ ئەشعەرییم بینی (ناوی پیاوێکە)، هەروەها حوزەیفەی کوڕی یەمان و ئیبنو مەسعوودم بینن پێکەوە قسەیان دەکرد، حوزەیفە بە عبدالله ی کوڕی مەسعوودی دەگوت: ئەو موصحەفەیان بدەیە! ئەویش دەیگوت: بەخوا وێیان نادەم، پێغەمبەری خوا (علیە الصلاة والسلام)حەفتاو ئەوەندە سوورەتەی بۆ خوێندوومەوە، ئنجا وێیان بدەم؟ بەخوا وێیان نادەم.

---

(١)- حديث صحيح أخرجه أبو عبيد في فضائل القرآن ص ٢٨٥، والطبراني ج٩ ص ٧١، والحاكم برقم: ٢١٩٦، قال الحاكم: صحيح الإسناد، قلت: وهو كما قال.

دیـاره‌ عبداللـه‌ ی کـوڕی مەسـعوود ئـەو قورئانـەی کـه‌ لەدەمـی پێغەمبـەر وەری گرتـوه‌، حەفتـاو ئەوەنـده‌ سـوورەته‌ بـووه‌ لـه‌ موصحەفێکدا نووسـیبویەتی، گوتوویـەتی: وێیـان نـادەم بسـووتێنرێ، کـه‌ هەڵبەتـه‌ ئـەو سـوورەتانەی لەوێشـدا بـوون، هـەر ئەوانـه‌ بـوون کـه‌ لیژنـه‌ چـوار قۆڵییه‌کـه‌ کۆیـان کردوونـەوە.



## هۆكاری دانانی (زید بن ثابت) به بەرپرسی لیژنه كه:

ئێستا با باسی ئەوە بکەین هۆکاری هەڵبژاردنی زەیدی کوڕی سابیت بۆ بەرپرسی ئەو لیژنە چوار قۆڵییە، چی بووە؟!

دەتوانین چەند هۆکارێک باس بکەین:

**یەکەم:** زەیدی کوڕی سابیت، کاتی خۆیشی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە ئەمینداری زانیوە بۆ نووسینەوەی وەحیی و لەسەردەمی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) کە لەژیاندا بووە، قورئانی کۆکردوەتەوە و، نووسیویەتەوە، بەهەمان شێوە لە ڕۆژگاری ئەبوبەکریشداو لە ڕۆژگاری عومەریشدا - خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ - کە یەکەم جار قورئان لە لاپەڕەکاندا کۆکرایەوە، دیسان زەیدی کوڕی سابیتیان هەڵبژارد و عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیش ڕەخنەی لێیان نەگرت، دیارە (زید) بەتواناتر بووە لەو بارەوە، ئەوەش زیان بە زەیدی کوڕی سابیت ناگەیەنێ، کە عبداللە ی کوڕی مەسعوود لەو بەتەمەنتر بووەو، لەپێشیەوە مسوڵمان بووبێ و، ژمارەیەکی زیاتری سوورەتی قورئانی لە زاری موبارەکی پێغەمبەر وەرگرتبن و بەدەستی خۆی نووسیبنیەوە، ئەوە فەزیلەتێک بووە بۆ عبداللە ی کوڕی مەسعوودو کەس نکووڵیی لێ نەکردوە.

**دووەم:** هیچ کام لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، نە عوسمان و نەغەیری عوسمانیش نەیانویستوە، لە پێگەو پلەی عبداللە ی کوڕی مەسعوود لە ئیسلامەتیی دا دابشکێنن، بەڵکو چاکیی و پێگەی بەرزی عبداللە ی کوڕی مەسعوود لەلای

هەمـوو لایـەک سـەلمێندراو بـووە، بـەڵام بـۆ ئەرکـی کۆکردنـەوەی قورئـان کەسـێکی دیکەیـان بـە شایسـتەتر زانیـوە.

**سێیەم:** بێگومـان کـە عبداللـە ی کـوڕی مەسـعوود ئـاگاداری پێـدا چوونـەوەی کۆتایـی قورئـان بـووە، ئـەوە فەزیلەتێکـە بـۆی، بـەڵام بـە تەنیـا ئـەوە نایکاتـە شایسـتەی ئـەوە، کـە بـەو کارە هەڵسـێ و، پێشـێ ئـەو ئەبوبەکـرو عومـەر زەیدیـان ڕاسـپاردوەو، دوایـی عوسـمانیش خـوا لێـی ڕازی بـێ هـەر زەیـدی ڕاسـپاردوە بـۆ ئـەو کارە.

**چوارەم:** زەیـد لـە کۆکردنـەوەی قورئانـدا لەسـەردەمی عوسـماندا خـوا لێـی ڕازی بـێ، پشـتی بـەو پەڕانـە بەسـتوە کـە لـەڕۆژگاری ئەبوبەکـردا (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـە پێشـنیاری عومـەر کۆکراونـەوەو پشـتی بـە لەبەرکـردنی خـۆی نەبەسـتوەو، پشـتی بـە لەبەرکـردنی غەیـری خۆیـشی نەبەسـتوە، بەڵکـو بـە شـێوەی سـەرەکیی و بنەڕەتیـی پشـتی بـەوە بەسـتوە کـە لـە ڕۆژگاری ئەبوبەکـردا خـوا لێـی ڕازی بـێ، کۆکراوەتـەوە.

**پێنجـەم:** بـۆ ئـەوەش کە عبداللـە ی کوڕی مەسـعوود نکوولـیی کردوە لـەوەی ئـەو دوو سـووڕەتە: فەلـەق و نـاس (الفلـق والنـاس)، بەشـێکبن لـە قورئـان و گوتوویـەتی: دوعـا بـوون، خـوا بـۆ پێغەمبـەری خـوای (علیـه الصـلاة والسـلام) سروشـکردوون، وەک پێشـتر باسـمانکرد، لـەو بـارەوە ئـەم دەقـەش هـەر دێنیـن:

(عـن علقمـة النخعـي عـن ابـن مسـعود أنـه كان يحـكُّ المعوِّذتـين مـن المصحـف ويقـول: إنمـا أُمِـرَ النبـيُّ (صـلى اللـه عليـه وسـلم) أن يتعـوَّذ بهـما، وكان عبداللـه لايقـرأ بهـما)[1].

عەلقەمـەی نەخەعیـی لـە عەبدوڵـلای کـوڕی مەسـعوود دەگێڕێتـەوە

(١)- حديث حسن أخرجه البزار في مسنده برقم: ١٥٨٦، والطبراني في الكبير ج٩ ص ٢٥٩، قلت: وإسناده حسن، والقائل: عبدالله بن يوسف الجديع.

کە دوو (مُعَوِّذَة)کەی لە موصحەف دەکڕاندن، دەیگوت: ئەوە تەنیا پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) فەرمانی پێکراوە پەنایان پێ بە خوا بگرێ، عبداللە ی کوڕی مەسعوود وەک قورئان نەیدەخوێندن، هەڵبەتە ئەوە بۆچوونی ئەو بووە!

بێگومان عبداللە ی کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، نەیزانیوە، کە ئەو دوو سوورەتەش بەشێکن لە قورئان، بەڵام هاوەڵانی دیکە (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەموویان زانیویانە، کە ئەو دوو سوورەتەش بەشێکن لە قورئان، ئنجا ئەوەی دەزانێ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نازانێ.

لەو بارەشەوە ،کە ئەم دوو سوورەتە، دوو سوورەتی قورئانن، نەک تەنیا دوو پاڕانەوەبووبن و، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) پەنایان پێ بەخوا بگرێ و پێیان بپارێتەوە، دەتوانین چەند بەڵگەیەک بێنینەوە.

هەڵبەتە ئەوە چەسپاوە لە پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) کە ئەم دوو سوورەتە قورئانن و، لەنوێژدا خوێندوونی، لەو بارەوەش ئێمە سێ بەڵگان دێنین:

**بەڵگەی یەکەم: سێ ڕیوایەتی ئەم دەقە دێنین:**

**١- (عن عقبة بن عامر الجهني رضي الله عنه قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): أُنزل عليَّ آياتٌ لم يُرَ مثلهن، قل أعوذ برب الفلق إلى آخر السورة، وقل أعوذ برب الناس إلى آخر السورة)[1].**

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی دەڵێ: پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) فەرمووی: چەند ئایەتێکم دابەزیونە سەر، وێنەیان نەبینراوە،[ قل أعوذ برب الفلق ]تا کۆتایی سوورەتەکە، و [ قل أعوذ برب الناس ] تا کۆتایی سوورەتەکە.

(١)- حديث صحيح أخرجه أحمد ج٤ ص ١٤٤ و ١٥٠ و ١٥١ و ١٥٢ ومسلم برقم ٨١٤ والترمذي برقم ٢٩٠٤ و ٣٣٦٤ والنسائي برقم ٩٥٤ و ٥٤٤٠ والدارمي برقم ٣٣١٦ وقال الترمذي: حديث حسن صحيح.

**٢- (عن عقبة بن عامر الجهني قال: إتبعتُ رسولَ الله (صلى الله عليه وسلم) وهو راكب وضعت يدي على قدمه، قلت أَقْرِئني يارسول الله (صلى الله عليه وسلم) سورة هود وسورة يوسف، فقال: لن تقرأ شيئاً أبلغ عند الله من: قل أعوذ برب الفلق وقل أعوذ برب الناس[١].**

عوقبەی کوڕی عامری جوهەنیی دەڵێ: شوێن پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) کەوتم، کە سواربوو، (سواری وڵاخێک بوو بوو)، منیش دەستم لەسەر پێی دانا، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! سووڕەتی هوودو سووڕەتی یوسفم بەسەردا بخوێنە، ئەویش فەرمووی: هیچ شتێک ناخوێنی لە لای خوا، کاریگەرتربێ لە: [قل أعوذ برب الفلق و، قل أعوذ برب الناس].

**٣- (عن عقبة بن عامر الجهني قال: كنت أقود برسول الله (صلى الله عليه وسلم) ناقته فقال لي: يا عقبة! ألا أُعلِّمك خير سورتين قُرِءتا؟ فعلَّمني قل أعوذ برب الفلق و قل أعوذ برب الناس، قال: فلم يرني سُرِرْتُ جداً، فلما نزل لصلاة الصبح، صلَّى بهما صلاة الصبح للناس، فلما فرغ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) من صلاته، التفت إِليَّ فقال: يا عقبة! كيف رأيت![٢].**

عوقبەی کوڕی عامری جوهەنیی دەڵێ: لە سەفەرێکدا حوشترەکەی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) لێ دەخوڕی، پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام - فەرمووی: ئەی عوقبە! باشترین دوو سووڕەتانت فێربکەم

(١)- حديث صحيح أخرجه أحمد ج٤ ص ١٤٩ و ١٥٩. والنسائي برقم ٩٥٣ و٥٤٣٩. و أخرجه أحمد ج٤ ص١٥٥. والدارمي برقم ٣٣١٤. قلت: وهذان إسنادان صحيحان.

(٢)- حديث صحيح أخرجه أحمد ج٤ ١٤٩ و ١٥٠ و ١٥٣. وأبو داود برقم ١٤٦٢ والنسائي ٥٤٣٦. وأخرجه أحمد ج٤ ص ١٤٤ و النسائي ٥٤٣٧ . والطحاوي في المشكل برقم ١٢٥. قلت وهذه أسانيد صحيحة إلى أبي القاسم.

کە خوێندراونەوە، ئنجا سوورەتی [ قل أعوذ برب الفلق و، قل أعوذ برب الناس ] ی فێرکردم، عوقبە دەڵێ: کاتێک بینی زۆر پێیان دڵخۆش نەبووم، کاتێک دابەزی بۆ نوێژی بەیانیی، ئەو دوو سوورەتەی خوێندن لە نوێژی بەیانییدا بۆ خەڵک، (واتە: لە ڕکاتی یەکەم دا دوای فاتیحە [ قل أعوذ برب الفلق ] ی خوێندوە و، لە ڕکاتی دووەم دا دوای فاتیحە [ قل أعوذ برب الناس ] ی خوێندوە)، کاتێک پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە نوێژەکەی بووەوە، ئاوڕی لێدامەوەو گوتی: ئەی عوقبە! چۆنت بینی. (واتە: ئەو دوو سوورەتەی فێری تۆم کردبوون لە نوێژی بەیانییدا خوێندمن ).

**ئەمە بەڵگەی یەکەم، کە ئەم دوو سوورەتە، بەشێک بوون لە** قورئان لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم).

**بەڵگەی دووەم:** ئەم دەقە دێنین:

**(عن زِرِّ بن حبيش قال: قلت لأبيّ بن كعب: إنّ ابن مسعود كان لايكتب المعوِّذتين في مصحفه، فقال: أشهد أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أخبرني أن جبريل عليه السلام قال: قل أعوذ برب الفلق، فقلتها، فقال: قل أعوذ برب الناس، فقلتها، فنحن مع ما قال النبي (صلى الله عليه وسلم)[(١)].**

زیڕی کوڕی حوبەیش دەڵێ: بە ئوبەی کوڕی کەعب گوت: عبداللە ی کوڕی مەسعوود، دوو موەعەوویذەکەی لە موصحەفەکەی دا نەدەنووسین! ئەویش گوتی: شایەدیی دەدەم کە پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) هەواڵی پێدام کە جیبریل پێی فەرمووە: بڵێ: [قل

(١)- حديث صحيح أخرجه الشافعي في السنن برقم ٩٣ . وأحمد ج٥ ص ١٣٠. والحميدي برقم ٣٧٤. والبخاري برقم ٤٦٩٢. ٤٦٩٣ والطحاوي في المشكل برقم ١١٩. والبيهقي في الكبرى ج٢ ص ٣٩٤. وأخرجه عبدالرزاق برقم ٦٠٤٠. والشافعي كذلك برقم ٩٣. وابن أبي شيبة ٣٠١٩٣. وآخرون غيرهم وقال: عبدالله بن يوسف الجديع: قلت وإسناده صحيح.

أعـوذ بـرب الفلـق ]، فەرموويـەتی: منيـش گوتـم، دوايـی پێـی فەرمـوو: [ قـل أعـوذ بـرب النـاس ] دوايـی منيـش گوتـم، ئنجا ئوبـەی کـوڕی کەعـب دەڵـێ: ئێمـەش هەمـان شـت دەڵێيـن، کـە پێغەمبـەری خـوا عليـە الصـلاة والسـلام فەرموويـەتی.

هەڵبەتـە ئوبـەی کـوڕی کەعـب يەکێکـە لـەو چـوار کەسانەی کـە پێغەمبـەری خـوا (صـلى اللـه عليـە وسـلم) فەرمـانی کـردوە قورئانيـان لـێ وەربگيـرێ، ئەويـش لـە موصحەفەکـەی خۆيـدا ئـەو دوو سـوورەتە موبارەکـەی هێنـاون، بەپێـی ئـەم دەقـە:

(أبوعبيد) في (الفضائل) عن (محمد بن سيرين) قال:

(كتـب أبي في مصحفـه فاتحـة الكتـاب والمعوذتـين، وأللَّهـم إنّـا نسـتعينك وأللَّهـم إيّـاك نعبـد، وتركهـنَّ ابـن مسـعود، وكتـب عثـمان بفاتحـة الكتـاب والمعوذتـين.

قلت: وإسناده صحيح إِلى ابن سيرين)[1].

واتـە: لـە موحەممـەدی کـوڕی سـيرينەوە (أبوعبيـد) هێناويەتـی کـە ئوبـەی کـوڕی کەعـب لـە موسـحەفەکەی خۆيـدا [ فاتحـة الكتـاب ] و [معوذتيـن]ی نوسـيبوون، هەروەهـا ئـەو دوو دوعايـەش [ أللَّهـم إِنّـا نسـتعينک و، أللَّهـم إيّـاک نعبـد ]، بـەڵام ئيبنـو مەسـعوود وازی لـێ هێنابـوون، بـەڵام عوسـمان خـوا لێـی ڕازی بـێ، [ فاتحـة الكتـاب ومعوذتين ]ی وەک قورئـان لـە موسـحەفەکەيدا نووسـين.

**بەڵگـەی سـێيەم:** عبداللـە ی کـوڕی مەسـعوود خـوا لێـی ڕازی بـێ، کۆمەڵێـک هاوەڵـی هەبـوون لەگـەورە گـەورەکانی جيلـی شـوێن کەوتـوان و زانيارييەکەيـان بـڵاو کردۆتـەوە، بـەڵام هيـچ کام لـە هاوەڵـەکانی هەمـان

(١) - وصحح الإسناد: د.عبدالله بن يوسف الجديع في (المقدمات الأساسية)، ص٣١٨.

هەڵوێستی ئیبنو مەسعوودیان نەبووە، بۆیە ئەو هەڵوێستەی ئەو بە هەڵە دادەنرێ و، بە ڕیزپەڕ (شاذ) دادەنرێ و، ڕاست ئەوەیە کە ئەو دوو سوورەتەش وەک هەموو سوورەتەکانی دیکە، دوو سوورەتی قورئانن، بەڵام عبداللە ی کوڕی مەسعوود لەو بارەوە بۆچوون و قەناعەتێکی هەڵەی هەبووە.

ئنجا سووتاندنی عوسمان خوا لێی ڕازی بێ بۆ هەموو ئەوانەی کە قورئانیان لەلای خۆیان کۆکردۆتەوەو، ئەوە کە ئیبنو مەسعوود ئامادە نەبووە موصحەفەکەی خۆییان تەسلیم بکات و، فەرمانیشی کردوە بە خەڵک کە موصحەفەکانی خۆیان بشارنەوە، کە کاتی خۆی بۆ خۆیان نووسیویاننەوە، ئەوەندە قورئانەی لەبەریان بووە نووسیویانەتەوە، بێگومان ئەو، ئەو لیژنە چوار قۆڵییەی بەو شێوەیە داندراوە، تێبینیی لەسەریان هەبووە، بۆیە پێی وابووە موصحەفەکەی خۆی بهێڵێتەوە، ئەگەر نا ئەوە نەبووە بڵێ: قورئانی من قورئانێکی جیایە! بەتەئکید ئەو حەفتاو ئەوەندە سوورەتەی لەلای ئەویش هەبوون، لەو موصحەفەی عوسماندا خوا لێی ڕازی بێ کە بە لیژنە چوار قۆڵییەکەی کۆی کردۆتەوە، لەوەی ئەوانیش دا هەر هەبوون.

واش پێ دەچێ عبداللە ی کوڕی مەسعوود سەرەنجام گەڕابێتەوە بۆ ڕای کۆمەڵی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، چونکە أبو وائل (شقیق بن سلمة) دەگێڕێتەوە لە عبداللە ی کوڕی مەسعوودەوە کە گوتوویەتی: [ إني قد سمعت القُرّاء فوجدتهم متقاربين، فاقْرأوا كما عُلِّمتم وإيّاكم والإختلاف والتنطُّع، فإنَّما هو كقول أحدكم هَلُمَّ وتعال].[1]

(١)- أثر صحيح أخرجه سعيد بن منصور في سنن برقم ٣٤، وأبو عبيد في الفضائل ص ٣٦١ وغريب الحديث ج ٣ ص ١٦٠ وابن أبي شيبة ج٣ ص ١٠٠٧ وابن جرير ج١ ص ٢٢ والبيهقي في السنن ج٢ ص ٣٨٥ والشعب برقم ٢٢٦٨ والخطيب في تأريخه ج٣ ص١٢٦ قلت: وإسناده صحيح.

ئەبو وائیل (شقیق بن سلمة) لە عبدالله ی کوڕی مەسعوودەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: من گوێم لە قورئان خوێنەکان بووە، بینیمن کە لێک نزیکن، کەواتە: چۆن فێرکراون، ئاوا قورئان بخوێنن و، خۆتان لە سەختگیریی بپارێزن، چونکە هەندێک لە جیاوازییەکان هەر وەک قسەی یەکێکتانە کە دەڵێ: (هَلُمَّ) یان (تعال) هەردووکیان بە مانای وەرەن.

**شایانی باسە:** ئەو پەڕانەی کە لەلای دایکمان خاتو حەفصە بوون، کە لەسەردەمی ئەبوبەکردا کۆکرابوونەوە، دوایی چوونە لای خاتو حەفصەو، عوسمان لێی وەرگرتوون و موصحەفیان لەبەر گرتوونەوە، دوایی لەسەردەمی مەڕوانی کوڕی حەکەمدا دەنێرێ بۆ لای عبدالله ی کوڕی عومەڕ خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، کە ئەو پەڕانەی بۆ بنێرێ، عبدالله ش بۆی دەنێرێ، مەڕوانیش فەرمان دەکات پەڕەکان بدڕێنرێن، دوایی مەڕوان دەڵێ: بۆیە وامکرد، نەوەک دوایی خەڵکێک بکەوێتە دوو دڵیی و گومانەوە و، پێیان وابێ کە جیا لەوەی لە موصحەفدا هەیە، لەو پەڕانەدا هەیە! (١)

دیارە مەڕوانی کوڕی حەکەم کە وایکردوە، ئیجتیهادێکی کردوە تاکو دوایی کەس گومانێک و دوو دڵییەکی بۆ دروست نەبێ، لەبارەی ئەو موصحەفەوە، کە ڕەنگە شتێک کە لەو پەڕانەدا بووبێ، لەو موصحەفەدا نەبێ، کە لە حەقیقەتیشدا ئەو موصحەفەش لەو پەڕانەدا بووەو، لەو پەڕانەوە گیراوەتەوە لەلایەن

(١)- ئەمەش شوێنەوارێکە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاستە. أخرجه ابن أبي داود في المصاحف ص٢٤ و ٢٥، وإسناده صحيح، وأبو عبيد في فضائل القرآن ص١٥٦ و روى نحو ذلك عمر بن أبي شيبة في تأريخ المدينة ج٣ ص٣٠٠٤ بأسانيد صحيحة.

ئـەو لیژنـە چـوار قۆڵییـەوە.

ئێمـە لێـرەدا دێینـە کۆتایـی ئەم تـەوەری نۆیەمـە: هەڵوێسـتی هاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، لەبـارەی کۆکردنـەوەی عوسـمان خوالێـی ڕازی بـێ بـۆ قورئـان، لـە ڕۆژگاری خۆیـدا، لـە نێـوان دوو توێـی موصحەفێکـدا.



# تەوەری دەیەم

# ڕێکخستنی قورئان

## (ترتیب القرآن)



بەڕێزان!

ئەم قورئانەی ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدایە، ئایاتەکانی هەر سوورەتێک کە بەو شێوەیەن و، سوورەتەکانی کە بەو شێوەیەی دەیبینین ڕێزکراون، ئایا ئەوە چۆن بووە؟

لە هەشت بڕگەدا ئەم بابەتە دەخەینە ڕوو و، وەڵامی ئەوپرسیارە دەدەینەوە:

## بڕگەی یەکەم: ڕیزبەندیی ئایەتەکان:

گومانی تێدا نیە کە ڕیزبەندیی ئایەتەکان لە هەر کام لە سوورەتەکاندا، شتێکی تەوقیفییە، واتە: خوا - سبحانه وتعالى - فەرمانی بە پێغەمبەری خاتەم کردوە: فڵان ئایەتە لە فڵان شوێن دابنێ و، با ئەو کۆمەڵە ئایەتە بەیەکەوەبن و، ئەو ئایەتە بخرێتە نێوان ئەو دوو ئایەتەوەو...هتد.

ئەمە یەکدەنگیی هەموو زانایانی لەسەرەو، لەو بارەوە دەتوانین چەند بەڵگەیەک بهێنینەوە:

**یەکەم:** (عن زيد بن ثابت رضي الله عنه قال: فقدت آية من الأحزاب حين نسخنا المصحف، قد كنت أسمع رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقرأ بها، فالتمسناها فوجدناها مع خزيمة بن ثابت الأنصاري:

﴿ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِ ﴾ الأحزاب: ٢٣

فألحقناها بسورتها من المصحف)[1].

(١) - أخرجه البخاري برقم: ٢٦٥٢ و٣٨٢٣ و ٤٥٦٠.

زەیـدی کـوڕی سـابیت (خـوا لێـی ڕازی بـێ)ت دەڵـێ: ئایەتێکـم لـە سـوورەتی ئەحزابـدا لـێ دیـار نەبـوو، کاتێـک کـە موسـحەکانمان لەبـەر دەگرتنـەوە، کـە مـن کاتی خـۆی لـە پێغەمبـەری خـوام دەبیسـت (علیـه الصـلاة والسـلام) دەیخوێنـد، بـۆی گەڕایـن و لـەلای خوزەیمـەی کـوڕی سـابیتی ئەنصاڕیـی بینیمانـەوە، ئەویـش ئـەو ئایەتەیـە:

﴿ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ﴾ الأحـزاب: ٢٣.

ئیـدی ئێمـە بـە سـوورەتەکەیەوە پەیوەسـتمانکرد، بـەو شـوێنەی خۆیـەوە لـە موصحەفـدا.

**دووەم: بەڵگەیەکی دیکـە لـەو بـارەوە: (عـن عبدالله بـن عباس رضي الله عنهـما قـال: قلـت لعثمان بن عفـان: ما حملكم عـلى أن عمدتـم إلى الأنفال وهـي مـن المثـاني، وإلى براءة وهي مـن المئين، فقرنتـم بينهما، ولم تكتبوا سـطر بسـم الله الرحمـن الريحـم، ووضعتموها في السـبع الطـوال، مـا حملكم على ذلـك؟! قـال عثمان: إن رسـول الله (صلى الله عليه وسـلم) كان مِـمّا يأتي عليه زمـان ينـزل عليـه مـن السـور ذوات عـدد، وكان إذا أُنـزل عليـه شيءٌ يدعـوا بعـض مـن يكتـب عنـده، فيقـول: ضعوهـا في السـورة التـي يذكـر فيهـا كـذا وكـذا، وينـزل عليـه الآيات، فيقـول: ضعوا هذه الآيـات في السـورة التي يذكر فيهـا كـذا وكـذا، وينـزل عليـه الآية فيقـول: ضعوا هـذه الآية في السـورة التي يذكـر فيهـا كذا وكـذا، وكانت الأنفـال من أوائل مـا أُنزل بالمدينـة، والبراءة من آخـر القـرآن، فكانـت قصتهـا شـبيهاً بقصتهـا، فقبـض رسـول اللـه (صـلى الله عليـه وسـلم) ولم يُبـيِّنْ لنـا أنهـا منهـا، وظننت أنهـا منها، فَمِـنْ ثَمَّ قرنـت بينهما، ولم أَكتـبْ بينهـما سـطرَ بسـم الله الرحمـن الرحيـم، ووضعتها في الطـوال)[1] .**

(١)- أخرجه أحمد برقم ٣٩٩ و ٤٩٩. وأبوداود ٧٨٦ و ٨٧٧ والترمذي برقم ٣٠٨٦ والنسائي في الكبرى برقم ٨٠٠٧ ، وجماعة من العلماء ، وقال الترمذي هذا حديث حسن.

عبداللـە ی کـوڕی عەبـاس دەڵـێ بـە عوسـمانی کـوڕی عەففانـم گـوت: چ شـتێک وای لێکـردن ،کـە سـووڕەتی (الأنفـال) کـە لەمەثانییـە -ئایەتـەکانی لـە سـەد کەمـترن- و سـووڕەتی (البراءة) کـە لە سـەدەییەکانە، پێکەوەیـان بێنـن و، دێـڕی (بسـم اللـە الرحمـن الرحیـم) یشـتان لـە نێوانـدا نەنووسـیون و (الأنفـال) تـان لـە ڕیـزی حـەوت سـووڕەتە درێژەکانـدا هێنـاوە، چ شـتێک پاڵـی پێوەنـان وابکـەن؟

عوسـمان گـوتی: پێغەمبـەری خـوا (علیـه الصـلاة والسـلام) ڕۆژگارێـک کەبەسـەریدا دەهـات، هەندێـک لـە سـووڕەتەکانی بـۆ دادبەزیـن، کـە چەنـد ئایەتێـک بـوون و، کاتێـک شـتێکی دادەبەزیە سـەر، هەندێـک لەوانـەی، کـە لـە خزمـەتی دابـوون و قورئانیـان دەنووسـیەوە، بانگـی دەکـردن دەیفەرمـوو: ئـەم سـووڕەتە کـە فـلان شـتەی تێدا بـاس دەکـرێ و، فـلان شـتەی تێـدا بـاس دەکـرێ، ئـەم ئایەتانـە کـە دابەزیـون لـە فـلان سـووڕەتەدا دایانبنێـن، دوایـی کـە هەنـدێ ئایـەتی بـۆ دادەبەزیـن، دەیفەرمـوو: ئـەم ئایەتانـە لـە نێـو ئـەو سـووڕەتەدا دابنێـن، کـە فـلان شـت و فـلان شـتەی تێـدا بـاس دەکـرێ.

هەروەهـا ئایەتێکـی بـۆ دادەبـەزی، (واتـە: پێشـێ سـووڕەتێک یاخـود چەنـد سـووڕەتێک، دوایـی چەنـد ئایەتێـک، دوایـی ئایەتێکیشـی بـۆ دادەبـەزی) دەیفەرمـوو: ئـەم ئایەتـە لـەو سـووڕەتەدا دابنێـن، کـە فـلان شـت و فلانـە شـتەی تێـدا بـاس دەکـرێ، (بـە تەئکیـد باسیشـی فەرمـووە، کـە ئـەم ئایەتـە بخەنـە نێـو ئـەو ئایەتـەو، ئـەو ئایەتـە) ئنجـا سـووڕەتی (ئەنفـال) لـە سـەرەتای ئـەو سـووڕەتانە بـوو کـە لەمەدینـە دابەزیـن.

---

هەڵبەتە هێندێک لە زانایان تانەیان لە سەنەدی ئەم دەقە داوە، بە تایبەت - المحدث أحمد محمد الشاكر - لە کاتێک دا قسەی کردوە لەسەر فەرموودەکانی موسنەدی ئیمام ئەحمەد بە ژمارە ٣٩٩.
بەڵام زانایانی دیکە، قسەی ئەحمەد موحەممەد شاکیریان بە پەرچ داوەتەوە.

سووڕەتی بەڕائەش لە کۆتایی قورئانەوە دابەزیوە، بەسەرهاتەکەشیان وێک دەچوو، (هەموویان باسی جەنگ و جیهادن)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گیانی کێشراو بۆی ڕوون نەکردینەوە کە ئەنفال بەشێکە لە تەوبە (براءة) -یان نا؟- من پێم وابوو کە (الأنفال) بەشێکە لە بەڕائە، بۆیە لە پەنای یەکدا دامنان و، دێڕی (بسم الله الرحمن الرحیم) یشم لە نێواندا نەنووسین و، لە ڕیزی حەوت سووڕەتە درێژەکانم دا دانا.

واتە: عوسمان خوا لێی ڕازی بێ پێی وابووە کە هەردوو سووڕەتی (الأنفال) و (التوبة) یەک سووڕەتن، بۆیە (بسم الله الرحمن الرحیم) ی لەسەرەتای ئەنفالەوە نووسراوە، بەڵام لە سەرەتای سووڕەتی بەڕائەوە نەنووسراوە.

ئەمەش زۆر بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ کە هەر ئایەتێک و هەر کۆمەڵە ئایەتێک کە دابەزیوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نووسەرەوەکانی وەحیی ڕێنمایی کردوون و پێی فەرموون: ئەو ئایەت یان ئەو چەند ئایەتە لەکوێ دابنێین؟

**سێیەم:** بەڵگەیەکی دیکە لەسەر ڕاستیی ئەو قسەیە ئەوەیە کە ئیعجازی قورئان و دەستەوسانکردنی قورئان، بێگومان بە هەرکام لە سووڕەتەکانەو، کاتێک خوای پەروەردگار بەیەک سووڕەت تەحەددای کردوە، وەک دەفەرموێ:

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ ﴾ البقرة: ٢٣.

ئەمە لێی وەردەگیرێ کە هەرکام لە سووڕەتەکان، لەلایەن خواوە دیارییکراون، سووڕەتیش بۆیە پێی گوتراوە سووڕەت، چونکە وەک چۆن شارێک دەورە دەدرێ، ئەویش ئاوا دەورە دراوە، کەواتە: هەرکام لە سووڕەتەکان و ئایەتەکان و، ڕیزبەندیی ئایەتەکان، بە

فەرمـانی ڕاسـتەوخۆی خـوای کارزان بـووە.

**چـوارەم:** بەڵگەیەکـی دی ئەوەیـە کـە چەنـد فەرمایشـتێک لـە پێغەمبـەرەوە (علیـه الصـلاة والسـلام) هاتـوون، کـە نـاوی هەندێـک سـووڕەتانی بـردووەو هەندێـک فەرمایشـت هەن لەبـارەی خوێنـدنی هەندێک لـە سـووڕەتەکانەوەو، پێغەمبـەری خـوا ژمـارەی ئایەتەکانیشـی، دیارییکـردوون، بـۆ نموونـە: (الملـك) کـە فەرموویەتـی: سـی (٣٠) ئایەتـە.

ئنجـا لەهیـچ ڕێیەکـی ڕوون و ڕاشـکاوو ڕاسـتەوەش نەهاتـوە، کـە هیـچ کام لـە هـاوەڵان دەسـتکاریی هیـچ ئایەتێکیـان کردبـێ، کـە لـە شـوێنێک دایبنێـن بـە ڕای خۆیـان، ئـەوەش کـە لـە عومـەرو عوسـمان و زەیـدی کـوڕی سـابیتەوە خـوا لێیـان ڕازی بـی هاتـوە، لەبـارەی ئـەو دوو ئایەتـەی کۆتایـی سـووڕەتی (التوبـة)ەوە، هیـچ کام لـەو گێڕدراوانـە، لـە ڕووی سـەنەدەوە ڕاسـت نیـن.

کەواتـە: بـە نسـبەت ڕیـز بەندیـی ئایەتەکانـەوە، زانایـان هەموویـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن کـە دانرانیـان ڕاسـتەوخۆ لەلایـەن خـواوە بـووەو، ئـەو بەڵگانـەش کـە هێنامانـنـەوەو، بەڵگـەی دیکـەش هـەن لـەو بـارەوە، سـەلمێنەری ئـەوەن، ئنجـا لەڕاسـتییدا ئایەتـەکانی هەر سـووڕەتێک هەموویـان وەک ئاڵقـەکانی زنجیرێـک یەکـدی دەبەسـتنەوەو، خـوا چـۆن فەرمایشـتەکەی فەرمـووە، ئـاوا نووسراوەتـەوە،

## بڕگەی دووەم: ڕیزبەندیی سووڕەتەکان:

زانایـان لەبـارەی ڕیزکرانـی سـووڕەتەکانەوە، ڕا جیاییـان هەبـووەو دەبـن بـە دوو ڕا، ڕایەکیـان ئەوەیـە کـە ئەویـش هـەر تەوقیفییـەو، کاتێـک ئەبوبەکـر خـوا لێـی ڕازی بـێ و، دوایـی عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، سـووڕەتەکانی قورئانیـان کـۆ کردوونـەوە، هـەر بـە پێـی ئـەو ڕیزبەندییـە بـووە کـە پێغەمبـەری خـوا (علیـە الصـلاة والسـلام) فەرمـانی کـردوە دابنرێـن و، لەموصحەفـەکانی مسولمانانیشـدا هـەر بەپێـی ئـەو ڕیزبەندییـە دانـدراون، ئەمـە ڕای بەشـێک لـە زانایانـە.

ڕای دووەمـی زانایـان ئەوەیـە کـە ڕیزبەندیـی سـووڕەتەکان، بـەو شـێوەیەی دەیبینیـن لـە موصحـەف دا بـەدوای یەکـدا دانـراون، ئەمـە تەوفیقییـە، نـەک تەوقیفیـی، واتـە: ئیجتیهادییەو هـاوەڵان خـوا لێیان ڕازی بـێ، وایـان پـێ بـاش بـووە ئـەو سـووڕەتانە بـەو شـێوەیە ڕیزبەندبکـەن، ئەمـەش قسـەی زۆربـەی زانایانـەو، چەنـد بەڵگەیەکیـش ئـەم ڕایـە پشـت ڕاسـت دەکەنـەوەو سـاغی دەکەنـەوە:

**بەڵگـەی یەکـەم:** ئـەو دەقـەی پێشـتر هێنامـان، کـە عبداللـە ی کوڕی عەببـاس لـە عوسـمان خـوا لێـی ڕازی بـێ دەپرسـێ: بۆچـی سـووڕەتی (ئەنفـال و بەڕائـە) تـان پێکـەوە دانـاون؟ عوسـمان خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: تەماشـام کـرد وێـک دەچـن و، پێغەمبەریـش (صـلی اللـە علیـە وسـلم) بـۆی ڕوون نەکردبووینـەوە، یەکـن، یـان جیـان؟ بۆیـە (ئەنفـال) م لـەو ڕیزبەندییـەدا دانـاوەو، لـە سـەرەتای (بەڕائـەش) دا (بسـم اللـە الرحمـن الرحیـم) م نەنووسـی، تاکـو هەردووکیـان وەک یـەک سـوڕەت بێنـە بەرچـاو و، لـە ڕیـزی سـووڕەتە درێژەکانیشـدا دامنـان، سـووڕەتە

درێــژەکان: [البقــرة، آل عمــران، النســاء، المائــدة، الأعــراف]، ئەمــە پێنــج، لــە دوای ئەعــراف (الأنفــال) دێ و، دواییــش (التوبــة) دێ، ئنجــا ئەگــەر ئەنفــال و تەوبــە یەکــبن، ســوورەتی (یونــس) دەبێتــە ســوورەتی حەوتــەم، لــە ســوورەتە درێــژەکان.

**بەڵگــەی دووەم:** لــەو بــارەوە کــە ڕیــز بەندیــی ســوورەتەکان بــە بۆچــوون و ئیجتیهــادی هــاوەڵان بــووە - خــوا لێیــان ڕازی بــێ - ئــەو دەقەیــە کــە کابرایەکــی عێراقیــی دێ بــۆ خزمــەت دایکــان خاتــو عائیشــە (خــوا لێــی ڕازی بــێ) و پرســیاری لــێ دەکا، لەبــارەی نووســینەوەی قورئــان و پێــی دەڵــێ:

**[یـا أمَّ المؤمنـین! أرني مصفحـكِ، قالـت: لـمَ، قـال: لعلّي أؤلِّـفُ القـرآن عليـه، فإنـه يُقْـرأُ غـير مؤلَّـف، قالـت: ومـا يضُرُّك أيَّـهُ قـرأت قبـل، إنمـا نـزل أول مـا نـزل منـه سـورة مـن المفصَّـل فيهـا ذكـر الجنـة والنـار]**[1].

واتــە: کابرایەکــی عێراقیــی دێ بــۆ خزمــەت دایکــان خاتــو عائیشــە - (خــوا لێــی ڕازی بــێ) - دەڵــێ: ئــەی دایکــی بــڕواداران! موصحەفەکــەی خۆتــم پێشــاندە، ئەویــش دەڵــێ: بۆچــی؟ دەڵــێ: بەڵکو منیــش قورئــان بەپێی ئــەو موصحەفــەی تــۆ بنووســمەوە، چونکــە قورئــان بەڕێکنەخراویــی دەخوێدرێتــەوە، دایکــان خاتــو عائیشــە: دەڵــێ: ئنجــا چ زیانێکــی هەیــە کــە کامیــان لــە پێشــدا دەخوێنــی، چونکــە قورئــان کــە دابــەزی، یەکەمیــن ســوورەتانێک لــە قورئــان دابەزیــن، ســوورەتە کورتــەکان بــوون، باســی بەهەشــت و دۆزەخیــان تێــدا بــووە، لــە درێــژەی حەدیســەکە دەڵــێ: تاکــو کاتێــک خەڵــک گەڕانــەوە بــۆ ئیمــان و ئیســلام، ئنجــا خــوا فەرمــووی:

(١) - رواه البخاري: ٤٧٠٧.

قەتـڵ مەكـەن و، زینـا مەكـەن و، شـەڕاب مەخـۆن.

**بەڵگـەی سـێیەم:** بەڵگەیەكـی دیكـە لـەو بـارەوە كـە ڕیزبەندیـی سـووڕەتەكان ئیجتیهادیـی بـووە، ئەوەیـە كـە ڕیزبەندیـی سـووڕەتەكانی موصحـەفی عبداللـە ی كـوڕی مەسـعوود، جیابـووە لـە ڕیزبەندیـی سـووڕەتەكانی موصحـەفی عـەلی كـوڕی ئەبـو تاڵیـب، هەروەها جیا بـووە لـە هـی، موصحـەفی ئوبـەی كـوڕی كەعـب، ئەوانیـش هەرسـێكیان جیـا بـوون لـە ڕیزبەندیـی سـووڕەتەكانی موصحەفـێ كـە عوسـمان خـوا لێـی ڕازی بـێ، لـە لایـەن ئـەو لیژنـە چـوار قۆڵییـەوە ڕێكیخسـتوە.

ئنجـا، بێگومـان ئـەوە كـە ڕیزبەندیـی سـووڕەتەكان ئیجتیهادییـە زانایـان، هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بێـت بـەو شـێوە بـە چاكیـان زانیـوە ڕیزبەندیـان: كـەن، ئەمـە ڕێگـر نیـە لـەوەی كـە هەندێک لـەو سـوڕەتانەش پێغەمبـەری خاتـەم صلى اللـه عليـه وسـلم لـە ڕۆژگاری خۆیـدا بـە هـاوەڵانی فەرمـووەن، بـۆ وێنـە، لـەو بـارەوە ئـەم دەقـە دێنیـن:

**عـن علقمـة بـن قيـس النخعـي والأسـود بـن يزيـد النخعـي قـالا: أتى ابـنَ مسـعود رجـلٌ فقـال: إني أقـرأ المفصـل في ركعـة، فقـال: أهـذّاً كهـذِّ الشـعر، ونَـثْراً كنـثر الدقـل، لكـن النبـي (صلى الله عليه وسلم) كان يقـرأ النظائـر السـورتين في ركعـة: النجـم والرحمـن في ركعـة، واقتربـت والحاقـة في ركعـة، والطـور والذاريـات في ركعـة، وإذا وقعـت و النـون في ركعـة، وسـأل سـائل والنازعـات في ركعـة، و ويـل للمطففـين وعبـس في ركعـة، والمدثـر والمزمـل في ركعـة، وهـل أتى ولا أقسـم بيـوم القيامـة في ركعـة، وعـم يتسـائلون والمرسـلات في ركعـة، والدخـان وإذا الشـمس كـورت في ركعـة.**[1]

(١) - أخرجه بهذه الرواية أبوداو برقم ١٣٩٦، قلت: وهذا إسناد صحيح.

عەلقەمـەی کـوڕی قەیـسی نەخەعیـی و ئەسـوەدی کـوڕی یەزیـدی نەخەعیـی، دەڵێـن: پیاوێـک هاتـە لای عبداللـە ی کـوڕی مەسـعوود، گـوتی: مـن هەمـوو موفەسسـەڵ لـە ڕکاتێکـدا دەخوێنـم، [موفەسسـەڵ کـە زۆربـەی زانایـان دەڵێـن لـە سـوورەتی (ق) ەوە دەسـت پێـدەکات، هەندێک دەڵێـن لـە سـوورەتی (الذاریـات)ەوە دەسـت پێـدەکات، تـا کۆتایـی قورئان] واتـە: چـوار جـوزء، چـوار بـەش لـە سـی بەشـەکەی قورئـان.

عبداللـە ی کـوڕی مەسـعوود پێیگـوت: هـەروەک چـۆن شـیعر دەخوێندرێتـەوە ئـاوا دەیخوێنیتـەوە، وەک چـۆن خورمـا یـان قەسـب بـڵاو دەکرێنـەوە، ئـاوا بڵاویـان دەکەیـەوە، بـەڵام پێغەمبـەر (صلی اللـه علیـه وسـلم) سـوورەتە هاووێنـەکانی لـە ڕکاتێکـدا دەخوێنـدن، [ئنجـا بیسـت سـوورەتی پـێ گوتـن]: (النجـم والرحمـن) لـە ڕکاتێکـدا، (اقتربـت والحاقة) لـە ڕکاتێکـدا، [واتـە: سـوورەتی قەمـەرو سـوورەتی حاقـە] و (الطـور و والذاریـات) لـە ڕکاتێکـدا، و (إذا وقعـت)، [سـوورەتی واقیعـە] و (نـون)، [سـوورەتی قەلـەم] لـە ڕکاتێکـداو، (سـأل سـائل) (المعـارج) و (النازعـات) لـە ڕکاتێکـدا، و (ویـل للمطففیـن وعبـس) لـە ڕکاتێـک دا و، (المدثـر والمزمـل)، هەردووکیـان لـە یـەک ڕکاتـدا و، (هـل أتی و لا أقسـم بیـوم القیامـة) لـە ڕکاتێکـدا و، (عـم یتسـائلون والمرسـلات) لـە ڕکاتێکـدا و، (دخـان و إذا الشـمس کـورت) لـە ڕکاتێکـدا.

ئەبـو داودی سیجیسـتانیی گوتوویـەتی: عبداللـە ی کوڕی مەسـعوود لـە موصحەفەکـەی خۆیـدا ئـاوا ئـەو سـوورەتانەی ڕیز بەند کـردوون.

بـەڵام وا پێدەچـێ هەندێک لـە سـوورەتەکان لـە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (علیـه الصـلاة والسـلام) بـەو شـێوەی ئێسـتا ڕیزبەندکرابـن، بـە تایبـەت حـەوت سـوورەتە درێژەکان و، هەندێ لە سـوورەتەکانی (مفصّـل)، کە وەک

گوتمان لە سوورەتی (ق) تاكو كۆتایی قورئانە، هەر چەند بەڵگەیەكی یەكلاییكەرەوە لەو بارەوە نیە، بەڵام مالیكی كوڕی ئەنەس، گوتوویەتی: [إنما أُلِّف القرآنُ على ماكانوا يسمعون من قراءة رسول الله (صلى الله عليه وسلم)] أخرجه الداني في المقنع بإسناد صحيح.[1]

واتە: قورئان بەو شێوەیە كە لە پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) یان بیستوە خوێندوویەتی، سوورەتەكان ڕیزبەند كراون.

ڕایەكی دیكەیش هەیە، گوتوویانە: هەموو قورئان تەوقیفییە، هەمووی بە فەرمانی خوایە، جگە لە سوورەتی (الأنفال و براءە) لەبەر ئەوەی لە فەرموودەكەدا هاتوە عوسمان خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ: بۆیە ئاوامان دانان، چونكە...

بەڵام بێگومان ئەو ڕایە بەڵگەدارترە كە ڕیزبەندیی سوورەتەكان، زیاتر بۆچوون و ئیجتیهادی هاوەڵان بووەو، ڕەنگە هەندێكیشیان لە پێغەمبەری خاتەمەوە بیستبێ، كە فڵان سوورەتەی لە پێش ئەو سوورەتەدا خوێندوە، بە تەئكید لەو شوێنەوارانەوەش بەهرەمەند بوون لە ڕیزبەندكردنی سوورەتەكان دا.




(١)- ص ٨.

## بڕگەی سێیەم: ناوی سووڕەتەکان:

هیـچ دەقێـک نەهاتـوە لەسـەر هیـچ سـووڕەتێک کـە بـەو نـاوە نـاو بـنرێ، بـەڵام زۆر دەق هاتـوون، زۆر فەرمایشـتی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) کـە نـاوی هەندێـک لـە سـووڕەتەکانیان تێـدا هاتـوون، وەک سـووڕەتەکانی، (الفاتحـة و البقـرة و آل عمـران)و غەیـری ئەوانیـش، بـەڵام بێگومـان لـە بـۆ هـەرکام لـە سـووڕەتەکان، ناوێکـی دیارییکـراو نیـە.

هەربۆیـەش هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بێ، لـە ناونانی سـووڕەتەکاندا، ڕا جیاییـان بـووە، بـۆ وێنـە ئـەم دەقـە دێنینەوە:

(عـن سـعید بـن جبیر قـال: قلـت لابـن عبـاس سـورة الحـشر، قـال: قل سـورة النضـیر)[1].

سـەعیدی کـوڕی جوبەیـر دەڵـێ: بـە عبداللـە ی کـوڕی عەبباسـم گـوت سـووڕەتی حـەشر، گـوتی: بڵـێ سـووڕەتی نەضیـر.

ئنجا هەندێ لەو سووڕەتانە زیاتر لەناوێکیان هەیە، بەڵکو هەیانە تاکو بیست ناویش ڕۆیشتوە، بە تایبەتی سووڕەتی - الفاتحة - کە بە: (الفاتحة ) و (أم الکتاب )و ( أم القرآن)و ( الشفاء )و ( الأساس ) و کۆمەڵێک ناوی دیکەشی هەن و، خەڵک سووڕەتی ( الحمد ) ی پێ دەڵێن، هەروەها سووڕەتی ( التوبة ) کە بە ( البراءة ) و (التوبة ) ش هاتوە، هەروەها بە (المشقشقة) ش و بە (الفاضحة)ش هاتوە، هەروەها سووڕەتی (الإسراء)، هەم بە سووڕەتی ( الإسراء ) هەم بە سووڕەتی ( إسرائیل ) یش هاتوە، سووڕەتی ( الإخلاص ) کە بە سووڕەتی ( الإخلاص ) و سووڕەتی ( قل هو الله أحد )و کۆمەڵێک ناوی دیکەش و، هەندێکیان گەیاندوویاننە بیست ناویش.

---

(١)- رواه البخاري: (٣٨٠٥ و ٤٦٠١).

کەواتە: ئەو ناوانەی دانراون لەسەرەتای سوورەتەکاندا، بە وەحیی دانەبەزیون، بەڵکو بەرهەمی بۆچوون و تێفکرینی هاوەڵان یان زانایانە، لە دوای هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوان وایان بە باش زانیوە و بەشێک نین لە قورئان.



## بڕگەی چوارەم: کۆتایی ئایەتەکان ( فواصل الآيات ) :

لـەو بـارەوە دوو ڕا هـەن: ئایـا کۆتایـی ئایەتـەکان، ئایەتێـک لـە کوێ تـەواو دەبـێ، ئایـا ئەمـە تەوقیفییـە، یاخـود تەوفیقییـە، تەوقیفیـی واتـە: خـوا پێغەمبـەری وەسـتاندبێ کـە ئـەو ئایەتـە لـە فـڵان شـوێن کۆتایـی دێ و، ئایەتێکـی کـە دەسـت پـێ دەکا، تەوفیقیـی ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) یاخود هـاوەڵان بە بۆچـوونی خۆیـان کۆتایـی ئایەتەکانیان دیاریـی کردبێ.

**ڕای یەکـەم :** ئەوەیـە کـە ئەمـەش تەوقیفییـە واتـە: پێغەمبـەری خـوا (عليـه الصـلاة والسـلام) بە فەرمـانی خوا ئەو سـوورەتەی دابەش کـردوە، بۆ ئەوەنـدە ئایـەت، لەوبـارەوە دەتوانیـن چەند شـتێک بـە بەڵگـە بێنینەوە:

١ـ (عـن عبداللـه بـن مسـعود رضى اللـه عنـه قـال: أقـرأني رسـول الله (صـلى اللـه عليـه وسـلم) سـورة مـن الثلاثين مـن - آل حـم - يعنـي الأحقاف، قـال: وكانـت السـورة إذا كان أكـثر مـن ثلاثـين آيـة، سـميت الثلاثين.[١]

واتـە: عبداللـە ی کـوڕی مەسـعوود دەڵـێ پێغەمبـەری خـوا (عليـه الصـلاة والسـلام) سـوورەتێکی لـە سـییەکان لـە ئالـی حـا میـم بەسـەردا خوێندمـەوە، کـە مەبەسـتی پـێ سـوورەتی (الأحقـاف)ە، دەڵێ: سـوورەتێک کـە لـە سـی (٣٠) ئایـەت زیاتـر بوایـە، پێیـان دەگـوت: (الثلاثیـن) واتـە: لـە سـییەکانە.

کەواتـە: لێـرەدا دەردەکـەوێ کـە ژمـارەی ئایەتـەکان لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەردا (صـلى اللـه عليـه وسـلم) دیاربـووە.

٢ـ هەروەهـا لەبـارەی سـوورەتی (الفاتحـة)ەوە هاتـوە، کـە حـەوت

---

(١)- رواه أحمد برقم: (٣٩٨١).

ئایەتـە، وەک پێغەمبـەر (علیـه الصـلاة والسـلام) فەرموویـەتی: (الحمدللـه رب العالمیـن، هـي السـبع المثـاني والقـرآن العظیـم التـي أوتیتـه).[1]

پێغەمبــەر (علیــه الصــلاة والســلام) فەرموویــەتی: (الحمدللــه رب العالمیـن)، بریتییـە لـە حـەوت دووبـارە کـراوەکان و، ئـەو قورئانـە مەزنـەی پێمـدراوە.

هەروەهــا لــە ئەبــو هورەیــرەوە هاتــوە پێغەمبــەر (علیــه الصــلاة والســلام) فەرموویــەتی: (أم القـرآن) دایکـی قورئـان بریتییـە لـە حـەوت ئایەتـە دووبارەکـراوەکان و قورئانـی مـەزن، وەک (بخـاري) هێناویـەتی، بەژمـارە:٤٤٢٧ .

بۆیـەش سـوورەتی فاتیحـە پێیگوتـراوە: (المثـاني) چونکـە دووبـارە دەکرێتـەوە لـە هـەر ڕکاتێکـدا، یاخـود لەبـەر ئـەوەی سـتایشی خوایـان پـێ دەکـرێ ئـەو حـەوت ئایەتـە.

٣ـ هەورەهــا لــە فەرمایشــتی پێغەمبــەردا (علیــه الصــلاة والســلام) باســکراوە کــە ســوورەتی (الملــک) یــان (تەبــارەک)، ســی (٣٠) ئایەتــە، وەک لــەم فەرمایشــتەوە دیــارە:

(إن سـورة مـن القـرآن ثلاثـون آيـة شـفعت لرجـل حتـى غُفِـرَ لـه، وهـي تبـارك الـذي بيـده الملـك).[2]

پێغەمبــەر (علیــه الصــلاة والســلام) فەرمــووی ســوورەتێک لــە قورئـان کـە سـی ئایەتـە، تـکای کـرد بـۆ پیاوێـک هەتـا لێـی بـوردرا، کـە بریتییـە لـە سـوورەتی (تبـارک الـذي بیـده الملـك).

---

(١) -البخاري برقم: ٤٢٠٤ و٤٣٧٠ و ٤٤٢٦ و ٤٧٢٠ وأخرجه البخاري كذلك برقم: ٤٤٢٧ من حديث أبي هريرة قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): أم القرآن هي سبع المثاني والقرآن العظيم.

(٢)- أحمد برقم: ٧٩٧٥ وه ٨١٧٦، وإسحاق بن راهويه في مسنده برقم: -١٢٢-، مسند أبي هريرة وأبو داود برقم: ١٤٠٠ والترمذي برقم: ١١٩٣، والنسائي في اليوم والليلة برقم: ٧١٠ ، وابن ماجة: ٣٧٨٦.

**ئەمە ڕای یەکەم کە ژمارەی ئایەتەکان، تەوقیفییە.**

**ڕای دووەم:** هەیە کە بڕیتییە لەوەی ژمارەی ئایتەکان ئیجتیهادیی بووە، لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە سووڕەتەکان، دەقێکی ڕوون و ڕاشکاو لەبارەیانەوە نەهاتوە، کە چەند ئایەتن؟

بەڵام بێگومان ڕای یەکەم لە ڕاستییەوە نزیکترە، هەڵبەتە بە نیسبەت ئەو سووڕەتانەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ژمارەی ئایەتەکانی دیاریی کردوون، ئەوە دیارە.

ئنجا پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) کاتێک قورئانی خوێندوە هاوەڵان توانیویانە ژمارەی ئایەتەکان بژمێرن، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی زۆر بە شێنەیی و بە کاوەخۆ، خوێندوە، وەک لە دایکمان خاتو ئوممو سەلەمەوە ئەم گێڕدراوەیە هاتوە:

(عن ابن أبي مليكة عن أم سلمة: كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقطع القراءة، يقول: الحمد لله رب العالمين، ثم يقف، الرحمن الرحيم، ثم يقف، وكان يقرأها ملك يوم الدين).[١]

ئەمە ڕیوایەتێکی، ڕیوایەتێکی دیکەیشی هاتوە:

(عن أم سلمة رضي الله عنها أنها سُئلت عن قراءة رسول الله (صلى الله عليه وسلم)؟ قالت: كان يقطع قراءته آية آية: بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله رب العالمين، الرحمن الرحيم، مالك يوم الدين).[٢]

ڕیوایەتی یەکەمیان: ئوممو سەلەمە لەبارەی خوێندنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ قورئان گوتویەتی: قورئانەکەی کە دەخوێند، لێکی دادەبڕی دەیفەرموو: (الحمد لله رب العالمين) ، دوایی دەوەستا،

---

(١)- قال الدارقطني وقد روى الحديث في سننه برقم ٣١٢ و ٣١٣ و إسناده صحيح وكلهم ثقات.
(٢)- أحمد في المسند ج٦،ص٣٠٢، وأبوداود برقم: ٤٠٠١. والترمذي برقم: ٢٩٢٨.

(الرحمـن الرحيـم)ی دەخوێنـد، دوایـی دەوەسـتاو (مالـک یـوم الدیـن) یـان (ملـک یـوم الدیـن) دوایـی دەوەسـتا، تـا کۆتایـی.

ڕیوایەتەکـەی دیکـە: ئوممو سـەلەمە پرسـیاری لـێ کـراوە لەبـارەی قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەری خـواوە (علیـه الصـلاة والسـلام) گوتویـەتی: ئایـەت ئایـەت لێکـی دادەبڕیـن، (بسـم اللـه الرحمـن الرحيـم) ، (الحمدللـه رب العالميـن)، (الرحمـن الرحيـم)، (مالـک یـوم الدیـن).

ئەمـەش ئـەوە دەگـەیەنـێ کـە پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسـلام) هەر لـە ڕۆژگاری خۆیـدا، بـە هـۆی خوێندنەکـەی خۆیـەوە، توانیویـەتی هاوەڵان فێربـکات کـە ئـەو سـووڕەتە چەند جـار تێیدا وەسـتاوەو چەنـد ئایەتە؟

بـەڵام بێگومـان لـەو بـارەوە بـۆ هـەرکام لـە ژمـارەی ئایەتـەکانی هـەر سـووڕەتێک دەقێـک نیـەو، هیـچ حوکمێـک لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە بنیات نانرێ،لەبـەر ئـەوە هـەر ڕایەک لـەو بارەوە بگوتـرێ، گرێ و گۆڵـی تێدا نیە.



## بڕگەی پێنجەم : لەبارەی (بسم الله الرحمن الرحيم) ەوە :

(البسملة) (واتە: گوتنی (بسم الله الرحمن الرحيم) ، بەیەكدەنگیی هەموو زانایان (بسم الله الرحمن الرحيم) بەشێكە لە ئایەتێك لە سوورەتی - النمل -:﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَـٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ النمل: ٣٠ ، هەروەها زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوە كە (بسم الله الرحمن الرحيم - ئایەتێك نیە لە سوورەتی (التوبة)و لەسەرەتایەكەیەوە نیە.

بەڵام لەبارەی سوورەتەكانی دیكەوە، زانایان ڕا جیاییان هەیەو، بەگشتیی ڕایەكانیان دەبنە چوار:

**ڕای یەكەم:** دەڵێن: (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێكە لە سەرەتای هەموو سوورەتەكان، بێجگە لە سوورەتی (التوبة).

**ڕای دووەم:** دەڵێن: (بسم الله الرحمن الرحيم) لە سەرەتای هیچ كام لە سوورەتەكاندا ئایەتێك نیە، بەڵكو تەنیا بۆ پیت و پێز نووسراوە.

**ڕای سێیەم:** دەڵێن: (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێكی سەربەخۆیەو لەگەڵ ژماردنی ئایەتەكانی سوورەتەكەدا حیساب ناكرێ، بەڵام بۆیە داندراوە، تاكو هەر سوورەتێك لە سوورەتەكەی دیكە جیا بكاتەوە.

**ڕای چوارەم:** ئەوەیە كە (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێكە لە سوورەتی (الفاتحة) بەتایبەت و، لە سوورەتەكانی دیكەدا بۆ لێك جیاكردنەوەیانە.

واش پێ دەچێ ئەم ڕایەی چوارەم، كە (بسم الله الرحمن الرحيم) ئایەتێكە لە سوورەتی (الفاتحة) بەتایبەت و ئایەتێكی جیاكەرەوەشە لە نێوان سوورەتەكاندا، ڕای بەهێزترو پەسەندتربێ، بێگومانیش

قورئان بوونی (بسم الله الرحمن الرحیم) مادام لە موصحەفدا هەیەو لە ڕۆژگاری هاوەڵانەوە هەیە، هیچ کەس ناتوانێ نکوولیی لێ بکات.

بەڵگەش لەسەر ئەوە کە (بسم الله الرحمن الرحیم) بەشێک لە قورئانە، زۆرن:

١ـ یەکێک لەوانە ئەوەیە کە لە موصحەفدا هەیەو، بە یەکدەنگیی زانایانیش (بسم الله الرحمن الرحیم) لە موصحەفدا دانراوە.

٢ـ بەڵگەیەکی دیکە ئەم دەقەیە:

(عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما قال: كان النبي (صلى الله عليه وسلم) لايعرف خاتمة السورة حتى ينزل بسم الله الرحمن الرحيم، فإذا نزل بسم الله الرحمن الرحيم، علم أن السورة قد خُتِمَتْ واسْتُقْبِلت أو ابتدئت سورة أخرى).[1]

عبداللە ی کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەیدەزانی سووڕەتێک لە کوێ کۆتایی دێ، تاکو(بسم الله الرحمن الرحیم) دانەبەزیبایە، کاتێک (بسم الله الرحمن الرحیم) دادەبەزی، دەیزانی ئەو سووڕەتەی پێشێ کۆتایی هاتووەو سووڕەتێکی دیکە پێشوازیی لێ کراوە، یاخود ئەوە سەرەتای سووڕەتێکی دیکەیە.



(١) ـ أخرجه البزار برقم: ٢١٨٧، وأبو داود برقم: ٧٨٨، والطحاوي في شرح المشكل برقم: ١٣٧٦، والحاكم برقم: ٨٤٥ والبيهقي في السنن: ج٢، ص٤٢.

## بڕگەی شەشەم: ئایا سوورەتی (الأنفال) و (التوبة) دوو سوورەتن، یاخود یەک سورەتن؟

لەو بارەوە پێشتریش گوتمان: زانایان ڕا جیاییان هەیە، هەندێک گوتوویانە: ئەو دوو سوورەتە یەکن و، هەندێکیش گوتوویانە: دوو سوورەتن، بەڵام وا پێدەچێ ڕای دوو سوورەت بوونیان ڕاستتربێ، بەڵام بۆیە (بسم الله الرحمن الرحیم) لەسەرەتای (البراءة) ەوە نەنووسراوە چونکە هەمووی باسی جەنگ و، باسی سزادانی بێبڕوایان و باسی پەردە لەسەر هەڵدانەوەی مونافیق و دەغەڵ و دڵنەخۆشەکانە.



## بڕگـەی حەوتـەم: جـۆرە کانی سـووڕەتە کان لـە ڕووی درێژییەوە:
## زانایـان سـووڕەتەکانی قورئانیـان کـردوون بـە چـوار جۆر:

**جـۆری یەکەم:** سـووڕەتە درێـژەکان، کە (الطِّـوال) و (الطُّـول) هەردوو وشـەکە بەکاردێـن، کە بریتیـن لە حەوت سـووڕەت:

**یەک:** (البقرة).

**دوو:** (آل عمران).

**سێ:** (النساء).

**چوار:** (المائدة).

**پێنج:** (الأنعام).

**شەش:** (الأعراف).

حەوتەمیش هەندێک گوتوویانە: سـووڕەتی (التوبة)یەو هەندێکیشیان گوتوویانـە: (الأنفـال و التوبـة)ن و، وەک یـەک سـووڕەت وان، هەندێکیش گوتوویانە: سـوڕەتی (یونس)ە.

ئەمە جۆری یەکەمی سووڕەتەکانی قورئان، سووڕەتە درێژەکان.

**جـۆری دووەم:** سـەدییەکان (المئیـن): ئـەو سـووڕەتانەن کـە ژمـارەی ئایەتەکانیـان لـە سـەد (١٠٠) زیاتـرن، یـان نزیکـن، وەک : (الأنفـال، یونس، هـود، النمـل، الإسراء، المؤمنـون).

**جـۆری سـێیەم:** (المثـاني) کـە بریتیـن لـەو سـووڕەتانەی ژمـارەی ئایەتەکانیـان لـە سـەد (١٠٠) کەمـترن، وەک سـووڕەتەکانی: (النـور و الفرقـان و القصـص و یـس و الزمر)، هەڵبەتە وشـەی ئەلمەثانیـی (المثاني) کە لـە قورئانـدا بـەکار هاتوە،بـە دوو واتایـان هاتـوە:

أـ بۆ هەموو قورئان بەکار هاتوە:

وەک خوا فەرمووویەتی:

﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ ﴾ الزمر: ٢٣

ئەویش لەبەر ئەوەی بەسەرهات و هەواڵەکانی تێدا دووبارە دەکرێنەوە.

ب ـ ئەلمەثانیی (المثاني) واتە: ئەو سوورەتانەی کە ژمارەی ئایەتەکانیان لە سەد (١٠٠) کەمترن و لە سوورەتە کورتەکانیش درێژترن، وەک پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووویەتی:

(عن واثلة بن الأسقع قال: قال النبي (صلى الله عليه وسلم): أُعطيتُ مكان التوراة السبع الطوال، و مكان الزبور المئين، ومكان الإنجيل المثاني، وفُضِّلْتُ بالمفصَّل[1].

پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) فەرمووویەتی: لە شوێنی تەورات حەوت سوورەتە درێژەکانم پێیدراون و، لە شوێنی زەبوور سەدییەکان (المئين) م پێدراون [ئەو سوورەتانەی ئایەتەکانی لە سەد زیاترن] و، لە شوێنی ئینجیل ئەلمەثانیي (المثاني)م پێدراون [ئەو سوورەتانەی ژمارەی ئایەتەکانی لە سەد کەمترن]و، سوورەتەکورتەکانیشم پێدراون وەک ئیمتیازێک و زیادەییەک.

**جۆری چوارەم:** سوورەتە کورتەکان: (المفصل):

کە بریتین لەو سوورەتانەی لە سوورەتی (ق) ەوە دەست پێ دەکەن تاکو کۆتایی قورئان.

کە ئەوانیش دەبنەوە بە سێ بەش: أ ـ درێژەکان، کە تاکو سوورەتی (نبأ) دەچن، ب ـ نێوەنجییەکان کە تاکو (الضحى) دەچن. ج ـ کورتەکان کە لە (الضحى)ەوە تا کۆتایی قورئان دەچن.

(١) - الطيالسي برقم: ١٠١٢ - ومن طريق أحمد ج٤ ص١٠٧، - والطحاوي في شرح المشكل برقم: ١٣٨٩، - وابن جرير في التفسير برقم: ١٢٦، و الطبراني في الكبير ج٢ ص٧٥ ، والبيهقي في الشعب ٢٤٨٤.

## بڕگـەی هەشـتـەم و كۆتایـی: دابەشـكردنی قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء)و هەربەشـێكیش بـۆ دوو حیـزب:

ئەمـە هیـچ گومانـی تێـدا نیـە كـە زانایـان وایانكـردوە، بـۆ ئـەوەی بتوانـن لـە مـاوەی مانگێكـدا هەمـوو قورئـان بخوێنـن، یاخـود چەنـد جارێـك بیخوێنـن، گرنـگ ئەوەیـە كە ئەمـە شـتێكی ئیجتیهادییـەو زانایان وایـان كـردوە، هەروەهـا لـە كـردەوەی هاوەڵانیشـدا ئەسـڵێكی هەیـە، بـەڵام بەدڵنیاییـەوە شـتێك نیـە لـەو شـتانەی كـە خـوا پەرسـتییان پـێ ئەنجـام بـدرێ، چونكـە جـاری وا هەیـە سـوورەتێك دابـەش دەبـێ بەسـەر دوو جوزئـدا، كـە بەسـەرهاتێكی تێدایـە بەسـەر هەردووكیانـدا دابـەش دەبـێ، وەك سـوورەتی یاسـین و سـوورەتی كەهـف.

بۆیـە دابەشـكردنی قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء)، ئیجتیهـادو بۆچوونێكـی زانایـان بـووە، هەروەهـا هـەر بەشێكیشـیان كردۆتـە دوو بـەش، بەنـاوی حیـزب، بەڵكـو جـاری وا هەیـە حیزبێكیشـیان كردۆتـە دوو بـەش كـە نیـوەی حیـزب (نصـف الحـزب) یـان چواریەكـی بـەش (ربـع الجـزء)ە، بێگومـان ئـەوە هەمـووی بـە بۆچـوونی زانایـان بـووە، بـۆ ئاسـان كـردنی قورئـان خوێنـدن، تاكـو بزانـن چەنـد دەخوێنـن، لـە حەفتـەدا، لـە مانگـدا، لـە سـاڵداو چەنـد جـار قورئـان هەمـووی پێكـەوە دەخوێنـن؟

بەڕێزان!

لە چوار بڕگـــەدا هەوڵدەدەین بە کورتیی و گوشراویـــی، ئەم تەوەرە بخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەکەم: پێناسەی ڕێنووسی عوثمانیی (الرسم العثماني):

مەبەسـت لـەو وشـەیە، ئـەو شـێوە نووسـینە بـووە کـە لـە ڕۆژگاری فەرمانـدەی بـڕوادران عوثمـانی کـوڕی عەففـان دا خـوا لێـی ڕازی بـێ موصحەفـەکانی کـە بەسـەر شـارەکاندا دابەشـکراون، پێـی نـووسراون:

[ الرسـم العثـماني هـو شـكل الإمـلاء لخـط المصحـف الإمـام الـذي أمـر أمـير المؤمنـين عثـمان بـن عفـان رضي اللـه عنـه بـأن يكتـب عليـه].

ئنجـا ئایـا ئـەو شـێوە نووسـینە، ئـەو ڕێنووسـە، عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ) خـۆی دایهێنـاوە؟

بـە تەئکیـد نەخێـر، بەڵکـو ئـەو کاتـە زمـانی عەرەبیـی بەو ڕێنووسـە نووسراوە.

بـۆ وێنـە: هـەر کام لـە (الصـلاة) و (الربـا)، نـووسراون (الصلـواة) و (الربـوا) هەروەها وشـەی (آيات) پیتـی (ا)ی سـەر (ي) وەک جووڵە (حركة) یـەک لەگـەڵ (ي)دا نـووسراوە، بـەم شـێوەیە (آيات)، دیسـان (يا لـوط)، (ياء النـداء) لکێـنراوە بـە (ل)ی (لـوط) بـەم شـێوەیە (يلـوط)، کە ئەمە مەبەسـت پێـی: جۆرێـک لـە نووسـین نیە وەک نووسـینی: نەسـخ و کوفیـی و ڕوقعە، بەڵکـو مەبەسـت پێی ئەو شـێوە نووسـینە بـووە، کە لـەو کاتەدا بـاو بووە بۆ زمـانی عەرەبیـی، ئەویـش وەنەبێ لەسـەر چەنـد بنچینەیەکـی کۆنترۆڵکراو بەڕێـوە چووبـێ، هەرچەنـدە زۆربـەی دەگەڕێتەوە بـۆ بنچینەیەک.

وەک (الإمام أبو عمرو الداني) لە کتێبی (المقنع في معرفة مرسوم مصاحف أهل الأمصار)دا هەروەها (السیوطي) لە (الإتقان)[1]ی خۆیدا، ڕوونی کردۆتەوە.

بۆ وێنە: (الصلاة و الزکاة) یان بە واو (و) نووسیون، لەجیاتی ئەلیف (أ) بەو ئیعتیبارەی لە ئەسڵدا صەلات لە (صَلو) هاتووەو زەکات لە (زکو)ەوە هاتووە، هەروەها وشەی (الَّیل)یان بە یەک لام نووسیوەو لامەکەی تێیدا دەغم کراوە، هەروەها (لیکونن)و (لنسفعن) نووسراون: (لیکوناً) بە تەنوین و (نسفعاً) دیسان بە تەنوین لەجیاتی نوون، وەک حوکمیان لە کاتی وەستاندا.

بەڵام هەندێکیان بە پێی ئەو بنچینەیەش ڕاست دەرناچن، وەڵامەکەی هەر ئەوەیە، کە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ لەوکاتەدا بەو شێوەیە نووسیویانە، لەبەر ئەوەی ڕێنووسی زمانی عەرەبیی بەو شێوەیە بووە.



(١)- ١ ج٢ ص٤٧١ ـ ٤٨٠.

## بڕگــەی دووەم: مەبەســت لــە خاڵــەکان و وێنــەی وشــەکان چییــە؟!:

**أ ـ (نقـط):** بریتییـە لـە دانـانی خاڵێـک، یـان دوو خـاڵ یان چەنـد خاڵێک لەسـەر ئـەو پیتە، یاخود خاڵێـک یان دوان لەژێـر پیتەکەدا، بۆ ئـەوەی ئەو پیتە جیابێتـەوە لـەو پیتـەی دیکەی لە نووسـیندا پێـی دەچـێ، وەک (ب و ت).

(ب)و (ت) وێنـە (رسـم)ە کەیـان وەک یـەک دەنـووسرێ، بـەڵام بـۆ جیاکردنـەوەی (ب) لـە (ت) نوختەیـەک خراوەتـە ژێـر بـێ (ب)و، دوو نوختـە لەسـەر (ت) دانـراون، ئـەو کاتـە دەزانـرێ کامیـان (ب)و کامیـان (ت)ە.

هەروەهـا (ر) و (ز)، بـە هەمـان شـێوە، بێگومـان ئـەو پیتانـە لەیـەک جیـا دەکرێنـەوە بـە هـۆی ئـەو خاڵانـەوە، ئنجا ئـەوە کاتی خـۆی پێیگوتـراوە: ئیعجـام، (الإعجـام) واتـە: دانـانی خاڵـەکان لەسـەر پیتـەکان.

**ب ـ شَكْل:** [الشكل هو الضبط بالحركات].

شەکل بریتییە لە کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستن بەهۆی جووڵەکانەوە.

بـۆ وێنـە: ئەگـەر پیتێـک سـەر(فتحة)ی لەسـەر بـێ، دەزانیـن بـە سـەر دەخوێندرێتـەوە، وەک (بَ) (بـە) بـەڵام ئەگـەر ژێـری هەبـێ،(ب) بـە (بی) دەخوێندرێتـەوە، هەروەهـا ئەگـەر بۆر(ضمـة)ی لەسـەربێ، (بُ) ئەوکاتـە دەگوتـرێ: (بـو).

گومـانی تێـدا نیـە کـە هـەم دانـانی خاڵـەکان لەسـەر پیتـەکان، هـەم دانـانی جووڵـەکانی ئیعـڕاب لەسـەر پیتـەکان، واتـە: سـەرو بـۆرو ژێـر، هەروەهـا زەنە(سکون)، ئەمانـە کاتی خـۆی لـە ڕێنووسـێکدا کـە موصحەفـی پـێ نـووسراوە، نەبـوون، بەڵکـو دوایـی زیادکـراون، تاکـو خەڵـک لـە خوێندنی قوڕئانـدا بەهەڵـەدا نەچـێ.

بۆیـە موصحەفـەکان بەپێـی ئـەو خوێنەرانـە کـە خوێندوویانـن، بـە پێی قورئـان خوێنـەکان، شـێوەی وشـەکان گـۆڕدراوە، بـۆ وێنـە: ئـەوەی کـە بەپێی خوێندنـەوەی (حفـص عـن عاصـم) دەخوێنـدرێ و، ئـەوەی دیکـەی بەپێـی خوێندنـەوەی (ورش عـن نافـع) دەخوێنـدرێ، هـەم لـە خـاڵ بەندییەکـەدا، لـە خاڵەکانـدا کـە دانـدراون، هـەم لـە شـەکڵدا، لـە جووڵـەی ئیعرابـدا، لێـک جیـاوازن.



## برگەی سێیەم: نیشانەكانی وەستان و، ئەوەی كە پێیانەوە پەیوەستە لە حوكمەكانی قورئانخوێندن:

بێگومان هەموو ئەو نیشانانەی كە دانراون بۆ وەستان، لە فڵان شوێن دەوەستی، نووسراوە: (ق) پیتی قاف دانـدراوە، یان پیتی جیم (ج) دانـدراوە، واتـە: دروستە بوەستی، یان پیتی (م) میم دانـدراوە، واتـە: پێویستە بوەستی، ئەمانە بێگومان بەشێک نین لە ڕێنووسی موصحەفی عوثمان، بەڵكو زانایان دوایی بە پێی جیاوازیی خوێندنەوەكان ئەوانەیان داناوە.

ئەو نیشانانەیان داناون، بۆ ئەوەی بزاندرێ لەكوێ دەوەستی و لەكوێ بێدەنگ دەبی؟ لەكوێ پێویستە بوەستی و لەكوێ دروستە بوەستی؟ یان دروستە نەوەستی؟ لەكوێ وەستان باشترە و لەكوێ نەوەستان باشترە؟ ئەوانە هەموویان زانایان بۆ چاكخوێندنەوەی قورئان، ئەو نیشانانەیان داناون و، كاتی خۆی لە ڕێنووسی موصحەفی عوثماندا، نەبوون.



## بڕگەی چوارەم: حوكمی پارێزگارییكردن لە ڕێنووسی عوثمان:

لـەو بـارەوە زانایـان ڕاجیـان و، كاتی خۆیـشی عوثمـان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـە لیژنـە چـوار قۆڵییەكـەی گـوت، بـە سـێ قورەیشـییەكان كـە بریتـی بـوون لـە: (عبداللـە بـن الزبیـر) و (سـعید بـن العـاص)و (عبدالرحمـن بـن الحـارث بـن هشـام) ئـەو سێیە قوڕەیشـیی بـوون، زەیـدی كـوڕی ثابیـت، مەدینەیـی بـوو، عوثمـان (خـوا لێـی ڕازی بـێ) پێیگوتـن: [إذا اختلفتـم و زیـد بـن ثابـت في شيء مـن القـرآن، وفي روایـة في عربیـة مـن عربیـة القـرآن، فاكتبـوا بلسـان قریـش، فإنمـا نـزل بلسـانهم، ففعلـوا][1].

عوثمـان خـوای لـێ ڕازی بـێ، كاتی خـۆی بـە لیژنـە چوارقۆڵییەكـەی خـۆی گـوت (كـە دەیانویسـت قورئـان لـە دوو توێـی دوو بەرگـدا وەك موصحەفێـك، هـەر لـە بـەر ڕۆشـنایی ئـەو پەڕانـەدا كـە هەبـوون و، كاتی خـۆی لەسـەردەمی ئەبوبەكـردا كۆكرابوونـەوە، بنووسـنەوە) ئەگـەر ئێـوە هـەر سێكتان لەگـەڵ زەیـدی كـوڕی سابیت لـە شـتێك لـە قورئانـدا، یـان لـە بـە عەرەبیـی نووسـینی قورئانـدا، كەوتنـە ڕا جیایـی، بـەزاری قوڕەیـش بینووسـن، چونكـە بـە زمـانی ئـەوان هاتۆتـە خـوار.

واتـە: زۆربـەی قورئـان بـە ڕەچاوكـردنی زار (لهجـة)ی قوڕەیـش هاتۆتـە خـوار، ئەوانیـش بـەو شـێوەیەیان كـردوە.

ئنجـا كـە ئـەو موصحەفـە، یاخـود ڕێنووسـی موصحـەف، پـاڵ دەدرێتـە لای عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لەبـەر ئەوەبـووە :كـە بـە فەرمـانی وی و، بەسەرپەرشـتیی وی، بـەو شـێوەیە نـووسراوە، ئەگـەر نـا هەمـوو مسـوڵمانان لەسـەری یـەك دەنـگ بـوون و، هیـچ موصحەفێـك

(١)- البخاري برقم: ٣٣١٥و٤٦٩٩و٤٧٠٢ عن أنس بن مالك.

دوایی نەگیراوەتەوە، مەگەر بە پێی ئەو ڕێنووسەی ئەو موصحەفە کە لە ڕۆژگار عوسماندا خوا لیی ڕازی بێ، ئەو لیژنە چوار قۆڵییە نووسیویانە.

هەر بۆیەش زۆربەی هەرە زۆری زانایان لە پێشین و لە دوایین، (من السلف والخلف) بە پێویستیان زانیوە کە پارێزگاریی بکرێ لە ڕێنووسی موصحەفی عوثمان و، بە هیچ جۆرێک گۆڕانی بەسەردا نەیەت.

هەڵبەتە ئەمە ڕای زۆرینەیەو، لەو بارەوەش بەڵگە زۆرن، کە ئەمە ڕای زۆرینەی هەرە زۆری زانایان بووە لە پێشین و پاشین، بۆ وێنە:

(أشهب بن عبدالعزيز) گێڕاویەتەوە دەڵێ:

[سُئلَ مالك فقيل: له: أرأيت مَنِ استكتب مصحفاً اليوم، أترى أن يُكْتَبَ على ما أحدث الناس من هجاء اليوم؟ فقال: لا أرى ذلك ولكن يكتب على الكَتْبة الأولى][1].

ئەشهەبی کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ: لە مالیک پرسیارکرا، پێی گوترا: ئایا ئەگەر کەسێک ئەمڕۆ موسحەفێک بنووسێ، پێت وایە ئەو شێوە نووسینەی کە ئێستا داهێندراوە، ڕەچاو بکرێ؟

ئەویش گوتی: ڕام وا نیە، بەڵکو دەبێ هەر بە شێوە نووسینی یەکەم بنووسرێ.

هەروەها لەو بارەوە (الإمام أبو عمر الداني) گوتوویەتی: [ولا مخالف له في ذلك من علماء الأمة][2].

واتە: هیچ ڕا جیاییکارێک نەبووە لەو بارەوە، لەنێو زانایانی ئۆممەتی ئیسلامدا.

واتە: هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوون، کە دەبێ ئەو

(١) - الداني في المقنع ص٩ و ١٠، المحكم في نقط المصاحف ص١١.
(٢)- المقنع، ص ١٠ .

ڕێنووسـه کـه کاتی خـۆی موصحەفـی پـێ نـووسراوه، ڕەچـاو بکـرێ.

شـایانی باسـه: ئـەو ڕێنووسـەی عوثمـان (خـوا لێـی ڕازی بـێ) کـه یەکـەم جـار لـه ڕۆژگاری ئـەودا موصحەفـی پێ نـووسراوه، هەمـوو قورئان خوێندنـه ڕاسـتەکانیش دەتوانـێ وەخـۆی بگـرێ.

بەڵـێ: ئـەو ڕێنووسـه بـه جۆرێکـه، کـه هەمـوو جـۆره قورئـان خوێندنـەکان دەتوانـێ تەحەممـول بـکات و هەڵبگـرێ، بـەڵام بێگومـان ئەگـەر ڕێنووسـەکه بگـۆڕدرێ، ئـەو کاتـه هەندێـک لـه خوێندنـەوەکانی قورئـان تەحەممـول نـاکات و، ناگونجـێ پێـی بخوێندرێـن.

هەڵبەتـه هەندێـک لـه زانایـان بـۆ وێنـه: (الباقـلاني) گوتوویـەتی: دروسـته بەپێـی ڕێنـووسی تـازەش قورئـان بنـووسرێ، بـەڵام ئـەو ڕایـه ڕاسـت نیـه، چونکـه ئەگـەر بێـت و ئـەو ڕێنووسـەی کاتی خـۆی قورئـانی پـێ نـووسراوه، بگـۆردرێ، وەک گوتمـان، هەندێـک لـه جـۆره قورئـان خوێندنـەوەکان بەپێـی ڕێنووسـی تـازه، وەخـۆ ناگیرێـن، ئـەوه کـه پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) فەرموویـەتی: [أنـزل القـرآن علـى سـبعة أحـرف]، قورئـان لەسـەر حـەوت پیتـان دابەزیـوه، واتـه: بـه حـەوت جـۆران دەخوێندرێتـەوه، کـه زانایـان لێـرەدا دەڵێـن:

مەبەسـتی پێغەمبـەر (عليـه الصـلاة والسـلام) ئەوەبـووه کـه لـەو بـارەوه پێشـتر قسـەمان لێکـرد، کـه دەگونجـێ حـەوت جـۆر گۆڕانکاریـی بـبن لـه خوێندنـەوەی هەندێـک لـه وشـەکانی قورئانـدا.

بـەڵام بێگومـان کاتێـک کەسێـک ئایەتێـک وەردەگـرێ لـه قورئـان، زانایـان دەڵێـن: بـه ڕێنـووسی تـازه بنـووسرێ، چونکـه ئـەو کاتـه حوکمـی موصحەفـی نیـه، بـەڵام لـه ڕاستییدا هـەر باشـتر وایـه کـه ڕاسـتەوخۆ لـه موصحەفـەوه وەربگیـرێ، وەک ئێسـتا بـاوه کـه موصحەفـەکان لـه ڕێـی

ئینتەرنێتەوە ڕێک بەڕێنووسی شکڵی خۆی، ئەو ئایەتە وەردەگیرێ، بەڵام ئەگەر کەسێک بە ڕێنووسی تازەش ئایەتێک یان چەند ئایەتێک بەکاربێنێ و بیاننووسێ، دروستە، لەبەر ئەوەی ئەو کاتە کەس ناڵێ: ئەوە موصحەفە، دەڵێن: ئەوە ئایەتێکە بەو جۆرە نووسراوە.

ئنجا لەوبارەوە با ڕای (لجنة الفتوى بالأزهر)یش بێنین ، لە کتێبی (معجم القرآت القرآنية مع مقدمة في القرآت وأشهر القرآء)دا دەڵێ:

[رأي لجنة الفتوى بالأزهر برسم المصحف][1].

کە ئەمە دەقی فەتوایەکەیانە، دەڵێ:

[ترى لجنة الفتوى بالأزهر رَفْضَ هذا الرسم والوقوف عند المأثور من كتابة المصحف وهجائه، وذلك لأن القرآن الكريم كتب وقت نزوله عن النبي (صلى الله عليه وسلم) ومضى عهده (صلى الله عليه وسلم) والقرآن على هذه الكَتْبة، ولم يحدث فيه تغيير ولا تبديل، وقد كُتِبَتْ به مصاحف عثمان، ووضعت على الأمصار لتكون إماماً المسلمين، وأقرَّ أصحابُ النبي (صلى الله عليه وسلم) عَمَلَ عثمان رضي الله عنه ولم يُخالِفْهُ أحدٌ فيما فعل: واستمرّ المصحف مكتوباً بهذا الرسم في عهد بقية الصحابة والتابعين وتابعي التابعين والأئمة المجتهدين في عصور مختلفة، ولم ينقل عن أحد من هؤلاء جميعاً، أنه رأى تغيير هجاء المصحف عمّا رسم به أولاً إلى تلك القواعد التي حدثت في عهد آزدهار التأليف والتدوين في البصرة والكوفة، بل ظَلَّ مصطلح القرآن قائماً مستقلاً بنفسه بعيداً عن التأثّر بتلك القواعد.

وأما ما رآه أبو بكر الباقلاني أن الرسم العثماني، لايلزم أن يتبع في

(١)- ج١ ص٤٢ ط٢.

كتابـة المصحـف، هـو رأي ضعيـف لأن الأئمـة في جميـع العصـور المختلفـة درجـوا عـلى الإلتـزام بكتابـة المصحـف، ولأن سـدَّ ذرائـع الفسـاد مهـما كانـت بعيـدةً، أصـل مـن أصـول الشريعـة الإسـلامية التـي تُبْنـى الأحـكامُ عليهـا، ومـا كان موقـف الأئمـة مـن الرسـم العثـماني، إلاّ بدافـع هـذا الأصـل العظيـم في حفـظ القـرآن وصونـه][1].

دەڵـێ: لیژنـەی فەتـوای ئەزهـەر پێـی وایـە: ئـەو ڕێنـووسی تـازە، ڕەفـز بكـرێ و ئـەوەی، كـە كاتی خـۆی بـووە هـەر لەسـەر ئـەوە بوەسـتێ، لـە نووسـینی موصحەفـداو لـە خوێندنـەوەی موصحەفـدا، چونكـە قورئـانی كەریـم كاتی خـۆی، كـە دابەزیـوە لەسـەر پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) ڕۆژگاری پێغەمبەریـش (عليـه الصلاة والسـلام) تێپەڕیـوەو قورئان بـەو شـێوەیە نـووسراوەو هیـچ گـۆڕان و دەسـتكاریی تێـدا نەكـراوە.

موصحەفـەكانی ڕۆژگاری عوثمانیـش هـەر بـەو ڕێنووسـە نووسراون و، دوایـی بەسـەر شـارەكاندا دابەشـكراون، تاكـو بـبن بـە پێشـەوا بـۆ مسـوڵمانان.

هـاوەڵانی پێغەمبەریـش (عليـه الصـلاة والسـلام) كردەوەكـەی عوسـمانیان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـە چـاك دانـاوەو هیـچ كـەس لـەوەدا كـە كردوویـەتی، ڕا جیایـی نەبـووە لەگەڵـی دا، موصحـەف هـەر بـەو شـێوەیە نـووسراوەو لەسـەر ئـەو ڕێنووسـە، لەسـەر دەمـی هـاوەڵان، دوایی شـوێنكەوتوانیان، دوایـی شـوێنكەوتوانی شـوێنكەوتوان و، پێشـەوایانی موجتەهیـد لـە ڕۆژگارە جیاوازەكانیانـدا، هیـچ كـەس ڕا جیایـی نەبـووە لەوانـە كـە ڕێنووسـی موصحـەف بگـۆڕدرێ، كـە یەكەمجـار پێـی نـووسراوە، بـەرەو ئـەو بنچینانـەی كـە دوایـی لـە كاتێكـدا نووسـین

(١) - معجم القرآت القرآنية ج١ ص٤٢ - ٤٣ في مجلة الأزهرج٧، ص٧٣١.

گەشـەی کـردوە لـە (بەسـرەو کووفـە)، هێندێـک بنچنـە داهێـنراون، بگوازرێتەوە بۆ ئەو بنچینە تازانە، بەڵکو نووسینی قورئان و ڕێنووسی قورئان هەر بەو شێوەیە، سەربەخۆ بووەو بەدوور بووە لەو بنچینانە!
ئەوەش ئەبوبەکری باقلانیی پێی وابووە کە ڕێنووسی عوسمان خوا لێی، ڕازی بێ پابەندکەر نیە لە نووسینی موصحەفدا، ئەوە ڕایەکی بێهێزە، چونکە تێکڕای پێشەوایان لە هەموو ڕۆژگارە جۆراو جۆرەکاندا پابەندبوون بەو ڕێنووسەوە، لە نووسینی موصحەفداو، چونکە ئەوە ڕێگرێکیشە لە تێکچوونەکان و ڕێگرتن لە تێکچوون و پەیدابوونی هەڵەش، یەکێکە لە بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلامیی کە حوکمەکانی لەسەر بنیات دەندرێن و، ئەو هەڵوێستەی پێشەوایانیش لە ڕێنووسی عوسمانیی (خوا لێی ڕازی بێ)، تەنیا بەو هاندەرەوە بووە، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە پێی دەگوترێ: (سد الذرائع) ڕێگرتن لە تێکچوون و لادان، بۆ ئەوەی قورئان بپارێزرێ و بەسەلامەتیی وەک خۆی بمێنێتەوە.



بەڕێزان!

ئایا قورئان چۆن لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) گوازراوەتەوە بۆ هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ و، لە هاوەڵانەوە بۆ جیلی دوای خۆیان، شوێنکەوتوان (التابعین)و، لەوانیشەوە بۆ شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان (تابعوا التابعین)و لەوانیشەوە پێ بەپێ تاکو گەیشتووەتە ئێمە؟

ئێمە لێرەدا پێویستە سەرەتا پێناسەی تەواتور (التواتر) بکەین، چونکە قورئان هەمووی بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە.

بۆیە لەپێشدا پێناسەی تەواتور دەکەین، دوایی پێناسەی گواستنەوەی قورئان دەکەین بۆ ئێمە، دواییش ئەو شوبهەو تۆمەتانەی کە لەسەر گواستنەوەی قورئان هەن، کە حەوت شوبهەن، بەگشتیی، یەک بەیەک هەڵیان دەوەشێنینەوە.

کەواتە: ئەم تەوەرە لە سێ بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەکەم: پێناسەی تەواتور:

أ. لەڕووی زمانەوانییەوە:

[التواتر في اللغة: قال الجوهري واترتُ الكتب فتواترت، أي جاءت بعضها في إثر بعض،وِتْراً وِتراً من غير أن تنقطع][1].

[الجوهري] لە [الصحاح] دا دەڵێ: [واترتُ الكُتُبَ فتواترت]، نووسینەکانم یەک بە دوای یەکدا ڕەوان کردن، ڕەوان کران، واتە: یەک لە دوای یەک هاتن، بێ ئەوەی دابڕێن و بپچڕێن.

(١)- الصحاح مادة: وتر.

هەروەها لە: (تاج العروس من جواهر القاموس)دا کە شەرحی (القاموس المحیط)ە هی (الزبیدي)[1] دەڵێ:

[أصل هذا من الوتر، وهو فرد، وهو أنيِّ جعلتُ كلَّ واحد بعد صاحبه فرداً فرداً، والخبر المتواتر أن يُحَدِّثَهُ واحد بعد واحد، وكذلك خبر الواحد مثل المتواتر].

دەڵێ: متەواتیر، بنچینەکەی لەوەترەوە هاتووە، وەتر بە مانای تاک، ئەویش ئەوەیە کە من هەر کامێک لە تاکەکانم جیاکردۆتەوە لە هاوەڵەکەی و تاک تاک بوون ، هەواڵی موتەواتیر ئەوەیە کە یەک لە دوای یەک، ئەو هەواڵە بگێڕنەوە، هەروەها هەواڵی تاکیش وەک هەواڵی موتەواتیرە [بەڵام هەواڵی تاک یەکێک دەیگێڕێتەوە، بەڵام هەواڵی موتەواتیر یەک لەدوای یەک دەیگێڕنەوە].

کەواتە: لەڕووی زمانەوانییەوە ،تەواتور لە گواستنەوەی هەواڵێکدا ئەوەیە کە گێڕەرەوانی ئەو هەواڵە، یەک لە دوای یەک بێن، هەر کامێکیان لەدوای ئەوی دیکە بێ، بەبێ دابڕان.

ب. لە ڕووی زاراوەییەوە: ڕاجیایی زانایان هەبووە کە ئایا (التواتر) چییە؟ بەڵام هەموویان لەسەر شتێک یەکدەنگن:

[إتفقوا على أن التواتر في الأخبار هو ما أفاد القطع بصحتها وأسقط الظن].

هەواڵی موتەواتیر ئەوەیە کە یەکلاییکردنەوەو دڵنیایی بگەیەنێ و، گومان و دوو دڵیی لابەرێ.

یانی: هەر هەواڵێ دڵنیایی کردنی گەیاندو، دوو دڵیی لادا، ئەوە پێی دەگوترێ: هەواڵێکی موتەواتیر.

---

(١)- ج١٤ ص ٣٣٨.

بەڵام هەندێک لە زانایان ژمارەیان بە مەرج گرتوەو گوتوویانە : هەواڵی موتەواتیر ئەوەیە ژمارەیەک کە نەگونجێ لەسەر درۆ کۆببنەوە، هەواڵێک ببیستن و بیگەیەنن بە ژمارەیەک لە دوای خۆیان، کە نەگونجێ لەسەر درۆ کۆببنەوە، بەو شێوەیە تاکو دەگاتە ئێمە.

بەڵام هەندێک لە زانایان گوتوویانە: لەبەرئەوەی ڕا جیایی هەبووە لە ژمارەی ئەو کەسانەدا کە دەبێ ئەو هەواڵە بگوازنەوە، بۆیە گوتوویانە: باشتر وایە بگوترێ: هەواڵی موتەواتیر ئەوەیە کە زانیاریی بگەیەنێت و لێی دڵنیابین کە ئەو هەواڵە ڕاستەو، هیچ دوو دڵیی و گومانی تێدانیە.

چونکە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) قورئانی لە جیبریلەوە وەرگرتوەو گێڕاویەتەوە، جیبریلیش - عليه السلام - لە خوای پەروەردگاری گێڕاوەتەوە، کە بێگومان هەم جیبریل کە لە خوای پەروەردگاری وەرگرتوە تاکەو، هەم پێغەمبەریش - عليه الصلاة والسلام کە لە جیبریلی وەرگرتوە، تاکە، بەڵام لە سەداسەد (١٠٠/١٠٠) لێیشی دڵنیاین کە ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە جیبریلی وەرگرتوەو، ئەوەی جیبریل لە خوای پەروەردگاری وەرگرتوە،ڕاستە هەرچەندە ژمارەیەکی زۆریش نین، بەڵکو تاک لە تاکی وەرگرتوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە لەو هەواڵە دڵنیاو پشت ئەستوورین، کەواتە: ئەگەر بگوترێ: هەواڵی موتەواتیر هەواڵێک کە دڵنیاکەربێ، ئەو کاتە چەمک و واتایەکەی ئەوەش دەگرێتەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە جیبریل و جیبریل لە خوای پەروەردگاری وەرگرتوە.

دەشگونجێ بڵێین: ئەوەی پێغەمبەری خاتەم (عليه الصلاة والسلام) لە جیبریلی وەرگرتوەو، جیبریل لە خوای بەرزومەزنی

وەرگرتوە، شتێکی تایبەتە، بەڵام بۆ هەواڵە کانی دیکە کاتێک مرۆڤ لێیان دڵنیا دەبێ کە ژمارەیەکی دڵنیاکەر هەبن، بەڵێ ژمارەکە ڕا جیایی تێدایە، هەندێکیان گوتوویانە: دە (١٠) کەس، هەندێکیان گوتوویانە: بیست یان سی، یان چل، یان سەد، بەڵام ئەوە ڕەنگە بەپێی هەواڵەکانیش بگۆڕێ و، دەبێ ژمارەیەکی وابن مرۆڤ دڵنیابێ کە تێیدا بەهەڵەدا نەچوون و، لەسەر درۆ و هەڵەش کۆنەبوونەتەوە.



## بڕگەی دووەم: پێناسەی گواستنەوەی قورئان (نقل القرآن):

بێگومـان قورئـان سـەرەتا پێغەمبـەری خاتـەم (صـلی اللـه علیه وسـلم) بـە تـاک لـە جیبریـلی وەرگرتـوەو، جیبریلیـش لـە خـوای پـەروەردگاری وەرگرتـوە، بـەڵام دوای ئـەوەی کـە پێغەمبـەری خاتـەم ((صـلی اللـه علیـه وسـلم)) ـ کـە ئێمـە بـە موعجیزەکـەی و بـە حـاڵ و سـیفەتەکانی دڵنیابوویـن کـە پێغەمبـەری خوایـەو ڕاسـتگۆیە -گەیاندوویـەتی بـە هـاوەڵان و بـە ئۆممـەت، ئەوکاتـە قورئـان هەمـوو ئۆممـەت هەڵیگرتـوە و هـەزاران لـە هـاوەڵان - خـوا لێیـان ڕازی بـێ - کـەم و زۆر قورئانیـان لەبـەر بـووە لـە سینەیانداو، نووسـیویانەتەوە، هەتـا دوایـی لـە دوو توێـی موصحەفێکـدا لـە ڕۆژگاری عوثمانـدا کۆکراوەتـەوەو دابـەش کـراوە بەسـەر شـارەکاندا.

کەواتە: ئەم قورئانەی کە ئێسـتا لەبەر دەسـتی ئێمەدایە، ئەم موصحەفە، هـاوەڵان - خـوا لێیـان ڕازی بـێ ـ کـە لـە حەجـی ماڵئاواییـدا بەپێـی هەنـدێ گێـڕدراوان دەڵێـن: سـەد هـەزار(١٠٠٠٠٠)و بەپێـی هەندێـک گێـڕدراوەش: سـەدو بیسـت هـەزار (١٢٠٠٠٠) کـەس بوون ـ ئەوانـە هەموویان کـەم و زۆر لـە قورئـان شـارەزابوون و ئەوانیـش قورئانیـان بە ئێمـە گەیاندوە.

کەواتـە: لەڕاسـتییدا ئەم قورئانـە ئۆممەتی پێغەمبـەر - (صلی الله علیه وسـلم)- هەمـووی لـە ڕۆژگاری خۆیدا هەڵیگرتـوە، هـاوەڵان گەیاندوویانە بە جیلـی دوای خۆیـان کە شـوێن کەوتوانـن و، ئەوانیـش بە جیلـی دوای خۆیان، هەتا گەیشـتۆتە ئێمە، بە دوو شـێوە: هەم بە شـێوەی نووسـین، لە موصحەفداو لـە موصحەفەکانـدا، هەم بە شـێوەی لەبەرکـردن لە عەقڵ و سـینەکانیاندا.

## بڕگـەی سـێیەم: ئـەو شـوبهانەی هـەن لـە بـارەی گواسـتنەوەی قورئانـەوە:

سـەرجەم ئـەو شـوبهانە دەتوانیـن بڵێیـن: حـەوت شـوبهەن، کـە ئێمـە بەڕیـز دەیانهێنیـن، وەک لـەو کتێبـەدان کـە لێـی نەقـڵ دەکەیـن: [المقدمات الأساسـية فـی علـوم القـرآن] :

**شــوبهەی یەکــەم:** هەڵوێســتی عبداللـــە ی کــوڕی مەســعوود لــە کۆکردنـەوەی عوسـمان (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـە دانـانی لیژنەیەکـی چـوار قۆڵیـی و، کۆکردنـەوەی قورئـان بـەو شـێوەیە لـە دوو توێـی دوو بەرگـدا، پێشــتر باســمانکرد کــە عبداللــە ی کــوڕی مەســعوود ڕەخنــەی هەبــوو لــە لیژنــە چوارقۆڵییەکــە، هەروەهــا دەربــارەی: موعەووزیزەتەیــن، ســووڕەتی (فەلـەق) و سـووڕەتی (نـاس) کـە لـە موصحەفەکـەی خۆیـدا نەینووسـیون و گوتوویــەتی: بەڵــێ خــوا بــۆ پێغەمبــەری دابەزانــدوون (علیــه الصــلاة والسـلام) بـەڵام دوو دوعابـوون پەنـای پـێ بەخـوا گرتوون و، پێیـان لەخوای بەخشــندە پاڕاوەتــەوە، کــە پێشــتر لەوبــارەوە قســەمانکردو پێویســت نــاکا دووبــارەی بکەینــەوە، باسیشــمانکرد کــە عبداللــە ی کــوڕی مەســعوودیش، لــە کۆتاییــدا گەڕاوەتــەوە بــۆ ڕای تێکــڕای هــاوەڵان و گوتوویــەتی: خوێندنــەوەکانی قورئــان لێــک نزیکــن و، وازی لــە ڕیزپەڕیــی (شــذوذ) ەکـەی خـۆی هێنـاوە.

**شــوبهەی دووەم:** بــاس کــراوە کــە موصحەفەکــەی ئوبــەی کــوڕی کەعــب هەندێــک شــتی تێدابــووە، کــە لــەو موصحەفــەی ئێســتا لەبەردەســتی ئێمــەدا هەیــە، نیــە!

ئوبـەی کـوڕی کەعـب کـە یەکێـک بـووە لـەو کەسانەی پێغەمبـەر

(علیـه الصـلاة والسـلام) مەدحـی کـردوون لەبـارەی شـارەزاییانەوە لـە قورئانـداو ، ئوبـەی کـوڕی کەعـب یەکێـک بـووە لـە زۆر شـارەزایان لـە قورئانـدا، وەک لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا (صـلی اللـه علیه وسـلم) هاتوە، ئـەو قسـەیەش وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە دەگونجـێ ئوبـەی هەنـدێ شـتی وەک تەفسـیر و لێکدانـەوەی هێندێـک ئایەتـان نووسـیبێ، یـان وشـەیەک لـە قورئانـدا هاتـوەو، وشـەیەک کـە پێـی وابـووە تەفسـیری ئەو وشـەیەیە، هێنابێتـی!، هەندێکـی دیکـەش گوتوویانـە: دەگونجـێ هێندێـک قورئـان کـە نەسـخ کرابێتـەوە، ئوبـەی کـوڕی کەعـب هێنابێتـی لـە موصحەفەکەی خۆیـدا، بـەڵام ئـەوە هەمـووی هـەر قسـەیەو گریمانەیـەو، ئـەوەی گرنگـە ئەوەیـە کـە ئوبـەی کـوڕی کەعـب نکووڵیـی نەکـردوە لـەوەی عوسـمان کردوویـەتی و، لـەو بـارەوەش ئـەم شـوێنەوارە دێنیـن:

**(عـن هـانيء البربـري مـولى عثمان قـال: كنت عند عثمان وهـم يَعْرِضون المصاحـف، أرسـلني بكتـف شـاة إلى أبيّ بـن كعب فيهـا (لم يتسـنّ) وفيها (لا تبديـل للخلـق) وفيهـا (فأمهـل الكافريـن) قـال: فدعـى بـدواة فمحـا إحـدى اللامـين وكتـب (لاتبديـل لخلـق اللـه) [الـروم ـ ٣٠] ومحـا فأَمهـل، وكتـب (فمَهّـل) [الطـارق آيـة ١٧] وكتـب [لَـم يَتَسـنَّه]، [البقـرة ٢٥٩] أَلْحَـقَ فيهـا الهاء)**[١].

کەواتـە: ئوبـەی کـوڕی کەعب هـەر پابەندبـووە بـەو موصحەفەوە کە لەسـەردەمی عوسـماندا (خـوا لێـی ڕازی بێ)، لیژنـە چوار قۆڵییەکـە ڕێکیان خسـتوە، هەروەها لـەڕووی ڕێنووسیشـەوە بە هەمان شـێوە.

**شـوبهەی سـێهەم:** قسـەیەکە دەڵـێ: هەندێـک هـەواڵ هاتـوون لەبارەی قورئانێکـەوە، کـە خوێندنەوەکەی نەسـخ کراوەتەوە، کە ئێمـە دوایی لەباسی

(١)- أبو عبيد في فضائل القرآن ص٢٨٦، - ومن طريقه ابن جرير في تفسيره ج٣ ص٣٨.

نەسخدا باسی ئەوە دەکەین و، تەوەرێکمان تایبەت کردوە بە (نەسخ)ەوە.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ڕایە، کە گوایە خوا هەندێک لە قورئانی دابەزاندوە، خوێندنەوەکەی نەسخ کراوەتەوە، بەڵام حوکمەکەی ماوەتەوە! ، ئەوە ڕایەکە لە ڕایەکانی زانایان و من ئەو ڕایەم پێ هەڵەیەو، پێم وایە هیچ شتێک لەو قورئانەی ئێستا لەبەردەستی ئێمەدا هەیە، ئەوە نیە کە نەسخ کرابێتەوەو خوێندنەوەکەی یان حوکمەکەی مابێ، هەڵبەتە دەگونجێ و ڕێی تێدەچێ خوا (سُبحانه وتعالى) هەندێک ئایەتی ناردبن و دوایی لایبردبن، حوکم و خوێندنەوەو هەموو شتێکیان، بەڵام من ئەوەش بە دوور دەزانم و، دەبێ بەڵگەیەک هەبێ لەسەر قورئان بوونی ئایەتێک، یان چەند ئایەتێک، بەڵگەی موتەواتیر هەبێ، چونکە قورئان بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، کە دوایی لەوبارەوە قسە دەکەین.

**شوبهەی چوارەم:** ئەوەیە کە هەندێک هەواڵ هاتوون کە گوایە هەندێک ئایەت زیادەیان تێدا هەیە.

با بۆ وێنە لەو بارەوە ئەم دەقە بێنین:

**(عن أسماء بنت يزيد رضي الله عنها قالت: سمعت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: (يا عبادي الذين أسرفوا على أنفسهم لاتقنطوا من رحمة الله إن الله يغفر الذنوب جميعاً ـ ولا يبالي ـ إنه هو الغفور الرحيم) الزمر آية ٥٣**[1]**.**

واتە: ئەسمائی کچی یەزید (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (صلى الله عليه وسلم) ئەو ئایەتەی دەخوێند:

[يا عبادي الذين أسرفوا على أنفسهم لاتقنطوا من رحمة الله إن

---

(١) - أحمد ج٦، ص٤٥٤ و ٤٥٩ و ٤٦٠ و ٤٦١، وعبد بن حميد برقم: ١٥٧٧ و الترمذي برقم: ٣١٣٥، والطبراني في الكبير برقم: ٢٤١٦١، والحاكم برقم: ١٩٨٢.

الله يغفر الذنوب جميعاً] دواییش فەرمووی: (ولا يبالي) گوێ ناداتێ (إنه هو الغفور الرحيم).

هەروەها لە دەقێکی دیکەدا لە عبدالله ی کوڕی مەسعوودەوە هاتوە گوتوویەتی: **(إن أكبر آية في القرآن فرحاً آية في سورة الغرف: قل يا عبادي الذين أسرفوا على أنفسهم لاتقنطوا من رحمة الله إن الله يغفر الذنوب جميعاً) إن شاء**[1].

عبدالله ی کوڕی مەسعوود گوتوویەتی: ئایەتێک کە لە هەموو قورئاندا جێگای گەورەترین دڵخۆشییە، ئەو ئایەتەیە لە سووڕەتی (الغرف)دا کە دەفەرموێ: بڵێ ئەی ئەو بەندانەم، کە بەرامبەر بە خۆتان زێدە ڕۆییتان کردوە! لەبەزەیی خوا نائومێد مەبن، خوا لە هەموو گوناهان تێکڕا دەبووری، (إن شاء) ئەگەر بیەوێ.

هەروەها لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاسەوە ئەمە هاتوە:

أنه كان يقرأ هذه الآية:

[وإن كان رجل يورث كلالة أو امرأة وله أخ أو أخت، لأم] - النساء - ١٢- واتە وشەی (لأمٍّ)ی زیاد کردوە[2].

بەڵام ئەمانە و هاو وێنەکانیان، ناگونجێ ڕەخنەیان پێ بگیرێ، لە ئەوە کە هەموو هاوەڵان لەسەر کتێبی خوا کۆبوونەتەوە، چونکە ئەمانە لە دوو ئەگەران بەدەرنین:

**ئەگەری یەکەم:** یان زیادەیەکە بۆ تەفسیرکردنی ئەو ئایەتەو، یەکێک لە هاوەڵان زیادی کردوە، یان لە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) بیستوە ،کە زیادی کردوە، بۆ ڕوونکردنەوەی چەمک و واتایەکەی.

(١)- أخرجه الطبراني: ج٩ ص ١٤٢، وإسناده صحيح.
(٢)- أثر صالح الإسناد، أخرجه الدارمي - في المسند: ٢٨٦٣ وأبو عبيد في فضائل القرآن: ٢٩٧، وابن ابي حاتم: ٤٩٣٦.

**ئەگـەری دووەم:** ئەوەیـە کـە ئـەم زیادەیـە قورئانێـک بووبـێ، نەسـخ کرابێتـەوە، کـە مـن ئـەو ڕایـەم پـێ بێهێـزەو، پێـم وایـە هەمـوو ئەو وشـانە زیـاد کـراون، بـۆ زیـادە تیشـک خسـتنە سـەر چەمـک و واتـای ئـەو ئایەتە موبارەکانە.

**شـوبهەی پێنجـەم:** گوایـە لـە بـەر ئـەوەی لـە جەنگـەکانی هەڵگەڕاوانـدا، ژمارەیەکـی زۆر لـە هـاوەڵان شـەهید کـراون، کـە قورئانیـان زۆر لـە لابـووە، ئـەو قورئانـەش بـە هـۆی کـوژرانی ئەوانـەوە فەوتـاوە!

بـەڵام بێگومـان ئـەو قسـەیە هیـچ نیـە، چونکـە ڕاسـتە ئەوانـەی لـە جەنگـەکانی هەڵگەڕاوانـدا، کـوژراون، قورئـان لەبـەر بـوون و شـارەزای قورئـان بـوون، بـەڵام لـە هیـچ ڕیوایەتێکـدا نەهاتـوە کـە ئـەو قورئانـەی ئـەوان لەبەریـان بـووە، هـاوەڵانی دیکـە - خـوا لێیـان ڕازی بـێ - لەبەریـان نەبـووە، بەڵـێ ئەوانیـش قورئانیـان لەبـەر بـووە، بـەڵام بێگومـان هاوەڵانـی دیکەیـش خـوا لێیـان ڕازی بـێ، هەمـان ئـەو قورئانـەی ئـەوان لەبەریـان بـووە، ئەوانیـش لەبەریـان بـووە، بۆیـە کـە ئـەوان شـەهید بـوون، ئـەوە هاندەرێـک بـووە کـە عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـۆ ئەبوبەکـر خـوا لێیـان ڕازی بـێ پێشـنیار بـکات، کـە قورئـان لـە دوو توێـی دوو بەرگـدا بنووسرێتـەوەو کۆبکرێتـەوە، گوتوویـەتی: چونکە دەگونجێ لە شـوێنەکانی دیکـەش هـاوەڵان شـەهید بـبن، ئنجـا نـەوەک هەندێـک لـە قورئـان زایـە ببـێ، ئـەوەش دووربینییـەک بـووە، بـەڵام مانـای وانیـە کـە ئـەو هاوەڵانەی دیکـەی شـەهید بـوون، بـەس ئـەوان ئـەو بەشـە قورئانەیـان لەبـەر بـووە!

**شوبهەی شەشەم:** لە دایکمان خاتو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە:

[عـن عائشـة رضي اللـه عنهـا قالـت: لقـد نزلـت آيـة الرجـم ورضاعـة الكبـير عـشراً، ولقـد كان في صحيفـة تحـت سريـري، فلـما مـات الرسـول

(صـلى اللـه عليـه وسـلم) وتشـاغلنا بموتـه، دخـل داجـن، فأكلهـا][١].

واتـە: دایکـمان خاتـو عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گوتوویـەتی: ئایـەتی بەردبارانکـردن و ئـەوە کـە دەبـێ پیـاوی بەتەمـەن، دە جـاران بخـوات، شـیری ئافرەتێـک بخواتـە:وە، لـە نووسراوێکـدا بـوون (لـە پەڕێکـدا) لـە ژێـر تەختەکـەی مـن (ئـەو شـوێنەی کـە لەسـەری دەخەوتـم) کاتێـک پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) کۆچـی دوایـی کـرد، ئێمـە بـە هـۆی مـردنی ئـەوەوە سـەرقاڵ بوویـن و، ئاژەڵێکـی دابەسـتەمان هەبـوو لەمـاڵ، هـات و خـواردی!!

بـەڵام ئەمـە بێگومـان لـە ڕووی سـەنەدەوە زانایـان بـە گێڕدراوەیەکـی هەڵەیـان دانـاوەو، لـەو بـارەوە (د.عبداللـە بـن یوسـف الجديـع) لێکۆڵینەوەیەکـی باشـی کـردوە کـە کورتەکـەی ئەوەیـە: لـە ڕووی سـەنەدەوە ڕاسـت نیـەو، دایکـمان خاتـو عائیشـە - (خـوا لێـی ڕازی بـێ) - شـتی وای نەگوتـوە، بەڵکـو ئـەوە شـتێکی هەڵبەسـتراوە.[٢]

**شـوبهەی حەوتـەم و کۆتایـی:** ئەوەیـە کـە هەندێـک دەق پاڵدەدرێنـە لای قورئـان، کـە ئـەوەی پاڵیـان دەداتـە لای قورئـان، جگـە لـە لافلێـدان و دەعـوای ڕووت، هیـچ بەڵگەیەکـی بەدەسـتەوە نیـەو ناتوانـێ بـۆ هیچیـان سـەنەد بێنـێ.

بـۆ وێنـە: یەکێـک لـەو شـتانە ئەوەیـە کـە کاتی خـۆی (رافضـة) کـە جۆرێـک بـوون لـە شـیعەو، هەندێـک لـە زانایانیـش بـە هەمـوو شـیعە دەڵێـن ڕافیـزە، ئیددیعایـان کـردوە کـە سـووڕەتێک لـە قورئانـدا هاتـوە بـە نـاوی (سـورة الولايـة) کـە گوایـە حـەوت ئایـەت بـووە، لـە مەدحـی عـەلی

---

(١) - ابن ماجه: ١٩٤٤و أبو يعلى: ٤٥٨٧ - ٤٥٨٨.

(٢)- بڕوانە: المقدمات الأساسية في علوم القرآن، ص١٧٣ ـ ١٧٧ ، لەتەفسیری سوڕەتی (الأحزاب) ئەو شوبهەیەمان باش هەڵتەکاندووە.

کوڕی ئەبی تاڵیب دا (خوا لێی ڕازی بێ)ت! بەڵام ئەوە قسەیەکی پووچە، هەروەها هەندێک لە تێپەڕێنەرانی شیعە (غلاة الشيعة) کە شیعەی دوازدە ئیمامیی بەڕائەتیان لێ کردوون، گرنگ ئەوەیە شیعەی ئێستا هەموویان واتە: شیعەی دوانزە ئیمامیی و شیعەی زەیدیی هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن ئەو قوڕئانەی ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدا هەیە، هەر هەمان قوڕئانە بۆ پێغەمبەری خاتەم دابەزیوە (عليه الصلاة والسلام) و یەکەم جار لەسەردەمی ئەبوبەکرو، دوا جار لەسەردەمی عوسمان دا خوا لێی ڕازی بێت، لە نێوان دوو بەرگدا کۆکراوەتەوە، بەشێوەی ئەو موصحەفەی کە دەیبینین، هیچ زانایەکی شیعەی موعتەبەر نیە کە لەو بارەوە ئێستا لەم ڕۆژگاری ئێمەدا، قسەی لەسەر ئەوە هەبێ، بەڵێ کاتی خۆیشی هەندێک لە شیعە بوون کە قسەی جیاوازیان کردوە، بەڵام شیعەکانی ئێستا هەموویان دەڵێن: هەرکەسێک تانە (طعن) لە قوڕئان بدات، لەبازنەی ئیسلام دەچێتە دەر!!

بەڕێزان!

**ئێمە ئەم تەوەری سێزدەیەمە، لە چوار بڕگەدا دەخەینە ڕوو:**

**بڕگەی یەکەم** پێناسەی خوێندنەوەکانی قورئان.

**بڕگەی دووەم:** جۆرەکانی خوێندنەوەکانی قورئان.

**بڕگەی سێیەم:** مەرجەکانی ڕاستیی خوێندنەوەکانی قورئان.

**بڕگەی چوارەم:** سوودەکانی جیاوازیی خوێندنەوەکانی قورئان.

## بڕگەی یەکەم : پێناسەی خوێندنەوەکانی قورئان:

[القراءات جمع قراءة، وهي مذهب من مذاهب النطق في القرآن، يذهب به إمام من القُرّاء مذهباً يخالف غيره، مع الموافقة لرسم المصحف وثبوت الإسناد إلى النبيِّ - (صلى الله عليه وسلم) -].

ئەمە پێناسەیەکی کورت و پوختە:

واتە: خوێندنەوەکان کۆی خوێندنەوەیە، کە بریتییە لە بۆچوونێک لە بۆچوونەکانی گۆ کردن بە قورئان، کە پێشەوایەک لە پێشەوایەکانی قورئان خوێنان تەبەننیی دەکات و، جیایە لە هی جگەلە خۆی لە قورئان خوێنەکان، بەڵام بەپێی ڕێنووسی موصحەفە و لە ڕووی سەنەدیشەوە، چەسپاوەو پاڵدەدرێتە لای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام).

کەواتە: خوێندنەوەکانی قورئان، ئەو جۆرە خوێندنەوانەن کە لە ڕووی پاڵدرانیان بۆ لای پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) چەسپاون.

هەروەها لە ڕووی تەباییانەوە لەگەڵ ڕێنووسی موصحەفدا، کە لەبەردەستمانە، گونجاون.

## بڕگەی دووەم: جۆرەکانی خوێندنەوەکانی قورئان:

خوێندنەوەکانی قورئان زانایان دابەشیان کردوون بۆ چوار جۆر:

**جۆری یەکەم:** موتەواتیر(المتواتر) ئەویش ئەوەیە هەموو قورئان خوێنەکان، ئەوەی کە بە ڕاستیی و دروستیی لێیانەوە گوازراوەتەوە، لەسەری یەکدەنگبوون، کە زۆربەی هەرە زۆری قورئان بەو شێوەیە خوێندراوەو، زۆرێک لە زانایانیش ئەو قورئانەی کە بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، کورتی دەکەنەوە لە حەوت قورئان خوێنەکاندا، کە دوایی باسیان دەکەین، وەک (عاصم و نافع) و هەندێکیان لە دە (١٠) قورئان خوێنەکاندا کورتی هەڵدێنن، بەڵام ڕای دیکەش هەیە، کە دەڵێ: مەرج نیە لەو حەوت قورئان خوێنەدا کورت هەڵاتبێ، هەروەها مەرجیش نیە تەنیا لە دەیەکانیشدا کورت هەڵاتبێ.

ئنجا هەڵەیە کە بگوترێ: حەوت جۆرە قورئان خوێندنەکان (القراءات السّبع) هەموویان موتەواتیرن، بەڵکو تەواتور ئەوەیە کە بەشێک لەو قورئانخوێندنە، حەوتەکانیان یان دەیەکان، واتە: حەوت قورئانخوێنە سەرەکییەکان یاخود دەیەکان، لەسەری یەکدەنگ بووبن.

بەڵام بێگومان ئەگەر یەکێک لەو پێشەوایانە، بە تەنیا، شتێکی بە تایبەت خوێندبێتەوە، ئەو کاتە بە تەواتور دانانرێ، بەڵکو دەبێ هەموو قورئانخوێنەکان، هەر حەوتیان یان هەر دە یان، یاخود زۆربەیان لەسەر جۆرێک لە قورئانخوێندن یەکدەنگ بووبن، ئەوجار بە تەواتور لەقەڵەم دەدرێ.

بەڵام ئەگەر تەنیا یەکێکیان، بە جۆرێک ڕستەیەکی خوێندۆتەوە، کە لە حەوتەکانیشەو لە دەیەکانیشە، ئەوە بەتەواتور لەقەڵەم نادرێ، مادام بە تەنیا ڕای خۆی بێ.

**جۆری دووەم:** باو (المشهورة) :

ئەویش ئەوەیە کە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاستەو، لەلای قورئان خوێنەکان زاندراوە، بێ ئەوەی هیچ کامیان نکوولّیی لێ بکەن، بەڵام نەگەیشتۆتە ڕاددەی تەواتور، لەگەڵ ئەوەشدا کە لەگەڵ ڕێنووسی عوسمان و زمانی عەرەبییشدا دێتەوە.

ئەوەیش وێنەی ئەو شوێنانەی کە حەوت قورئان خوێنەکان، یان دە یەکان، ڕاجیاییان لەبارەیەوە هەیە، لەو بارەوەش کتێب زۆر نووسراون، بۆ وێنە: (التيسير لأبي عُمَر الداني) هەورەها (الشاطبية لأبي القاسم بن فرا الأندلسي) و (النشر لابن الجزري)، کە ڕەنگە لە هەموویان گرنگتر (النشر لابن الجزري) بێ، لەبارەی ڕاجیایی قورئان خوێنەکان حەوتەکان، یاخود دەیەکانەوە، لە خوێندنەوەی هەندێک لە وشاندا.

**جۆری سێیەم:** یەکەکان (الآحاد):

ئەویش ئەوەیە کە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاستبێ، بەڵام لە ڕووی ڕێنووسی عوسمانییەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، جیاوازبێ.

وەک زۆرێک لەو خوێندنەوانەی کە گێڕدراوەنەوە لە هەندێک لە هاوەڵانەوە، کە وەک چۆن فەرموودەیان لێوە گێڕدراوەتەوەو وەردەگیرێ، ئەو قورئان خوێندنەشیان لێوە گێڕدراوەتەوەو وەردەگیرێ.

وەک خوێندنەوەی عبداللە ی کوڕی مەسعوودو ئەبی دەردا، خوا لێیان ڕازی بێ کە خوێندوویانەتەوە:

(والليل إذا يغشى. والنهار إذا تجلّى. والذكر والأنثى).

لە جیاتی (وما خلق الذكر والأنثى)[1].

(١) - البخاري: ٣٥٣٢ و ٣٥٣٣ و ٣٥٥٠ و ٥٩٢٢.

بـەڵام بێگومـان ئـەوە بـە قورئـان دانانـدرێ، چونکـە لەڕێـی تاکـەکان (آحـاد)ەوە بـە ئێمـە گەیشـتوەو، عبداللـە ی کوڕی مەسـعوودو ئەبـوودەرداء خـوا لێیـان ڕازی بـێ وایـان خوێندووەتـەوە.

بـەڵام ئـەوەی کـە لـە موصحەفـدا هەیـەو، هـاوەڵان لەسـەری یەکدەنـگ بـوون، ئەوەیـە: (وماخلـق الذکـر والأنثـی) نـەک (والذکـر والأنثـی).

**جۆری چوارەم:** ڕیزپەڕ ( الشاذة):

کە بریتییە لەوەی گێڕدراوەتەوە، بەڵام سەنەدەکەی ڕاست نیە.

وەک خوێندنەوەی: (ملکا یوم الدین).

کـە ئەمـە پاڵدراوتـە لای هەندێـک لـە زانایـان، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە ئەمـە پێـی دەگوتـرێ: ڕیـز پـەڕو بێگومـان بە بەشـێک لـە قورئـان و، جۆرێک لە خوێندنـەوەکانی ڕاسـتی قورئـان دانانرێ.

شـایانی باسـە: زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کە دروسـت نیـە قورئان بـە خوێندنـەوەی ڕیزپـەڕ بخوێندرێتـەوە، هەروەهـا دروسـتیش نیـە خوێندنەوەی ڕیزپـەڕ پـاڵ بدرێتـە لای قورئان.

هەروەهـا خوێندنـەوەکانی کـە لـە ڕێـی ئاحـادەوە بـە ئێمـە گەیشـتوون، دیسـان زۆربـەی زانایـان ڕێگرییـان کـردوە لـەوە کـە قورئانیـان پـێ بخوێندرێ، چونکـە کاتێـک بـە قورئـان لەقەڵـەم دەدرێ، کـە بـە تەواتـور بـە ئێمـە گەیشـتبێ، واتـە: ئێمە دڵنیابیـن و، یەکلابووبینـەوە کە ئەوە فەرمایشـتی خوای پـەروەردگارەو، پێغەمبـەر (صـلی اللـە علیـە وسـلم) بـەو شـێوەیە خوێندیەتی و لـە جیبریـل وەری گرتـوە.

بـەڵام هەرشـتێک کـە ئەگـەری تێدابـێ و جێـی دڵنیایـی نەبـێ، بـە بەشـێک لـە قورئـان دانانـرێ.

هەڵبەتە لەو بارەوە ڕای دیکەی جیاوازیش هەیەو، ڕەنگە هەندێکیان بڵێن: با لە ڕێی فەرموودەی ئاحادیشەوە بە ئێمە گەیشتبێ، هەر دروستە قورئانی پێ بخوێندرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبێ بگوترێ: ئەوە بەشێک نیە لەو قورئانەی کە لە نێو موصحەفدا هەیە، بەڵام بەو جۆرەش خوێندراوەتەوە، بەڵام ئەو ڕایە بێهێزە.



## بڕگەی سێیەم: مەرجەکانی ڕاستیی خوێندنەوەکانی قورئان:

دەبـێ بزانیـن ،کـە ئـەو قورئـان خوێندنەوەیـە، ڕێـک و ڕاسـتە، کـە سـێ مەرجـی سـەرەکی تێـدا هەبـن، وەک پسـپۆڕانی ئـەو بـوارە گوتوویانـە، بـۆ نموونـە:

(إبـن الجـزري) لـە کتێبەکـەی خـۆی (النـشر في القـرءآت العـشر)دا، کە پێشـتریش باسـمانکرد، دەڵێ:

( كل قـراءة وافقـت العربيـة ولـو بوجـه، وافـق المصاحـف العثمانيـة، ولـو إحتـمالاً، وصـحَّ سـندها، فهـي القـراءة الصحيحـة التـي لا يجـوز ردُّهـا، ولا يحـلُّ إنكارهـا، بـل هـي مـن الأحـرف التـي نـزل بهـا القـرآن، ووجـب عـلى النـاس قبولهـا، سـواء كان عـن الأئمـة السـبعة، أم عـن العـشرة، أم عـن غيرهـم مـن الأئمـة المقبولـين.

ومتى اختلَّ ركن من هذه الأركان الثلاثة، أطلق عليها الضعيفة، أو الشاذة، أو الباطلة، سواء كانت عن السبعة، أم عَمَّن هو أكبر منهم، هذا هو الصحيح عند أئمة التحقيق من السلف والخلف، وصرَّح بذلك الحافظ أبو عمر عثمان بن سعيد الداني، ونصَّ عليه في غير موضع الإمام أبو محمد مكي بن أبي طالب، وكذلك الإمام أبو عباس أحمد بن عمار المعدوي، وحققه الإمام الحافظ أبو قاسم عبدالرحمن بن إسماعيل المعروف بأبي شامة، ومذهب السلف الذي لايعرف عن أحد منهم خلافه)[1].

ئیبنولجەزەریی دەڵێ: هەر خوێندنەوەیەکی قورئان، ئەو سێ مەرجەی تێدا بوون، ئەوە ڕێک و ڕاست و دروستە:

**مەرجی یەکەم:** ئەگەر بە ڕوویەک لە ڕووەکانیشەوەبێ، لەگەڵ زمانی عەرەبی دا بێتەوە.

---

(١)- ص ١٥.

**مەرجی دووەم:** ئەگەر بەشێهانە (احتمال)یش بێ، بە پێی یەکێک لە موصحەفەکانی ڕۆژگاری عوثمان بێ.

(کە گوتمان عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ) چوارو، هەندێک دەڵێن: حەوت و، هەندێک دەڵێن: هەشت، موصحەفی نووسیون و بەسەر شارەکاندا دابەشی کردوون، کە هەندێک لە موصحەفەکان لەگەڵ هەندێکیاندا لە ڕێنووسی هەندێ وشاندا، ڕاجیاییان هەبووە).

**مەرجی سێیەم:** هەروەها سەنەدەکەشی ڕاستبێ بۆ لای پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، ئەگەر وابوو- ئەوە قورئان خوێندنێکی ڕاستەو، ناگونجێ بەرپەرچ بدرێتەوەو نکوولیی لێ بکرێ، بەڵکو ئەوە لەو حەوت پیتانەیە کە قورئانیان پێ دابەزیوە و، لەسەر خەڵک پێویست بووە کە وەریان بگرن.

ئنجا ئایا ئەو شێوە قورئان خوێندنە، لە یەکێک لە حەوت پێشەوایەکانی قورئان خوێندنەوەبێ، یاخود لە یەکێک لە دەیەکانەوە بێ، یا خود لە یەکێ لە پێشەوایانی پەسەندەوە بێ.

بەڵام هەرکاتێک پایەیەک لەم سێ پایانە نەما، ئەوکاتە ئەو شێوە قورئان خوێندنە، پێی دەگوترێ: (ضعيفة) بێ هێز، یان (یە شاذة) ڕیز پەڕ، یان (باطلة) پووچ.

ئنجا ئەو شێوە قورئان خوێندنە لە یەکێک لە حەوتەکانەوەبێ، یاخود لەهی لەوانیش گەورترەوەبێ.

ئەوەیە ڕای ڕاست لەلای پێشەوایانی ساغکەرەوە لە پێشین و لە پاشین، هەر کام لە (الحافظ أبو عمر: عثمان بن سعيد الداني)، هەروەها لە (أبو محمد بن أبي طالب)، هەروەها (أبوالعباس أحمد بن عمار المهدوي)و (الإمام الحافظ أبو قاسم عبدالرحمن بن إسماعيل

المعروف بابن أبي شامة) ساغی کردوەتەوەو، ئەمە ئەو ڕای پێشینەیە کە نەزانراوە ڕا جیایی لە بارەیانەوە هەبێ.

لێرەدا پێویستە شتێکی دیکەش بزانین هەر (إبن االجزري) دەڵێ: (فإنَّ القراءات المنسوبة إلى كل قارئ من السبعة وغيرهم، منقسمة على المجمع عليه والشاذة، غير أن هؤلاء السبعة لشهرتهم وكثرة الصحيح المجتمع عليه في قراءاتهم، تركن النفس إلى ما نقل عنهم، فوق ما ينقل عن غيرهم)[1].

واتە: ئەو شێوە خوێندنانەی کە پاڵدەدرێنە لای هەر کام لە حەوت قورئان خوێنەکان (کە دوایی ناویان دێنین)و جگە لەوانیش، دابەش دەبن بۆ شێوە قورئان خوێندنێ کە یەکدەنگیی لەسەرە، هەروەها هی ڕیزپەڕیشیان تێدایە، بەڵام ئەو حەوتە لەبەر ئەوەی زیاتر ناوداربوون و، بە زۆریی ئەوەی لێیانەوە گوازراوەتەوە، ئەو شێوە قورئان خوێندنە بووە کە یەکدەنگیی لەسەر بووە، بۆیە نەفس زیاتر مەیل بەلای ئەوەدا دەکات کە لەوانەوە نەقڵ کراوە، زیاتر لەوەی کە لە جگە لەوانەوە گوازراوەتەوە.

کەواتە: دەبێ ئەم سێ مەرجە هەبن، بۆ هەر خوێندنێکی قورئان، بۆ ئەوەی بە ڕەسمیی بناسرێ و دانی پێدا بنرێ:

یەک: بە شێوەیەک لە شێوەکان لەگەڵ زمانی عەرەبییدا بگونجێ.

دوو: بە پێی ڕێنووسی عوسمان بێ خوای لێ ڕازی بێ، لەیەکێک لە موصحەفەکانی کە لە ڕۆژگاری عوسماندا بوون.

سێ: پێویستە سەنەدەکەی ڕاست بێ، بۆلای پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم).

---

(١)- سەرچاوەی پێشوو، ص ١٥ .

## بڕگەی چوارەم: سوودەکانی جیاوازیی قوڕئان خوێندنەکان.

ئایـا ئـەو شـێوە قوڕئـان خوێندنانـە، ئنجـا ئەگـەر حەوتـن، ئەگـەر دەن، سـوودی ئـەو جیاوازییانـە کـە لـە نێوانیانـدا هەیـە، چییـە؟ بـا تەماشـا بکەیـن:

بـەلای کەمــەوە ســێ ســوود هــەن، بــۆ جیاوازیــی خوێندنــەوەکانی قورئــان:

**ســوودی یەکــەم:** ســووککردن لەســەر ئۆممــەت (التخفيــف عــن الأمــة)و لابـردنی سـەغڵەتیی لەسـەریان، بـە تایبـەت ئـەوەی کـە پەیوەسـت دەبێتــەوە بــە چۆنیــەتی گۆکــردنی پیتــەکان و ســیفەتی پیتەکانــەوە.

چونکـە شـێوە قوڕئـان خوێندنێـک دەڵـێ: ئـەو پیتـە دەبـێ بـەو شـێوە گـۆ (تلفـظ) بکـرێ، شـێوە قوڕئـان خوێندنێکـی دیکـە دەڵـێ: نەخێـر بـەو شـێوەیە، یاخـود بـەو شـێوەیەش دروسـتە، ئنجـا ئـەوە دەبێتـە هۆی ئاسـانیی لەسـەر ئۆممـەت، بـۆ شـێوەی قوڕئـان خوێنـدن.

**سـوودی دووەم:** بریتییـە لـە دەرخسـتنی بەشـێکی دیکـە لـە ئیعجازی قورئـان، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە بـە زیاتـر لـە جۆرێـک دەخوێندرێتـەوە، چونکـە جـاری وا هەیـە پیتێـک یـان وشـەیەک بـە چـوار پێنـج جـۆر دەخوێندرێتـەوەو، هـەر کام لـەو جۆرانـە واتایەکـی هەیـە، کـە ئـەوەش مانـای قورئـان و واتـاکانی قوڕئـان فراوانـتر دەکات و، قوڕئـان لـە ڕووی واتاوەدەوڵەمەندتـر دەکات.

دەتوانین لەو بارەوە دوو وێنە بێنینەوە:

أ. خوا (سُبحانه وتعالى) لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى

ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾ المائـدة: ٦

ئەمـە لێـرەدا لـە خوێندنـەوەی نافیـع و ئیبنـو عامیـرو کیسـائیی و عاصیـم لـە ڕیوایەتێکـداو حەفـص، بـە سـەر (الفتحـة) خوێدراوتـەوە (وأرجلَکـم) کـە ئـەو کاتـە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ﴾ المائـدة: ٦

(وأرجلَکم) کەواتـە: شـۆردن (غسـل)ی بـە سـەردا دێتـەوە، واتـە: دەبـێ پێیەکانیش بشـۆردرێن، بەڵام ئـەوانی دیکە بە ژێر (الکسرة) خوێندوویانەتەوە، کـە ئـەو کاتە دەچێتەوە بۆ مەسـح و، دەگێڕدرێتـەوە بۆ (رؤوس) کـە وەک چۆن سـەر مەسـح دەکرێ، پێیەکانیش مەسـح بکرێن، ئنجا ئەم خوێندنـەوەی دووەم، مەسـحکردن لەسـەر هەردوو خوففەکان دەگەیەنێ لەلای زۆربەی هـەرە زۆری زانایان.

ب. وێنەیەکی دیکە، ئەوئایەتە موبارەکەیە:

﴿قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ١٣٦ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ١٣٧﴾ الشعراء.

خوێندراوەتەوە (إن هذا إلا خُلُق الأولين)، هەندێکیشیان خوێندوویانەتەوە: (خَلْـقُ الأولـين) ئەگـەر (خَلْـق) بـێ: (أي مـا جئـت بـه كَـذِبُ وآفـتراء الأولـين) ئـەوەی کـە هێناوتە، درۆو هەڵبەسـتنی پێشـووەکانە، بەڵام (خُلُـق الأولين) واتە: ئـەوە عادەتی پێشـووەکانە، مانـای وایە دوو مانایـان بەدەسـتەوە دەدات، بەپێی هـەردووک خوێندنەوەی (خَلْـق) و (خُلُق).

**سـوودی سـێیەم:** بۆ جیاوازییـەکانی خوێندنـەوەکانی قورئـان، ئەوەیە کە شـتێک لە ئایەتێکـدا هاتوە بە کورتیـی و، خوێندنەوەیەکی دیکـەی مانایەکەی زیاتـر ڕۆشـن دەکاتـەوە، بۆ وێنـە: ئایـەتی (٢٢٢) لە سـوورەتی (البقرة):

﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾ البقرة: ٢٢٢ .

ئەمە زۆربەی حەوت قورئان خوێنەکان وایان خوێندووەتەوە، بەڵام حەمزەو کیسائیی و لە ڕیوایەتێکیش لە عاصیمەوە بووە خوێندوویانەتەوە: (حتى يَطَّهَّرنَ)، خوێندنەوەی یەکەم جۆرێک لە کورتیی (إجمال)ی تێدایە، کە دەگونجێ مەبەست لە پاکبوونەوەی ئافرەتەکان، پاکبوونەوەیان بێ لە خوێن، تاکو خوێنی حەیزیان نامێنێ و لە حەیز دەچنەوە، بەڵام خوێندنەوەی دووەم، وێڕای ئەوە، ئەوەش دەگەیەنێ کەدەبێ دوای ئەوەی خوێنی حەزیشیان نەما، خۆیشیان بشۆن، کەواتە: خوێندنەوەی دووەم، زیاتر تیشک دەخاتە سەر واتای خوێندنەوەی یەکەم.



# تەوەری چواردەیەم

# پێشەوایانی قورئان خوێندن

# (أئمة القراءة)



بەڕێزان!

ئەم تەوەرەش لە پێنج بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەکەم: پێناسەی قورئانخوێندن:

بێگومـان قورئـان خوێنـدن، ڕێ و ڕەسـمێکە کـە لـە پێغەمبـەری خاتەمـەوە (صلی اللـە علیـە وسلم) بـە هـاوەڵانی گەیشـتوەو، لەهاوەڵانەوە بـە جیلـی دوای خۆیـان، شـوێن کەوتـوان و، لەوانیشـەوە بـەوانی دوای خۆیـان، تاکـو گەیشـتووەتە ئێمـە.

با لەو بارەوە چەند شوێنەوارێک بێنین:

١ـ لـەو بـارەوە لـە عـەلی کـوڕی ئەبـی تاڵیبـەوە خـوا لێـی ڕازی بـێ هاتـوە کـە گوتوویـەتی:

**[إن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يأمركم أن تقرؤوا كما عُلِّمتم]**[1]،

واتـە: پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللە علیـە وسـلم) فەرمانتـان پێدەکات کـە قورئـان بخوێننـەوە، وەک فێرکراون.

٢ـ **[عن زيد بن ثابت رضي الله عنه قال: القراءة سنة]**[2].

واتـە: زەیـدی کـوڕی سـابیت (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گوتوویـەتی: خوێندنـەوەی قورئـان ڕێ و شـوێنە.

واتە: ڕێ و شوێن و ڕێبازی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).

(١) - حديث صحيح أخرجه أبو عبيد في فضائل القرآن ص٣٦١، والبزّار :٤٤٩، عبدالله بن أحمد في زوائد المسند: ٨٣٢، وابن جرير ج١ ص١٢ والحاكم: ٢٨٨٥ - ٢٨٨٦. وإسناده جيد، وقال الحاكم: صحيح الإسناد.

(٢) - أخرجه سعيد بن منصور: ٦٧ فضائل القرآن، وأبو عبيد برقم: ٣٦١، والطبراني في الكبير ج٥ ص ١٤٥ – ١٤٦، وابن مجاهد في السبعة ص٥٠ -٥٢، والحاكم: ٢٨٨٧، والبيهقي في السنن: ج ٢ ص ٣٥٨، وفي الشعب: ٢٦٧٩، والخطيب في أخلاق الراوي: ١٥٩٦. قلت: وهذا إسناد حسن، وقال الحاكم: صحيح الإسناد.

**٣ـ [عن محمد بن المكندر قال: القراءة، يأخذها الآخر عن الأول]**[١].

واتـە: موحەممـەد بنولمونکەدیـر گوتوویـەتی: قورئـان خوێنـدن ڕێبازە، هـی دوایـە لـە هـی یەکەمـی وەردەگـرێ.

**٤ـ [عـن عـروة بـن الزّبـير قـال: إنمـا قـراءة القـرآن سـنة مـن السـنن فاقـرؤه كـما عُلِّمتمـوه]**[٢].

واتـە: عـوڕوەی کـوڕی زوبەیـر گوتوویـەتی: خوێندنـەوەی قورئـان ڕێبازێکـە لـە ڕێبـازەکان، (واتـە: ڕێبـازەکانی کـە پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) پێشـانی داویـن)، بۆیـە چـۆن فێرکـراون، ئـاوای بخوێننـەوە.

ئەم شوێنەوارانە ئەوە دەگەیەنن.

کـە خوێندنـەوەی قورئـان و کۆنترۆڵکـردنی خوێندنـەوەی قورئـان، دەبـێ لەڕێـی وەرگرتـن و بیسـتنەوە بێ، لـە زاری مامۆسـتایان و شـارەزایان و، تەنیـا بـەوە، کـە مـرۆڤ خـۆی موصحـەف بخوێنێتـەوە، فێـری نابـێ وەک پێویسـت، بەڵکـو پێویسـتە دەمـاو دەم وەربگیـرێ.

ئنجا ئـەم بڕگـەی یەکەمـە، بـە قسـەیەکی (أبـو عبيـد) کۆتایـی پـێ دێنیـن لـە کتێبەکـەی خـۆی (فضائـل القـرآن)دا دەڵـێ:

[وإنمـا نـرى القُـرّاءَ عَرَضـوا القـراءة عـلى أهـل المعرفـة بهـا، ثـم تمسّـكوا بمـا علمـوا منهـا، مخافـة أن يزيغـوا عـما بـين اللّوحـين بزيـادة أو نقصـان، ولـذا تركـوا سـائر القـراءات التـي تخالـف الكتـاب، ولم يلتفتـوا إلى مذاهـب العربيـة فيهـا، إذا خالـف ذلـك خـطَّ المصحـف، وإن كانـت العربيـة فيـه أظهـر بيانـاً مـن الخـط، ورأوا تتبـع حـروف المصاحـف وحِفْظَهـا كالسُّـنن القائمـة التـي لايجـوز لأحـد أن يَتَعدّاهـا][٣].

(١)- أثر صحيح أخرجه ابن المجاهد في السّبعة: ص٥٠ - ٥١.
(٢)- أخرجه أبو عبيد ص٣٦١ وابن مجاهد ص٥٢ . قلت: إِسناده حسن.
(٣)- ص٣٦١.

ئەبو عوبەید دەڵێ: بۆیە قورئان خوێنەکان خوێندنەوەی قورئانیان ڕانواندوە لەسەر شارەزایان بە قورئان خوێندن و دوایی، دەستیان بەوەوە گرتوە کە فێری بوون، ئەوەک لەوەی کە لەنێوان دوو بەرگەکەی موصحەفدایە، بە لێزیادکردن یان کەمکرد، لابدەن و، هەموو ئەو شێوە خوێندنانەش کە لە گەڵ موصحەفدا ناگونجێن (لەگەڵ ڕێنووسی موسحەفدا ناگونجێن) وازیان لێ هێناون و، گوێشیان نەداوەتە بنچینەکانی شارەزایانی زمانی عەرەبیی کە پێچەوانەی ڕێنووسی موصحەفبن، هەرچەندە لە ڕووی بنچینەکانی زمانی عەرەبییەوە ئاشکراتربێ لە ڕێنووسی قورئان و، پێیان وابووە کە شوێنکەوتنی ڕێنووسی موصحەفەکان و پاراستنی، وەک ئەو ڕێبازە ڕاستانەیە کە دەبێ پەیڕەوییان لێ بکرێ و، هیچ کەس نابێ لێیان تێپەڕێنێ.



## بڕگەی دووەم: حەوت قورئان خوێنەکان (القراء السبعة):

حـەوت قورئـان خوێنـەکان، ژمارەیـەک لـە زانایـان کتێبـی تایبەتیـان لەبارەیانـەوە نووسـیون، بـۆ وێنـە:

أ. یەکێـک لەوانـە: (معرفـة القـراء الکبـار) (لإمـام المؤرخـين الحافـظ شـمس الديـن أبي عبداللـه الذهبـي، المتـوفيّ سـنة ٧٤٨ هــ).

کتێبێکـی دیکـە (غايـة النهايـة في طبقـات القـراء) (لإمـام القـراء شـمس الديـن أبي الخـير ابـن الجـزري المتـوفي ٧٣٣ هــ).

هەڵبەتـە زانایـانی دیکەیـش هـەر بـوون کـە لـە بـارەی حـەوت قورئان خوێنەکانـەوە، کتێبـی تایبەتیـان نووسـیون، بەڵام ئـەو دوو کتێبـە ناودارترن و، نووسەرەکانیشـیان دوو زانـای گەورەو موعتەبەری مسـوڵمانانن.

حەوت قورئان خوێنەکانش، ئەم حەوتەن، کە ئێستا ناوەکانیان دەڵێین:

**١ـ یەکەمیان: (إمام أهل المدينة، نافع بن عبدالرحمن بن أبي نعيم المدني):**

کە لە سێ خاڵدا بە کورتیی باسی دەکەین:

**یەکـەم:** قورئـانی خوێنـدوە لـە لای حەفتـا (٧٠) لـە زانایـانی جیلـی شـوێنکەوتوان (تابعیــن).

هەروەهـا زیاتـر لـە حەفتـا سـاڵ قورئـانی فێـری خەڵـک کـردوەو، بەڵگـە بـووە لـە قورئـان خوێندنـداو، لـە قسـەکرندا زۆر ڕاسـتگۆ بـووە.

**دووەم:** ژمارەیـەک لـە زانایـانی گـەورە حەزیـان بـە قورئـان خوێنـدنی نافیـع کـردوە، بـۆ وێنـە:

(عن مالك بن أنس قال: قراءة نافع سنة)[1].

مالیکی کوڕی ئەنەس گوتوویەتی: قورئان خوێندنی نافیع سوننەتە.

(١)- أخرجه ابن مجاهد في (السّبعة) ص٦٢.

واتە: ڕێبازی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم).

هەروەهـا بـە هەمـان شـێوە لـە (عبداللـە بـن وهـب المـصري) یـەوە مەدحـی نافیـع هاتـوە[1]، دیسـان لـە (لیـث بـن سـعد) ەوە، مەدحـی هاتـوەو[2]، عبداللـە ی کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل لـە بابـی پرسـیوە: (أي القراءتـين أحـب إليـك؟ قـال: قـراءة أهـل المدينـة)[3].

واتـە: کام لـە دوو قورئـان خوێندنەکانـت لـە لا خۆشەویسـتترە؟ گوتوویـەتی: قورئـان خوێنـدنی ئەهلی مەدینـە. کـە دیـارە نافیـع پێشـەوای ئەهـلی مەدینـە بـووە.

نافیع لە ساڵی ١٦٩ ک دا، کۆچی دوایی کردوە.

سێیەم: دوو قوتابـی لـە قوتابییـەکانی کـە زۆر نـاودار بـوون، بـەوە کـە قورئانیـان لـێ وەرگرتـوە:

أ ـ یەکەمیان وەڕش (ورش) کە ناوی (عثمان بن سعید القبطي المصري) یـە بـەڵام نافیع بـە وەڕش نازناوی داوەتـێ، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆر سـپیی بـووە، وەڕشـیش شـتێکە لە شیر دروسـت دەکرێ، یاخـود نـاوی باڵندەیەکە پێـی دەگوتـرێ: (الورشـان)، وەڕش متمانـە پێکـراو بـووەو، بەڵگـە بـووە لـە قورئـان خوێندنـداو، لە میصـڕدا قورئان خوێندن ئـەو پێشـەوایەتیی کردوە لە ڕۆژگاری خۆیـداو، لەسـاڵی ١٩٧ی کۆیـی دا کۆچیـی دوایی کردوە.

ب ـ قوتابی دووەمی نافیع بریتییە لە قالوون (قالون)، کە ناوی (عیسی بن مینا بن الوردان الزرقي المدني) یەو، و نازناوەکەی قالوونە، قالوون بە زمانی ڕۆمی یانی: زۆرباش، ئەویش هەر نافیع ئەو نازناوەی داوەتێ، لەبەر ئەوەی زۆر چاک قورئانی خوێندوە.

(١)- هەمان سەرچاوە: ص٦٢، ٦٣.
(٢)- هەمان سەرچاوە، ص٦٣.
(٣)- مسائل الإمام أحمد رواية ابنه عبدالله (نص: ٣٨٨).

قالوونیش لە قورئان خوێندندا بەڵگە بووەو، زۆر ڕاست بێژ بووەو لەساڵی (٢٢٠)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**٢ـ زاناو قورئان خوێنی دووەم، لە حەوت قورئان خوێنەکان:**

**(إمام أهل مكة عبدالله بن كثير بن عمر الداري):**

ئەمیش لە دوو خاڵ دا باسی دەکەین:

**یەکەم:** (إبن كثير) لە زمانی عەرەبییدا زۆر شارەزا بووەو، زۆر زمان پاراو بووەو، لە قورئان خوێندندا بەڵگە بووەو، لە فەرموودەدا متمانە پێکراو بووە، شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، قورئان خوێندنی ئیبنو کەسیری هەڵبژاردوەو، لەساڵی (١٢٠)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**دووەم:** ئەوەی ناوی دەرکردوە کە قورئان خوێندنی ئەوی گواستووەتەوە، دوان لە زانایان:

أ ـ : (البزي) کە ناوی (أحمد بن محمد بن عبدالله المكي) بووە، ئەویش پێشەوایەکی زۆر چەسپاو بووە لە قورئان خوێندندا، بەڵام لە ڕووی فەرموودەوە بە بێهێزیان داناوە، ئەویش ڕەنگە لەبەر ئەوەبێ کە زیاتر خەریکی قورئان و کۆنترۆڵ کردنی خوێندنی بووە، ڕەنگە زۆر نەیپەڕژابێتە سەر فەرمووده، لە ساڵی (٢٥٠)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

ب ـ (قنبل) کە لە (إبن كثير) ەوە قورئانی بۆ ئێمە نەقل کردوە، (قنبل) ناوی (محمد بن عبدالرحمن بن محمد االمخزومي)یە ئەمیش زۆر متمانە پێکراو بووەو، لە قورئان خوێندندا زۆر شارەزابووەو، لە ساڵی (٢٩١)ی کۆچیی دا، کۆچی دوایی کردوە.

**٣ ـ سـێیەم لـە حـەوت پێشـەوایاکانی قورئـان خوێـن: (إمـام أهـل البـصرة أبـو عمـرو بـن عـلاء المـازني) :**

زانایـان زۆربەیـان گوتوویانـە: نـاوی (زبـان) بـووە، بـەڵام کونیەکەی ئەبـو عەمرە.

**ئەمیش لە دوو خاڵ دا باسی دەکەین:**

**یەکـەم:** لـە پێشـەوایانی خەڵـک بـووە لـە زمـانی عەرەبییـداو لـە قورئـان خوێندنـداو، لەگـەڵ ئەوەشـدا پیاوێکـی زۆر ئەمیـن و دینـدارو زۆر جێـی متمانـە بـووە.

زانایـان زۆر ستایشـیان کـردوە، بـۆ وێنـە: هـەرکام لـە (ابـن مجاهـد) و (شـعبة بـن حجـاج)و (ابـن الجـزري) مـەدح و سـتایشی زۆریـان کـردوە.

ئەم زانایە لە ساڵی (١٥٤)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**دووەم:** دوو لـە قوتابییـەکانی کـە زۆر ناوداربـوون و، قورئانیـان لـەوەوە بـۆ ئێمـە گواسـتوەتەوە:

أ ـ (الـدوري أبـو عمـر حفـص بـن عمـر بـن عبدالعزيـز البغـدادي) کـە لـە سـاڵی (٢٤٦)ی کۆچییـدا، کۆچـی دوایـی کـردوە.

ب ـ : (السـوسي أبـو الشـعيب صالـح بـن زيـاد) کـە هـەر کامیـان: (الـدوري و السـوسي) بەڵگـە بـوون لـە قورئـان خوێندنـدا و، دینـدارو متمانـە پێکراوبـوون.

(السوسي)یش لە ساڵی (٢٦١)ی کۆچیی دا ،کۆچی دوایی کردوە.

**٤ ـ چوارەم لـە حـەوت پێشـەوا قورئـان خوێنـەكان: (إمـام أهـل الشـام عبداللـە بـن عامـر اليحصبي) :**

ئەمیش لە دوو خاڵ دا باسی دەكەین:

**یەكەم:** لە پێشەوایانی شوێنكەوتوانەو، پێشەوا بووە لە مزگەوتی جامیع لە دیشمەق و، بەڵگە بووە لە قورئان خوێندن داو، جێی متمانە بووە لە فەرموودەدا، قورئان خوێندنەكەی ئەو لە سەدەی یەكەمدا قورئان خوێندنی خەڵكی شام بووە بە تێكڕا، لە ساڵی (١١٨)ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوە.

**دووەم:** دوو لە قوتابییەكانی كە زۆر ناودار بوون و، قورئانیان لەوەوە نەقڵ كردوە بۆ دوای خۆی:

أ ـ (هشام بن عمار أبو الوليد السلمي) كە ئەمیش زۆر شارەزابووە لە قورئان خوێندن و لەفەرموودەداو، زۆر ڕاستگۆ بووەو، لە ساڵی (٢٤٥)ی كۆچیی دا، كۆچی دوایی كردوە.

ب ـ : (إبن الذكوان) كە ناوی (عبدالله بن أحمد بن بشير بن ذكوان البحراني)یە، ئەمیش لە قورئان خوێندندا زۆر شارەزابووەو، لە گواستنەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا، زۆر ڕاستگۆ بووە.

(أبو زرعة الدمشقي) لە مەدحی (إبن الذكوان)دا گوتوویەتی: (لم يكن بالعراق ولا بالحجاز ولا بالشام ولا بمصر ولا خراسان في زمن عبدالله بن ذكوان، أقرأ منه عندي)[1].

واتە: لە عێراق و حیجازو شام و میسرو خوراسان لەسەردەمی عبدالله ی كوڕی ذەكواندا، لەو شارەزاتر لە قورئان بەلای منەوە، نەبووە.

لە ساڵی (٢٤٢)ی كۆچییدا ،كۆچی دوایی كردوە.

---

(١)- تأريخ دمشق، لابن عساكر (٨/٢٧) .

**٥ ـ پێنجەم لە حەوت پێشەوا قورئان خوێنەکان: (إمام أهل الكوفة عاصم بن بهذلة بن أبي النجود الأسدي):**

ئەمیش لە دوو خاڵدا باسی دەکەین:

**یەکەم:** سەرۆکایەتیی قورئان بە خەڵک خوێندن، لە کووفەدا لەدوای (أبي عبدالرحمن السلمي) بۆلای وی هاتوە، بۆلای (عاصم بن بهذلة بن أبي النجود الأسدي)، زۆریش زمان پاراوو زۆر شارەزا بووەو، لە هەموو خەڵک دەنگی خۆشتربووە بە قورئان و، لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) زۆر ڕاستگۆ بووەو، جێی متمانە بووە، (لە ساڵی ١٢٧)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**دووەم:** دوو لە قوتابییەکانی کە قورئان خوێندنیان لێوە گواستوەتەوە، بۆ دوای خۆی:

أ ـ (أبوبكر بن عياش الأسدي الكوفي)، گوتراوە: ناوی شوعبە بووە، کە ئەویش لە قورئان خوێندندا بەڵگە بووەو، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) زۆر جێی متمانەو ڕاستگۆ بووە، لە ساڵی (١٩٣)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

ب ـ قوتابی دووەمی: (حفص بن سليمان الأسدي الكوفي) ئەمیش لە قورئان خوێندندا بەڵگە بووە، بەڵام لە گواستنەوەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەو شێوەیە نەبووە، (الذهبي) گوتوویەتی: (أما في القراءة، فثقة ثبت ضابط بخلاف حاله في الحديث) واتە: لە قورئان خوێندندا جێی متمانەیەو، زۆر چەسپاوەو کۆنترۆڵکەریەتی، بەڵام لە فەرمایشتدا بەو شێوە نەبووە. لە ساڵی (١٨٠)ی کۆچیی دا، کۆچی دوایی کردوە.

**٦ ـ شەشـەم لـە حـەوت پێشـەوایەکانی قورئـان خوێـن، (إمـام أهـل الكوفـة حمـزة بـن حبيـب الزيـات):**

ئەمیش لە دوو خاڵدا باسی دەکەین:

**یەکـەم:** (حمـزة بـن حبیـب الزیـات) لـە پێشـەوایانی قورئـان خوێندن و عیلمـی میـرات و زمـانی عەرەبیـی بـووە، لـە کووفـەدا، لەگـەڵ دینداریـی و چاکێتیـی و خواپەرسـتیی و متمانـە پێکراویـی دا، گوتوویـەتی: (مـا قـرأت حرفـاً قـطّ إلاّ بأثـر)[1] واتـە: هیـچ شـتێکم لـە قورئـان نەخوێندۆتـەوە، مەگەر شـوێنەوارێکم بەدەسـتەوە بووبـێ.

ئـەم زانایـە (حمـزة بـن حبیـب الزیـات) لـە سـاڵی (١٥٦)ی کۆچیـی دا، کۆچـی دوایی کـردوە.

**دووەم:** دوو لـە قوتابییـەکانی کـە زۆر نـاودار بـوون و، قورئـان خوێندنیـان لێـوەی نەقـڵ کـردوە:

أ ـ (خلـف بـن هشـام أبـو محمـد البـزار) کـە ئەویـش پیاوێکـی متمانـە پێکـراو و بەڵگـە بـووە لـە قورئـان خوێندنـدا، لـە سـاڵی (٢٢٩)ی کۆچییـدا، کۆچـی دوایـی کـردوە.

ب ـ (خـلاد بـن خالد الشـيباني الكـوفي) ئەویش پیاوێکی زۆر شـارەزا لـە قورئـان و زۆر ڕاسـتگۆ بـووە، لەسـاڵی (٢٢٠)ی کۆچییـدا، کۆچی دوایی کردوە.

(١) أخرجه إبن مجاهد في (السبعة) بسند جيد، ص٧٦.

**٧ـ حەوتـەم و كۆتايـی لە حەوت قورِئـان خوێنەكان: (إمـام أهل الكوفة علـي بن حمزة الكسـائي):**

ئەميش لە دوو خاڵدا باسی دەكەين:

**يەكـەم:** يەكێـك بووە لەپايـەكانی زمانی عەرِەبيی و پايـەكانی قورِئان خوێندن.

(أبـو عبيـد) گوتوويـەتی: (كان مـن أهـل القـراءة وهـي كانـت علمـه وصناعتـه، ولم أجالـس أحـداً كان أضبـط وأقـوى بهـا منـه)[1] واتـە: لـە شـارەزايانی قورِئـان خوێنـدن بـووەو، قورِئـان خوێنـدن و قورِئـان فێـری خەڵـك كـردن زانيارييەكـەی و پيشـەكەی بـووەو، لەگـەڵ هيـچ كـەس دانەيشـتووم ،كـە رِاسـتتر و چاكـتر لـەو قورِئـان بخوێنـێ، لـە سـاڵی (١٨٩) ی كۆچييـدا ،كۆچـی دوايـی كـردوە.

**دووەم:** دوو لــە قوتابييــەكانی كــە زۆر نــاودار بــوون و، قورِئــان خوێندنيــان لێــوە نەقــڵ كــردوە بــۆ دوای خــۆی:

أ ـ (أبـو الحـارث الليـث بـن خالـد البغـدادي) كـە ئەميـش پياوێكـی متمانـە پێكـراوی شـارەزا بـووەو، لـە جـۆری قورِئـان خوێنـدنی كيسـائييدا زۆر لـە پێشـەوە بـووە، لـە سـاڵی (٢٤٠)ی كۆچييـدا، وەفـاتی كـردوە.

ب ـ قوتابـی دووەم: (الـدوري أبـو عمـر حفـص بـن عمر بـن عبدالعزيز البغـدادي) ئەميـش قوتابـی دووەمـی ئەلكيسـائيی بـووە، كـە قورِئـانی لێـوە گواسـتووەتەوە.

ئەمانــە حــەوت قورِئــان خوێنــە ناودارەكانــن و، چــواردە قوتابييــە زۆر ناودارەكانيانـن، كـە قورِئانيـان لێـوە نەقـڵ كـردوون بـۆ دوای خۆيـان، كـە بێگومـان وردەكاريـی زياتـر لەبـارەی ئـەو قورِئانخوێنانـەو، چـواردە

---

(١)- معرفة القراء الكبار: للذهبي (١/١٢٢).

قوتابییەکانیشــیانەوە، لــە کتێبــی: (الســبعة) ی (إبــن المجاهــد)دا، هەیــە، کــە یەکــەم کــەس بــووە لەبــارەی ئــەو حەوتانــەوە، ئــەو کتێبەی نووســیوەو کتێبــی دووەم: (التيســير في القــراءات الســبع للــداني)، هەروەهــا: (النــشر في القــراءات العــشر لابــن الجــزري) ئــەو ســێ کتێبــە وردەکاریــی و درێــژەی زیاتریــان لەبــارەی ئــەو حــەوت قورئــان خوێنــەو، چــواردە قوتابییەکانیشــیانەوە، هێنــاوەن.

حــەوت جــۆرە قورئانخوێندنــەکان، لــە حــەوت پیتــەکانی قورئانخوێنــدن، جیــان:

بەڵــێ حــەوت جــۆرە خوێندنــەکان، (القــراءات الســبع) جیــان لــەوەی کــە پێغەمبــەر (عليــه الصــلاة والســلام) دەفەرمــوێ: (أنــزل القــرآن عــلى ســبعة أحــرف).

حــەوت جــۆرە قورئــان خوێندنــەکان، یەکێــک لــە زانایــان بــە نــاوی (إبــن مجاهــد) کــە لــە ســاڵی (٢٤٥)ی کۆچیــی دا لەدایــک بــووەو، لــە ســاڵی (٣٢٤)ی کۆچیــی دا، کۆچــی دوایــی کــردوە، ئــەو حــەوت جــۆرە قورئــان خوێندنــەی کۆکردوونــەوە ،کــە ناویانمــان هێنــاو پێناســەمان کــردن.

بــەڵام ئــەوەی کــە پێغەمبــەر (صــەڵاوات و ســەلامی خوای لەســەربێ) فەرموویــەتی: قورئــان لەســەر حــەوت پیتــان دابەزیــوە، پێشــتر زۆر قســەمان لێکــردو، کورتەکــەی ئەوەیــە کــە: حەوت جۆرە جیاوازیــی هەن لە خوێندنــەوەی هەندێــک لە وشــەکانی قورئاندا، کە جیاوازییــەکان لە حەوتان تێپــەڕ ناکــەن و، لــەو بــارەوە قســەی خۆمانمــان کــرد.

کەواتــە: حەوت قورئان خوێندنــەکان (القراءات الســبع) لەگەڵ حەوت پیتــەکان (ســبعة أحــرف)، کە قورئانیان بــە پێ دابەزیــوە، لێک جیان.

هەربۆیـەش زۆربـەی زانایـان ڕەخنەیـان گرتـوە لـە (إبـن مجاهـد) بـە هـۆی ئـەو کارەوەی کـە کردوویـەتی، کـە هەڵساوە لـە نێـو هەمـوو قورئـان خوێنەکانـدا حەوتیـانی گوڵبژێـر کردوونـەو، لـە کتێبێکـی دا بەنـاوی (القـراءات السـبع) دا، باسـی کـردوون.

یەکێـک لـەو زانایانـەی کـە ڕەخنـەی لێگرتـوە (إبـن الجزري)یـە لـە کتێبەکـەی خۆیـدا: (النـشر في القـراءات العـشر) کـە بـەو شـێوەیە ڕەخنـەی لـێ دەگـرێ و دەڵـێ: (ولذلـك كـره كثـير مـن الأئمـة المتقدِّمـين اقتصـار ابـن مُجاهـد عـلى سبعة مـن القـراء وخطَّئـوه في ذلـك، وقالـوا: ألا اقتـصر عـلى دون هـذا العـدد أو زاده، أو بـينَّ مُـرادَه، لِيَخْلُـصَ مـن لايعلـم مـن هـذه الشـبهة)[1].

دەڵـێ: زۆرێـک لـە پێشـەوا پێشـووەکان، ڕەخنەیـان لـە (إبـن مجاهد) گرتـوە لەسـەر ئـەوە کـە تەنیـا حـەوت لە قورئـان خوێنـەکانی باس کـردوون و، لـەوەدا بـە هەڵەیـان دانـاوە، گوتوویانـە: دەبوایـە یـان لـە حەوتـان کەمـتر بوونایـە، یـان لـە حەوتـان زیاتـر بوونایـە، یاخـود مەبەسـتی خـۆی ڕوون کردبایـەوە، بـۆ ئـەوەی کەسێـک کـە نازانێ لـەو شـوبهەیە دەربـازی ببوایە.

ئنجـا (إبـن الجـزري) ژمارەیـەک لـە زانایـان دێنـێ، کـە ڕەخنەیـان گرتـوە لـەو کـردەوەی (إبـن مجاهـد):

١ ـ یەکێک لەوانە: (أحمد بن عمار المهدوي)

٢ ـ یەکی دیکە لەوانە (الإمام أبو محمد مكي)یە.

٣ ـ یەکی دیکە لەوانە: (الامام الحافظ أبو عمر الداني)یە

٤ ـ یەکی دیکە: (أبو القاسم الهذلي)یە.

٥ ـ یەکـی دیکـە: (ألشـيخ الإمـام مجتهـد ذلـك العـصر أبـي العباس

(١)- النشر في القراءات العشر، ص ٣٥ ـ ٣٨.

بـن عبدالحليـم بـن عبدالسـلام بـن تيمية)يـە.

٦ ـ يەكی ديكە لەوانە (أبو حيان الأندلسي)يە.

ئەمـە هەمـووی (إبـن الجـزري) لـە (النـشر في القـراءات العـشر)دا، باسـی هەمـوو ئـەو زانايانـەی كـردوە، كـە ڕەخنەيـان لێـی هەبـووە، بۆچـی لـە نێـو هەمـوو قورئـان خوێنەكانـدا ئـەو حەوتـەی دياريـی كـردوون، كـە دوايـی تێكەڵيـی ببـێ لەگـەڵ ئـەو فەرمايشـتەی پێغەمبـەردا (صـلى اللـه عليـه وسـلم) كـە فەرموويـەتی: (أنـزل القـرءان عـلى سـبعة أحـرف).

كە پێشتر لەو بارەوە قسەمانكرد.

بـەڵام ئايـا (إبـن مجاهـد) لـەو بـارەوە پاسـاوی چـی بـووەو، بەڵگـەی چـی بـووە؟ دەڵێيـن: (إبـن مجاهد)يـش بێگومـان بە دڵسـۆزيی وايكـردوە، بە پاسـاوو بەڵگـەی ئـەوە كە خەڵكێكی ناشـێ لـە ڕۆژگاری ئەودا پەيـدا بووە، ئنجـا بـۆ ئـەوە ئـەو خەڵكـە بـە ناشـێيی بـە قورئـان خوێـن لەقەڵـەم نەدرێن، يـان بەجۆرێـك قورئـان نەخوێنن، كە لەگـەڵ ڕێنـووسی موصحەفێك دا كە عوسـمان خـوا لێـی ڕازی بـێ، بـە ليژنـە چـوار قۆڵييەكـەی ئامـادەی كـردوە، تێـك بگيـرێ، هەڵسـاوە ئـەو حەوتەی كـە زياتـر ناوداربوون بـە ڕای خۆی، لـە كتێبێكـدا بڵاو كردوونـەوە، واتە: ئەويـش بۆيە وايكـردوە، تاكو لە ڕووی قورئـان خوێندنـەوە، خزمـەت بـكات بـە قورئـان خوێنـان، جـۆرە خوێنـدنی نارێـك و ڕيزپـەڕو دەگمـەن، نەيەنـە نێـو قورئـان خوێندنەوە.

هەڵبەتـە ئێمـە پێشـتر باسـی حـەوت قورئـان خوێنەكانمـان كـردو، لـە كتێبـی (معجـم القـراءات القرءانيـة مـع مقدمـة في القـراءات وأشـهر القراء) يشـدا باسـی ئـەو حـەوت قورئـان خوێندنانـەو خاوەنەكانيـان كـراوە[1].

---

(١)- بڕوانە: ج١ ص ٧٩ ـ ٩١ ، هەروەها ص١٩٤ ـ ٢٠٣.

## بڕگەی سێیەم: سێ قورئان خوێنەکان تەواوکەری دەیەکان:

دە جۆرە قورئـان خوێندنـەکان (القـراءات العـشرة) حەوتیـان ئەوانـە بـوون کـە باسـمانکردن و، سێشـیان بریتیـن لـە هـەر کام لـە: (أبـو جعفـر، و یعقـوب، و خَلَـف).

ئنجـا بـا کورتەیـەک لەبـارەی هـەر کام لـەو سـێ قورئـان خوێنـەش باسـبکەین، چونکـە زانایـان ئـەو سێیەشـیان لەگـەڵ حەتەکانـدا پێکـەوە باسـکردوون و ،گوتوویانـە: جـۆرە قورئـان خوێنـدنی ئەوانیـش بەگشـتیی موتەواتیـرەو، حوکمـی حەوتەکانیـان هەیـە.

١ ـ یەکـەم: بریتییـە لـە (أبـو جعفـر یزیـد بـن قعقـاع المخزومـي إمـام المدینـة النبویـة التابعـي) نووسـەرانی(معجم القـراءات القرآنیـة) گوتوویانە: (لم یکـن بالمدینـة أقـرأ للسـنة مـن أبي جعفـر)[1].

ئەبـو جەعفـەر یەزیـدی کـوڕی قەعقاعـی مەخزومیـی ئیمامـی مەدینـەی پێغەمبـەر بـووە (علیـه الصـلاة والسـلام)و لـە زانایـانی شـوێنکەوتوان بـووەو لـە مەدینـە، هیـچ کـەس لـەو شـارەزاتر نەبـووە لـە ڕۆژگاری خۆیـدا، لـە سـوننەتی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) .

ڕای ڕاسـت ئەوەیـە: کـە ئەبوجەعفـەر لـە سـاڵی (١٣٠) کۆچیـی دا، کۆچـی دوایـی کـردوە[2].

٢- دووەم: لـە سـێیەکانی تەواوکـەری دەیـەکان، بریتییـە لـە یەعقـووب:

[هو أبو محمد یعقوب بن إسحاق بن زید بن عبدالله بن إِسحاق الحضرمي

(١)- هەمان سەرچاوە، ج١ ص ٩٢ .
(٢)- هەمان سەرچاوە، ج١، ص٩٢، لە: (لطائف الإشارات)، ج١ ص٩٧.

البصري، كان إماماً كبيراً، انتهت إليه الرئاسة بالقراءة بعد أبي عمر، ووصفه أبو حاتم السجستاني بأنه أعلم من رآه بالحروف والإختلاف بالقرآن وعِلَلِه و مذاهب النحو، وأروى الناس لحروف القرآن وحديث الفقهاء، ولد سنة (١١٧هـ) وتوفي سنة (٢٠٥) وله ثمان وثمانون سنة].

هـی دووەمیـان یەعقـووب، كونیەكـەی (أبـو محمـد) كوڕی ئیسـحاق كـوڕی زەیـد كـوڕی عبداللـه كـوڕی ئیسـحاقی حەضرەمیـی بەصڕایـی، پێشـەوایەكی گـەورە بـووە لـە ڕۆژگاری خۆیـدا، قورئـان پێخوێنـدن لـە دوای ئەبـو عومـەر بەدەسـت ئـەوەوە بـووە، ئەبـو حاتەمـی سەجیسـتانیی پێناسـەی كـردوە گوتوویـەتی: زاناتریـن كەسـە بـە پیتـەكانی قوڕئـان و جیاوازییـەكانی قوڕئانخوێندنـەكان و، كـەم و كوڕییـەكان كـە هەندێـك لـە قوڕئـان خوێنـەكان دەیانكـەن و، ڕێیـەكانی ڕێزمـانی عەرەبیـی و، گێڕەوەترینـی خەڵـك بـووە بـۆ پیتـەكانی قورئـان، لەگـەڵ جـۆرەكانی خوێندنـەوەی قورئـان دا، هەروەهـا قسـەی شـەرعزانان، لەسـاڵی (١١٧)ی كۆچیـی دا لەدایـك بـووەو، لـە سـاڵی (٢٠٥)ی كۆچیـدا، كۆچـی كـردوە، لـە تەمـەنی هەشـتاو هەشـت سـاڵییدا.[١]

٣ ـ سێیەم لـە دەیـەكان، لـەو سێیانەی كـە لەگـەڵ حەوتەكانـدا دەبن بـە دە (١٠)، بریتییـە لـە خەڵـەف: [هو الإمام أبـو محمد خلف بن هشـام البزار الصلحـي نسـبة إلى فـم الصلـح، بأعمال واسـط، وقراءتـه في إختيـاره لم تخرج مـن قـراءة الكوفيـين إلاّ حـرف واحـد] وهو قولـه تعالى:

﴿وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ﴾ الأنبياء: ٩٥

قرءها بالألـف (حـرام)، (ومولـده سـنة ١٥٠هــ ووفاتـه سـنة ٢٢٩ هــ ببغـداد)[٢].

(١)- هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٩٣، لە: (لطائف الإشارات)، ج١ ص٩٨.
(٢)- هەمان سەرچاوەو بەرگ ، ص٩٤.

واتــە: خەڵەفیـش، بریتییــە لــە: ئەبــو موحەممــەد کــوڕی هیشــام ئەلبــەززاری صوڵحیــی، پاڵدراوەتــە لای (فـم الصُّلـح) لــە دەوربــەری واسـیط و، خوێندنەوەکەیـشی هـەروەک هـی کوفییـەکان بـووە، جگـە لـە پیتێـک، ئەویـش برتییـە لـە: (حـرام عـلی قريـة أهلكناهـا) ئـەو بـە (حَـرام) خوێندوویەتــەوەو کوفییــەکان بــە (حِــرْم) خوێندوویانەتــەوە.

لــە ســاڵی (١٥٠)ی کۆچیــی دا لەدایــک بــووەو، لــە ســاڵی (٢٢٩) ی کۆچیـی دا لەبەغـداد، کۆچـی دوایـی کـردوە، (واتــە: لـە تەمــەنی (٧٩) ســاڵییدا).

شــایانی باسیشــە: هــەر کام لــەو ســێ قورئانخوێنــەش، یەکــی دوو گێــڕەرەوە (راوي) هەبــوون، کــە شــێوەی قورئــان خوێندنەکەیــان لــێ گێڕاونــەوە:

أ ـ دوو ڕاوییەکانی ئەبو جەعفەر:

١ ـ یەکەمیـان: (إبـن وردان) بـووە، (عيـسى بـن وردان المديـني الحـذاء تـوفي في حـدود سـنة ١٦٠)

عیسـای کـوڕی وەردانی مەدەنیـی نازنـاوی (حـذاء) هەبـووە، ڕەنگـە پێــڵاوی دروســتکردبن، لــە دەوری ســاڵی (١٦٠)ی کۆچیــی دا ،کۆچــی دوایــی کــردوە.

٢ ـ گێــڕەرەوەی دووەمــی ئەبــو جەعفــەر: بریتییــە لــە : (إبـن جـماز هـو ربيـع بـن سـليمان بـن مسـلم بـن جـماز، وتـوفي سـنة ١٧٠ هــ).

ڕەبیعـی کـوڕی سـولەیمان کـوڕی موسـلیم کـوڕی جەمـاز، لـە سـاڵی (١٧٠)ی کۆچییـدا، کۆچـی دوایی کـردوە.[١]

(١)- هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٩٤ .

ب ـ دوو گێڕەرەوەکەی قورئان خوێندنەوەکەی یەعقووب:

١ ـ یەکـەم: (رويـس هـو أبوعبداللـه بـن المتـوكل اللؤلـؤي البـصري وتـوفي سـنة ٢٣٨هـ بالبـصرة).

(ڕوەیس) لە ساڵی (٢٣٨) ی کۆچیی دا، لە بەسرا کۆچی دوایی کردوە.

٢ ـ گێـڕەرەوەی دووەم: (رَوْح: هـو أبـو الحسـن رَوْح بـن عبدالمؤمـن بـن عَبـدة بـن مسـلم الهـذلي، وتـوفي سـنة ١٣٤ أو ١٣٥هـ ).

(ڕەوح) لە ساڵی ١٣٤ یان ١٣٥ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

ج ـ دوو گێڕەرەوەکەی خەڵەف:

١ ـ یەکـەم: (المـروزي هـو إسـحاق بـن إبراهيـم بـن عثـمان المـروزي، ثـم البغـدادي وتـوفي سـنة ٢٨٦ هــ).

(ئەلمیرِوەزیی) لە ساڵی ٢٨٦ی کۆچییدا، وەفاتی کردوە.

٢ ـ گێـڕەرەوەی دووەم: (إدريـس هـو أبـو الحسـن إدريـس بـن عبدالكريـم البغـدادي الحـداد، مولـده سـنة ١٩٩، وتـوفي يـوم عيـد الأضحـى سـنة ٢٩٢، عـن ٩٣ سـنة).

(ئیدریـس) ئەمیـش لـە سـاڵی ١٩٩ی کۆچیـی دا لەدایـک بـووەو، لـە جـەژنی قوربـانی سـاڵی (٢٩٢)ی کۆچیـی دا، لـە تەمـەنی (٩٣) سـاڵییدا کۆچـی دوایـی کـردوە.[1]

ئەمـەش سـێ قورئانخوێنـەکان کـە لەگـەڵ حەوتەکـەی پێشـێ دەبـن بـە دە (١٠) یـانی: (القـراءات العـشرة) کـە خـاوەنی دە (١٠) جـۆرە قورئانخوێندنـەکان (القـرآت العـشر)ن.

دەربـارەی ئـەو دە (١٠) جـۆرە قورئانخوێندنانـە، زانایـان دەڵێـن: سـێیەکەی دیکـەش حوکمـی حەوتـەکانی پێشـێیان هەیـە، چونکـە

(١)- هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص ٩٤.

هەموویان بە تەواتور بۆ ئێمە نەقڵ کراون و، هیچ کام لە زانایان نەبوون کە ئەو سێیانەش لەگەڵ حەوتەکانی دیکەدا باس نەکەن، هەڵبەتە هەندێک گوتوویانە: حەوتەکان بەهێزترن، بەڵام زانایانی دیکە زۆربەیان گوتوویانە: هەموویان یەک حوکمیان هەیە، چونکە هەموویان بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوون.



## بڕگەی چوارەم: چوار قوڕئانخوێنەکانی لە دەیان زیاد:

جگـە لـەم دە (١٠) قوڕئانخوێنـەو، لـەو دە جـۆرە قوڕئـان خوێندنانـە (القـراءات العـشر) کـە (إبـن الجـزري) کتێبێکـی تـەواوی لەبـارەی ئـەو دە جـۆرە قوڕئـان خوێندنـەدا، دانـاوە: (النـشر في قـراءات العـشر) چـواری دیکـەش هـەن، چـوار جـۆرە قوڕئانخوێنـدنی دیکـە، یـان چـوار قوڕئانخوێنی دیکـە، کـە لـەو دەیانـە زیـادن و، زۆرێـک لـە زانایـان ئـەو چوارەیـان لـە خوێندنـەوە ڕیزپـەڕەکان (القـراءات الشـاذة) دا سـەرژمێر کـردوون، بەڵکـو خـاوەنی (معجـم القـراءات القرءانيـة) دەڵـێ: (هنـاك إجـماع مـن القـراء عـلى شـذوذ هـذه القـراءات الأربـع).[1]

واتـە: یەکدەنگیـی لـە لایـەن قوڕئـان خوێنانـەوە هەیـە، کـە ئـەم چـوارە لـە جـۆرە قوڕئانخوێندنـە ڕیزپەڕەکانـن.

خـاوەنی کتێبـی (معجـم القـراءات القرآنيـة) دەڵـێ: دەبوایـە ئێمـە ئـەم چوارەمـان لـە ڕیـزی خوێندنـەوە ڕیزپـەڕەکان (القـراءات الشـاذة) دا باسـکردبانایە، بـەڵام بۆیـە لێـرە باسـمانکردن، چونکـە لـە ڕووی سـەنەدەوە لـە یـەک نزیکـن، دەڵـێ: [ولكـن رأينـا أن هـذه القـراءات الأربـع قريبـة في الروايـة والسـند، مـن روايـات وإسـناد القـراءات السـبع أو العـشر، فإلحاقها بالقـراءات السـبع أو العـشر، مـع شـذوذها مـن ناحيـة الروايـات والسـند، هـو السـبب في إفرادنـا لهـا هـذا الحديـث في هـذا الموضـع][2].

واتـە: بۆیـە ئێمـە بـە چاکـمان زانـی ئـەم چـوار جـۆرە قوڕئانخوێندنەش لـەدوای دە قوڕئانخوێندنـەکان بـاس بکەیـن، چونکـە لـە ڕووی سـەنەدو

(١)- سەرچاوەی پێشوو، ج١ ص٩٥ .
(٢)- هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

گێڕدرانەوەوە، لە گێڕدرانەوەو سەنەدی حەوت جۆرە قورئان خوێندنەکانەوە، یاخود دەیەکانەوە، نزیکن، بۆیە لەگەڵ ئەوەشدا کە بەڕیزپەڕ (شاذ) دادەنرێن (نابێ لەنوێژدا بخوێندرێن و، قورئانیان پێ بخوێندرێ، مەگەر بۆ فێرکردن) بۆیە لێرەمان باسکردن (چونکە لە ڕووی ریوایەت و سەنەدەوە لەوانی پێشەوە نزیکن).

ئەو چوار جۆرە قورئانخوێندنەش کە لە دەیەکان زیادن، ئەم چوارەن[(١)]:

یەکەم: [إبن المحيصن، هو أبو عبدالله محمد بن عبدالرحمن بن محيصن المكي، كان عالماً في الأثر والعربية، وقال درباس: لما جاء في (كامل) الهذلي: ما رأيت بأعلم من ابن المحيصن بالقرآن والعربية، توفي سنة١٢٣ هـ].

یەکەم لەو چوارانە: ئیبنو موحەیصینە کە کونیەکەی (أبو عبدالله)یە، موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی موحەیصنی مەککەیی، شارەزابووە هەم لە شوێنەوارەکان (واتە: لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و قسەی زانایانی پێشین) هەم لە زمانی عەرەبییداو، (دیرباس) گوتوویەتی: (دیرباس یەکێکە لەزانایان) وەک لە (کامل) هوزەیلی هاتوە: هیچ کەسم لە ئیبو موحەیصین لە قورئان و لە زمانی عەرەبیی شارەزاترم نەبینوە، لە ساڵی (١٢٣)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

دووەم: لەو چوارانە: (اليزيدي هو أبو محمد يحيى بن مبارك اليزيدي العدوي البصري، كان فصيحاً مفوَّهاً إماماً في اللغات والآداب، مولده سنة (١٢٨) أيام مروان بن محمد، وتوفي سنة (٢٠٢) عن أربع وسبعين سنة، وقيل جاوز التسعين).

(١)- بۆ هەر چواریان بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ج١ ص ٩٥ ـ ٩٦ .

دووەم: لەو چوار زانایانە: ئەلیەزیدییە، ئەبو موحەممەد یەحیا کوڕی موبارەکی یەزیدیی عەدەویی بەصڕایی،پیاوێکی زۆر زمان پاراوو قسە زان بووەو، پێشەنگ بووە لە زمانەکان و لە ئەدەبەکاندا، لە ساڵی (١٢٨)ی کۆچیی لە ڕۆژگاری مەڕوانی کوڕی موحەممەددا، لەدایک بووەو، لە ساڵی (٢٠٢) کۆچیی دا، کۆچی دوایی کردوە، لە تەمەنی (٧٤) ساڵییداو هەندێک گوتوویانە: لە (٩٠) تێپەڕیوە.

سێیەم: لەو قورئان خوێنانەی، کە جۆری قورئان خوێندنەکەیان لەهەندێ وشاندا بە ڕیز پەڕ (شاذ) دادەنرێ، نەک لە هەموویدا: [الحسن البصري، هو الإمام أبو سعيد الحسن بن أبي حسن البصري، مولى الأنصار، إمام زمانه علماً وعملاً، ولد خلافة عمر رضي الله عنه سنة (٢١) وتوفي سنة ١١٠هـ].

سێیەمیان: حەسەنی بەصڕاییە، کونیەکەی: ئەبو سەعیدە، حەسەن کوڕی ئەبولحەسەن ئەلبەسڕیی دۆستی پشتیوانان، (کاتی خۆی ئەوان خۆی یان بابیان ئازاد کردوە) پێشەوای ڕۆژگاری خۆی بووە، لە ڕووی زانیاریی و کردەوەی باشەوە، (زۆر مەدحی کراوە) لە ڕۆژگاری حوکمڕانیی عومەری کوڕی خەتتابدا لەدایک بووە، لە ساڵی (٢١)ی کۆچیی داو، لە ساڵی (١١٠)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە، (واتە: ئەویش دەوری نەوەد ساڵ ژیاوە).

چوارەم: لەو چوار قورئانخوێنانە: [الأعمش هو محمد بن سليمان بن مهران الأعمش الأسدي الكاهلي، مولاهم الكوفي وكان فصيحاً لم يَلْحَنْ قَطُّ ولد يوم عاشوراء سنة ٦٠ هـ يوم قتل حسين وتوفي سنة ١٤٨هـ].

واتە: ئەعمەش ئەبو موحەممەد کوڕی سولەیمان کوڕی میهرانی

ئەعمەشی ئەسەدیی کاهلیی، ئەویش بە دۆست و نزیکی کووفییەکان و ئازادکراویان ئەژمێرکراوە، پیاوێکی زۆر زمانپاراو بووە، هەرگیز هەڵەی نەکردوە لە قسەکردندا، لە ڕۆژی عاشووڕای ساڵی (٦٠)ی کۆچیی دا، ئەو ڕۆژەی حوسەینی تێدا شەهید کرا (لە لایەن سوپایەکەی یەزیدی کوڕی معاویەوە) لە دایک بووەو، لە ساڵی (١٤٨)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

هەر کام لەو چوارانەش یەکی دوو قوتابییان هەبوون، کە شێوەی قورئان خوێندنەوەکەیانیان گێڕاونەوە، ئەوانیش هەر بە خێرایی باس دەکەین[1]:

١ـ (إبن و محیصن) دوو گێڕەرەوەی هەبوون شێوەی قورئان خوێندنەکەیان گێڕاوەتەوە:

یەکەم: (البزي)، کە پێشتریش باسکراو یەکێکە لە قورئان خوێنەکانی (إبن کثیر)یش ناوی (أبوالحسن بن محمد بن عبدالله بن القاسم بن النافع البزي).

دووەم: [إبن شنبوز، هو أبو الحسن محمد بن أحمد بن أیوب بن صَلْت البغدادي المعروف بشنبوز، وكان إماماً شهيراً وأستاذاً كبيراً صالحاً، وتوفي في صفر سنة ٣٢٨ على الصواب].

ئەمیش لە ساڵی (٣٢٨) ی کۆچیهدا ،کۆچی دوایی کردوەو پێشەوایەکی ناودارو مامۆستایەکی گەورەو چاک بووە.

٢ ـ دوو گێڕەرەوەکەی (الیزیدي): یەکەم: [سليمان بن الحكم هو سليمان بن أيوب بن الحكم أيوب الخياط البغدادي عرف بصاحب البصري، توفي سنة ٢٣٥].

ئەمیش لە ساڵی ٢٣٥ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردوە.

(١)- بۆ دوو گێڕەرەوەکەی هەرچواریان بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ج١ ص ٩٦ – ٩٨ .

دووەم گێـڕەرەوەی: (أحمـد بـن فـرح بالحـاء المهملـة كان ثقـة ضابطـاً جليلاً عالماً بالتفسـير، توفي شـهر ذي الحجة سـنة ٣٠٣ وقد قارب التسـعين).

ئەميـش پياوێکـی متمانـە پێکـراو بـووە زۆر، ئـەو شـتانەی لەبـەری کـردوون، زۆر چـاک کۆنترۆڵـی کـردوون، پياوێکـی پايـەدار بووەو شـارەزا بـووە بـە تەفسـيری قورئـان، لـە لـە مانگـی ذيلحيججـەی سـاڵی (٣٠٣)ی کۆچييـدا کـە تەمەنی لە نەوەد سـاڵ نزيک بووەتـەوە، کۆچی دوايـی کردوە.

٣ ـ دوو گێڕەرەوەکەی حەسـەنی بەسـڕایی، کە قورئان خوێندنی ئەويان لـە هەندێک لەو وشـانەدا کە جياوازن، لێيـان گێڕاوەتەوە:

يەکـەم: (أبـو نعيـم البلخـي، هـو شـجاع بـن أبي النـصر البلخـي الزاهـد ولدسـنة (١٢٠) ببلـخ، ومـات ببغـداد سـنة (١٩٠) ولـه سـبعون سـنة).

ئەميـش لـە سـاڵی ١٢٠ی کۆچيی دا، لـە بەڵخ لەدايک بووەو لە سـاڵی (١٩٠)ی کۆچيـی دا، لـە تەمەنی (٧٠) سـاڵييدا وەفاتی کردوە.

دووەميان: (الدوري، أبوعمر)، کە پێشتر باسمان کرد.

٤ ـ دوو گێڕەرەوەکەی ئەلئەعمەش:

يەکـەم: (المُطَّوِّعـي) هـو الإمـام أبـو العبـاس الحسـن بن سـعيد المطوع، وكان إمامـاً في القـرءات، وتـوفي سـنة ٣٧١ وقـد جـاوز المئة سـنة).

(موطەووەعيـی) لـە سـاڵی (٣٧١)ی کۆچيـی دا کۆچـی دوايـی کردوە، کـە تەمـەنی لە سـەد سـاڵ تێپەڕيوە.

دووەميـان: لـە گێـڕەرەوەکانی قورئان خوێنـدنی ئەعمـەش، بريتييە لە: (الشـنبوذي الشـطبي هو أبـو الفرج بن محمد بـن أحمد بن إبراهيم بالشـنبوذي الشـطبي، ولد سـنة ٣٠٠ وتوفي في صفر سـنة ٣٨٨).

(شـەنبووذيی) لـە سـاڵی (٣٠٠)ی کۆچيـدا لەدايک بـووە و، لە مانگی صەفـەری (٣٨٨ هـ) دا کۆچـی دوايی کردوە.

شایانی باسە:

بێجگە لەم چوارده قورئانخوێندنانە، هەندێک قورئانخوێندنی دیکەش هەن پێیان دەگوترێ: (القراءات الشاذة)، قورئانخوێندنە ڕیزپەڕەکان.

ئەم خوێندنەوانە کە پێیان دەگوترێ: : (القرءات الشاذة) زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە نەک هەر ئەمانە، بەڵکو چوارەکەی پێشێش، بە ڕیزپەڕ لەقەڵەم دەدرێن و، جۆری خوێندنەوەکەی ئەوان، بە ئەو قورئانە لە قەڵەم نادرێ، کە خوای پەروەردگار دایبەزاندوە، لەو جۆرە خوێندنەوانەی ئەو وشانەدا، کە جیان لە هی دەیەکان، نەک لە هەموو شتێکیان دا.

قورئان خوێندنە ڕیز پەڕەکان، وەک لە کتێبی: (معجم القراءات القرءانية) دا هاتوە[1]، ناودارترینی ئەوانەی کە هێندێک وشەی قورئانیان بەشێوەیەکی ڕیزپەڕ خوێندوون، ئەمانەن:

**یەکەم: لە خەڵکی مەدینە:**

١ ـ (عبدالله بن عباس بن أبي الربيعة المخزومي).

٢ ـ (أبو سعيد أبان بن عثمان بن عفان).

٣ ـ (مسلم بن حبيب من التابعين).

٤ ـ : (شيبة بن النصاح بن سرجس بن يعقوب من أهل المدينة).

ئەم چوارە لە خەڵکی مەدینە بوون، هەندێک وشەی قورئانیان بەشێوەیەکی ڕیزپەڕ خوێندوون.

هەڵبەتە ئەوانیش هەر بۆیە بەو جۆرەشیان خوێندوە، وەک زانستێک بۆ ئەوەی ون نەبێ، کە ئەم ئایەتە بەو جۆرەش

(١)- ج١ ص ١١٧، ١١٨.

دەخوێندرێتـەوە، بـەڵام بێگومـان جگـە لـەو خوێندنەوانـە بـە تەواتـور بـە ئێمـە گەیشـتوون، ئـەوانی دیکـە، دروسـت نیـە کـە لـە نوێـژدا قورئانیـان پـێ بخوێـنرێ، لەسـەر ڕای زۆربـەی زانایـان.

**دووەم: لە خەڵکی مەککە:**

**لەوێش چوار وێنەی هێناون:**

١ ـ (إبن أبي عمارة).

٢ ـ (إبن محيصن).

خوێندنەوەیەکی واش هەیە.

٣ ـ (ديرباس).

٤ ـ (حميد بن قيس الأعرج).

سێیەم: لە خەڵکی بەسرا:

١ ـ (عبدالله بن إسحاق الحضرمي).

ئەویش دیارە خوێندنەوەیەکی وای هەیە.

٢ ـ (عاصم بن الجحدري).

٣ ـ (عيسى بن عمر الثقفي).

٤ ـ (أبو المنذر سلام).

چوارەم: لە خەڵکی کووفە:

١ ـ (طلحة بن مطرف من أهل همدان).

٢ ـ (عيسى بن عمر الهمداني).

٣ ـ (الأعمش).

٤ ـ (إبن أبي ليلى).

پێنجەم: لە خەڵکی شام:

١ ـ (أبوالبرهسم، عدوان بن عثمان الزبيدي)

٢ ـ (يزيد اليزيدي)

٣ ـ (خالد بن معدان).

شەشەم: لە خەڵکی یەمەن:

(محمد بن السميفع)، خەڵکی یەمەنە، بەڵام لە بەسڕا دانیشتوە.



## قسەیەکی گرنگی (إبن الجزري):

ئیبنولجەزەریـــی لەبـــارەی ئـــەم جـــۆرە قورئـــان خوێندنانـــەوە، قســـەیەک دەکا لـــە کتێبەکـــەی خۆیـــدا: (النـــشر في القـــراءات العـــشر)[1]، هەروەهـــا (الســـیوطي) ش لـــە (الإتقـــان)[2]دا، ئەویـــش هەمـــان شـــتی هێنـــاوە، دەڵـــێ[3]:

[کل قـــراءة وافقـــت العربيـــة ولـــو بوجـــه، وافقـــت أحـــد المصاحـــف العثمانيـــة ولـــو احتـــمالا، وصـــحَّ ســـنَدُها، فهـــي مـــن القـــراءة الصحيحـــة التـــي لايجـــوز ردُّهـــا، ولا يحـــل إنكارهـــا، بـــل هـــي مـــن الأحـــرف الســـبعة التـــي نـــزل بهـــا القـــرآن.

واجـــب عـــلى النـــاس قبولهـــا، ســـواء كانـــت عـــن الأئمـــة الســـبعة، أم عـــن العـــشرة، أم عـــن غيرهـــم مـــن الأئمـــة المقبولـــين، ومتـــى اختـــلَّ ركـــن مـــن هـــذه الأركان الثلاثـــة، أطلـــق عليهـــا ضعيفـــة أو شـــاذة أو باطلـــة، ســـواء كان عـــن الســـبعة، أو عـــن مـــن هـــو أكـــبر منهـــم، وهـــذا هـــو الصحيـــح عنـــد أئمـــة التحقيـــق مـــن الســـلف والخلـــف].

واتـــە: هـــەر خوێندنەوەیـــەک لەگـــەڵ زمـــانی عەرەبییـــدا ڕێکبێتـــەوە، ئەگـــەر بەڕوویـــەک لـــە ڕووەکانی زمـــانی عەرەبییـــش بـــێ و، لەگـــەڵ ڕێنووســـی یەکێـــک لـــە موصحەفـــەکانی عوســـماندا خـــوا لێـــی ڕازی بـــێ (کـــە نـــاردوونی بـــۆ شـــارەکان، پێنـــج بـــوون، حـــەوت بـــوون، هەشـــت بـــوون) تێـــک بکاتـــەوە، ئەگـــەر بـــە ئەگـــەریـــش بـــێ و، سەنەدەکەشـــی ڕاســـتبێ

(١)- النشر في القراءات العشر.
(٢)- الإتقان في علوم القرآن، ج١ ص٧٥.
(٣)- پێشتریش ئەو قسەیەمان هێنا.

(بـۆ لای پێغەمبـەر (علیـه الصـلاة والسـلام) ئـەوە بەخوێندنەوەیەکـی ڕاسـت دادەنـرێ و، دروسـت نیـە ڕەت بکرێتـەوەو، دروسـت نیـە کـەس نکوڵیـی لـێ بـکا، بەڵکـو ئـەوە لـە ڕیـزی ئـەو حـەوت پیتانەیـە کـە پێغەمبـەر (علیـه الصـلاة والسـلام) فەرموویـەتی قورئانیـان پـێ دابەزیـوەو، لەسـەر خەڵـک پێویسـتە قبووڵیـان بکـەن، ئنجـا چ ئـەو جـۆرە خوێندنـە، لەهـی حـەوت پێشـەواياکانی قورئـان خوێندنەوەبـێ، [کـە (إبـن مجاهـد) کتێبـی لەسـەر نووسـیون] یـان لـە دەیـەکان بـێ [کـە سـێی دیکـەش زیـاد دەکرێـن بـۆ حەوتـەکان] یاخـود لـە غەیـری ئەوانیشـەوە بـێ لـە پێشـەوایانی پەسـەند، لـە قورئـان خوێندنـدا، بـەڵام هەرکاتێـک یەکێـک لـەو سـێ پایانـە نەمـا، [واتـە: ئەگـەر لەگـەڵ زمـانی عەرەبیـی دا نەگونجـا، یاخـود لەگـەڵ ڕێنووسـی موصحەفێکـی عوسـماندا نەگونجـا، یاخـود سـەنەدی ڕاسـت نەبـوو بـۆ لای پێغەمبـەر ((صـلی اللـه علیـه وسـلم)) ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: (قـراءة ضعیفـة) خوێندنەوەیەکـی بـێ هێـزە (أو شـاذة) یاخـود ڕیزپـەڕە (أو باطـل) یاخـود پووچـە.

ئنجـا چ ئـەو جـۆرە خوێندنـە، لـە حەوتەکانەوەبـێ، یاخـود لـە سـێیەکانی دوایـان، یاخـود لـە کەسـێک کـە لەوانیـش گەورەتربـێ، ئەمـە ڕای ڕاسـتە لـەلای پێشـەوایانی سـاغکەرەوە لـە زانایـانی پێشـین و دواییـن.

بێگومـان ئەمـە لێـی وەردەگیـرێ کـە هەندێـک لـە حـەوت قورئـان خوێنەکانیـش، ڕەنگـە هەندێـک وشـەیان خوێندبـن، کـە بەڕێـز پـەڕو بێهێـز لەقەڵـەم بـدرێ، بـەڵام بەگشـتیی شـێوە قورئـان خوێندنی ئـەوان - وەک ئیبنـو موجاهیـد لـە کتێبەکـەی خۆیـدا هێناویـەتی، بـەڕای

ئـەو و، بـە ڕای ژمارەیەکـی زۆر لـە زانایـان ـ لـە خوێنـدنی قورئـان خوێنـەکانی دیکـە ڕاسـتتر بـووە.

هەڵبەتـە سـێیەکەی دیکـەش کـە باسـمانکردن، کـە بریتیـن لـە: (أبـو جعفـر و يعقـوب و خلـف) ئـەو سـێیەش بێگومـان لەگـەڵ حەوتەکانـدا دەبـن بـە دە (١٠)، وەک ئیبنولجەزەرییـش کتێبەکـەی خـۆی: (النـشر في القـراءات العـشر)ی لەسـەر بنیـات نـاون.

چوارەکـەی دیکـەش کـە لەگـەڵ ئـەو دەیانـەی دیکـە دەبـن بـە چـواردە، کـە بریتیـن لـە (محيصـن، اليزيـدي، الحسـن البـصري، الأعمـش) ئـەو چـوارەش هەرچەنـدە لـە ڕووی ڕیوایـەت و سـەنەدەوە نزیکـن، لـە هـی دەیـەکانی ڕابـردوو، بـەڵام یەکدەنگیـی زانایـان لەسـەر ئەوەیـە، کـە ئەوانـە بـە ڕیزپـەڕ (شـاذة) لەقەڵـەم دەدرێـن و، حوکمـی دە جـۆرە قورئـان خوێندنـەکانی دیکەیـان نیـە.

هەروەهـا ئەوانـەش کـە هەندێـک وشـەیان بـە شـێوەیەکی ڕیزپـەڕ خوێنـدوون، ئـەو چـوارەش و ئـەوانی دیکـەش، پێیـان دەگوتـرێ: خوێندنـەوە ڕیـز پـەڕەکان، یـان خوێندنـەوە بـێ هێـزەکان، بەڵکـو هەندێـک لـە خوێندنـەوەکان بـە پـووچ و باطـڵ دادەندرێـن.

وەک پێشـتریش باسـمانکرد: یەکێـک لـە هانـدەرەکانی ئیبنـو موجاهیدیـش هـەر ئـەوە بـووە، کـە سـنوورێک دابنـێ، بـۆ ئەوانـەی قورئانیـان خوێنـدوە بـە ناشـێی و بـە شـێوەیەکی نارێـک، بـۆ ئـەوەی هاوکاریـی کەسـانێک بـکات ،کـە دەیانـەوێ بـە شـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت قورئـان بخوێنـن، کـە بەپێـی خوێندنـەوەی ئـەو حەوتـە بیخوێنـن.

## سوودو حیكمەتەكانی جیاوازیی قورئانخوێندنەكان:

لــە كۆتایــی باســی قورئــان خوێندنــەكان و پێشــەوایانی قورئــان خوێندنــدا بــە باشــی دەزانــم، جارێكــی دیكــە تەماشــایەكی ئــەوە بكەینــەوە ،كــە ســوودەكانی جیاوازیــی ئــەو قورئــان خوێندنانــە چیــن؟

هەڵبەتــە پێشــتر قســەیەكمان لێكــرد، بــەڵام بــە بــاشی دەزانــم جارێكی دیكــە لــەو بــارەوە هەندێــك قســەی دیكــە بێنیــن، چونكــە بێگومــان خــوا (سُــبحانه وتعــالی) كــە فەرمایشــتی خــۆی وا فەرمــووە، بــە چەنــد جۆرێــك بخوێندرێتــەوە، مســۆگەر بــۆ ئەوەیــە: كــە كۆمەڵێــك ســوودو حیكمــەت لــە جیاوازیــی جــۆرەكانی قورئــان خوێندنــدا هەبــن، جــارێ كــە بــاس لــە حیكمــەت و ســوودەكانی جیاوازیــی قورئــان خوێندنــەكان بكەیــن، دەبــێ ئــەو ڕاســتییە بخەینــە ڕوو، كــە ئیبنولجەزەریــی لــە كتێبەكــەی خۆیــدا هێناویــەتی، دەڵــێ:

(أمــا حقیقــة اختــلاف هــذه الســبعة الأحــرف المنصــوص علیهــا مــن النبــي (صــلى اللــه علیــه وســلم) و فائدتــه، فــإن الإختــلاف المشــار إلیــه في ذلــك، اختــلاف التنــوع والتغایــر، لااختــلاف التضــاد والتناقــض، فــإن هــذا محــال أن یكــون في كلام اللــه تعــالى، قــال تعــالى:
﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا﴾
النســاء: ﴿٨٢﴾).(١)

واتــە: ئنجــا: ئــەو جیاوازییــەی كــە لــە حــەوت پیتەكانــدا هەیــە، كــە فەرمایشــتی پێغەمبــەر (صــلى اللــه علیــه وســلم) دەقــی لەســەر كــردوون

(١)- النشر في القراءات العشر، ص ٤٤ .

و سوودی ئەو ڕا جیاییە، دەبێ بزاندرێ مەبەست لەو ڕا جیاییەی ئاماژەی بۆ کراوە، ڕا جیایی جیاوازییە، نەک ڕا جیایی تێکگیران و پێکەوە ناکۆک بوون، چونکە ئەمە لە فەرمایشتی خوادا مەحاڵە، وەک خوا فەرموویەتی:

(ئایا لە قورئانەوە ڕا نامێنن، ئەگەر لە لای جگەلە خواوە بوایە، ڕا جیایی و ناکۆکیی زۆریان تێدا دەبینی).

ئیبنولجەزەریی دەڵێ: من تەماشام کردوە ئەو جیاوازییانەی خوێندنەکان، لە سێ حاڵ بەدەر نین:

یەک: (إختلاف اللفظ والمعنى واحد)، بێژەکە جیاوازە، بەڵام یەک واتای هەیە.

دوو: (إختلافهما جميعاً، مع جواز اجتماعهما في شيء واحد) هەم بێژەکەیان هەم ماناکەیان جیایە، بەڵام دەگونجێ لەیەک شتدا کۆببنەوە.

سێ: (إختلافهما جميعاً، مع امتناع جواز اجتماعهما في شيء واحد، بل يتفقان من وجه آخر لايقتضي التضاد) هەم بێژەیان هەم واتایان لێک جیایەو، ناشگونجێ لەیەک شتدا کۆببنەوە، بەڵام لە ڕوویەکی دیکەدا پێکەوە کۆ دەبنەوە، کە پێکەوە ناکۆک و دژ نەبن.

ئنجا وێنە دێنێتەوەو دەڵێ:

هی یەکەمیان: وەک: جیاوازیی نێوان (سراط) و (صراط) کە بە (س) و (ص) خوێندراوەتەوە، هەروەها (علَيْهِم) و (عَلَيْهُم)، و (يـؤُدُّهُ) و (يَـؤُدْهُ)، هەروەها وە (قُـدُس) و (قُـدْس) و وێنەی ئەوانە.

کە لە مانادا یەکن و لە بێژەدا جیان.

هی دووەمیان وەک (مالک و ملک)، لە سوورەتی فاتیحەدا، کە

بێژەکـەش و ماناکەشـی جیایـە، بـەڵام دەگونجـێ لـە شـتێکدا کۆببنـەوە، چونکـە (مالـک) واتـە: خـاوەن، (ملک)یـش واتـە: حوکمـڕان، هەردووکیـان لـە خاوەنداریێتییـدا کـۆ دەبنـەوە.

هی سێیەمیان: وەک:

﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ یوسف: ١١٠

کـە بـە (كُذِبُـوا) خوێندراوەتـەوە، بەبـێ گیـرە (شـدة)و بـە گیـرەش: (كُذِّبـوا)، کـە بێگومـان مانایـان جیایـە، بـەڵام لـە ڕوویەکـی دیکـەوە تێـک دەکەنـەوە، کـە بریتییـە لـەوەی پێیـان وابـووە : بـەدرۆ دانـراون، یـان پێیـان وابـووە: درۆیـان لەگەڵـدا کـراوە.

حیکمەت و سوودەکانی جیاوازیی قوڕئان خوێندنەکان:

ئیبنولجەزەریی هەشت سوودی هێناون:

**یەکـەم:** ئەوەیـە کـە چۆنیەتیـی قوڕئانخوێندنەکـە لەسـەر ئۆممـەتی پێغەمبـەر (صلی اللـه علیـه وسـلم) ئاسـان و سـێنابێ و سـووکبێ، چونکـە کەسـی وا هەیـە، پیتێکـی نایەتـە سـەر زار، هەیـە پیتێکـی چـاک بـۆ گـۆ (تلفـظ) ناکـرێ، بۆیە بـە پیتێکـی دیکـەش خوێندراوەتەوە، بۆ وێنـە (ص) ی بـۆ نایـە، بـە (س) یـش خوێندراوەتـەوە.

**دووەم:** سـوودی دووەمـی ئەوەیـە، کـە بێگومان لـەو جیاوازیی قوڕئان خوێندنانـەدا، ئەوپـەڕی ڕەوانبێژیـی و ئـەو پـەڕی دەستەوسـانکەریی و، ئەو پـەڕی کورتیـی هەیـە، چونکـە بە یـەک جـۆر نـووسراوە، بـەڵام بەچەند جۆر دەخوێندرێتـەوەو، هەر خوێندنەوەیەک وەک ئایەتێکی سـەربەخۆیە، وشـەی وا هەیـە بـە چـوار پێنـج جـۆر دەخوێندرێتـەوە، ئنجـا وەک خـوا (سُـبحانه وتعـالی) چـوار پێنج ئایـەت، یاخـود، چوارپێنـج وشـەی دابەزاندبن.

**سێیەم:** حیکمـەتی سێیەمی جیاوازیـی قوڕئـان خوێندنـەکان ئەوەیە،

کـە لەگـەڵ ئـەو هەمـوو جیاوازییـەدا، دژایەتیـی و ناکۆکیـی لـە نێـوان ماناکانیانـدا نیـە، بەڵکو هەرکامێکیان پشـتگیریی ئەوی دیکـە دەکاو، ئەوی دیکـە بەڕاسـت دادەنێ.

**چـوارەم:** ئەوەیـە کـە بـۆ ئۆممـەتی پێغەمبـەر (صـلى الله عليه وسـلم) ئاسـانتر لەبـەر دەکرێ و ئاسـانتر نەقڵ دەکـرێ، ئەگەر خوا - سـبحانە وتعالى - وشـەیەک کـە بە پێنج جـۆر دەخوێندرێتەوە، بە پێنج وشـەی دابەزاندبانایە، ئـەو کاتە قورئان ئێسـتا چەندە قەبارەکەی سـێ چـوار هێندە دەبـوو، کەواتە: ئێسـتا لەگـەڵ کورتییدا، ئاسـانتریش لەبەر دەکـرێ و دەگوازرێتەوە.

**پێنجـەم:** ئەوەیـە کـە ئۆممـەتی پێغەمبـەر (عليـه الصـلاة والسـلام) زۆر وەدوای مانـا جۆراوجـۆرەکانی قورئـان خوێنـدن دەکـەون و، حوکمـو و حیکمەتیـان لـێ هەڵدەهێنجـن، ئەوکاتەش پاداشـتیان زیاتـرو گەورەتر دەبێ.

**شەشـەم:** ئۆممـەتی پێغەمبـەر (عليه الصلاة والسـلام) کە بەو شـێوەیە خـوای بەخشـندە ئـەو فەرمایشـتەی بـۆ دابەزانـدوە، کـە بـە چەنـد جۆرێـک دەخوێندرێتـەوەو، هـەر جـۆرەش واتایـەک دەدا، واتایەکانیـش لەیـەک ڕەوتـدان و پێکـەوە ناکـۆک و دژ نیـن، ئەمـە گەورەیـی پێگـەی ئۆممـەتی پێغەمبـەر دەگەیەنـێ (عليـه الصـلاة والسـلام) .

**حەوتـەم:** سـوودی حەوتەمـی جیاوازیـی قورئـان خوێندنـەکان، ئەوەیە کـە: ئـەم ئۆممەتـە بـە هـۆی ئـەوەوە کـە کتێبەکـەی ئـاواش دەخوێنـدرێ و، ئـاواش دەخوێنـدرێ، ئـاواش دەخوێنـدرێ، کەسـانێک دەبـن پسـپۆڕ دەبن لە چۆنیەتیـی خوێندنـەکانی قورئانـداو، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی ئـەوە کە باشـتر قورئـان خزمـەت بکـرێ و، چاکـتر ئاگایان لێ بـێ و، چاکتر کەسـانێک تێیدا پسـپۆڕو شـارەزابن و پاداشـتێکی زیاتریـان هەبێ.

**هەشـتەم:** خـوا - (سُـبحانە وتعـالى)- ئـەو فەرمایشـتەی خـۆی کـە

فەرموویەتی: دەیپارێزم، پاراستوویەتی و ، لە ئەنجامی جۆراوجۆریی قورئان خوێندنەکاندا، لەنێو ئوممەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) زانایانێک ناچاربوون کە پسپۆڕو شارەزابن بۆ پارێزگاریی لێکردنی قورئان و، ئەوەی کە خوا فەرموویەتی: (ئێمە کتێبمان، ذیکرمان دابەزاندووە، خۆیشمان پارێزەری دەبین) بێگومان لە ڕێی ئەو زانایانەوە کە پسپۆڕیی و شارەزاییان تێیدا هەیە، لە ڕێی وانەوە دەپارێزرێ، ئنجا جیاوازیی قورئانخوێندنەکان، بووەتە هۆی ئەوەی زانایان زیاتر پێش برکە بکەن، یەکێکیان بەو قیرائەتە دەیخوێنێ، یەکێکی دیکە بەجۆرێکی دیکە دەیخوێنێ، یەکێکی دیکە بەجۆرێکی دیکە دەیخوێنێ، یەکێکیان بە هەر دە جۆرەکان و، یەکێکیان بە حەوت جۆرەکان و تا کۆتایی.[١]




(١)- النشر في القراءات العشر، ص٤٦، ٤٧.

بەرێزان!

لەمێژە لەبارەی هەبوون و نەبوونی نەسخەوە لە قورئان دا، لە نێو زانایانی ئیسلام دا ڕاجیایی و مشت و مڕ هەیەو، ئێستاش بەردەوامەو، بەشێک لە ڕاجیایی و مشت و مڕەکەش، پەیوەستە بە لێک حاڵیی نەبوونەوەو، بە هۆی جیاوازیی چەمک و واتای نەسخ لە نێوان زانایانی پێشین و پاشین دا.

بۆیە بە باشم زانی پانتاییەکی باشی ئەم کتێبە، بۆ ئەو مەسەلەیە تەرخان بکەم و، لە شەش بڕگەدا ئەم تەوەرە دەخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم:**

مانای نەسخ، لە زمان و قورئان و، لە زاراوەی زانایانی پاشین و زانایانی پێشیندا.

**بڕگەی دووەم:**

چەسپان و نەچەسپانی نەسخ لە قورئان و لە سوننەتدا.

**بڕگەی سێیەم:**

مەرجەکانی چەسپاندنی نەسخ.

**بڕگەی چوارەم:**

ئەوەی نەسخی تێدا دەبێ.



**بڕگەی پێنجەم:**

جۆرەکانی نەسخ لە قورئاندا.

**بڕگەی شەشەم:**

چەند سەرنجێک لەبارەی نەسخەوە.

ئێستاش دێینە سەر بڕگەی یەکەم:

## بڕگەی یەکەم :
## چەمک و مانای نەسخ، لە زمان و، قورئان و، زاراوی زانایان و، زانایانی پێشین دا:

کەواتە: لەپێنج خاڵاندا پێناسەی (نسخ) دەکەین:

١. وشەی نەسخ لە زمانی عەرەبییدا:

[النسخ في لسان العرب: الرفع والإزالة، ومنه يقال نسخ الكتاب رفع منه إلى غيره، ونَسَخَتِ الشَّمسُ الظِلَّ أزالَتْهُ].

واتە: لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا وشەی نەسخ بە مانای لابردن و نەهێشتنە، دەگوترێ: (نسخ الكتاب) واتە: نووسینەکەی لەبەر گرتەوە، نوسخەی لەبەر گرتەوە بۆ غەیری خۆی، دەگوترێ: (نسخت الشمس الظل) واتە: خۆر سێبەرەکەی نەسخ کردەوە، و لایبرد.

٢. لەبەکارهێنانی قورئاندا، وشەی نەسخ بە سێ واتایان بەکار هاتوە:

**یەکەم لابردن:** وەک لە سوورەتی حەج ئایەتی (٥٢) دا خوا دەفەرموێ:
﴿ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ الحج: ٥٢

واتە: ئنجا ئەوەی شەیتان فڕێی داوە [بۆ نێو وەحیی (خوا)و فڕێیداوەتە نێو فەرمایشتی خواوە] خوا لای دەبات و ئایەتەکانی خۆی مەحکەم و قایم دەکات.

**دووەم:** مانای دووەمی نەسخ لە قورئاندا، کە پێی بەکار هاتوە، بریتییە لە گۆڕین:

﴿ وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ﴾ النحل: ١٠١ .

واتـە: کاتێـک ئایەتێکـمان بـە ئایەتێـک گـۆڕی (یـان نیشـانەیەکمان بـە نیشـانەیەک گـۆڕی)، وشـەی (آیـة) دەگونجـێ بـە مانـای ڕسـتەی قورئـان بـێ، دەشـگونجێ بـە مانـای موعجیـزەی پێغەمبـەران - (علیـه الصـلاة والسـلام)-.

سـێیەم: مانـای سـێیەمی وشـەی نەسـخ بریتییـە لـە گواسـتنەوە (نقـل):

وەک خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ الجاثیة: ٢٩.

واتـە: ئێمـە ئـەوەی ئێـوە دەتانکـرد، نوسـخەبەردارییمان دەکـرد، فوتوکۆپییـمان دەکـرد.

کەواتـە: وشـەی نەسـخ (نسـخ) لـە بەکارهێنـانی قورئـاندا، هـەم بـە مانـای لابـردن، هـەم بـە مانـای گۆڕیـن، هـەم بـە مانـای گواسـتنەوە، بـەکار هاتـوە.

٣. لە زاراوی زانایاندا، ڕەنگە باوترین پێناسە بۆ نەسخ ئەوەبێ:

[النسـخ: رفـع حكـم شرعـي عمـلي جـزئي ثبـت بالنـص، بحكـم شرعـي عمـلي جـزئي، ثبـت بالنـص، وَرَد عـلى خلافـه، متأخر عنـه في وقـت تشريعه، ليـس متصلاً بـه][1].

واتـە: نەسـخ بریتییـە لـە لابـردنی حوکمێکـی شـەرعیی کردەیـی بەشـیی، کـە بەدەقێـک چەسـپاوە، بـە حوکمێکـی شـەرعیی کردەیـی بەشـیی، کـە ئەویـش بەدەقێـک چەسـپاوە و، بـە پێچەوانـەی ئـەوە وە هاتـوە، لێشـی دوا کەوتـوە لـە کاتی دانانیـداو، پێییـەوە پەیوەسـت نیـە.

(١)- المقدمات الأساسية في علوم القرآن، ص ٢٠٧ .

کەواتـە: نەسـخ بریتییـە لـە لابردنـی حوکمێکـی شـەرعیی، لـەو حوکمـە شـەرعییانەی کـە پەیوەندییـان بـە کردوەکانـەوە هەیـە، نـەک بـە ئیـمان و عەقیـدەوە، بـە حوکمێکـی شـەرعیی دیکـە، دیسـان هەر لـەو بارەوە کـە لێـی دوا کەوتـوە، واتـە: دەبـێ هەردووکیشـیان بـە دەقێکـی شـەرعیی چەسـپابن، ئنجـا وشـەی نەسـخیان بـۆ بـەکاردێ و دەبـێ تێکیـش بگیرێـن و پێکـەوە نەگونجێـن، ئنجـا بەیەکیـان دەگوتـرێ: لابـەرو، بـەوی دیکەیـان دەگوتـرێ: لابـراو (ناسـخ و منسـوخ).

ئەمە وشەی نەسخ لە زمان و لە قورئان و لە زاراوی زانایاندا.

٤. ئنجـا بـا بزانیـن زانایـانی پێشـین ڕەحمـەتی خوایـان لـێ بـێ، وشـەی نەسـخیان بـەچ مانایـەک بەکارهێنـاوە؟

زانایانی پێشین وشەی نەسخیان بە پێنج واتایان بەکار هێناوە:

**جۆری یەکەم: تایبەتکردنی گشتیی (تخصيص العام):**

یانی: شتێک کە بەگشتیی هاتوە، دوایی تایبەت کراوە.

وەک خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

[قال: ابن عباس: لما نزل قوله تعالى:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ النور-٢٧.

ثم نسخ واستثنى من ذلك:

﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمۡ﴾ النور: ٢٩(١) ]

عبداللـە ی کـوڕی عەببـاس خـوای لـێ ڕازی بـێ گوتوویـەتی: کـە ئـەو فەرمایشـتەی خـوا هـات:

ئـەی ئەوانـەی بڕواتان هێنـاوە! مەچنە ماڵانێک جگە لە ماڵـەکانی خۆتان

(١) - أخرجه البخاري في (الأدب المفرد): ١٠٥٦، وابن الجوزي (في نواسخ القرآن): ص٤٠٧ - ٤٠٨ قلت : وإسناده حسن.

هەتاكو هۆگریی و ئاشنایی ئەوان پێتان، وە دەستنەهێنن و، دڵنیا نەبن كە پێیان خۆشە بچن بۆ لایان و، مۆڵەتیان لێ وەرنەگرن و سڵاویان لێ نەكەن.

دەڵێ: دوایی ئەوەی نەسخ كردو لێ هەڵاوارد، و فەرمووی:

﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ﴾ النور: ٢٩

واتە: گوناحتان ناگاتێ بچنە ماڵانێكەوە كە نیشتەجێ نین و سوودو بەهرەیەكتان لەوێدا هەیە.

لێرەدا نەسخ بەو واتایەیە: كە ئەوەی پێشێ چەمكەكەی گشتیی بووە، بەڵام دوایی تایبەت كراوە بەو ماڵانەوە، كە ئاوەدانن و خەڵكیان تێدایە، بەڵام ئەو شوێنە گشتییانەی، كە ئاوەدان نین، یا خود خەڵكێكیان تێدا نیە، وەك، ماڵ و خێزان، ئەو كاتە ئەوە هەڵاوێردراوە.

كە ئیبن و عەبباس گوتوویەتی: نەسخ، بەڵام لە ڕاستییدا ئەمە تایبەتكردنی حوكمێكی گشتییە، ئنجا وەك دوایی باسی دەكەین، ئەوە هۆی بە هەڵەدا چوونی ژمارەیەكی زۆر لە زانایانی دوایی بووە ، كە هەر جارێك هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، وشەی نەسخیان بەكارهێنابێ، هەرچەندە مەبەستیان لابردنی حوكمێكیش نەبووبێ، ئەوان هەروای لێ حاڵیی بوون!

بۆ نموونە: (إبن عباس) لێرە ،كە دەڵێ: (ثم نسخ واستثنى من ذلك)، دوایی نەسخی كردەوەو ئەوەی لێ هەڵاوارد، یانی: ئەوەی دوایی لێ هەڵاوارد، كە گوناهتان ناگاتێ، كە بچنە شوێنە گشتییەكانەوە كە بە هرەو سوودێكتان لەوێدا هەیە، مادام خەڵكیان تێدا نەبێ، واتە: خەڵكێكی دیارییكراو وەك ماڵ و خێزان، كە ئەمەش تایبەتكردنی حوكمێكی گشتییە، نەك لابردنی حوكم!

**جۆری دووەم: بەندارکردنی ڕەها (تقييد المطلق):**

یانی شتێک بە ڕەهایی دێ، بەڵام دوایی بەندی دەخرێتە سەر.

بۆ وێنە: خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران.

زانایانی پێشین گوتوویانە: [(نُسِخَت بقوله تعالى : ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾ التغابن: ﴿١٦﴾.(١)].

ئـەوەی پێشـێ بـە ڕەهایـی، دەفەرمـوێ: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! وەک بـۆ خـوا شایسـتەیە پارێـزی لـێ بکـەن.

زانایـان گوتوویانـە: دوایـی ئـەوە نەسـخ کرایـەوە بـە قسـەی خـوای بـەرز، کـە دەفەرمـوێ: ئەوەنـدەی، کـە دەتوانـن پارێـز لـە خوابکـەن!

لـە ئایـەتی پێشـێدا بـە ڕەهایـی دەفەرمـوێ: وەک بۆ خـوا شایسـتەیە پارێـزی لێبکـەن، بـەڵام لـە ئایـەتی دووەمـدا دەفەرمـوێ: ئەوەنـدەی لـە تواناتانـدا هەیـە پارێـزی لـێ بکـەن.

کـە ئەمـە پێـی دەگوتـرێ: بەندارکـردنی ڕەهـا (تقييـد المطلـق)، شـتێک بەڕەهایـی هاتـوە، دوایـی بەنـدار دەکـرێ.

کـە لـە ڕاسـتییدا ئـەوە بـە مانـا باوەکـەی ، نەسـخ نیـە، بەڵکـو شـتێک بـە ڕەهایـی هاتـوە، ئنجـا بـۆ ئـەوەی هـاوەڵان و مسـوڵمانان بـە هەڵـە تێنەگـەن، خـوا (سُـبحانه وتعـالى) دەقێکـی دیکـەی نـاردوە، تاکـو هـی دوایـی، ئـەو ڕەهاییـە بەندداربـکات بـەوەوە ،کـە لـە توانـادا هەیـە.

(١) - أخرجه عبدالرزاق في تفسيره ج١ ص١٢٨، وابن جرير ج٤ ص٢٩ جزء٢٨ ص١٢٧، وابن الجوزي في نواسخ القرآن ص٢٤٢.

**جۆری سێیەم:** شتێک بە کورتیی هاتوە، بەڵام دوایی دەقێکی دیکە هاتوەو ڕوونی کردۆتەوە (تبيين المجمل):

کە زۆربەی زانایان بۆ ئەم جۆرە، ئەمە بە نموونە دێننەوە، هەرچەندە دەقەکە درێژە، بەڵام هەر دەیهێنین: خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: ٢٨٤

واتە: ئەگەر ئەوەی لە دەروونتاندا هەیە، ئاشکرای بکەن یاخود پەنهانی بکەن، خوا لێپرسینەوەتان لەسەری لەگەڵدا دەکات.

لەو بارەوە ئەم دەقە دابەزیوە:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: لما نزلت على رسول الله (صلى الله عليه وسلم):

﴿ لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ البقرة: ٢٨٤

قال: فاشتدَّ ذلك على أصحاب رسول الله (صلى الله عليه وسلم)، فأتوا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ثم بَركوا على الركب فقالوا: أي رسول الله! كُلِّفنا بأعمال ما نطيق الصلاة والصيام والجهاد والصدقة وقد أنزلت عليك هذه الآية ولا نطيقها.

قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): أتريدون أن تقولوا كما قال أهل الكتابين من قبلكم: سمعنا وعصينا؟!

بل قولوا: سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا وإليك المصير.

قالوا سمعنا وأطعنا غفرانك ربنا وإليك المصير.

فلما اقترأها القوم، ذلَّت بها ألسنتهم، فأنزل الله في إثْرها:

﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ

وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾ البقـرة: ٢٨٥

**فلما فعلوا ذلك، نسخها الله تعالى، فأنزل الله عزوجل:**

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ البقـرة: ٢٨٦

**قال نعم.**

﴿رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ البقرة: ٢٨٦

**قال نعم.**

﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ البقرة: ٢٨٦

**قال نعم.**

﴿وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ البقـرة: ٢٨٦

**قال نعم[(١)].]**

واتـە: ئەبوهورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: کاتێـک ئەمـە دابەزی بـۆ سـەر پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیه وسـلم) :

هەرچـی لـە ئاسمانەکان و هەرچـی لـە زەویـدا هەیـە، هـی خوایـەو ئـەوەی کـە لـە دەروونتـان دایـە ئاشـکرایبکەن، یـان پەنهانـی بکـەن خـوا لەسـەری لێپرسـینەوەتان لەگەڵـدا دەکات، هەرکەسـێک بیـەوێ لێـی دەبـوورێ و، هـەر کەسێکیشـی بیـەوێ، سـزای دەدا، خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێک بەتوانایـە.

ئنجـا کـە ئەمـە دابـەزی لەسـەر هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (علیـه الصلاة والسـلام) قـورس بوو، هاتنـە خزمـەت پێغەمبەری خـوا (علیه الصلاة

(١)- مسلم: ١٢٥، و أبوعوانة ج١ ص٧٦ - ٧٧، والطحاوي في شرح المشكل:١٦٢٩، وابن حبان: ١٣٩.

والسـلام) لەسـەر ئەژنۆیـان دانیشـتن، گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! کردەوەکانمـان لەسـەر پێویسـت کـراون، کـە دەتوانیـن بیانکەیـن، نوێـژو ڕۆژووگرتـن و جیهـادو ماڵ بەخشـین، بەڵام ئـەم ئایەتەت بۆ سـەر دابەزیوە، ناتوانیـن جێبەجـێ بکەیـن! [هەڵبەتە بۆیـە گوتوویانـە: ناتوانین جـێ بەجێی بکەیـن چونکـە وا حاڵیـی بـوون، هـەر خەتەرەیەکـی خـراپ بەدڵیـان دابـێ خـوا سـزایان دەدات لەسـەری، کە مەبەسـت ئـەوە نیە، بـەڵام ئـەوان وای لێ حاڵیـی بـوون، لەبـەر زێـدە ئیحتیـات کـردن و دووربینیـی کـردن] پێغەمبەر فەرمـووی: ئایـا دەتانـەوێ وەک خـاوەنی دوو کتێبـەکان بڵێـن، کـە لەپێـش ئێـوەدا گوتیـان: (سـمعنا وعصینا) ئەوە بیسـتمان بەڵام سـەرپێچییکار بوین و یاخیـی بوویـن؟!، بەڵکو بڵێن : [سـمعنا وأطعنا غفرانک ربنـا وإلیک المصیر]، بیسـتمان و فەرمانبەریـن، داوای لێبوردنت لێ دەکەیـن پەروەردگارمان! بەس بـۆلای تۆیـش دێینـەوە، ئەوانیـش گوتیـان: [سـمعنا وأطعنـا غفرانـک ربنـا وإلیـک المصیـر]، کاتێـک کـە خەڵکەکـە خوێندیانەوەو زمانیـان پێی ڕاهات، ئنجـا خـوا بـە دوای ئـەوەدا ئـەم ئایەتـەی دابەزاند:

﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ البقـرة: ٢٨٥

واتـە: پێغەمبـەرو بـڕواداران بڕوایـان هێنـا بـەوەی کـە بـۆ سـەری دابەزێـنراوە لـە لایـەن پەروەردگاریـەوە، هەموویـان بڕوایان هێنا بـە خواو بە فریشـتەکانی و بـە کتێبـەکانی و بـە پێغەمبـەرانی و (گوتیـان: ) جیاوازیـی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانیەوەو گوتیان: بیسـتمان و فەرمانبەرین، داوای لێبوردنـت لـێ دەکەین پەروەردگارمان ! بۆلای تـۆش دێینەوە، کاتێـک ئەوەیـان گـوت: ئنجـا خـوای بەرز لایـبردو سـڕیەوەو ئەمـەی دابەزاند:

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ البقرة: ٢٨٦

واتە: خوا لە هیچ کەسێک داوا ناکات، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە، هەرکەسێک چاکە بکات، پاداشتەکەی بۆ خۆیەتی و، هەرکەسێ خراپە بکات، سزایەکەی لەسەر خۆیەتی.

پەروەردگارمان! ئەگەر لەبیرمان چوو یان هەڵەمانکرد، مەمانگرە (سزامان مەدە)!

خوا فەرمووی: بەڵێ.

﴿رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ البقرة: ٢٨٦

پەروەردگارمان! هەروەها باری قورسمان مەخە سەرشان وەک خستووتە سەرشانی ئەوانەی پێش ئێمە (بە هۆی گوناح و لادانیانەوە)

خوا فەرمووی: بەڵێ.

﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ البقرة: ٢٨٦ .

پەروەردگارمان! شتێک مەخە سەرشانمان کە لە تواناماندا نیە.

(دیسان پەروەردگار) فەرمووی: بەڵێ.

﴿وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ البقرة: ٢٨٦

چاوپۆشییمان لێبکەو، لێمان ببوورە و بەزەییت پێماندا بێ، تۆ سەرپەرشتیارمانی ، بەسەر کۆمەڵی کافراندا سەرمان بخە.

خوا فەرمووی: بەڵێ.

ئنجا بێگومان لێرەدا ئەوەی پێشێ کە دابەزیوە، لەگەڵ ئەوەی دواییدا، تێک ناگیرێن، بەس ئەوەی پێشێ زیاتر لەواتایەک هەڵدەگرێ، بەڵام ئەوەی دوایی، واتای ئەوەی پێشێی ڕوون کردووەتەوەو، ئەمەش

پێـی دەگوتـرێ: (تبييـن المجمـل وتفسـيره)، شـتێک کـە بـە کورتیـی هاتـوە، دوایـی ڕوونکراوەتـەوە، کـە لـە ڕاسـتییدا پێـی ناگوتـرێ: نەسـخ بـە واتـا زاراوەییەکـەی و، ئـەم ئایەتـە موحکەمـە، وەک لـە تەفسـیری سـوورەتی (البقـرة) دا باسـمانکردوە.



**جـۆری چـوارەم:** کارنەکـردن بـە دەقێـک لەبـەر گۆڕانـی هـەل و مـەرج (تـرک العمـل بالنـص لتغيُّـر الظـرف):

بۆ وێنە: خوا (سُبحانه وتعالى) کە دەفەرموێ:

﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَٱنتَظِرۡ﴾ السجدة: ٣٠

واتە: پشتیان تێبکەو چاوەڕێ بە.

ئەمـە هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانـە : [منسـوخ، نسـختە بـراءة والقتـال]. واتـە: نەسـخ کراوەیـە بـە سـوورەتی بەرائـە (الـبراءة) سـوورەتی (القتـال) ـ کـە پێشـی دەگوتـرێ: سـوورەتی موحەممـەد (محمـد) ـ، نەسـخیان کردۆتـەوە.

بـەڵام وشـەی نەسـخیان بەکارهێنـاوە، بـۆ ئـەوە کـە جـارێ کاری پـێ ناکـرێ، لەبـەر ئـەوەی زەمینـەی نـە ڕەخسـاوە، یـان عومـەر خـوای لـێ ڕازی بـێ کـە لەسـاڵی برسـیەتی (المجاعـة)و گرانییـدا، سـزای دەسـتبڕینی ڕاگـرت، هەروەهـا ئـەوەی کـە دەدرا بـە دڵ ڕاگیـراوان (مؤلفـة القلـوب) ڕایگـرت، چونکـە شایسـتە نەبـوون.

بـەڵام ئایـا ئایەتـەکان نەسـخ بوونـەوە؟ نەخێـر، هـەر لەجێـی خۆیانـدان، بـەڵام دەبـێ زەمینـەی جـێ بەجـێ کردنیـان بڕەخسـێ، ئنجـا جـێ بەجـێ دەبـن! ئەمـەش حاڵەتێکـی دیکەیـە کـە زانایـانی پێشـوو، وشـەی نەسـخیان بـۆ بـەکار هێنـاوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا بـە مانـا زاراوەییەکـەی، نەسـخی بـۆ بـەکار نایـەت.

(الزركشي) لەو بارەوە قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ:

[مـا أمـر بـه لسـبب ثـم يـزول السـبب، كالأمـر حـين الضعـف والقلـة بالصـبر، والمغفـرة للـذي لايرجـون لقـاء اللـه ونحـوه، مـن عـدم إيجـاب الأمـر

بالمعروف والنهي عن المنكر والجهاد ونحوها، ثم نسخه إيجاب ذلك، وهذا ليس بالنسخ في الحقيقة إنما هو نَسْأ][1].

واتە: ئەوەی خوا بە هۆیەکەوە فەرمانی پێکردوە، دوایی هۆیەکە لادەچێ، (یانی فەرمانەکە نامێنێ) وەک خوا لەکاتی بێ دەستەڵاتیی و کەمییدا و، فەرمانی کردوە بە خۆڕاگریی و بە لێبووردن و چاوپۆشیی لەوانەی کە بە ئومێدی دیداری خوا نین، هەروەها وێنەی ئەوانە، وەک پێویست نەکردنی فەرمانکردن بە پەسەندو ڕێگریی لە ناپەسەندو جەنگ و جیهادو وێنەی ئەوە، دوایی کە خوا ئەو شتانەی پێویست کردوون و، ئەوەی پێشێی نەسخ کردوەتەوە، ئا ئەوە نەسخ نیە، بەڵکو ئەوە دواخستن (نَسْأ)ە، یانی هەتا ئەو بارودۆخ و واقعە دێتە پێش، کاتێک ئەو هەل و مەرجە هاتە پێش، ئەو ئایەتە هەر لە جێی خۆیەتی.




(١)- البرهان في علوم القرآن، للزركشي (٤٢/٢).

جۆری پێنجەم: شتێک کە لە ئەسڵدا ڕەوایەو حوکمەکەی دەگۆڕڕێ، واتە: پلە پلەیی (نقل حكم الإباحة الأصلية: التدُّرج):

بۆنموونە: کاتێک خوا (سُبحانه وتعالى) ئەم ئایەتەی نارده خوار:
﴿۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا﴾ البقرة: ٢١٩

عومەر بانگکراو بەسەریدا خوێندرایەوە، گوتی: [أَللَّهم بيِّنْ لنا في الخمر بياناً شافياً].

واتە: ئەی خوایە! لەبارەی شەڕابەوە ڕوونکردنەوەیەک کە تەواو ڕوونبێ و شیفای دڵمان بدات، بۆمان دابەزێنە.

ئنجا ئەو ئایەتەی سووڕەتی (النساء) دابەزی:
﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ﴾ النساء: ٤٣

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەسەرخۆشیی توخنی نوێژ مەکەون.

عومەر بانگکراو بەسەریدا خوێنرایەوە، گوتی: ئەی خوایە! لەبارەی شەڕابەوە ڕوونکردنەوەیەکی شیفا دەرمان بۆ دابەزێنە!

دوایی ئایەتەکەی سووڕەتی (المائدة) دابەزی:
﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ المائدة: ٩١

ئیدی عومەر بانگکراو بەسەریدا خوێندرایەوە، ئەویش گوتی: وازمان هێنا، وازمان هێنا[١].

(١)- أحمد: ٣٧٨، و أبو عبيد في الناسخ والمنسوخ: ٢٥٤، وأبو داود: ٣٦٧٠، والترمذي: ٣٠٤٩ والنسائي: ٥٥٤٠، وابن جرير في تفسيره،والنحاس في الناسخ والمنسوخ، والجصّاس في أحكام القرآن، والبيهقي والضياء في المختارة: ٤٥٦.

کــە لــە ڕاســتییدا ئایەتــەکانی پێشــێ یەکــەم: هــی (البقــرة:٢١٩) کــە خــوا دەفەرمــوێ: لەبــارەی شــەڕاب و قومــارەوە لێــت دەپرســن، بڵــێ: گوناحێکــی گەورەیــان تێدایــەو هەنــدێ ســوودو بەرژەوەندییــش، گوناحەکەشیان لــە ســوودەکەیان گەورەتــرە، ئەمــە نەســخ نابێتــەوە، چونکە هەواڵــە، بێگومــان شــەڕاب و قومــار گوناحــی گەورەیــان تێدایــەو ســوودو بەژوەندییشــیان بــۆ خەڵــک تێدایــە، کــە بازرگانییــان پێــوە دەکــەن.

دووەم: هەروەهــا ئــەوەی ســووڕەتی (النســاء) ـ ٤٣ ـ نەســخ نەبووەتــەوە، چونکــە خــوا دەفەرمــوێ: بەسەرخۆشــیی نوێــژێ مەکــەن، مانــای ئــەوە نیــە ئایەتەکــەی ســووڕەتەکەی (المائدة) ئــەوەی لابردوەو، بەســەر خۆشــیی دروســتە نوێــژ بخوێــنرێ! بەڵکــو هــەر دروســت نیــە بەســەر خۆشــیی نوێــژ بکــرێ.

بــەڵام کۆتــا بڕیــار لەبــارەی قومــارو شــەڕابەوە، لــە ئایــەتی ســووڕەتی مائیــدەدا هاتــوەو، ئایەتــەکانی دیکــەش هــەر لــە شــوێنی خۆیانــن.

بەڵــێ ئــەو پێنــج واتایــە، زانایــانی پێشــین، وشــەی نەســخیان بــۆ بــەکار هێنــاون، بــەڵام لەڕاســتییدا نەســخ بــە مانــا زاراوەییەکــەی، لەگــەڵ ئــەو پێنــج واتایــەدا ناگونجــێ.

(الشــاطبي) لــە کتێبەکــەی خــۆی (الموافقــات)[1] دا هــۆکاری ناونــرانی ئــەو پێنــج واتایــە بــە نەســخ، ڕوون دەکاتــەوەو دەڵــێ:

[لأن جميــع ذلــك مشــترك في معنــى واحــد، وهــو أن النســخ في الإصطــلاح المتأخــر اقتــضى أن الأمــر المتقــدم غــير مــراد في التكليــف، وإنمــا المــراد مــا جــيء بــه آخــراً، فــالأول غــير معمــول والثــاني هــو المعمــول بــه].

واتــە: هەمــوو ئــەو پێنــج واتایــە لەیــەک شــت دا پێکــەوە

(١)- ج٣ ص١٠٨، ١٠٩.

بەشدارن، ئەویش ئەوەیە کە نەسخ لە زاراوی دواییدا، کە زانایان لەسەری ڕێککەوتوون، ئەوەیە کە فەرمانەکەی پێشێ، مەبەست نیە بۆ ئەرکدارکردن، بەڵکو ئەوەی دوایی هاتوە، ئەویان فەرمانی پێکراوەو ئەوەی پێشێ کاری پێ ناکرێ و دووەمیان کاری پێ دەکرێ.

یانی: ئەم پێنج واتایە، لە واتایەکی هاوبەشدا لەگەڵ نەسخدا تێک دەکەنەوە، بۆیە وشەی نەسخیان بۆ بەکار هێناوە، بەڵام هیچ کام لەوانە بە واتا زاراوەییەکەی، بە نەسخ لەقەڵەم نادرێ.



## برگـەی دووەم: چەسـپان و نەچەسـپانی نەسـخ لـە قورئـان و لـە سـوننەتدا:

ژمارەیەک لە زانایان لە پێشووان و هاوچەرخان، چەند ئایەتێک لە قورئان دێننەوە و دەیانکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە، کە نەسخ لە قورئاندا هەیە!

١-یەکەمیان ئەو ئایەتەی دەفەرموێ:

﴿ * مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾، البقرة: ١٠٦، (نُنسِها)[1].

دەڵێن: ئەمە بەڵگەیەکی زۆر ڕوونە لەسەر ئەوە کە نەسخ لە قورئاندا ڕوویداوە!!

واتە: هەر ئایەتێک نەسخ بکەین، یان لەبیری بەرینەوە (و دوای بخەین)، چاکتر لە خۆی، یان وێنەی خۆی دێنین، ئایا نازانی خوا لەسەر هەموو شتێک بەتوانایە؟

بەڵام ئەو ئایەتە زانایانێکی زۆر چەند جۆرە لێکدانەوەیەکی دیکەیان بۆ کردوونو، گوتوویانە: مەبەست پێی نەسخکردنەوەی هەندێک لە ئایەتەکانی قورئان نیە:

**یەک:** هەندێک لە زانایان ـ وەک من لە تەفسیری ئەم ئایەتەو لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)دا باسمکردوە ـ گوتوویانە: لێرەدا خوا مەبەستی لە ئایەت، موعجیزەیە، یانی: هەر موعجیزەیەکی پێغەمبەران لابەرینو، موعجیزەیەکی دیکە بێنین، بۆ پێغەمبەری دواتر، وەک ئەوە یاخود لەو چاکترە.

واتە: ئایەت بە مانای ڕستەی قورئان نیە، بەڵکو بە مانای موعجیزەی پێغەمبەرانە (علیه الصلاة والسلام) وەک خوا دەفەرموێ:

---

(١)- ئـەم وشـەیە بـەدوو جـۆر خوێندراوەتـەوە: (نُنسِـها) و (نُنْسـئْها)، بۆیـەش بـە: (لەبیـری ببەینـەوە)و (دوای بخەیـن) مانـا کـراوە.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍ بَيِّنَٰتٍ ﴾ الإسراء: ١٠١ .

واتە: بەدڵنیایی ئێمە نۆ نیشانەی ڕوون و ئاشکرامان بە مووسا دابوون.

ئنجا دەڵێین: بەڵگەش لەسەر ئەوە کە (آیـة) لێرەدا مەبەست پێی بەڵگەو موعجیزەی سەلماندنی ڕاستیی پێغەمبەرانە(علیهم الصلاةوسلام)،ئەوەیە کەلە کۆتایی ئایەتەکەدا فەرموویەتی:﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ١٠٦ ﴾ البقرة.

واتە: ئایا نازانی خوا لەسەر هەموو شتێک توانایە! کەواتە: مەبەست هێنانی موعجیزەیە نەک دابەزاندنی ئایەت، ئەگەرنا دەیفەرموو: ( أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ بكُلِّ شَيْءٍ عليم )، هەروەها لە ئایەتەکانی (١٠٧ و ١٠٨)دا فەرموویەتی:﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ١٠٧ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٠٨ ﴾ البقرة: ١٠٧ – ١٠٨ .

ئاشکرایە کە گەلی مووسا بەردەوام داوای موعجیزەی بەرهەستیان لە مووسا دەکرد، بۆوێنە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ ٥٥ ﴾ البقرة.

دوو: هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە:

مەبەست لە لابردن (نَسْخ) یان لە بیربردنەوەو، دواخستن (إِنساء و نَسْأ)، لابردن و نەهێشتن یان لەبیربردنەوەو وازلێهێنانی حوکم و یاسایەکانی شەریعەتە پێشووەکانە، کە حوکم و یاسایەکانی شەریعەتی کۆتایی خوا، شوێنیان دەگرنەوە.

سێ: یەکی دیکە لە زانایان گوتوویەتی مانای ئەو ئایەتە بەم شێوەیە: (إن أَيَّة آية قرآنية نمحو كتابتها و نقوشها على ما سطر عليها، أو نُنْسي الحفّاظ مافي ذاكرتهم منها، نأت ببديلٍ خيرٍ منها من حيث المصلحة، أو مثلها في ذلک)[١].

واتە: هەر ئایەتێکی قورئان نووسین و خەت و نیگارەکەی لەسەر ئەوەی

(١) مباحث قرآنية، بابا علي الشيخ عمر القرة داغي ، ص(٧٩).

تێیدا نووسراوە، لایبەرین و بیسڕینەوە، یان لە بیرو هۆشدانی لەبەرکەرانیدا نەیهێڵین و لە بیریان ببەینەوە، جێدارێکی باشتر لەخۆی، یان وەک خۆی، لە ڕووی بەرژەوەندییەوە دەهێنینە جێی.

ئنجا گریمان مەبەستی پێ ئایەتی قورئانیش بێ، دیسان نابێتە بەڵگە لەسەر نەسخکرانەوەی ئایەتەکانی قورئان، چونکە خوا ڕستەکەی بە (ما) هێناوە، کە لێرەدا (ما) (إسم شرط)ەو بە مانای (إنْ)ی (شرطية)یە، یانی: خوا نەیفەرمووە: ئایەتێک (نەسخ دەکەین) بەڵکو فەرموویەتی: ئەگەر ئایەتێک نەسخ بکەین، یان لەبیربەرینەوە و دوای بخەین، مەرجیش نیە مرج (شرط)ەکە بێتەدی، تاکو مەرجگیراو (مشروط)ەکە بێتەدی! وەک ئایەتی: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾ الزمر.

**٢-هەروەها دوو ئایەتەکەی سوورەتی (النحل) کە دەفەرموێ:**

﴿وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَكَانَ آيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِنْ رَبِّكَ بِالْحَقِّ لِيُثَبِّتَ الَّذِينَ آمَنُوا وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾﴾ النحل.

واتە: هەرکاتێک ئایەتێکمان گۆڕی و لە شوێنی ئایەتێک دانا، خواش دەزانێ چی دادەبەزێنێ، دەڵێن: تۆ هەڵبەستەری، بەڵکو زۆربەیان نازانن، بڵێ ڕووح لقودس لە پەروەردگارتەوە بە حەق دایبەزاندوە، تاکو ئەوانەی بڕوایان هێناوە، پێیان بچەسپێنێ و ڕێنمایی و موژدە بێ بۆ مسوڵمانان.

ئەمیش وەک لە تەفسیری سوورەتی (النحل)دا باسمانکردوە، لەبەر دوو هۆکار بەڵگە نیە لەسەر ئەوە کە ئەم موصحەفەی ئێستا لەبەردەستمانە، ئایەتی تێدا هەبێ مەنسووخ بێ و کاری پێ نەکرێ:

أ. سوورەتی (النّحل) مەککەییە و، لە مەککەش بە گشتیی ئایەتەکانی حوکمەکان (آيات الأحكام) دانەبەزیون و، بە هیچ جۆرێک باسی

نەسخ لە ئارادا نەبووە، تاکو ئەو دوو ئایەتەی (النّحل) بەو جۆرە تەفسیر بکرێن.

ب. ژمارەیەک لە ڕوونکەرەوانی قوڕئان، ئەو دوو ئایەتەیان بەو جۆرە تەفسیر کردوون کە مەبەست پێیان لابردنی بەرنامە پێشووەکان (نسخ الشرائع المَقَدِّمة)ە، وەک (القرطبي)، گوتوویەتی: (قیل: بدَّلْنا شریعة متقدِّمة بشريعة مُسْتَأْنفة)[1] واتە: گوتراوە: بەرنامەیەکی پێشوومان بە یەکی دیکەی تازە گۆڕی.

٣-هەروەها ئایەتێکی دیکە بە بەڵگە دێننەوە، کە هیچ پەیوەندیی بەو پرسەوە نیە:

﴿ يَمْحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ الرعد: ٣٩ .

کە وەک ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الرعد)دا باسمانکردوە، ئەمە هیچ پەیوەندیی بەو باسەوە نیەو، باسی ئەندازەگیریی و بڕیاردانی خوایەو، باسی سڕینەوەو لابردنی هەندێک لە بڕیارو کارەکان و چەسپاندنی هەندێکی دیکەییانو سووڕەتی (الرَّعد)یش مەککەییە.

٤- هەروەها ئایەتێکی دیکەش بە بەڵگە دێننەوە، لە سووڕەتی (یونس)، ئایەتی ژمارە (١٥):

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآىِٕ نَفْسِىٓۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ من ربى ﴾ يونس: ١٥ .

واتە: هەرکات ئایەتە ڕۆشنەکانمانیان بەسەردا خوێندرانەوە، ئەوانەی

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٤ ص١٤٥. شایانی باسە: (القرطبي) وەک (قیل) هێناویەتی و خۆی ڕای زۆرینەی تەبەنني کردوە.

بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، دەڵێن: قورئانێکی دیکەی جگە لەمە بێنە، یان بیگۆڕە، بڵێ: بۆم نیە لە خۆمەوە بیگۆڕم، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم کە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆم سروش دەکرێ.

ئەمیش دیسان بەڵگەی هەبوونی نەسخ نیە لەقورئان دا ، چونکە خوا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: (بڵێ: بۆمن نیە لەخۆمەوە قورئان بگۆڕم)، ئنجا ئەوە چ پەیوەندییەکی بەنەسخ کردنەوەی قورئانەوە هەیە؟!.

هەروەها وەک بەڵگە بۆ ئیسپاتی هەبوونی نەسخ لە قورئاندا، قسەیەکی (إبن الجوزي) دێنن لە کتێبەکەی خۆی (نواسخ القرآن)[1] دا کە دەڵێ: [إنعقد إجماع العلماء على هذا، إلّا أنه قد شذّ من لاُيلْتَفَتُ إليه].

واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، (کە نەسخ لەقورئان دا بووە) بەڵام هەندێک زانا ڕیزپەڕبوون کە ئاوڕیان لێ نادرێتەوە، (واتە: قسەکەیان بە هەند وەرناگیرێ).

منیش دەڵێم:

مادام هەرکام لەو ئایەتانە، وێڕای ئەو تەفسیرەی بڕوا پێبووانی نەسخ هەبوون لە قورئان دا، بۆیان کردوون، لێکدانەوەو تەفسیری دیکەشیان بۆ کراوەو، مانای دیکەش هەڵدەگرن، هەمیشەش ئیجماع لەسەر مەسەلەیەک دروست دەبێ کە دەقێکی شەریعەتی ڕوون و بێ چەندچوون بوویێتە بناغەی و لەسەری بنیات نرابێ، کەواتە: ناگونجێ ئیجماع لەسەر مەسەلەی وا دابمەزرێ‌و، بە پێی بنەمای (إذا دخل الإحتمال بطل الإستدلال) هەرکات ئەگەر (شێمانە) هاتە نێو، بەڵگە پێهێنانەوە هەڵدەوەشێتەوە، ئەو قسانەیان جێی خۆیان ناگرن.

(١)- ص ٨٤.

شایانی گوتنیشە: لافلێدانی هەبوونی یەکدەنگیی (إدعاء الإجماع) لەسەر مەسەلەیەک، عادەتێکی لە مێژینەی هەندێک لە زانایانە، بەڵام ساغکەرەوان (محققون) ئەو لافلێدانانەیان زۆر بە هەڵوەشاندوونەوەو (إبن حزم الأندلسي) و (الشوكاني)و (إبن حِبّان)و (أهل الظاهر)و (أحمد في إحدى الروايتين)و ژمارەیەکی دیکە لە زانایان گوتوویانە:

جگە لە یەکدەنگیی هاوەڵان (إجماع الصحابة) هیچ یەکدەنگییەکی دیکە نەبووەو نیە، [1] هەروەها (إبن تيمية) ش هەمان ڕای هەیە [2].

هەڵبەت باسکردنی هەبوونی یەکدەنگیی (إجماع)[3]ی هاوەڵان (أصحاب) لەسەر هەبوونی نەسخ ـ بە زاراوەی زانایانی پاشین ـ لە قورئاندا، جگە لە ئەفسانەیەک و قسەیەکی بێ بنەما هیچی دیکە نیە، چونکە:

چۆن دەگونجێ بیرۆکەیەک یەکدەنگیی لەسەر دروست بێ، کە ئەو هەموو ڕا جیاوازانەی لەسەر بن، تەنانەت لە لایەن ئەوانەشەوە کە بڕوایان بە هەبوونی نەسخ هەیە لە قورئاندا؟

١. قتادة بن دعامة / ١١٧ هـ لە کتێبەکەیدا باسی چل (٤٠) ئایەتی مەنسووخی کردوە.

٢. محمد بن حزم / ١٧٨ هـ لە کتێبەکەیدا باسی دووسەدو چواردە (٢١٤) ئایەتی کردوە.

٣. أبو جعفر النحاس / ٢٤٥ هـ لە کتێبەکەیدا باسی سەدو سی و چوار (١٣٤) ئایەتی کردوە.

(١) - بڕوانە: الإحكام لأصول لأحكام، لابن حزم. ٤ج ص١٤٧. إرشاد الفحول في علم الأصول، للشوكاني ١ج ص ٢١٧، صحيح آبن حبان ج٥ ص ٤٧١ ، روضة الناضر ، ص١٤١ ، التمهيد ج٣ ص٢٥٦.

(٢) - مجموع الفتاوى، ج١١ ص٣٤١.

(٣) - لە کۆتایی ئەو بڕگەیەدا (لاباسێك) لەبارەی ئیجماعەوە دەکەین.

٤. هبة الله بن سلامة / له کتێبەکەیدا دووسەدو سێزده (٢١٣) ئایەتی باسکردوون.
٥. مكي بن أبي طالب / له کتێبەکەیدا سەدو نەوەدو پێنج (١٩٥) ئایەتی لەو جۆرەی هێناون.
٦. إبن الجوزي / سەدو چل و هەشت (١٤٨) ئایەتی هێناون.
٧. العتائقي / دووسەدو بیست و چوار (٢٢٤) ئایەت.
٨. إبن البازري / دووسەدو چل و نۆ (٢٤٩) ئایەت.
٩. السيوطي / له (الإتقان) دا، بیست (٢٠) ئایەت.
١٠. محمد بن عبدالعظيم الزرقاني/ له (مناهل العرفان) دا، نۆ (٩) ئایەت.
١١. الدكتور مصطفى زيد/ له (النسخ في القرآن الكريم) دا، شەش (٦) ئایەت.

ئنجا ئایا کام لەو ڕایانە یەکدەنگییان لەسەرە؟!

بێگومان هیچ کامیان، چونکە یەکدەنگیی (إجماع) دەبێ لەسەر شتێکی ڕوون و دیارییکراوو سەلمێنراوبێ، نەك بەلای کەمەوە لەسەر یازده (١١) ڕای جۆراو جۆر!!

له کۆتایی ئەم بڕگەیەدا دەڵێین:

گریمان هەندێک له ئایەتەکانی قورئان، خوا دایبەزاندبن و دوایی لایبردبن، ئەوە شتێکی گونجاوو ڕێ تێچوویە، نەک ئەم موصحەفەی ئێستا لەبەردەستی ئێمەدا هەیە، ئایەتی تێدا هەبن بخوێندرێنەوە، بەڵام کاریان پێ نەکرێ، یەک ئایەتی واش نیە له قورئاندا.

چونکە من هەموو قورئانم تەفسیر کردوەو، ناچار نەبووم لەبەرامبەر هیچ ئایەتێکدا، بڵێم: ئەم ئایەتە، فڵان ئایەتە لایبردوەو نەسخی کردۆتەوە.

ئنجا هەموو ئەو ئایەتانەی کە زانایان باسی ناسیخ و مەنسوخیان تێیان دا کردووە، هەرچی بەڵگەیان هێناوەتەوە لەو بارەوە، هەموویانمان بەرپەرچ داونەوە.

بۆیە دەڵێین: موصحەفێک کە ئێستا لەبەردەستماندایە، هیچ ئایەتێکی تێدا نیە نەسخ کرابێتەوەو کاری پێ نەکرێ.

هەڵبەتە فەرمایشتی خواش کە لە پێناسەی قورئاندا فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ۝٨٢﴾ النساء.

واتە: ئایا لە قورئانێوە ڕانامێنن! ئەگەر لەلایەن ئەگەر لەلایەن جگە لە خواوە بووایە، ناڕێکیی و ناکۆکییەکی زۆریان تێدا دەبینی.

ئەمە بەڵگەیەکی زۆر بەهێزی نەبوونی نەسخە لە قورئاندا، چونکە بێگومان هەبوونی لابەر و لابراو (ناسخ و منسوخ) لە قورئاندا، ناڕێکییو تێکگیرانەو، خواش عزوجل نەبوونی ناڕێکییو تێکگیرانی لە قورئاندا، کردۆتە بەڵگە و نیشانەی لەلایەن خواوە بوون، کەواتە:

بۆ ئەوەی قورئانی مەزن ناڕێکییو تێکگیرانی تێدانەبێ، پێویستە ناسخ و مەنسوخی تێدانەبێ.



# لا باسێک لە بارەی ئیجماعەوە:

بەڕێزان!

بە پێویستی دەزانم تیشکێک بخەمە سەر بابەتی ئیجماع، کە کەسانێک زۆر بە هەڵەو کرچ و کاڵیی لێی حاڵیی بوون و، لە غەیری شوێنی خۆیدا بەکاری دێنن و، پێیان وایە وەک گۆچانێکی جادوویی (عصا سحرية)یەو، هەموو مەرامێکیان پێی ساز دەبێ و، قەرەبووی نەبوونی هەموو زانیاریی و بەڵگەیەکیان بۆ دەکاتەوەو، هەرکات ویستیشیان بەرپەرچی قسەو بیرۆکەیەکی کەسێکی پێ بدەنەوە، ئەوەندە بەسە بڵێن: ئەوە پێچەوانەی کۆڕا (إجماع)یە!

بێ ئەوەی ڕوونی بکەنەوە، ئەو ئیجماعەی دەیڵێن:

چییەو، چۆنەو، کەی بووەو، لەکوێ بووە، ئایا ڕاستە هەیە، یان بەس قسەو بانگەشەیە؟!

بێ ئاگا لەوە کە ئیجماع ڕاجیاییەکی زۆری تێدایەو، بۆ لێتێگەیشتنی ڕاست و دروستی، لێکۆڵینەوەو وردەکارییەکی زۆری پێویستەو، ناگونجێ هەروا سەرکێڵیی و سەرپێیانە باسی بکرێ.

هەوڵ دەدەین بە کورتیی و گوشراویی لە پێنج خاڵاندا باسی ئیجماع بکەین:

**یەکەم: ئیجماع بابەتێکی فرە ڕەهەندو بە لق و پۆپە:**

دەشتوانین بڵێین: فرە ڕەهەندیی و لق و پۆپ زۆریی ئیجماع لە سێ ڕووەوەیە:

**یەك: لە ڕووی کەسانێکەوە کە ئیجماعیان پێ دێتە دی:**

زانایان لەو بارەوە ڕاجیان:

١ـ ئایا ئیجماع پەکی لەسەر یەکڕا بوونی ئۆممەت کەوتوە، یان تەنیا یەکڕابوونی کۆمەڵێک لە ئۆممەتی دەوێ؟

٢ـ ئنجا ئەگەر تەنیا کۆمەڵێک لە ئۆممەتی بوێ، ئەوانە کێن؟

٣ـ ئایا بەس خەڵکی مەدینەن، وەك مالیك گوتوویەتی؟ یان تەنیا خەڵکی بنەماڵەی پێغەمبەرن؟ یان مشوور خۆران (أهل الحل والعقد)ن؟ یان حوکمڕان و زانایانن؟ یان تەنیا زانایانن؟

٤ـ ئنجا ئەگەر زانایانن: ئایا بەس زانایانی (أهل السنة)ن، یان زانایانی ئۆممەتن بە هەموو ڕەوتەکانیانەوە؟!

٥ـ ئنجا ئەگەر هەرکام لەو جۆرانەش بن، ئایا یەکڕابوونی تێکڕایان پێویستە، یان هی زۆربەیان؟

٦ـ پاشان ئایا پێویستە هەموویان قسەیان کردبێ، یان هەر کامێکیان تەنیا زانینی ئەو قسەیەی بۆ بە مەرج گیراوە، با بێدەنگیش بووبێ؟!

٧ـ ئنجا ئایا پێویستە بە شێوەی تەواتور لێیانەوە گوازرابێتەوە "کە ئەو ڕایەیان هەیە" یان شێوازی ئاحاد بەسە؟!

**دوو: لە ڕووی سرووشتی ئەو مەسەلانەوە کە یەکڕاییان لەسەر دەبێ:**

١ـ ئایا تەنیا ئەوانەن کە دەقێکی قورئان و سوننەت بۆیان بۆتە بناغەو لەسەریان هەڵچنراوە، یان ئەوانەشن کە دەقیان لەسەر نیە؟

٢ـ ئنجا ئەگەر بەس مەسەلە دەقدارەکان (المسائل المنصوص علیها) بن، ئایا تەنیا ئەو جۆرەن کە دەقە یەکلاییکەرەوەکان لە ڕووی سەنەدو دەلالەتەوە (المسائل المنصوصة القطعیة الثبوت والقطعیة الدلالة) بوونە بناغەیان، یان جگە لەوانیش "کە مەسەلە گومانییەکان (المسائل الظنیة)ن" دەگرنەوە؟!

**سێ: لەڕووی حوکمی ئیجماعەوە:**

زانایان لەبارەی حوکمی ئیجماعەوە ڕاجیایی زۆریان هەبووەو هەیەو، بەپێی جۆرەکانی ئیجماع و پلەکانی، حوکمی جۆراو جۆریشیان بۆ بڕیارداون[1]، بۆ وێنە:

(الشوكاني) گوتوویەتی:

(العلم باتفاق الأمة لايحصل إلاّ بعد معرفة كل واحد منهم، وذلك مُتَعذِّر قطعاً، ومَنِ الذي يعرف جميع المجتهدين من الأمة في الشرق والغرب وسائر البلاد الإسلامية؟! إن العمرَ يفنى دون مجرد البلوغ إلى كل مكان من الأمكنة التي سكنها أهل العلم، فضلاً من اختبار أحوالهم ومعرفة من هو من أهل الإجماع منهم...!)[2].

واتە: بەبێ ناسینی یەک یەکی ئۆممەت، زانیاریی بۆ کۆڕای ئۆممەت پەیدا نابێ، ئەوەش بە دڵنیایی نەلواوە، ئاخر کێ تێکڕای موجتەهیدانی ئۆممەت لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاواو وڵاتانی دیکەی ئیسلامیی دەناسێ؟ بێگومان تەمەن تەواو دەبێ بێ ئەوەی مرۆڤ تەنیا بگاتە ئەو شوێنانەی زانایان تێیاندا نیشتەجێن، چ جای ئەوەی حاڵ و باڵیان بجەڕێنێ و بزانێ کامیان ئەهلی ئیجماعن؟!

**دووەم: ڕاجیایی زۆری زانایان لەبارەی ئیجماعەوە:**

زانایانی ئیسلام بە گشتیی بە پێشین و پاشینەوە، ڕاجیایی زۆریان لە بارەی ئیجماعەوە هەبووەو هەیە، نەک وەک کەسانێکی زۆر لە کۆن و تازە گومانیان بردوەو دەبەن، ئیجماع ڕێیەکی تەخت و ئاچووغ بێ!

(١) نظرات في أصول الفقه، د. عمر سليمان عبدالله الأشقر ص ١٢ ـ ١٣و ٤١ و ٤٢.
(٢) إرشاد الفحول، ص ٧٢.

ئێستاش با سەرنج بدەینە قسەی هەندێک لە زانایان لەوبارەوە:

١ـ (الإمام أحمد بن حنبل) گوتوویەتی: (ما يدّعي الرجل فيه الإجماع هذا الكذب، من ادَّعى الإجماع فقد كذب، لعلَّ الناس قد اختلفوا)[1].

واتە: ئەوەی پیاوێک لافی ئیجماعی تێدا لێ بدا، درۆیە، هەرکەس لافی هەبوونی ئیجماع لێبدات، درۆی کردوە، ڕەنگە خەڵک ڕا جیابووبن (و ئەو نەیزانیبێ).

٢ـ ژمارەیەک لە زانایان نکووڵیی لە ئیجماعی جگە لە هاوەڵان دەکەن[2]، وەک:

أـ داود الظاهري. ب ـ إبن حزم الأندلسي. ج ـ الإمام أحمد ـ لە ڕایەکیدا ـ د ـ أبو زهرة، هـ - الشوكاني.

٣ـ (إبن تيمية) گوتوویەتی:

(مَعْنَى الْإِجْمَاعِ : أَنْ تَجْتَمِعَ عُلَمَاءُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى حُكْمٍ مِنْ الْأَحْكَامِ، وَإِذَا ثَبَتَ إجْمَاعُ الْأُمَّةِ عَلَى حُكْمٍ مِنْ الْأَحْكَامِ، لَمْ يَكُنْ لِأَحَدٍ أَنْ يَخْرُجَ عَنْ إجْمَاعِهِمْ؛ فَإِنَّ الْأُمَّةَ لَا تَجْتَمِعُ عَلَى ضَلَالَةٍ وَلَكِنْ كَثِيرٌ مِنْ الْمَسَائِلِ يَظُنُّ بَعْضُ النَّاسِ فِيهَا إجْمَاعًا وَلَا يَكُونُ الْأَمْرُ كَذَلِكَ، بَلْ يَكُونُ الْقَوْلُ الْآخَرُ أَرْجَحَ فِي الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ)[3].

واتە: ئیجماع ئەوەیە کە زانایانی مسوڵمان لەسەر شتێک کۆبنەوە، ئنجا هەر کات ئۆممەت لەسەر حوکمێک لە حوکمەکان یەکڕا بوو، هیچ کەس بۆی نیە لە ئیجماعیان بچێتە دەرێ، چونکە ئۆممەت لەسەر گومڕایی کۆنابێتەوە، بەڵام زۆر مەسەلە هەندێک کەس پێیان وایە ئیجماعیان لەسەرە، بەڵام وانیە، بەڵکو قسەی دیکەی بەرانبەری لە قورئان و سوننەتدا زاڵترو بەڵگەدارترە.

(١) أخرجه عبدالله بن أحمد عن أبيه في (مسائله) رقم: ١٨٢٦، هەروەها بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) لابن تيمية، ج١٩ ص ١٤٧.
(٢) نظرات في أصول الفقه، ص ٤٩.
(٣) (مجموعة الفتاوى) ج ٢٠ ص ١٠.

کەواتە: مەرج نیە هەرکەسێک لافی هەبوونی ئیجماعی لەبارەی مەسەلەیەکەوە لێدا، قسەکەی ڕاست بێ و، هیچ کەس بە لافلێدانی ڕووت هیچی بۆ ناچەسپێ و، وەک گوتراوە:

((کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ)).

**سێیەم: پێناسەی ئیجماع:**

ئاشکرایە زۆربەی هەرە زۆری کتێبەکانی زانیاریی (أصول الفقه) ئەم پێناسە باوەی (إجماع)یان هێناوە:

(إتفاق مجتهدي أمة محمد "صلى الله عليه وسلم" بعد وفاته في عصر من العصور على حكم شرعي)[1].

ڕێککەوتنی موجتەهیدانی ئۆممەتی موحەممەد دوای کۆچکردنی لە چاخێک لە چاخەکاندا لەسەر حوکمێکی شەرعیی.

بەڵام ژمارەیەکیان ئەو جۆرە ئیجماعەی ئەو پێناسەیە بیگرێتەوە، بە خەیاڵیی و ناواقیعیی دەزانن و، دەڵێن مەحاڵە بتوانرێ بیروڕای سەرجەم زانایانی موجتەهید لەسەر مەسەلەیەک کۆبکرێتەوە[2]، هەرچەندە پێم وایە لەم ڕۆژگارەدا بە هۆی بەرەو پێشچوونی هۆیەکانی گواستنەوەو تەکنۆلۆژیای ڕاگەیاندنەوە، ئەوە ئاسان بووە.

---

(١) تيسير علم أصول الفقه ، ص ١٤٩ . هەروەها : الإحكام، في أصول الأحكام للآمدي ج١ ص ٢٥٤ ، دیسان : (أصول الفقه) لمحمد أبي زهرة، ص ١٨٢.

(٢) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە، هەروەها بڕوانە: (أصول الفقه) محمد أبو زهرة ص ١٩٤ ، دیسان (إرشاد الفحول) للشوكاني ص ٧٢.

**سێ جۆرە پێناسە بۆ ئیجماع بۆ وەخۆگرتنی (إستیعاب)ی جۆرەکانی:**

١ـ بە ئاشکرا زانراو لە ئایین (المعلوم من الدين بالضرورة)[١]:

کە بریتیە لەوەی مسوڵمانان تێیدا ڕاجیا نین، وەک: پێنج پایەکانی ئیسلام و، قەدەغە بوونی ئازاردانی دڵی باب و دایک و، مەی خواردنەوەو، زینا...

ئەوجۆرەی ئیجماع تێکڕای زانایان لەسەری ڕێککەوتوون و (الشافعي) لەبارەیەوە گوتوویەتی: (لن أقول ولا أحد من أهل العلم: هذا مجتمع عليه، إلاّ لما تلقى عالما أبداً إلاّ قال لك وحكاه عن مَنْ قبله، كالظهر أربع، وكتحريم الخمر، وما أشبه هذا)[٢].

واتە: نە من و نە هیچ کام لە زانایان ناڵێین: ئەمە یەکدەنگیی لەسەرە، مەگەر بۆ شتێک کە هیچ زانایەک نابینی مەگەر پێت دەڵێ و لە کەسانی پێش خۆی دەیگێڕێتەوە، وەک: نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتەو، قەدەغە بوونی مەی و، وێنەی ئەوانە.

بۆیەش بەشێک لە زانایان لە پێناسەی ئیجماعدا گوتوویانە:

(الإجماع هو ماتفق عليه المسلمون من الأحكام الثابتة في الكتاب والسنة)[٣].

واتە: ئیجماع ئەوەیە کە مسوڵمانان لەسەری یەکدەنگ بووبن لە حوکمە چەسپاوەکانی قورئان و سوننەت.

هیچ گومانیشی تێدا نیە کە نکوڵییکەر لەو جۆرە ئیجماعە، مەترسیی دەرچوونی هەیە لە بازنەی ئیسلام و مسوڵمانان.

(١) التجديد الأصولي . بإشراف د. أحمد الرَّيسوني، ص ٢٩٧.
(٢) الرسالة للشافعي، رقم النص: ١٥٥٩.
(٣) تيسير علم أصول الفقه. ص ١٥٠.

٢ـ یەکدەنگیی و ڕێککەوتنی موجتەهیدانی ڕۆژگارێک لە چاخەکانی ئیسلام، لەسەر حوکمێک بە هۆی بەڵگەیەکەوە (إتفاق مجتهدي عصر من عصور الإسلام على حكم لدليل)[١].

کە وەک پێشتر گوتمان: ئەو جۆرە ئیجماعە بەو پێناسەیە لە دنیای واقیعدا بوونی نەبووە، جگە لە سەردەمی هاوەڵان (عصر الصحابة) خوا لێیان ڕازی بێ.

پسپۆڕانیش هۆکاری ئەوە دەگێڕنەوە بۆ لەدایکبوونی ئەو چەمک و پێناسەیە لە منداڵدانی زانایانی کەلام (متكلمين)دا، کە کەمتر حاڵەتی واقیعیی و کردەیی لە قسەو کتێبەکانیاندا ڕەچاو کراوە[٢]، بەپێچەوانەی شەرعزانان (فقهاء)ەوە.

٣ـ بێدەنگ بوونی زانایان لە چاخێک لەسەر قسەیەک یان کارێک (سكوت العلماء في عصر على قول أو فعل)[٣].

کە ئەوە لە زاراوەی زانایانی بنچینەکان (علماء الأصول)دا بە یەکڕایی بێدەنگیی (الإجماع السكوتي) ناسراوە، چاخی هاوەڵانیش بەتایبەت ڕۆژگاری حوکمڕانیی عومەری کوڕی خەتتاب "خوا لێی ڕازی بێ" -کە نەیدەهێشت هاوەڵانی شارەزا لە مەدینە بچنە دەرێ بۆ ئەوەی ڕاوێژیان پێ بکات- چاخی زێڕینی ئەو جۆرە کۆڕایە بوو.




(١) التجديد الأصولي . ص ٣٠١ .
(٢) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.
(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٣٠٢

**چوارەم: بناغەی ئیجماع و بەڵگەکانی:**

زۆربەی هەرە زۆری زانایان گوتوویانە: (لابد للإجماع من مستند من الكتاب والسنة، لأنه ليس بدليل مستقل وإنّما هو دليل تبعي)[1].

واتە: دەبێ ئیجماع پشتیوانییەکی لە قورئان و سوننەتدا هەبێ، چونکە بەڵگەیەکی سەربەخۆ نیەو، بەڵگەیەکی شوێن کەوتەیە.

بۆ نموونە: (الزركشي) گوتوویەتی: (ولابد له من مستند لأن أهل الإجماع ليست لهم مرتبة الإستقلال بإثبات الأحكام، وإنما يثبتونها نظراً إلى أدلتها ومآخذها، فوجب أن يكون عن مستند، لأنه لو انعقد من غير مستند، لاقتضى إثبات الشرع بعد النبي وهو باطل)[2].

واتە: ئیجماع هەر دەبێ پاڵپشتێکی هەبێ، چونکە ئەهلی ئیجماع پلەی سەربەخۆیان نیە لە دانانی حوکماندا، بەڵکو بە لەبەرچاوگرتنی بەڵگەکانیان و شوێنی لێوەرگیرانیان دەیانچەسپێنن، بۆیە دەبێ پاڵپشتێکی هەبێ، چونکە ئەگەر بەبێ پاڵپشت گرێدرابایە، ئەوە خوازیاری دانانی حوکمی شەرعیی بوو دوای پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم"و، ئەمەش ناڕاستە.

شایانی باسیشە: زانایان چەند دەقێکیان بە بەڵگەی ڕاست و ڕەوایی ئیجماع هێناونەوە، هەرچەندە مشت و مڕی زۆریش دەربارەی بەڵگە بوونیان لەو بارەوە هەیە، بۆ نموونە:

١- ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥ ﴾ النساء.

واتە: هەرکەس دوای ئەوەی ڕێی ڕاستی بۆ دەرکەوتوە، سەرپێچیی لە پێغەمبەر بکات و بکەوێتە شوێن ڕێیەک جیا لە ڕێی بڕواداران، حەواڵەی

(١) تيسير أصول الفقه. ص ١٥٢.
(٢) البحر المحيط في أصول الفقه، ج٣ ص٤٩٩.

ئەوەی دەکەین کە شوێنی کەوتوەو دەیخەینە دۆزەخەوەو، ئەویش خراپترین سەرەنجامە.

٢ـ (لا تجتمـع أمتـي عـلى ضلالـة أبـداً) رواه الدارمـي، وهـو عنـد أحمـد في المسـند (١٤٥/٥) بلفـظ: (إن اللـه عزوجـل لـن يجمـع أمتـي إلاّ علـى الهـدى)، واتـە: هەرگیـز ئۆممەتـم لەسـەر گومڕایـی کۆنابێتـەوە.

هەرچەندە بەلای زۆرێک لە زانایانەوە سەنەدەکەی بێهێزە، بەڵام مانایەکەی ڕاستەو ناشگونجێ ئۆممەتی ئیسلام لەسەر مرۆڤایەتیی بکرێتە شایەدو، لەسەر ناهەقیش کۆبێتەوە، خوا لەبارەی شایەد بوونی ئۆممەتی موحەممەدەوە، لەسەر مرۆڤایەتیی فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ البقرة.

واتە: هەر بەوشێوەیە گێڕاومانن بە باشترین کۆمەڵ (کۆمەڵێکی میانجیی) تاکو بەسەر خەڵکەوە شایەدو چاودێر بن.

٣ـ (عليكم بالجماعة وإياكم والفرقة، فإن الشيطان مع الواحد، وهو من الإثنين أبعد، من أراد بحبوحة الجنة فليلزم الجماعة)، الترمذي: (١٦٥٠) وقال حديث حسن صحيح.

واتە: هەر کۆمەڵ و کۆبن و خۆتان لە پەرتەوازەیی دووربگرن، چونکە شەیتان لەگەڵ یەکێک (ی تەنیا) دایەو لە دووان دوورترە، هەرکەس نێوەڕاستی بەهەشتی دەوێ، با لەگەڵ کۆمەڵ (ی مسوڵمانان)دا بێ.

لەو بارەوەش کە ئیجماع هەر دەبێ پشتیوانێکی لە قورئان و سونەتدا هەبێ (إبن تيمية) گوتوویەتی:

(لاتوجـد قـط مسـألة مُجْمَـعٌ عليهـا إلاّ وفيهـا بيـان مـن الرسـول "صـلى اللـه عليـه وسـلم" ولكـن قـد يخفـى ذلـك عـلى بعـض النـاس،

ويُعلَمُ الإجماعُ فيُستدلّ بـه)[١].

واتـە: هەرگیز مەسەلەیەكی یەكڕایی لەسەر نەبووە، مەگەر ڕوونكردنەوەیەكی پێغەمبەری لەسەر هەیە، بەڵام هەندێك كەس ئەوە نازانن و لێیان پەنهان دەبێ و، ئیجماعەكە دەزانرێ و بە بەڵگە دەهێنرێتەوە.

**پێنجەم: گرنگیی ئیجماع:**

ئیجماع بە هەر سێ جۆرو پلەكەیەوە، گرنگیی و بایەخێكی زۆری هەیە، كە دەتوانین لە حەوت بڕگەدا بیانخەینە ڕوو:

١ـ جۆری سەرەكیی و بنەڕەتیی ئیجماع كە بریتیە لە ڕێككەوتن لەسەر ئەو شتانەی بە ئاشكرا لە ئاییندا زانراون (الإتفاق على ما علم من الدين بالضرورة) قەبارەی تەبایی و یەكدەنگیی مسوڵمانان دەردەخات و، دەبێتە ڕێگریش لە لادەران و داهێنەران.

٢ـ زانیاریی هەبوون بە بابەتە یەكڕاییی لەسەرە سەرەكییەكان (القضايا المجمع عليها) متمانەی پتر بۆ بڕواداران بە ئایینەكەیان دەدات و، ڕێگریی لە قسەو قاڵی ئەوانەش دەكات كە دەڵێن: مسوڵمانان لە هەموو شتێكدا پێكەوە ناتەباو ناكۆكن.

٣ـ ئیجماع دەبێتە هۆی بەرزكردنەوەی ئاستی ئیجتیهادو بیروڕا تاكییەكان بۆ: دڵنیایی و هەڵبڕین (اليقين والقطع) بۆ وێنە[٢]:

أـ زانایان یەكدەنگن لەسەر پێویست بوونی خۆ شۆردن بۆ پیاو و ئافرەت بە هۆی پێكگەیشتنی چووك و زێ (التقاء الختانين) بە بێ ئاو هاتنەوە، بینا لەسەر دەقی: (إذا التقى الختانان وجب الغسل) أحمد: ٢٦٠٢٥.

---

(١) مجموع الفتاوى ج ١٩ ص ١٩٥.
(٢) التجديد الأصولي . ص ٣١٤.

ب ـ هەروەها یەکدەنگیی لەسەر قەدەغە بوونی فرۆشتنی خواردن بەر لە وەرگیرانی (حرمة بیع الطعام قبل قبضه) بینا لەسەر فەرموودەکەی (إبن عمر) کە بوخاریی: ٢٠١٧ و موسلیم: ١٥٢٥ هێناویانە.

ج ـ (أبوبکر) خوا لێی ڕازی بێ بۆ جەنگ کردن دژی زەکات نەدەران و هەڵگەڕاوان، قیاسی زەکاتی کردە سەر نوێژو، هاوەڵانیش پشتیان گرت.

د ـ هاوەڵان بینا لەسەر بەرژەوەندیی (مصلحة)، لەسەر کۆکردنەوەی قورئان لە نێو دوو بەرگی (مصحف)دا، یەکدەنگ بوون.

٤ـ بێگومان هیچ ئیجماعێک بێ پشتیوانیی قورئان و سوننەت نیە، بەڵام زۆر کەس بەڵگەو پشتیوانەکە نازانێ و ئیجماعەکە دەزانێ.

٥ـ ئیجماع دەبێتە مایەی جەختکردنەوەی حوکمی مەسەلەیەک کە قورئان و سوننەت و عەقڵ بەڵگەی بن و، ئیجماعیش دەبێتە بەڵگەیەکی دیکە.

٦ـ دەقە شەرعییەکان بە گشتیی ئەگەری تەئویل و تایبەتکردن (تخصیص)و بەنددار کردن (تقیید)یان هەیە، هەروەها دەقەکانی سوننەت لە ڕووی سەنەدەوە، مشت و مڕیان لەسەرە، ئنجا هەرکات یەکدەنگیی (إجماع) هەبوو، ئەو مەسەلەیە هەڵدەبڕێ و ساغ دەبێتەوە[١].

٧ـ سوودو بەرهەمێکی دیکەی ئیجماع ئەوەیە کە (إبن حزم) ڕوونی کردوەتەوەو گوتوویەتی:

(مال أهْل العلم إلى معرفة الإجماع؛ لِيُعَظِّموا خلاف مَنْ خالفه، وليزجروه عن خلافه، وكذلك مالوا إلى معرفة اختلاف الناس؛ لتكذيب من لا يبالي بادِّعاء الإجماع جرأة على الكذب، حيث الإختلاف موجود، فيردعونه بإيراده عن اللجاج في كذبه)[٢].

(١) نظرات في أصول الفقه ، ص ٥٢ ـ ٥٤.
(٢) الإحكام في أصول الأحكام ، ج ١ ص٥٠٦.

واتـە: زانایـان حەزیـان کـردوە ئیجـماع بزانـن، تاکـو ئـەو کەسـەی سـەرپێچیی دەکات لەسـەری مـەزن بکـەن و بیپرینگێننـەوە لە سـەرپێچیی، هەروەهـا حەزیـان کـردوە ڕاجیایـی خەڵـک بزانـن، تاکو ئـەو کەسـەی بەبێ گوێپێـدان لافـی ئیجـماع لـێ دەدات، بـە درۆی بخەنـەوە، ئەو کەسـەی بەبێ باکیـی درۆ دەکات لـە حاڵێکـدا ڕاجیاییـش هەیـە، ئنجـا بـە خسـتنە ڕووی ڕاجیایـی، لەبـەردەوام بـوون لەسـەر درۆیەکـەی دەیپرینگێننـەوە.

بێگومانیـش دوای ئـەوەی بـە وردیـی لـە ئیجـماع تێدەگەیـن، ئنجـا دەزانین کە شـتێکی زانسـتییانەو ژیرانـە نیە، هەر لە خۆوە وشـەی (ئیجماع) بـە دەمـەوە بگریـن و، هەر قسـەو بیرۆکـەو هەڵوێسـتێکی کەسـێکمان بەدڵ نەبـوو، یـان لـە عەقڵـەوە نەچـوو، بـێ لێکۆڵینـەوەو وردبوونەوە بڵێیـن: ئەوە پێچەوانـەی ئیجماعـەو، خەڵکێکـی سـادەو ناحاڵییـش کـە بەبـێ تێڕامـان لاسـایی ئـەم و ئـەو دەکەنەوە، بیانخەینـە دوو دڵیی و گومانـەوە، بەرانبەر بە شـتێک کـە شایسـتەی دوو دڵیـی و گومـان نیە.

بەڵێ باسـکردنی هەبوونی یەکدەنگیی (إجماع) لەسـەر هەبوونی نەسـخ "بـە زاراوەی زانایـانی پاشـین کـە: لابردنی حوکمێکـی دواترە بـۆ حوکمێکی پێشـتر» لـە قورئانـدا، جگـە لـە ئەفسـانەیەک و قسـەیەکی بێ بنەمـا هیچی دیکـە نیـە، چونکە:

چـۆن دەگونجـێ بیرۆکەیـەک یەکدەنگیـی لەسـەر دروسـت ببـێ، کـە ئـەو هەمـوو ڕا جیاوازانـەی لەسـەر بـن، تەنانەت لە لایـەن ئەوانەشـەوە کە بڕوایـان بـە هەبوونی نەسـخ هەیـە لـە قورئاندا؟

کـە ئەمانـە یـازدە (١١) ڕان، لـەو بیـروڕا زۆرانـەی لەوبـارەوە خراونـە ڕوو:

١ـ قتادة بن دعامة / ١١٧ هـ لە کتێبەکەیدا باسی چل (٤٠) ئایەتی

مەنسووخی کردوە.

٢ـ محمد بن حزم / ١٧٨ هـ لە کتێبەکەیدا باسی دووسەدو چواردە (٢١٤) ئایەتی کردوە.

٣ـ أبو جعفر النحاس / ٢٤٥ هـ لە کتێبەکەیدا باسی سەدو سی و چوار (١٣٤) ئایەتی کردوە.

٤ـ هبة الله بن سلامة / لە کتێبەکەیدا دووسەدو سێزدە (٢١٣) ئایەتی باسکردوون.

٥ـ مكي بن أبي طالب / لە کتێبەکەیدا سەدو نەوەدو پێنج (١٩٥) ئایەتی لەو جۆرەی هێناون.

٦ـ إبن الجوزي / سەدو چل و هەشت (١٤٨) ئایەتی هێناون.

٧ـ العتائقي / دووسەدو بیست و چوار (٢٢٤) ئایەت.

٨ـ إبن البازري / دووسەدو چل و نۆ (٢٤٩) ئایەت.

٩ـ السیوطي / لە (الإتقان) دا، بیست (٢٠) ئایەت.

١٠ـ محمد بن عبدالعظیم الزرقاني/ لە (مناهل العرفان) دا، نۆ (٩) ئایەت.

١١ـ الدكتور مصطفى زید/ لە (النسخ في القرآن الكریم) دا، شەش (٦) ئایەت[1].

ئنجا ئایا کام لەو ڕایانە یەکدەنگییان لەسەرە؟!

بێگومان هیچ کامیان، چونکە یەکدەنگیی (إجماع) دەبێ لەسەر

(١) - ژمارەیەکیش لەزانایانی هاوچەرخ ڕایان وایە کە هیچ ئایەتێکی مەنسووخ لەقورئاندا نیەو، ئەو زانایانەش کە وشەی: (نسخ)یان بۆ هەندێك ئایەتەکان بەکارهێناوە، مەبەستیان پێی: (تخصیص العام) بەندداركردنی ڕەهاو، (تقید المطلق) ڕوونکردنەوەی کورت و، (تبیین المجمل) پلە پلەیی (تدرّج) بووە، هەرکام: د. محمد أبو زهرةو، محمد خضري بگ و، شیخ محمد الغزالي و، د. یوسف القرضاوي و، د.طه جابر العلواني و، د. جاسر عودة و، د. مصطفى زلمي و، بەندەش، چەند نموونەیەکن لەوانەی ئەو ڕایەیان هەیەو بێگومان زۆری دیکەش هەن.

شتێکی ڕوون و دیارییکراو و سەلمێنراوبێ، نەك بەلای کەمەوە لەسەر یازدە (١١) ڕای جۆراو جۆر، کە زۆرترینیان دەڵێ: دووسەدو چل و نۆ (٢٤٩) ئایەت مەنووسخن و، کەمترینیشیان دەڵێ: شەش (٦) ئایەت نەسخ کراونەوە!!

هەروەها وێڕای ئەوەش کە ڕابرد:

زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە دروست نیە هیچ ئایەتێکی قورئان، بەبێ بەڵگەیەکی دڵنیاکەر لە پێغەمبەری خواوە، بە مەنسووخ دابنرێ، بۆ وێنە:

١ـ (الشافعي) گوتوویەتی: ( ولا يستدل على الناسخ والمنسوخ إلاّ بخبر عن رسول الله صلى الله عليه وسلم...)[1] واتە: بە هەواڵێک لە پێغەمبەری خواوە نەبێ، بەڵگە لەسەر نەسخ ناهێنرێتەوە.

٢ـ (الغزالي) گوتوویەتی: (لا ينسخ حكم بقول الصحابيِّ: نُسِخَ حكمُ كذا، ما لم يَقُلْ: سمعت رسول الله يقول: نسخت حكم كذا... فلعلَّهُ ظن ما ليس يُنْسَخُ نسخاً)[2].

واتە: هیچ حوکمێک بەقسەی هاوەڵ: فڵان حوکم نەسخ کراوەتەوە، نەسخ ناکرێتەوە، مەگەر بڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: فڵان حوکمەم نەسخکردوەتەوە... چونکە ڕەنگە شتێک کە نەسخ نەبۆتەوە، وایزانیبێ نەسخ بۆتەوە.

٣ـ (إبن تيمية) گوتوویەتی: (النَّسخُ لا يصار إليه إلا بيقين، وأمّا بالظن فلا يثبت النسخ)[3].

(١) إختلاف الحديث ج١ ص٤٨٥.
(٢) المستصفى ج١ ص ١٠٣.
(٣) مجموع الفتاوى ج٢١ ص ٥٧٥.

واتـە: نەسـخ بـە دڵنیایی نەبـێ پەنای پێ نابـرێ، بەڵام بە گومان نەسـخ ناچەسپێ.

٤ـ (إبـن حـزم) گوتوویـەتی: (لا یحـل لمسـلم أن یقول في آیـة ولا حدیث بالنَّسـخ إلاَّ عـن نص...)[1].

واتـە: هیـچ موسـوڵمانێک بـۆی نیە باسـی نەسـخ بوونـەوەی ئایەتێک یـان فەرموودەیـەک بـکات، مەگـەر بـە دەقێک...

٥ـ (إبـن رشـد) گوتوویـەتی: (لم یجـز أن نـترك شرعـاً وجـب العمـل بـه، بظـن لم نُؤْمَـرْ أن نوجِـبَ النَّسْـخَ بـه...)[2].

واتە: شـەرعێک کە کارپێکردنی پێویژسـتە، دروست نیە بۆ گومانێک وازی لێ بهێنین، کە فەرمانمان پێ نەکراوە، نەسـخی پێ پێویسـت بکەین.

٦ـ الشوکاني گوتوویەتی: (النَّسْخُ لا یثبت بالإحتمال...)[3].

واتە: نەسخ، بە شێمانەو ئەگەر ناچەسپێ...

ئنجا شایانی باسە:

کـە وشـەی (نسـخ) و ڕیشـەی (ن س خ) بـە هیـچ سـەنەدێکی ڕاسـت یـان بـاش (صحیـح أو حسـن) لەهیـچ فەرموودەیەکـی پێغەمبـەری خـوادا (صـلی اللـە علیـە وسـلم) نەهاتـوە، لـە هیـچ کام لـەو شـازدە (١٦) کتێـب و سـەرچاوانەی سـوننەت دا، کـە هـی ئـەم فەرموودەناسـانەن:

١ـ البخـاري. ٢ـ مسـلم. ٣ـ الترمـذي. ٤ـ النسـائي.٥ـ أبـوداود. ٦ـ إبـن ماجـة. ٧ـ أحمد (في المسـند). ٨ـ مالـك (في الموطأ). ٩ـ الدارمـي. ١٠ـ الحاكم (في المسـتدرك). ١١ـ إبـن حبـان. ١٢ـ إبـن الجـارود. ١٣ـ إبـن خزیمـة. ١٤ـ

---

(١) الإحكام في أصول الأحكام، ج٧ ص٣٨٠.
(٢) بداية المجتهد ونهاية المقتصد، ج١ ص ٦١٣.
(٣) فتح القدير، ج١ ص ٣٠٥.

البيهقي. ١٥ـ الدارقطني. ١٦ـ الشافعي (في المسند)[١].

کە بێگومان ئەوەش بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، چونکە خوای کار بەجێ و زانا، کتێبی کۆتایی خۆی (قورئان)ی بەوە وەسفکردوە کە سەرجەم ئایەتەکانی موحکەم و پتەو و قایم و نە لەخشاون:

﴿الٓر كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ①﴾ هود .

ئنجا مادام دڵنیایی (یقین) یمان هەیە لەبارەی موحکەم بوونی تێکڕای ئایەتەکانی قورئانەوە، هەتا دڵنیاییشمان لەبارەی مەنسووخ بوونی ئایەتێک یان زیاتریەوە نەبێ، دروست نیە هەر لە خۆمانەوە باسی مەنسووخ بوونی بکەین.

چونکە بنچینەیەکی گەورەی شەرعیی و عەقڵییە کە:

(الیقین لایزول بالشك) دڵنیایی بەدوودڵیی "بگرە بەگومان (ظن)یش" لاناچێ، بەڵکو پێویستە دڵنیاییەکی دژو پێچەوانەی هەبێ، ئنجا لادەچێ، کە بەدڵنیایی هەرگیز ئەو جۆرە دڵنیاییە نەبووەو ناشگونجێ هەبێ، چونکە هەموو ئەو زانایانەی قسەکانیانمان هێنان، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەبێ هەواڵدانی پێغەمبەر "صلى الله علیه وسلم" لەسەر مەنسووخ بوونی ئایەتێك یان زیاتر، دروست نیە باسی نەسخکرانەوەی بکرێ و، لەسەرجەم سەرچاوەکانی سوننەتیشدا "کە شازدەیانمان هێناون" وشەی نەسخ (ن س خ) بەسەرزمانی پێغەمبەری خوادا نەهاتوە، کەواتە: دڵنیایی (الیقین)ێك کە خوا "عز وجل"، لەبارەی موحکەم بوونی سەرجەم ئایەتەکانی قورئانەوە پێیداوین، چەسپاو و نەلەخشاوە.

(١) نقد نظرية النسخ. د.جابر عودة ص٩٥. ط١ / ٢٠١٣م.

## برگەی سێیەم: مەرجەکانی چەسپانی نەسخ:

ئایـا بـۆ ئـەوەی ناچاربیـن بڵێیـن: فـڵان ئایەتـە نەسـخ کراوەتـەوە بەفـڵان ئایەتـە، مەرجـەکانی چیـن؟
کۆمەڵێـک مەرجـی هـەن، کـە دەتوانیـن بڵێیـن: بـە گشـتی حـەوت مەرجـن و، ئـەو حـەوت مەرجـەش زۆر زەحمەتـە زۆربەشـیان بێنـەدی، چ جـای هەموویـان و، دەبـێ هـەر هەمووشـیان هەبـن ئنجـا ناچاریـن بڵێیـن: فـڵان ئایەتـە نەسـخ کراوەتـەوەو، فـڵان ئایەتـە حوکمەکـەی لابـردوە.

قسـەی ژمارەیـەک لـە زانایـان لەبـارەی ڕەوا نەبـوونی باسـکردنی نەسـخەوە لـە قورئـان دا، مەگـەر بـە بەڵگەیەکـی دڵنیاکـەر:

بەڕێزان!
بـە پێویسـتی دەزانـم بـەر بـە خسـتنەڕووی حـەوت مەرجەکـەی چەسـپاندنی نەسـخ لـە قورئـان دا، بـۆ بەرچـاو ڕوونیـی زیاتـر، قسـەو بیـروڕای پێنـج زانـای بەرجەسـتەی ئیسـلام لـەو بـارەوە بێنیـن:
١ ـ (أبو جعفر النحاس) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (الناسخ والمنسوخ)دا دەڵێ:
[لايقال منسوخ لما ثبت في التزيل، إلاّ بتوقيف أو دليل قاطع][1].
واتـە: ناگوتـرێ: لابـراو (منسـوخ) بـۆ شـتێک، کـە لـە قورئانـدا چەسـپاوە، مەگەر بەوەسـتاندن، یاخـود بەڵگەیەکـی هەڵبـڕەر ناچارمانبکات.
واتـە: هـەر بـە ئەگـەر (إحتـمال) و ڕێ تێچـوون، دروسـت نیـە بـاسی

(١)- ص ٣٥٥.

مەنسووخ بوونی ئایەتێک بکرێ، بەڵکو ئەسڵ ئەوەیە: هەموو حوکمەکانی، کە بە قورئان و سوننەت چەسپیون، کاریان پێ دەکرێ و، دەبێ بڕوامان وابێ هەموویان موحکەمن، هەتا یەقین و دڵنیاییمان بۆ پەیدا دەبێ لەوبارەوە کە فڵان حوکمە لابراوە و گۆڕدراوە.

چونکە خوا دەفەرموێ:

﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾ الأعـراف: ٣.

واتە: شوێن ئەوە بکەون، کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوەو، جگە لەو، مەکەونە شوێن سەرپەرشتیارانی دیکە، بە کەمیی پەند وەردەگرن.

٢ ـ (إبن الحزم)یش هەر لەو بارەوە دەڵێ:

[لايحل لمسلم يؤمن بالله واليوم الآخر أن يقول لِشَيئٍ من القرآن هذا منسوخ، إلاّ بيقين]. الإحكام في أصول الأحكام[1].

واتە: بۆ هیچ موسوڵمانێک، کە بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە، ڕەوا نیە، بە هیچ شتێک لە قورئان بڵێ: مەنسووخە، مەگەر دڵنیابێ.

٣ ـ (إبن الجوزي)یش گوتوویەتی: [إطلاق القول برفع حكم آية لم يرفع، جرأة عظيمة]. نواسخ القرآن لابن الجوزي[2].

واتە: کە بگوترێ: حوکمی ئەو ئایەتە لابراوە، کە لاش نەبرابێ، ئەوە بوێرییەکی مەزنە (لەبەرامبەر خوادا).

٤ ـ هەروەها (الموفَّق ابن قدامة) دەڵێ: [لا يجوز ترك كتاب الله وسنة رسوله، إلاّ بالنسخ والنسخ لايثبت بالإحتمال]. المغني في الفقه لابن قدامة.[3]

(١)- ج ٤ ص ٨٣ .
(٢)- ص ٧٥.
(٣)- ج٢ ص ٦٦٦ .

واتە: دروست نیە واز لە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی بهێنرێ (علیه الصلاة والسلام) مەگەر بە نەسخ، نەسخیش بەئەگەر ناچەسپێ.

٥ ـ (أبو إسحاق الشاطبي) لە (الموافقات)ەکەی خۆیدا، دەڵێ: (الأحكام إذا ثبتت على المكلَّف، فادِّعاء النسخ فيها لايكون الاّ بأمر محقق، لأن ثبوتها على المكلف أولاً محقَّقٌ، فرفعها بعد العلم بثبوتها، لايكون إلاّ بمعلوم محقق][1].

واتە: ئەو یاسایانەی کەچەسپیون لەسەر ئەرکدار کراو، لاقلێدانی نەسخ تێدا بوونیان، مەگەر بە بەڵگەیەکی کە لێی دڵنیابین، ئەگەر نا ناچەسپێ، چونکە چەسپانی حوکمەکان لەسەر ئەرکدار کراو شتێکی ساغکراوەن، بۆیە دوای ئەوەی زانیارییان پێ پەیدا کراوە بە چەسپانیان، مەگەر بە زاندراوێکی ساغکراوە، ئەگەرنا لاناچن.

ئەمە قسەی پێنج لە زانایان بوو لەبارەی نەسخەوە، کە پێویستە زۆر بە وریاییەوە لەوبارەوە قسە بکرێ و، هەر ئایەتێک کە بە دڵنیایی دەزانی ئایەتی قورئانە، دەبێ دڵنیابین کە لابراوە، ئنجا بڵێین: حوکمەکەی لابراوە.




(١) - الموافقات، ج٣ ص١٠٥، ١٠٦.

## حەوت مەرجەكانی چەسپانی نەسخ لە قورئان دا:

**مەرجی یەكەم: دەبێ هەم ئەوەی، كە دەگوترێ: لابراوە و، هەم ئەوەی، كە دەگوترێ: لابەرە، هەم مەنسووخ، هەم ناسیخ، هەردووكیان بە دەق چەسپابن:**

هەڵبەتە ئەو (عبدالله بن یوسف الجدیع) دەڵێ: بەدەقی ئایەتێكی قورئان یاخود دەقی سوونەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، بەڵام من دەڵێم: لە ڕاستییدا سوونەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، قورئان نەسخ ناكاتەوەو، وەك شافیعیی و ژمارەیەكی زۆر لە زانایان گوتوویانە: تەنیا قورئان قورئان نەسخ دەكاتەوەو، موستەحیلە دەقێكی سوونەت هەبێ، ئایەتێكی قورئانی لابردبێ.

بۆیە ئەو ڕایە ڕاستەو ئەو ڕایە پێویستە تەبەننیی بكرێ، كە قورئان، ئەگەر گریمان نەسخیشی تێدا هەبێ، دەبێ هەر بە قورئان نەسخ بێتەوە، نەك بە سوونەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام).

كەواتە: مەرجی یەكەمی نەسخ ئەوەیە: كە هەم لابراوەكەو، هەم لابەرەكە، هەردووكیان دەبێ دەق بن، ئنجا ئەگەر قورئانبێ، قورئان قورئان نەسخ بكاتەوەو، ئەگەر سوونەتیش بێ، قورئان، یان سوونەت، سوونەت نەسخ بكاتەوەو، بۆ سوونەتیش بەڵگەمان هەیە، كە نەسخی تێدا بووە.

**مەرجی دووەم: دەبێ لابەرو لابراو (ناسخ و منسوخ) نەقڵكرانیان بۆلای ئێمە چەسپاوبێ:**

ئەم مەرجە لێرەدا مەبەستی پێ سوونەتە، دەبێ سەنەدەكەی ڕاستبێ، ئەگەرنا قورئان هەمووی بە تەواتور بۆ ئێمە نەقڵ بووەو هەمووی چەسپاوە.

ئنجا ئایا بەمەرج گیراوە كە، ئەو دەقەی سوونەت (لابراو و لابەر) بە تەواتور گەیشتبێ؟

لەو بارەوە زانایان ڕاجیان، بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە: مەرج نیە بە تەواتور گەیشتبێ، منیش هەر ڕام وایە: کە فەرموودەی ئاحاد، فەرموودەی ئاحاد لادەبا، بەڵام بە تەئکید هیچ جۆرێکی سوننەت، هیچ ئایەتێکی قورئان لانابات.

**مەرجی سێیەم: دەبێ دوو حوکمی شەرعیی بن، هەم لابراوەکەو هەم لابەرەکەش:**

واتە: بە بەڵگەی عەقڵی نەچەسپابن و، بە بەڵگەی ئەزموونکراو و بە پێنج هەستەکان نەچەسپابن، هەروەها لەو جۆرە نەبێ کە ئەسڵ تێیاندا ڕەوابوون (الإباحة) بێ، بەڵکو حوکمی شەرعیی بن، ئەو شتانەی کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا دایبەزاندوون.

**مەرجی چوارەم: دەبێ لابراوو لابەر (منسوخ و ناسخ) کردەوەیی بن:**

نووسەر وێنەی هێناوەتەوە بە لابردنی ڕووکردنە (بیت المقدس) لە نوێژدا، بە ڕووکردنە کەعبە، کە بێگومان ئەوە بە نەسخ لەقەڵەم نادرێ بۆ قورئان، چونکە خوا بە قورئان سوننەتی نەسخ کردۆتەوە، پێغەمبەری خوا ڕویدەکردە (بیت المقدس)، بەڵام خوا فەرمووی: لەمەودوا ڕووبکەنە کەعبە:

﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ البقرة: ١٥٠.

واتە: لەمەودوا ڕووبکە لای مزگەوتی حەڕام.

**مەرجی پێنجەم: دەبێ ئەو دوو حوکمە جوزئیی بن و، نابێ بنەمای گشتیی بن و لە ئامانجە شەرعییەکانبن:**

نابێ لابەرو لابراو (ناسخ و منسوخ) لە بنەماو حوکمە گشتییەکانبن، بەڵکو دەبێ بەشیی (جزئیی) بن، بۆ وێنە: دادگەری

لـە ئایەتێکـدا فەرزبـێ، ئایەتێکـی دیکـە نەسـخی بکاتـەوە، یـان: زوڵـم حەرامبـێ و ئایەتێکـی دیکـە نەسـخی بکاتـەوە!! شـتی وا نیـە.

**مەرجـی شەشـەم: دەبـێ لابـراوو لابـەر (منسـوخ و ناسـخ) ناکـۆک و تێکگیراوبـن:**

ئـەم قسـەیەی (الطبري) زۆر جـوان ئـەو مەسـەلەیە ڕوون دەکاتـەوە، دەڵـێ:

[وإنمـا يكـون الناسـخ مالَـم يَجُـزْ اجتـماع حكمـه و حكـم المنسـوخ في حـال واحـدة... فأمّـا مـا كان أحدهـما غـير نـاف حكـم الآخـر، فليـس مـن الناسـخ والمنسـوخ في شيء][1].

هەروەهـا (الشـافعي) یـش هەمـان قسـەی هێنـاوە، لـە (إختـلاف الحديـث)[2]دا.

واتـە: لابـەر (ناسـخ)، ئەوەیـە: کـە نەگونجـێ حوکمەکـەی لـە گـەڵ لابـراودا لەیـەک حاڵـدا پێکـەوە کۆببنـەوە... بـەڵام ئـەوە، کـە حوکمەکانیان تێـک نەگیرێـن، هیـچ پەیوەندیـی بـە (ناسـیخ و مەنسـووخ)ەوە نیـە.

بـۆ وێنـە: خـوا دەفەرمـوێ: بەسەرخۆشـی نوێـژێ مەکـەن: ﴿لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ﴾ النسـاء: ٤٣، دوایـی لـە سـوورەتی (المائـدة) دا دەفەرمـوێ: توخنـی شـەڕاب مەکـەون (فاجتنبـوه...) ئەمانـە تێـک ناگیرێـن، چونکـە بەسەرخۆشـیی نوێـژ هـەر دروسـت نیـە.

کەواتـە: ئایەتەکـەی (المائـدة)، ئایەتەکـەی سـوورەتی (البقـرة)ی لانەبـردوە، چونکـە تێکگیرانیـان لەنێوانـدا نیـە.

**مەرجـی حەوتـەم و کۆتایـی: دەبـێ ناسـیخ لـە ڕووی یاسادانانەوە لـە**

(١)- جامع البيان، ج٣ ص١٢٠.
(٢)- ص ٢١٤.

**دوای مەنسووخەوە بێ، پێشی مەنسووخەکە هاتبێ، ئنجا ناسیخەکە هاتبێ:**

نووسەر ئەم وێنەیەی بۆ ئەم مەرجە هێناوەتەوە:

**(عن براء بن عازب رضي الله عنه، أن أحدهم كان إذا نام قبل أن يتعشىً، لم يحل له أن يأكل شيئاً ولايشرب، ليلته ويومه من الغد حتى تغرب الشمس، حتى نزلت هذه الآية:**

﴿ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ﴾ البقرة: ١٨٧

**قال: ونزلت في أبي قيس بن عمرو أتى أهله وهو صائم بعد المغرب، فقال هل من شيء؟ فقالت آمرأته: ماعندنا شيء، لكن أخرج ألتمس لك عَشَاءً، فخرجت وووضع رأسه فنام، فرجعت إليه، فوجدته نائماً وأيقظته فلم يطعم شيئاً، وبات واصلاً صائماً حتى انتصف النّهار فَغَشِي عَليه، وذلك قبل أن تنزل هذه الآية، فأنزل الله فيه)**[1].

واتە: بەرائی کوری عازیب دەڵێ: (لەرەمەزان دا) یەکێک لە هاوەڵان ئەگەر خەوتبایە بەرلەوەی نانی ئێوارە بخوات، ئەو کاتە حوکم وابوو، بۆی حەڵاڵ نەبوو هیچ بخوات و دەبوایە نەشەوەکەی بخوات، نە رۆژەکەشی هەتا سبەینێ رۆژئاوا دەبوو، هەتا ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ:

﴿ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ البقرة: ١٨٧

گوتوویەتی: لەبارەی ئەبوقەیسی کوری عەمرەوە دابەزیوە، بەرۆژوو بوو دوای نوێژی شێوان، چووە لای هاوسەری و گوتی: هیچمان هەیە بخۆم؟ گوتی: هیچمان نیە، بەڵام دەچم شتێکت بۆ پەیدا

(١)- أحمد: ١٨٦١١ – ١٨٦١٢، و البخاري: ١٨١٦، وأبوداود: ٢٣١٤، والترمذي: ٢٩٦٨، والنسائي: ٢١٦٨،و الدارمي: ١٦٤٥.

دەکەم، وەک خواردنی ئێوارە، چووە دەرێ، تاکو هاتەوە، خەوتبوو (ماندوو بووە) کە بینی خەوتووە، هەڵیستاند، بەڵام (دەبێ خەواڵوو بووبێ) هیچی نەخوارد، بۆ بەیانییەکەشی بەڕۆژوو بوو، تاکو ڕۆژ نیوە بوو، بووڕایەوە، ئیدی لەوبارەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند.

منیش دەڵێم: لێرەدا هیچ شتێک دیار نیە کە خوا نەسخی کردبێتەوە، ئنجا یان ئەو کاتە عادەتیان وابووەو وایانزانیوە کە پێویستە دوای خەوتنی ئێوارە، هیچ نەخۆن، یان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای بۆ بڕیارداون، کە ئەگەر نوێژی شێوان بوو، دەبێ پێش ئەوەی بخەون، بەربانگ بخۆن، بەڵام ئەگەر پێش بەربانگ بخەون، تازە بۆیان نەبێ، بخۆن ، ئەمە لە هیچ ئایەتێکدا نیە، تاکو بڵێین، ئایەتێک ئەوەی نەسخ کردوەتەوە، بەڵکو ئەوە هەر لە سوننەتی پێغەمبەردایە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ.



## برگـەی چـوارەم: ئـەوەی نەسـخی تێـدا دەبـێ و، ئـەوەی نەسـخی پـێ دەکـرێ:

پێشـتر یاسـانکرد: کـە زۆربـەی زانایـان گوتوویانـە: دەگونجـێ قورئان نەسـخی تێـدا ببـێ، ئنجـا ئـەوەی نەسـخی تێدایـە، بـەڕای زانایـان، یـان جـۆرەکانی نەسـخ، چـوارن:

یـەک: ئـەوە کـە ئایەتێکـی قورئـان، یـان چەنـد ئایەتێـک، ئایەتێـک یـان زیاتـر لـە ئایەتێـک لـە قورئـان، نەسـخ بکەنـەوە.

دوو: ئـەوە کـە سـوننەتی پێغەمبـەر صـلی اللـە علیـە وسـلم قورئـان نەسـخ بکاتـەوە.

سێ: ئەوە کە قورئان سوننەت نەسخ بکاتەوە.

چوار: ئەوە کە دەقێکی سوننەت دەقێکی دیکەی سوننەت نەسخ بکاتەوە.

ئنجا با ئێمە تەماشا بکەین:

**یەکەم: ئەوە کە قورئان قورئان نەسخ بکاتەوە:**

ئێمـە پێـان وایـە کـە ئێسـتا ئـەم موصحەفـەی لەبەردەسـتماندایە، ئـەم قورئانـە، هیـچ ئایەتێکـی تێـدا نیـە، خـۆی و حوکمـی نەسـخ بووبێـتەوەو، حوکمەکـەی کاری پـێ نەکـرێ، هەروەهـا هیـچ ئایەتێکیـش نیـە، کـە خـۆی نەسـخ کرابێتـەوە، بـەڵام حوکمەکـەی مابـێ، چونکـە ئـەو دوو ڕایـە هـەن.

هەندێـک لـە زانایـان دەڵێـن: هەندێـک ئایـەت هـەن، دەخوێندرێـن، بـەڵام کاریـان پـێ ناکـرێ و حوکمەکەیـان لابـراوە، هەندێکـی دیکـەش گوتوویانـە: هەندێـک ئایـەت هـەن، حوکمەکەیـان مـاوە، بـەڵام خۆیـان لابـراون و ناخوێندرێـن!

ئنجا ئێمە پێمان وایە: هیچ کام لەو دوو حاڵەتە نین، با سەرنج بدەین! ئەوانەی پێیان وابووە کە ئەم قورئانەی لەبەردەستماندا هەیە دەگونجێ ئایەتی تێدا هەبن، ئایەتێک یان زیاتر لە ئایەتێکی نەسخ کردبێتەوە، چەند وێنەیەک دێننەوە.

**یەکێک لە وێنەکان:** دەڵێ: [مثل نسخ تخيير القادر على الصوم بين أن يصوم، أو يفتدي بالصوم دون الفدية].

**واتە:** هەڵوەشاندنەوەو، لابردنی سەرپشککردنی بابایەک کە بتوانێ بەڕۆژووبێ، لە نێوان ئەوەدا کە بەڕۆژوو بێت، یاخود قەرەبوو بدات، کە هەر دەبێ بەڕۆژوو بێت و قەرەبوو (فدیة)ی لێ وەرناگیرێ.

ئەو دوو ئایەتەش بۆ ئەوەی گوتمان بە بەڵگە دێننەوە:

١. ئایەتی ژمارە (١٨٤) لە سوورەتی (البقرة) کە دەفەرموێ:

﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٨٤ .

ئەوان ئاوایان لێکداوەتەوە: ئەوانەی دەتوانن بیگرن، قەرەبووەکیان ـ کە بریتییە لە خواردنی نەدارێک ـ لەسەرە، لەبەرامبەر ئەوەدا کە بە ڕۆژوو نەبن، هەرکەسێکیش خۆ بەخشانە زیاتر ببەخشێ، ئەوە بۆ وی باشترەو، ئەگەر بە ڕۆژووش بن بۆ ئێوە چاکترە.

گوتوویانە: ئەمە مەنسووخە بەو ئایەتەی دوایی، ئایەتی ژمارە (١٨٥) کە دەفەرموێ:

﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ ﴾ البقرة: ١٨٥

**واتە:** ئنجا هەرکامێک لە ئێوە ئامادەی مانگی ڕەمەزان بوو، با بیگرێ.

بۆ ئەوەش ئەم دەقە بە بەڵگە دێننەوە:

[عـن سـلمة بـن الأكـوع رضي اللـه عنـه قـال: لمـا نزلت هـذه الآيـة (وعلى الذيـن يطيقونـه طعـام مسـكين) كان مـن أراد مِنّـا أن يُفَطِـر ويفتـدي فعـل، حتـى نـزل هـذه الآيـة التـي بعدهـا، فنسـختها][1].

واتـە: سـەلەمەی کـوڕی ئەکـوەع دەڵـێ: کاتێـک ئـەم ئایەتـە دابـەزی، [وعـلى الذيـن يطيقونـه فديـة طعـام مسـكين]، هەرکامێـک لـە ئێمـە ویسـتبای بـەڕۆژو نەبـێ و قەرەبـوو بـدات، وایدەکـرد، هەتـا ئـەو ئایەتـەی دوایـی دابـەزی، ئـەوەی پێشـێی لابـرد.

بـەڵام وەک دوایـش باسـی دەکەیـن، لەڕاسـتییدا ئەگـەر سـەلەمەش وای لـێ حاڵـیـی بووبـێ، (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، بـەڵام نەیپێـکاوە، یاخـود مەبەسـتی لـە نەسـخ تایبەتکـردن (تخصيـص)ە، وشـەی (يطيقونـه)ش مانـای ئـەوە نیـە کـە: لـە توانایانـدا هەبـێ، چونکـە خـوا (سُـبحانه وتعـالى) چـۆن دەفەرمـوێ: [وعـلى الذيـن يطيقونـه فديـة طعـام مسـكين]. ئەوانـەی کـە لەتوانایانـدا هەیـە، بـا قەرەبـووی خواردنـی نەدارێـک بـدەن؟! بەڵکـو (يطيقونـه) بـە مانـای ئەوپـەڕی وزەیـان بەکاردێنـن، یـانی: زۆر مانـدوو نارەحـەت ببن تاکـو دەیگـرن، ئـا ئەوانـە بۆیـان هەیـە، قەرەبـوو بـدەن، کـە بریتییـە لـە خـواردنی نەدارێـک.

کەواتـە: ئـەو نموونەیـە کـە هێندراوەتـەوە، بەڵگـەی سـەلمێنەری هەبوونـی نەسـخ لەقورئـان دا ، نیـەو، دوایـی ئێمـە چەنـد نموونەیەکـی دیکەیـش دێنینـەوە، بـەڵام هیچیـان بەڵگـە نیـن لەسـەر ئـەوەی ئـەم موصحەفـەی ئێسـتا لەبـەر دەسـتی ئێمـەدا هەیـە، هیـچ ئایەتێکـی لـێ نەسـخ بووبێتـەوە: أ ـ چ خـۆی نەخوێنـدرێ و حوکمەکـەی مابـێ.

(١) - البخاري: ٤٢٣٧، ومسلم: ١١٤٥.

ب ـ چ بە حوکم و خوێندنەوەوە نەمابێ.

ج ـ چ بخوێندرێتەوە، بەس حوکمەکەی نەمابێ. ئەم موصحەفەی لەبەردەستماندا هەیە، هیچ بەڵگەیەک لەسەر ئەوە نیە، هیچ ئایەتێکی وای تێدا هەبێ.

**دووەم: لابردنی سوننەت بە سوننەت:**

دیارە کە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) جاری وابووە فەرمانێکی بە هاوەڵان کردوەو، دوایی فەرمانێکی دیکەی پێ کردوون. لەو بارەوە دەکرێ زۆر بەڵگە بێنینەوە، کە سوننەت سوننەت لادەبات، بەڵام سێ وێنان دێنینەوە:

**وێنەی یەکەم:** حاڵەتی دەستپێکەوە گرتن لە نێو ئەژنۆیەکاندا کە پێی دەگوترێ: (تطبيق)، پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دەبێ لە پێشدا وای پێ فەرمووبن و، دوایی فەرموویەتی: دەست لەسەر ئەژنۆکان دابنێن لە ڕکووعدا، لەو بارەوە ئەم دەقە هەیە:

أ. (عن علقمة بن قيس والأسود بن يزيد أنَّهما دخلا على عبدالله وهو ابن مسعود فقال: أَصلَّى مَنْ خلفكم؟ قالا: نعم، فقام بينهما وجعل أحدهما عن يمينه والآخر عن شماله، ثم ركعنا فوضعنا أيدينا على رُكَبنا، فضرب أيدينا ثم طبَّق بين يديه، ثم جعلهما بين فخذيه، فلما صلى قال: هكذا فعل رسول الله (صلى الله عليه وسلم))[1].

هەرکام لە عەلقەمەی کوڕی قەیس و ئەسوەدی کوڕی یەزید دەگێڕنەوە کە چوونە لای عبدالله ی کوڕی مەسعوود، ئەویش گوتوویەتی: ئایا ئەوانەی دوای ئێوە نوێژیان کردوە؟ گوتیان: بەڵێ،

(١)- مسلم: ٥٣٤.

(کەواتـە: ئـەو سـێیە مـاون) ئیـدی لـە نێوانیانـدا ڕاوەسـتاوەو، یەکێکـی لـە لای ڕاسـت دانـاوەو یەکێکـی لـە لای چـەپ، دوایـی نوێژیـان کـردوە، دەڵێـن :کـە چووینـە ڕکـووع، دەسـتیان لەسـەر ئەژنۆمـان دانـا (لـە پشـت ئەژنـۆ) ئەویـش دەسـتی لـە دەسـتیانداو، دوو دەسـتەکانی خـۆی پێکـەوە لکاندنـن و لـە نێـو ئەژنۆیانـی هاویشـتن، کاتێـک نوێـژی کـرد، گـوتی: پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) ئـاوای کـردوە.

ئەمـەش دەقێکـی دیکـە سـوننەت، کـە گوتـراوە ئـەم دەقـەی دوایـی، ئـەوەی پێشـێی لابـردوە:

**ب. (عـن مصعـب بـن سـعد بـن أبي وقـاص قـال: صلَّيـت إلى جنـب أبي، فلـمّا ركعـت شَـبَّكت بـين أصابعـي وجعلتهـما بـين ركبتـي، فـضرب يـديَّ، فلـما صـلَّى قـال: قـد كُنَّـا نفعـل هـذا، ثـم أُمِرْنـا أن نرفـع إلى الرُّكَـب)[1].**

واتـە: موسـعەبی کـوڕی سـەعدی کـوڕی ئەبـی وەققـاس خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: لەتەنیشـت بابمـەوە نوێژمکـرد، کاتێـک چووینـە ڕکـووع، پەنجەکانـم خسـتنە نێـو یـەک و خسـتمنە نێـوان دوو ئەژنۆیەکانـم، بـەڵام بابـم دەسـتێکی لـە دەسـتم دا ئامـاژەی بـۆ کـردوە کـە دەسـت لەسـەر ئەژنـۆی دابنـێ] کاتێـک نوێـژی کـرد، گـوتی: ئێمـە پێشـتر وامـان دەکـرد، دوایـی فەرمانمـان پێکـرا، کـە دەسـتەکانمان لـە پشـتی ئەژنۆکانمـان دابنێیـن.

دیـارە پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسـلام) پێشـێ بە شـێوەی لەپەدەسـت پێکـەوە نووسـاندن (تطبیـق) چۆتـە ڕکـووع، دوایـی دەسـتەکانی خسـتوونە پشـت ئەژنۆیەکانی.

**وێنـەی دووەم:** هەروەهـا پێغەمبـەری خاتـەم (صـلی اللـه علیـه وسـلم)

(١) - البخاري:٧٥٧، ومسلم: ٥٣٥.

پێشـێ نەهـی لـێ کـردوون کـە سـەردانی گۆڕسـتان بکـەن، دوایـی فەرمـوویـەتی بچـن، وەک لـەم دەقـەوە دیـارە:

**(عـن بريـدة الأسـلمي قـال: قـال رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم): كنـت نهيتكـم عـن زيـارة القبـور، فزورهـا، ونهيتكـم عـن لحـوم الأضاحـي فـوق ثـلاث، فأمسـكوا مـا بـدا لكـم، ونهيتكـم عـن النبيـذ إلاَّ في سـقاء، فاشربـوا في الأسـقية كلّهـا، ولاتشربـوا مُسْـكِراً)[1].**

پێغەمبـەر (عليـه الصـلاة والسـلام) فەرمـوویـەتی: مـن پێشـتر لێـم قەدەغەکردبـوون سـەردانی گۆڕان بکەن، ئێسـتا سـەردانیان بکـەن، هەروەها لێـم قەدەغـە کردبـوون گۆشـتی قوربانیـی لـە سـێ ڕۆژان زیاتـر هەڵبگـرن، ئێسـتا ئەوەنـدەی دەتانـەوێ هەڵبگـرن (لـە سـێ ڕۆژ زیاتریـش) دیسـان لێـم قەغەکردبـوون کـە خۆشـاو لـە جگـە لـە مەشـکە بکـەن، ئێسـتا لـە هەمـوو جـۆرە دەفرەکانـدا خۆشـاو بخۆنـەوە، بـەڵام سەرخۆشـکەر مەخۆنـەوە.

**وێنەی سێیەم:** وێنەیەکی دیکە لەوبارەوە:

**(عـن جابـر بـن عبداللـه رضي اللـه عنهـما قـال: كان آخـر الأمريـن مـن رسـول اللـه تـرك الوضـوء مِـمّا مَسَّـتِ النـار)[2].**

جابیـری کـوڕی عبداللـە خـوا لە خـۆی و بابی ڕازی بێـت دەڵێ: کۆتایی دوو کارەکان لـە پێغەمبـەرەوە (عليـه الصـلاة والسـلام) ئـەوە بـوو کـە ئـەو گۆشـتەی بەئاگـر کوڵێندرابـێ، دوای ئـەوەی دەخـورێ، پێویسـت نـاکات دەسـتنوێژی بـۆ تـازە بکرێتەوە.

پێشـتر فەرموویەتی: هەرکەسـێک گۆشـت بخوات، با دوای خواردنەکە دەسـتنوێژ بگرێتـەوە، ئەگـەر دەسـتنوێژیشی هەبـێ، بـەڵام لـە کۆتاییـدا فەرمـوویـەتی: پێویسـت بـە دەسـتنوێژ نـاکات.

---

(١)- أخرجه أحمد في المسند ج٥ ص٣٥٦ - ٣٥٩، ومسلم: ٩٧٧، والنسائي: ٢٠٣٢ - ٢٠٣٣ عن بريدة.
(٢) - البزار:١٩٢، والنسائي: ١٨٥.

هەندێـک لە زانایانیش گوتوویانە: مەبەسـتی لە دەسـتنوێژ، هەر دەسـت شـۆردن بـووە، لەبـەر ئـەوەی خواردنی گۆشـت، دەسـت و پـەل و دەم و ددان چەور دەکات،

کەواتـە: لابـردنی سـوننەت بە سـوننەت، شـتێکە زۆرە بـاوە و دەگونجێ لەو بـارەوە زۆر بەڵگـە بهێندرێنەوە.

**سێیەم: لابردنی قورئان بە سوننەت:**

ئایا سوننەت دەگونجێ قورئان لابەرێ؟!

لەو بارەوە دوو ڕای زانایان هەن:

**ڕای یەکەم:** هەرگیز قورئان بە سوننەت لاناچێ:

کـە ئەمـە ڕای سـوفیانی سـەوریی و شـافیعیی و ڕای ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەلـە، لەیەکێـک لـە دوو ڕیوایەتـەکان داو، ڕای کۆمەڵـێ لـە هـاوەڵانی مالیکـە.

لەوبارەوەش ئەم دەقە دێنین:

(سُئل أحمد بـن حنبـل: أَتَنْسَـخ السـنَّةُ شيئاً مـن القـرءان؟ قـال لاينسـخ القرآنَ إلاّ القـرآن)[1].

واتـە: پرسـیار لـە ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل کـراوە: ئایـا سـوننەت هیـچ بەشـێک لـە قورئـان لادەبـاو نەسـخی دەکاتـەوە؟ گوتوویـەتی قورئـان تەنیـا بـە قورئـان نەسـخ دەبێتـەوە.

هەروەهـا هەمان شـت لە شافیعییشـەوە هاتـوە، وەک لە (الرِّسـالة)[2]داو، لـە (أحكام القـرءان)[3]دا لـێ گێردراوەتەوە.

(١)- إبن عبدالبر في (جامع بيان العلم) ج٢ ص١١٩٤،و أبو داود في مسائله: ص١٧٦.
(٢)- ص ١٠٦.
(٣)- ج١ ص٣٣.

لەڕاستیدا هەر ئەم ڕایەش ڕای ڕاست و بەهێزو بەڵگە دارە.

**ڕای دووەم:** ئەوەیە کە دەگونجێ ئایەتێک بە دەقێکی سوننەت لابچێ.

ئەمەش ڕای حەنەفییەکان و کۆمەڵێک لە مالیکییەکانەو، هەندێک لە زانایانی شافیعیی مەزهەبیش هەڵیانبژاردوە، وەک (الجويني إمام الحرمين) و (الغزالي) و ئەمە ڕیوایەتی دووەمیشە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوەو (إبن حزم الظاهري) یش ئەمەی هەڵبژاردوە.

وێنەیەکیان بۆ ئەوە هێناوەتەوە کە دەگونجێ، دەقێکی سوننەت ئایەتێک، یان حوکمی ئایەتێک لابەرێ، ئایەتی ژمارە (١٨٠) لە سووڕەتی (البقرة)یان، بە وێنە هێناوەتەوە:

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ١٨٠

واتە: لەسەرتان پێویستکراوە هەرکات یەکێکتان مردنی گەیشتە سەر، ئەگەر ماڵێکی بەجێ دەهێشت، وەسییەت کردنی بۆ بابی و دایکی و بۆ خزمان بەشێوەیەکی پەسەند لەسەر نووسراوە، ئەمە مافێکە لەسەر پارێزکاران.

ئنجا هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەم پێویست بوونی وەسییەتکردن بۆ باب و دایک و خزمان، بەم فەرمایشتە، نەسخ کراوەتەوە کە دەفەرموێ:

[إنَّ الله قد أعطى كلَّ ذي حق حقَّه، فلا وصيَّةَ لوارثٍ][1].

واتە: خوا هەر خاوەن مافە، مافی خۆی پێداوە، بۆیە

(١) - أخرجه أحمد في المسند: ج٥ ص١٦٧، وأبو داود: ٢٨٧٠ - ٣٥٦٥، والترمذي: ٢١٢٠، وابن ماجه: ٢٧١٣، وقال الترمذي: حديث حسن. وقال عبدالله بن يوسف الجديع: إسناده جيد.

وەسیەتکردن بۆ میراتگر نیە.

بەڵام ئێمە دوایی قسە لەبارەی ئەو ئایەتەوە دەکەین و ئەگەر فەرموودەکە لە ڕووی سەنەدەوە چەسپاویش بێ، هەرچەندە مشت و مڕیشی لەبارەوە هەیە، بەڵام قورئانێک کە بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، بێگومان بە دەقێک کە سەنەدەکەی ئاحادە، ناگونجێ نەسخ بکرێتەوە.

## چوارەم: لابردنی سوننەت بە قورئان:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە، کە قورئان نەسخی سوننەت دەکاتەوە، بەڵام شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، نکووڵیی لەوە کردوە و، لەوەشدا گومانی تێدا نیە، کە نەیپێکاوە، چونکە ئێمە بەڵگەمان هەیە و، وێنەیەک بۆ ئەوە کە دەقێکی سوننەت، یاخود ڕەفتارێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئایەتێکی قورئان لای دەباو حوکمەکەی ناهێڵێ، ئەوەیە کە پێشتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی بۆ نوێژ ڕوویان دەکردە (بيت المقدس) لە سەرەتاوە، هەتا ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزی:

﴿ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ...﴾ البقرة: ١٤٣ .

کە دەفەرموێ: ئەو ڕووگەیەی پێشتر لەسەری بووی، بۆمان نەگێڕابووی، مەگەر بۆ ئەوەی بزانین: کێ شوێن پێغەمبەر دەکەوێ و کێش لەسەر پاژنەکانی هەڵدەگەڕێتەوە؟!

ئنجا ئەوەی ئەم ڕەفتارەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) کە ڕووکردنە (البيت المقدس)ە، لابردو حوکمەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەو

ئایەتـە موبارەکـەی (١٤٤)ی سـوورەتی - البقـرة - بـوو:

﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ ﴾ البقـرة: ١٤٤.

واتـە: ئێمـە ڕووی تـۆ دەبینیـن کـە هەڵگێـڕ و وەرگێڕی دەکـەی ڕوو بە ئاسمان (دەپاڕێیـەوە)، ئێمـە بەدڵنیاییـەوە ڕووت پـێ دەکەینـە ڕووگەیـەک کـە دڵ پەسـەندتبێ، لەمـەودوا ڕوو بکـە لای مزگـەوتی حـەڕام و، لـە هـەر شـوێنێک بـوون، ڕوو بکەنـە لای مزگـەوتی حـەڕام (لـە نوێژەکانتانـدا).

لەو بارەوەش ئەم دەقە هەیە:

(عـن ابـن عبـاس رضي اللـه عنهما قـال: كان رسـول اللـه (صـلى الله عليـه وسـلم) يصـلِّي وهـو بمكـة نحـو بيـت المقـدس والكعبـة بـين يديـه، وبعـد مـا هاجـر الى المدينـة سـتة عـشر شـهراً، ثـم صُرِفَ إلى الكعبـة)[١].

بە هەمان شێوە لە (البراء بن عازب) یشەوە هاتوە:

(كان رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم) صـلى نحـو بيـت المقـدس سـتة عـشر أو سـبعة عـشر شـهراً، وكان رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم) يحـب أن يوجـه نحـو الكعبـة، فأنـزل اللـه (قـد نـرى تقلـب وجهـك في السـماء) فتوجـه نحـو الكعبـة)[٢].

عبداللـە ی کـوڕی عەببـاس دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا (عليـه الصـلاة والسـلام) کاتێـک لـە مەککـە بـوو، ڕووی بـەرەو بەیتولمەقدیس دەکـرد بـۆ نوێـژ و کەعبـە لـە نێوانیانـدا بـوو، دوای ئـەوەی کۆچـی کـرد بـۆ مەدینـە، شـازدە مانـگان هـەر بـەو شـێوەیە نوێـژی کـرد، دوایی بـەرەو کەعبـە ڕووی پـێ وەرچەرخێـنرا.

(١)- أخرجه أحمد: ٢٩٩١ ، وابن سعد في الطبقات (٢٣٤/١) ،والبزار: ٤١٨، والطبراني في الكبير ١١٠٦٦ ، والبيهقي في الكبرى (٣/٢)، قلت: وإسناده صحيح (المقدمات الأساسية...) ص ٥٤ .
(٢) - البخاري: ٣٩٠، ومسلم: ٥٢٥.

بەڕائی کوڕی عازیبیش دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شازدە مانگ، یان حەڤدە مانگ، بەرەو بەیتولمەقدیس نوێژی کردو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەزی دەکرد ڕووی پێ بسوورێندرێ بەرەو کەعبە، دوایی خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: [قد نرى تقلب وجهك في السماء] تاکۆتایی ئایەتی ژمارە (١٤٤)و ڕووی کردە کەعبە.

کەواتە: دیارە کە قورئان ڕەفتارێکی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) کە لە ڕێبازەکەی دا هەبووە، لایبردوە.

ئەمە ئەوەیە کە نەسخی تێدا دەبێ، کە زۆرێک، یان بەشێک لە زانایان گوتوویانە: هەر چوار جۆرەکەیەتی، هەم قورئان قورئان نەسخ دەکا، هەم سوننەت قورئان نەسخ دەکا، هەم سوننەت سوننەت نەسخ دەکا، هەم قورئانیش سوننەت نەسخ دەکات.

کە گومان لەوەدا نیە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەگونجێ دەقێکی دیکەی سوننەت نەسخ بکات و، بەڵگەشمان لەسەر هێنایەوە، هەروەها قورئانیش دەگونجێ شتێک، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردوویەتی، نەسخی بکات و لایبەرێ، ئەوەش گومانی تێدا نیە، بەڵام ئەوەی، کە گومانی تێدا هەیەو، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، ئەوەیە: کە قورئان، ئەم قورئانەی ئێستا لەبەر دەستمانە، شتێکی تێدا هەبێ: نەسخ کرابێتەوە.

واتە: ئایەتەکە مابێ و حوکمەکەی لاچووبێ، یاخود حوکمەکە مابێ و، ئایەتەکە نەخوێندرێتەوە، یاخود خوای پەروەردگار ئایەتێکی نەسخ کردبێتەوەو لاییردبێ، بەڵام لە موصحەفی ئێستادا نەبێ، لە قورئاندا نەبێ، ئەوە بە هەرحاڵ دەگونجێ، ئەگەر بە بەڵگەی

دڵنیاکەر بچەسپێ، بەڵام ئەوەی ئێمە نکووڵیی لێ دەکەین، ئەوەیە: ئەم موصحەفەی لەبەر دەستمانە، ئایەتێکی تێدا هەبێ، کە بێژەکەی نەسخ کرابێتەوەو حوکمی مابێ، یان حوکمەکەی نەسخ کرابێتەوەو بێژەکەی مابێ.

ئەوەش کە سوننەت قورئان نەسخ بکاتەوە، ئەوەی ڕاستە وەک زۆربەی زانایان گوتوویانەو، ئێمەش هەر ڕای ئەوانمان پێ ڕاست و پەسەندە، ئەوەیە کە دەگونجێ سوننەتی پێغەمبەر (صلی اللـه علیه وسلم) ئایەتێکی قورئان ڕوون بکاتەوەو، دەگونجێ یاسایەکی گشتیی کە لە قورئاندا هاتوە، دەقێکی سوننەت تایبەتی بکات و، دەگونجێ دەقێکی سوننەت حوکمێکی ڕەها کە لە قورئاندا هاتوە، بەنّدداری بکات، کە ئەوە هەمووی دەکاتە ڕوونکردنەوە، ئەوەی خوا فەرموویەتی:

﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ﴾ النحل: ٤٤.

بەڵام ئەوە کە دەقێکی سوننەت قورئان لابەرێ و نەسخی بکاتەوە، هیچ بەڵگەیەکمان لەو بارەوە نیەو، ئەوەش کە لەو بارەوە زانایان باسیان کردوە، بەڵگە نیە و بەبەڵگە ناژمێردرێ.



## بڕگەی پێنجەم: جۆرەکانی نەسخ لە قورئاندا:

ئەوانەی کە پێیان وابووە لە قورئاندا نەسخ هەیە ـ کە ئێمە ئەو ڕایەمان پێ بێهێزە، چونکە بەدڵنیاییی پشت ئەستوور نیە بە هیچ بەڵگەیەکی ئیقناعکەر ـ وەک دوایی لە بڕگەی شەشەم دا زیاتر لەو بارەوە دەدوێین.

بەڵێ ئەوانەی پێیان وابووە: قورئان دەگونجێ نەسخی تێدا بووبێ، ئەم موصحەفەی بەردەستمان، هەروەها لە غەیری موصحەفیشدا، گوتوویانە: سێ جۆرە نەسخ هەیە:

**جۆری یەکەم:** لابردنی حوکمەکە لەگەڵ مانەوەی خوێندنەوەی (نسخ الحكم مع بقاء التلاوة).

**جۆری دووەم:** لابردنی خوێندنەوەکە لەگەڵ مانەوەی حوکمەکە (نسخ التلاوة مع بقاء الحكم).

**جۆری سێیەم:** لابردنی خوێندنەوەو حوکمەکەی (نسخ التلاوة والحكم).

**١ ـ جۆری یەکەم: لابردنی حوکمە کە لەگەڵ مانەوەی خوێندنەوەی:** زۆرێک لە زانایان ئەم نموونەیان بۆ هێناوەتەوە، ئایەتی ژمارە (١٥) لە سوورەتی (النساء) کە دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا﴾ النساء: ١٥.

واتە: ئەو ئافرەتانەی کە فاحیشە دەکەن لە ئافرەتانتان، چوار کەسیان (چوار پیاو) لە خۆتان لەسەریان بە شایەد بگرن، ئنجا ئەگەر شایەدییاندا، لەماڵەکاندا بیانهێڵنەوە، (حەپسیان بکەن) تاکو دەمرن،

یاخــود خــوا ڕێیه‌ كیــان بــۆ ده‌بینێتــه‌وه‌.

ده‌ڵێن: ئه‌مه‌ نه‌سخ بووه‌وه‌ به‌ ئایه‌تی ژماره‌ (٢) له‌ سووره‌تی (النور):
﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ ﴾ النور: ٢ .

واتــه‌: ئافــره‌تی زینــا كارو پیــاوی زینــا كار، هه‌ركامێكیــان یه‌كــی ســه‌د قه‌مچییــان لێبــده‌ن.

ئنجا له‌وباره‌وه‌ش به‌ڵگه‌ به‌وه‌ دێننه‌وه‌ كه‌ (إبن عباس) خوا لێیان ڕازی بێ وایگوتوه‌، وه‌ك له‌ (سنن أبي داود) دا به‌ سه‌نه‌دێكی باش و به‌ ژماره‌ (٤٤١٣) هاتوه‌، هه‌روه‌ها ده‌قێكی دیكه‌ی سوننه‌ت له‌وباره‌وه‌ به‌ به‌ڵگه‌ دێننه‌وه‌:

[خذوا عنِّي خذوا عنِّي قد جعل الله لهنَّ سبيلاً، البكر بالبكر، جَلْدُ مئة ونفي سنة، والثيب بالثيب، جَلْدُ مئة والرَّجمُ][(١)].

واته‌: لێم وه‌ربگرن، لێم وه‌ربگرن! خوا ڕێی بۆ دۆزینه‌وه‌ [بۆ ئه‌و ئافره‌تانه‌ی فاحیشه‌ ده‌كه‌ن، چونكه‌ دوایی ئێمه‌ ڕوونی ده‌كه‌ینه‌وه‌ كه‌ لێره‌دا مه‌به‌ست له‌ فاحیشه‌، زینا نیه‌] ئه‌وانه‌ی هاوسه‌ر گیرییان نه‌كردبێ (پیاوو ئافره‌ت) یه‌كی سه‌د قه‌مچیی و ساڵێكیش دووربخرێنه‌وه‌، به‌ڵام ئه‌وه‌ی هاوسه‌رگیریی كردبێ، له‌ پیاوو ئافره‌ت، یه‌كی سه‌د قه‌مچیی و به‌رد بارانیش بكرێن.

كه‌ ئه‌م ده‌قه‌ له‌ ڕاستییدا نه‌ له‌گه‌ڵ سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ردا ده‌گونجێ (علیه الصلاة والسلام) نه‌ له‌گه‌ڵ ئایه‌تی قورئاندا، به‌ڵێ، وه‌ك باسمانكرد له‌ سه‌رچاوه‌كانی سوننه‌تدا هاتوه‌، به‌ڵام نه‌ له‌گه‌ڵ ڕێبازی پێغه‌مبه‌ردا ده‌گونجێ، چونكه‌ پێغه‌مبه‌ری خوا زیناكارانی ئاوا سزا نه‌داون، نه‌ له‌گه‌ڵ ده‌قی قورئانیشدا.

ئه‌مه‌ گوایه‌: وێنه‌ی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ حوكمێكی قورئان نه‌سخ كراوه‌ته‌وه‌ و ئایه‌ته‌كه‌ش هه‌ر ده‌خوێنرێته‌وه‌!

(١) -أَخرجَهُ احمد في المسند: ج٥ ،٣١٣و ٣١٧و ٣١٨و ٣٢٠، ومسلم:١٦٩٠، وأبوداود: ٤٤١٥ و ٤٤١٦، والترمذي: ١٤٣٤، والنسائي في الكبرى: ٧١٤٣و ٧١٤٤، وابن ماجه: ٢٥٥٠، والدارمي: ٢٢٤١.

کە ئێمە دوایی ڕوونی دەکەینەوە، وا نیە.

شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (النساء) دا بەدرێژیی لەبارەی ئەم ئایەتەو، ئایەتەکەی دواییەوە قسەمان کردوە، کە ئەو ئایەتە (النساء ـ ١٥ ـ ) لەبارەی ئافرەتانی زیناکەرەوە نادوێ و، ئایەتی دواییشی لەبارەی ژن و پیاوێکەوە کە زینا دەکەن، نادوێ، بەڵکو ئەم ئایەتە لەبارەی ئافرەتانێکەوەیە، کە لێکخشێنەر (مساحقات)ن و، ئایەتی دواییشی [والذان يأتيانها منكم] (النساء ـ ١٦ ـ) لەبارەی دوو نێرینەوەیە کە نێربازیی پێکەوە دەکەن . دواییش زیاتر قسەی لێ دەکەین.

**٢ ـ جۆری دووەم: ئەوەیە کە خوێندنەوەکەی لابرابێ ، بەڵام حوکمەکەی مابێ:**

لەوبارەوە چەند دەقێک هاتوون، کە هیچیان پاڵنادرێنە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموویان قسەی هاوەڵانن، یەکێک لەوانە کە دەقێکی زۆر ناوداره لە کتێبەکاندا، ئەمەیە:

(عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: إن الله بعث محمداً بالحق وأنزل الكتاب، فكان مِمّا أنزل الله آية الرجم، فقرأناها وعقلناها ووعيناها).

وفي رواية: {وقد قرأتها: (الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة) رجم رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ورجمنا بعده}.

وفي رواية: {ولولا يقولوا أثبت في كتاب الله ما ليس فيه، لأَثبتُّها كما أنزل، فأخشى إن طال بالناس زمان، أن يقول قائل والله ما نجد آية الرجم في كتاب الله، فيضلوا بترك فريضة أنزلها الله، والرجم في كتاب الله حق على على من زنى إذا أحصن من الرجال والنساء، إذا

قامـت البينـة أو كان الحبـل أو الإعـتراف)[١].

گوایـە عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ گوتوویـەتی: خـوا موحەممـەدی بـە حـەق نـاردوەو، کتێبـی دابەزاندووەتـە سـەر و، لـەو کتێبـەدا کـە دایبەزانـدوە، ئایـەتی ڕەجم هەبـوو، ئێمـە خوێندمانـەوەو لێـی تێگەیشـتین و لێـی حاڵـی بووین.

لـە ڕیوایەتێکـدا دەڵـێ: ئایەتەکـەم خوێندۆتـەوە: [الشـيخ والشـيخة إذا زنيـا فارجموهـا البتـة]. پیـاوی بەتەمـەن و ئافـرەتی بەتەمـەن، هـەر کاتێک زینایـان کـرد بـە حەتمیـی بەردبارانیـان بکـەن، ئنجـا پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) بەردبـارانی کـردو، ئێمـەش لـە دوای ئـەو بەردبارانمـان کردوە.

لـە ڕیوایەتێکـدا دەڵـێ: ئەگـەر نەیانگوتبایـە: عومـەر ئایەتێکـی لـە کتێبـی خـوادا چەسـپاندوە کـە لـەوی نیـە، دەمچەسـپاند وەک دابەزیـوە، دەترسـێم ئەگـەر خەڵـک ڕۆژگاریان بەسـەردا تێپەڕ بـوو، بێژەرێکیـان بڵێ: ئێمـە ئایـەتی ڕەجم لـە کتێبی خـوادا نابینیـن و، بەهۆی ئـەوەوە فەرزێک کە خـوا دایبەزانـدوە وازی لێ بێنن و گومـڕا ببن، بەڵام بەردبارانکـردن لە کتێبی خـوادا هاتـوەو، پێویسـتە هەرکەسـێک زینای کـرد، ئەگەر هاوسـەرداربێ لە پیـاوان و لـە ژنـان، مـادام بەڵگـەی لەسـەربێ، یـان ئافرەتەکە حەمـل هەبێ، یاخـود دانپێدانـان، کـە بەردبـاران بکرێ.

ئەمـە دەقێکـە، بـەڵام بێگومـان لـە جۆری ئاحـاد (آحـاد)ەو قورئانیـش هەمـووی موتەواتیـرە، کەواتـە: ناگونجێ بە دەقێکـی ئاحاد شـتێک پاڵدەینە لای قورئـان، کـە هەمـووی بـە تەواتـور بـە ئێمـە گەیشـتوە، ئنجـا ئەگـەر بڵێیـن: ئەم ئایەتـە هەبووە، حوکمەکەی مـاوەو تەنیـا خوێندنەوەکەی لابراوە، دەڵێیـن: ئایـا خوێندنەوەکەی بۆچی لابـراوە ،ئەگەر حوکمەکـەی ماوە؟! چەند

(١)- البخاري:٦٤٤١ و ٦٤٤٢ و ٦٨٩٢، ومسلم: ١٦٩١، وابن ماجة:٢٥٥٣، وأحمد:٣٥٢، والنسائي:٧١٥١ و ٧١٥٤.

دەقێکـی دیکـەش لەوبـارەوە هاتـوون، کە هـەر بـەو شـێوەیەن و، هەموویان قسـەی هاوەڵانـن خـوا لێیـان ڕازی بێ.

**جۆری سـێیەم: ئەوەیە کـە هـەم خوێندنەوەکەی و، هەم حوکمەکەیشـی لابرابن:**

نووسـەری کتێبـی (المقدمـات الأساسـية في علـوم القـرآن) دەڵـێ: ئەمـەش دوو جـۆرە:

أ ـ ئەوەیـە کـە بێژەکـەی یاخـود بابەتەکـەی بـە ئێمـە گەیشـتبێ، بـەڵام دوایـی خوێندنـەوەشی و حوکمەکـەشی لابرابـێ، وەک لـە خاتـو عائیشـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) هاتـوە:

[كان فيـها أنـزل مـن القـرآن (عـشر رضعـات معلومـات يُحَرّمْـنَ) ثـم نسـخن بخمـس معلومـات][1].

گوایـە: دایکـمان خاتـو عائیشـە گوتوویـەتی لـەوەدا کـە لـە قورئـان دابەزێـنرا ئەوەبـوو: (دە جـار شـیر خـواردن کـە زاندراوبـن ، دەبنـە قەدەغەکـەر)ی ئـەو منداڵـە لـەو ئافرەتـە کـە شـیری خـواردوە، ئەگـەر کوڕبـێ لـە کچـەکانی و، بـۆ ئەگـەر کـچ بـێ لـە کـوڕەکانی، (دوایـی ئـەم دەیـە نەسـخ کرانـەوە بـە پێنجـی زانـدراو) کـە پێنـج جـاران شـیری لـێ بخـوات.

ئەمـەش گوایـە قورئـان بـووەو نەسـخ کراوەتـەوە، هـەم حوکمەکـەی و هـەم خوێندنەوەکەشـی.

ب ـ ئەوەیە کە ئێمە تەنیا هەواڵمان پێ گەیشتوەو، هیچی لەبارەوە نازانین، لەو بارەوەش ئەم دەقە هاتوە:

(عـن زر بـن حبيـش قـال: قـال لي أبي بـن كعـب: كأيِّـن تقـرأ سـورة

(١) - مالك في الموطأ: ١٧٨٠، وإسحاق ابن راهويه:١٠٠٧، ومسلم: :١٤٥٢، وأبو داود:٢٠٦٢، والترمذي: ١١٥٠، والنسائي:٣٣٠٧، والدارمي: ٢١٧٠.

الأحـزاب، أو كأيِّـن تَعُدُّهـا؟ قـال: قلـت: لـه ثلاثـاً وسـبعين آيـة، فقـال: قـط؟ رأيتهـا وإنهـا لتعـادل سـورة البقـرة)[1].

گوایـە زیـڕری کـوڕی حوبەیـش، ئوبـەی کـوڕی کەعـب پێیگوتـوە: تـۆ سـوورەتی (الأحـزاب)ت پـێ چەنـدە؟ یاخـود پێـت وایـە چەنـد ئایەتـە؟ ئەویـش گوتوویـەتی: پێمگـوت: (٧٣) ئایەتـە، گـوتی: هەرگیـز وا نیـە، مـن بینیومـە سـوورەتی ئەحـزاب بـە ئەنـدازەی بەقـەرە بـووە.

ئەمـەش هـەر قسـەیەکە کـراوەو پاڵدراوەتـە لای ئـەو هاوەڵانـە، یـان ئـەو هاوەڵانـە بـە بۆچـوونی خۆیـان شـتێکیان گوتـوە، بـەڵام بێگومـان ئەمـە بـە بەڵگـەی ئـەوە ناشـێ بڵێیـن: سـوورەتی ئەلئەحزاب هێنـدە بـووەو دوایـی نەسـخ بووەتـەوە! هەرچەنـدە گریـمان ئەگـەر سـوورەتی ئەحـزاب، یـان هـەر سـوورەتێکی دیکـە، چەنـد ئایەتێکـی لـێ نەسـخ بووبنـەوە، مادام ئێسـتا لـە قورئانـدا نەبـن، ئێمـە گرفتێکـمان نیـە بـۆ ئـەو موصحەفـەی لەبـەر دەسـتماندا هەیـە.

کەواتە: ئەوە سێ جۆرەکانی نەسخن بە لای زانایانەوە، کە ئێمە پێمان وایە، هیچ کام لەو سێ جۆرە بەڵگەیەکیان لەسەر نیە، چەسپاوبن:

١ ـ نە ئەوەی خوێندنەوەکەی مابێت و حوکمەکەی لاچووبێ.

٢ ـ نە ئەوەی خوێندنەوەکەی لاچووبێ و حوکمەکەی مابێ.

٣ ـ نە ئەوەی خوێندنەوەو حوکمی هەردووکیان نەمابن و لاچووبن.

لــە ڕاسـتییدا ئــەو نموونانــەی هێندراونــەوە، هیچیــان بایــی ئــەوە ناکــەن، ئیســپاتی ئــەو دەعوایەیــان پــێ بکــرێ، کــە ئێمــە ســێ جــۆرە ئایەتمـان هـەن لـە قورئانـدا، نەسـخ کراونـەوە: چ خوێندنـەوەو حوکمیـان، چ تەنیـا حوکمیـان، چ خوێندنەوەیـان مابـێ و، حوکمەکەیـان لاچووبـێ.

(١) - الطيالسي في مسنده: ٥٤٠ وعبدالرزاق في مصنفه: ٥٩٩٠، والنسائي في الكبرى: ٧١٥٠، وعبدالله بن أحمد في الزوائد المسند: ج٥ ص١٣٢، وابن حبان: ٤٤٢٨، والحاكم: ٣٥٥٤ و ٨٠٦٨.

## برگەی شەشەم: پێنج سەرنج لەبارەی نەسخەوە:

لە کۆتایی باسی هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، بەباشی دەزانین، پێنج سەرنجان لەبارەی نەسخەوە لە قورئاندا بخەینە ڕوو:

**سەرنجی یەکەم: بەرنامەکانی پێغەمبەرانی پێشوو بەگشتیی بۆ ئێمەش پابەندکەرە:**

بەڕای زۆربەی زانایان کە، لە نێویاندا: مالیک و زۆربەی هاوەڵانی هەن و، هەندێک لە حەنەفییەکان و، هەندێک لە شافیعییەکان هەن، هەروەها ئەو ڕایە ڕاستترە لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە، کە ئەوەی خوا ـ (سُبحانه وتعالى) ـ لە بەرنامەکانی پێغەمبەرانی پێشوودا دایبەزاندوە، ئێمە پابەندکراوین کە پەیڕەویی لێ بکەین و شوێنی بکەوین، بە مەرجێک نەسخ نەکرابێتەوە.

کاتێکیش دەتوانین بڵێین: فڵان شتە لە بەرنامەی فڵان پێغەمبەرەدا (عليه الصلاة والسلام) نەسخ کراوەتەوە، کە بەڵگەیەکمان بەدەستەوەبێ، ئەگەر نا، هەرچی خوا بۆ پێغەمبەرانی دابەزاندوە (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ)، بۆ ئێمەش پابەندکەرەو، زانایان ئەم زاراوەیان بۆ بەکارهێناوە: (شرع مَـنْ قَبْلَنا شرعٌ لنا) بەرنامەی ئەوانەی پێش خۆمان، بۆ ئێمەش بەرنامەیە.

لەو بارەوە دەگونجێ زۆر بەڵگە بهێندرێنەوە، بەڵام ئایەتی ژمارە (٩٠) لە سوورەتی (الأنعام) لەوبوارەدا بەسە، کە دوای ئەوەی خوا ـ (سُبحانه وتعالى) ـ ناوی هەژدە لە پێغەمبەران دێنێ لە سیاقێکدا، ئەو هەژدە پێغەمبەرەش (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ)، ئەمانەن:

(إبراهيم و إسحاق و يعقوب و نوح و داود و سليمان و أيوب و يوسف و موسى و هارون و زكريا و يحيى و عيسى و إلياس و إسماعيل و اليسع و يونس و لوط) صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموويانبێ، ئەمە لە ئايەتەكانی: (٨٦و ٨٧و ٨٨)ی سوورەتی (الأنعام)دا هاتووە، دوای ناوهێنانی ئەو هەژدە پێغەمبەرە، خوا ـ (سُبحانه وتعالى) ـ بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرمویٚ:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ٨٩ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ٩٠﴾ الأنعام.

واتە: ئەوانە (ئەو هەژدە پێغەمبەرە كە ناويان هێندراوە) ئەوانەن كە كتێب و حيكمەت و پێغەمبەرايەتييمان پێيداون، ئنجا ئەگەر ئەوانە، (ئەو كافرانەی رۆژگاری تۆ) پێيان بێبڕوا بن، ئەوە كەسانێكمان پێڕاسپاردوون، كە پێيان بێبڕوا نين (ياخود سپڵە نين) ئا ئەوانە (ئەو هەژدە پێغەمبەرە) كەسانێكن خوا ڕاستەڕێی كردوون، دە جا تۆش بەدوای ڕاستە ڕێكرانی ئەوان بكەوەو، بشڵێ: هيچ كرێتان لێ داوا ناكەم (هيچ پاداشتێک) ئەوە تەنيا بيرخەرەوەيە بۆ جيهانييان.

كەواتە: پێغەمبەری خاتەم ـ صلى الله عليه وآله وسلم ـ پابەندكراوە كە پەيڕەويی بكات لە پێغەمبەرانی پێش خۆی، چۆن پەيڕەوييان لێ بكات؟ ئەو بەسەرهاتانەی وان كە خوا بۆی گێڕاوينەوەو، ئەو شتانەی خوا لەبارەی پێغەمبەرانەوە باسی كردوون، دەبێ پەيڕەويی لەوە بكرێ.

بەڵام بێگومان ئەگەر بەڵگەيەک هەبێ لەسەر ئەوە، كە شتێک لەوەی كە لە كتێبی پێغەمبەرانی پێشوودا ـ صەڵات و سەلامی خوايان لەسەربێ ـ نەسخ كراوەتەوە، ئەو كاتە بێگومان پابەندكەر نيە بۆ ئێمە.

بەڵگەیەکی دیکەش لەو بارەوە، ئەم دەقەی سوننەتە:

(عن العوام بن حوشب قال: سألت مجاهداً عن السجدة التي في (ص) فقال: نعم، سألت عنها ابن عباس، فقال: أتقرأ هذه الآية: (ومن ذريته داود وسليمان) وفي آخره (فبهداهم آقتده) قال: أُمِرَ نبيُّكم أن يقتدي بداود)[1].

عەوامی کوڕی حەوشەب دەڵێ: لە موجاهیدم پرسی لە بارەی ئەو سەجدەیەی کە لە سوورەتی (ص)دا هەیە (ئەو سەجدەیە بەرم، ڕەوایە یان سوننەتە، یان پێویستە؟) گوتی: بەڵێ، من لەبارەیەوە لە ئیبنو عەبباسم پرسیوە، ئەویش پێیگوتم: ئایا ئەم ئایەتە دەخوێنیەوە [ومن ذريته داود وسليمان وأيوب ويوسف وموسى وهارون وكذلك نجزي المحسنين]، کە لە کۆتایی ئایەتەکاندا دەفەرموێ: [أولئك الذين هدى الله فبهداهم آقتده]، (واتە: ئایا نایخوێنی؟! ئەویش گوتوویەتی: با) ئەویش گوتوویەتی: پێغەمبەرەکەتان (صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ) فەرمانی پێکراوە کە داوود بکاتە سەرمەشق.

کەواتە: ئەگەر داوود سەجدەی بردوە سەجدەی شوکر، ئێوەش ئەو سەجدەیە ببەن.

بەڵێ هەرچی لەبەرنامەکانی پێغەمبەرەکانی پێشوودا هاتووەو لەبەسەرهاتەکانیاندا، کە خوا لە قورئاندا بۆمان دەگێڕێتەوە، بۆ ئێمەش پابەندکەرە، بەڵام بێگومان ئەوەی ئێستا لە کتێبەکانیاندایە، لەبەر ئەوەی خوا هەواڵی پێداوین، دەستکارییکراون و لەبیریان چووەو گۆڕانکارییان تێدا کراوە، مەگەر بەڵگەیەکمان لە قورئان یاخود لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەری بەدەستەوەبێ، ئەگەر نا بۆ ئێمە نابێتە پابەندکەر.

(١) - البخاري: ٣١٣٩ و٤٥٢٨ و٤٥٢٩.

**سـەرنجی دووەم: زانینـی لابـەرو لابـراو (الناسـخ والمنسـوخ)، زۆر پێویستـە، بـە تایبـەتی بـۆ کەسێک فەتـوا بـدات و، حوکمـە شـەرعییەکان بـۆ خەڵـک ڕوون بکاتـەوە:**

شـافیعیی ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ لـە کتێبەکـەی خـۆی (الأم)دا گوتوویـەتی:

(ولا ینبغي للمفتي أن یُفْتي أحداً إلاّ متى یجمع أن یکون عالماً، علم الکتاب، وعلم ناسخه ومنسوخه، و خاصّه وعامَّه، وأدبه، وعالماً بسنن رسول الله (صلى الله علیه وسلم)، وأقاویل أهل العلم قدیماً وحدیثاً، وعالماً بلسان العرب، عاقلاً یمیِّز بین المشتبه، ویعقل القیاس، فإنْ عَدِمَ واحداً من هذه الخصال، لم یحلّ له أن یقول قیاساً)[1].

واتـە: ناگونجـێ موفتـی فەتـوا بـدات بـۆ هیـچ کـەس، مەگـەر ئـەم زانیارییانـە کۆبکاتـەوە، شـارەزابێ بـە زانیاریـی کتێـب (قورئـان) و زانیاریـی ناسیخەکەی و مەنسووخەکەی و، تایبەتەکـەی و گشـتییەکەی و، ئەدەبـەکانی و، شـارەزابێ بـە سـوننەتەکانی پێغەمبـەری خـوا (علیه الصلاة والسلام) و بـە قسـەکانی زانایـان هی پێشـێ و هـی دوایە، [کۆن و تـازە]و زانابـێ بـە زمـانی عەرەبـان و، عاقـڵ بـێ و، ئـەو شـتانەی کـە وێک دەچـن، لێکیـان جیـا بکاتـەوەو، شـارەزای قیـاس بـێ، ئەگـەر یەکێـک لـەو زانیارییانـەی نەبـوون، بـۆی دروسـت نیە بـە قیـاس حوکمێـک هەڵبهێنجێ.

بێگومـان شـارەزابوون لـەوە، کـە چ حوکمێـک لابـراوەو، چ حوکمێـک ئـەو حوکمـەی لابـردوە، پێویسـتە، کـە ئێمـە لـە قورئانـدا ئەوەمـان نیـە، بـەڵام بێگومـان لـە سـوننەتی پێغەمبـەردا (صلى الله علیه وسلم) هەیـە، پێشـتر چەنـد نموونەیەکـمان هێنانـەوە، بـۆ وێنـە:

(١) - ج١٥ ص١٢٩.

[ كنت نهيتكم عن زيارة القبور، ألا فزوروها فإنّها تذكّركم الآخرة](١).

واتـە: پێشـتر سـەردانی گۆڕسـتانم لـێ قەدەغە کردبـوون، بـەڵام ئێسـتا سـەردان بکـەن، چونکـە ڕۆژی دواییتـان دەخاتـەوە یـاد.

ئنجـا ئەگـەر بێـت و مـرۆڤ ئـاگاداری ناسـیخەکە نەبـێ و، هـەر بـە مەنسـووخەکەوە پابەندبـێ، ناپێکـی، ئێسـتا هیچکـەس نابـێ بەهـۆی دەقـە لابراوەکـەوە، خەڵـک قەدەغـە بـکات بچـن بـۆ سـەر گۆڕسـتان، چونکـە دەبـێ ئـاگای لەوەبـێ کـە دوایـی پێغەمبـەر - (صـلی اللـه علیـه وسـلم)-، ڕێـگای پێـداوە، پێشـێ بۆیـە فەرموویـەتی سـەردانی گۆڕسـتان مەکـەن و لێـی قەدەغـە کـردوون، چونکـە خەڵـک لـە خـاوەن گـۆڕەکان پاڕاوەتـەوەو مەزەنـدەی ئـەوەی کـردوە تـووشی شـیرک ببـن، بـەڵام دوای ئـەوەی ئیمان و خواناسـیی و خواپەرسـتیی، یەکتـا پەرسـتیی لـە دڵیانـدا چەسـپاوە، لێیـان دڵنیـا بـووە کـە لەخـاوەن قەبـرەکان ناپاڕێنـەوە، مەگـەر بۆیـان بپارێنـەوە، ئـەو کاتـە ڕێـی داوە!

**سـەرنجی سـێیەم: پێویسـتە بزانـدرێ کـە تەنانـەت بـەڕای ئەوانـەش کـە دەڵێـن: مەنسـووخ هەیـە لـە قورئانـدا، یەکجـار کـەم و سـنووردارە:**

هەرچەنـدە زۆر بەداخـەوە لەوبـوارەدا، هەندێـک لـە زانایـان زێدەڕۆیی زۆریان کـردوە.

بـۆ وێنـە: هەندێـک لـەو زانایانـەی ڕایـان وایـە قورئـان ئایـەتی تێـدا هـەن نەسـخ کرابنـەوە، شـتی وایـان گوتـوە نەسـخ بووەتـەوە، کەهەرگیـز نەسـخی بەسـەردا نایـەت، بـۆ نموونـە: خـوا لەسـوورەتی (البقـرة) ـ ٣ ـ دا دەفەرمـوێ:

---

(١)- رواه مسلم : ٩٧٧ ، والنسائي: ٢٠٣٢ .

﴿ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾ البقرة: ③ .

واتە: لەوەی پێیانداون، دەبەخشن.

یەکێـک لـە زانایـان، یـان هەندێکیـان گوتوویانـە: ئـەم ئایەتـە نەسـخ کراوەتـەوە بـە فەڕزکـرانی زەکات!

کـە ئەمـە شـتێکی زۆر بـێ مەعنایـە! خـوا مەدحـی کەسـانێک دەکات بـەوە کـە: لـەوەی کـە پێـیان داون دەبەخشـن، ئنجـا بگوتـرێ: دوای ئـەوەی زەکات فەڕزکـراوە، ئـەوە نەسـخ کراوەتـەوە، یـانی: ئێسـتا بـا نەبەخشـن!

هەروەهـا هەندێـک کتێـب لەوبـارەوە هـەن، کـە زۆر زێـدە ڕۆییـان کـردوە، یەکێـک لەوانـە کتێبێکـی: (محمـد بـن حـزم) بەنـاوی (الناسـخ والمنسـوخ)، یەکـی دیکـە لەوانـە: (هبـة اللـه ابـن سـلامة)یە، یەکـی دیکـە، (مرعـي الكرمي)یـە، کـە هـی وایـان هەبـووە گوتوویـەتی: [آيـة السـيف نسـخت خمسـائة آيـة]. واتـە: ئایـەتی شمشـێر، پێنجسـەد ئایـەتی لابردوەو نەسـخکردۆتەوە، ئنجـا ئایـا کامانـەن ئـەو ئایەتانـەی لابـراون؟ هەمـوو ئـەو ئایەتانـەی بـاسی ئـەوە دەکـەن: سـەبربگرە، چاوپۆشـیی بکـە، لێبـوردن بکە، ڕوو وەرگێـڕە لـە نەفامـان، گوتوویانـە: ئەوانـە هەموویـان نەسـخ بوونـەوە، بـە چیـی؟ بـە ئایـەتی (سـيف) لـە حاڵێکـدا وشـەی (سـيف) لـە قورئانـدا هـەر نیـە، کـە مەبەسـتیان پێـی ئایـەتی ژمـارە پێنجـە لەسـوورەتی (التوبة) دا کـە دەفەرمـوێ:

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ التوبـة: ⑤ .

هەروەها هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست ئایەتی ژمارە (٢٩) یە:

﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ

ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴾ التوبة: ٢٩ .

بـەڵام لـە ڕاسـتییدا نەئایـەتی ژمـارە (٥) ئـەو واتایـە دەگـەیەنـێ، کـە هەمـوو ئایەتـەکانی کـە فەرمـان دەکـەن بـە خۆشـڕەفتاریی لەگـەڵ هاوبەش بـۆ خـوا دانـەران و بێبڕوایانـدا، نەسـخ کرابنـەوە! نـە ئایـەتی ژمـارە (٢٩)ش ئـەوە دەگـەیەنـێ!

بەڵکـو ئـەوە زێـدە ڕۆیـی بـووە، لەلایـەن ئەوانـەوە، کـە پێیـان وابـووە: قورئـان زۆر ئایـەتی تێـدان نەسـخ کرابنـەوە، کـە لـە ڕاسـتییدا هیـچ ئایەتێـک لـە قورئانـدا نیـە نەسـخ کرابێتـەوەو، دوای ئـەوەی ئێمـە سـتایش بـۆ خـوا، تەفسـیری قورئانمـان تـەواو کـردوە، لـە هیـچ شـوێنێک ناچـار نەبـووم بڵێـم: ئـەم ئایەتـە نەسـخ کراوتـەوە، واتـە: حوکمـی نەمـاوە، یاخـود حوکمەکـەی مـاوە، بـەڵام خوێندنەوەکـەی نەسـخ کراوەتـەوە!

**سـەرنجی چـوارەم: بێگومـان ئۆممـەتی پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) پابەنـد کـراوە، بـە هەمـوو دەقـەکانی قورئانـەوەو بـە ڕێبـازی پێغەمبـەرەوە (علیـه الصلاة والسلام) کـە چەسـپاون، مەگـەر ئـەوەی بۆمـان سـاغ بووبێتـەوە کـە لـە دەقـەکانی سـوننەت لابـراوە، یاخـود نەسـخ کراوەتـەوە:**

بەڵـێ هیچکـەس بـۆی نیـە لەبەرانبـەر هیـچ ئایەتێکـداو، لەبەرانبـەر هیـچ دەقێکـی سـوننەتدا، بوەسـتێ و بڵـێ: باسـاغی بکەمـەوە: داخـۆ نەسـخ کراوەتـەوە، یـان نەسـخ نەکراوەتـەوە؟ لەبـارەی قورئانـەوە، قورئـان هیـچ ئایەتێکـی مەنسـووخی تێـدا نیـە، لەبـارەی سـوننەتی پێغەمبەریشـەوە (صـلی اللـه علیـه وسـلم)، زانایـان ڕوونیـان کردۆتـەوەو، پێغەمبـەر - علیـه

الصلاة والسلام - جاری وا هەبووە، هەر بۆ خۆی ڕوونی کردوەتەوە بۆ وێنە: [کنت نهیتکم عن زیارة القبور ألا فزوروها، وکنت نهیتکم عن آدِّخار لحوم الأضاحي من أجل الدافّه[1]، فکلوا وادخروا وأمسکوا].

هەر لە هەمان سیاقدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوونی کردۆتەوە، کە ئەوەی پێشێ کاری پێ ناکرێ وکاتی خۆی حیکمەتێک بووە، کە ئەو فەرمانەی کردوەو دوایی لایبردوە.

خوا - سبحانه وتعالی - فەرمانی بە ئێمە کردوە شوێن ئەوە بکەوین کە دایبەزاندوە: (إتبعوا ما أنزل الیکم من ربکم) الأعراف ـ ٣ ـ.

ئنجا ئەوە کە خوا دەفەرموێ (شوێن ئەوە بکەون کە لە خوای پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێندراوە)، ئێمە لێی دڵنیاین ئەوە فەرمایشتی خوایە، ئنجا دەبێ هەمان دڵنیاییمان بۆ پەیدابێ لەبارەی نەسخ کرانەوەی هەر ئایەتێکەوە، ئنجا دەتوانین کاری پێ نەکەین، کە هەرگیزیش ئەو یەقینە پەیدا نابێت، چونکە هەرچی گوتراوە لەو بارەوە، هەمووی دەقی ئاحادە، بەزۆریش لە هاوەڵانەوەن، خوا لێیان ڕازی بێ.

ئنجا زانایان دەڵێن: هەرکەسێک کار بکات بە مەنسووخیش و واز لە ناسیخەکە بێنێ، لەبەر ئەوەی نازانێ، هیچ سەغڵەتیی لەسەر نیە، چونکە خوا دەفەرموێ:

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ البقرة: ٢٨٦ .

بەڵام هەرکاتێک پەی بە لابەر(ناسخ)ەکە برد، دەبێ واز لە لابراوەکە بهێنێ.

(١)- واتە: پێشتر لێم قەدەغە کردبوون گۆشتی قوربانیی پاشەکەوت بکەن و هەڵیبگرن، لەبەر خەڵکی غەوارەی نەدار، کەئەو ساڵە زۆر بوون، تاکو بەشیان بدەن.

**سـەرنجی پێنجـەم: حـەوت نموونـە لـەو ئایەتانـەی بـە مەنسـووخ دانـراون و، وانیـن :**

لـە کۆتایـی ئـەم تـەوەرەدا، (هەبـوون و نەبـوونی نەسـخ لـە قورئانـدا)، دەپرسـم: کـوان ئـەو ئایەتانـەی مەنووسـخن، چ ئایەتێـک لـە قورئانـدا، زانایـەک دەتوانـێ بەدڵنیاییـەوە بڵـێ: ئـەم ئایەتـە کاری پـێ ناکـرێ و مەنسـووخە؟.

واتـە: خوێندنەوەکـەی مـاوە، بـەڵام حوکمەکـەی کاری پـێ ناکـرێ؟، چونکـە ئـەوەی کـە خوێندنـەوەو حوکمـی نەسـخ بووبێتـەوە، ئـەوە ئێمـە نایزانیـن و لـە قورئانـدا نیـە، ئـەوەش کـە خوێندنـەوەی نەمابێـت، بـەڵام حوکمەکـەی مابـێ، وەک باسـمانکرد، ئـەوە شـتێکی ئەفسـانەیە، ئێمـە ناتوانیـن حوکمێـک پاڵدەینـە لای قورئـان، کـە قورئـان هەمـووی بـە تەواتـور بـە ئێمـە گەیشـتوە، چـۆن دەتوانیـن حوکمێـک پاڵدەینـە لای قورئـان، کـە لـە ڕێـی ئاحـادەوە بـە ئێمـە دەگا؟.

دەمێنێتـەوە ئـەوە کـە شـتێک لـە قورئانـدا، بێژەکـەی مابـێ، بـەڵام حوکمەکـەی لاچووبـێ، ئنجـا بـا تەماشـا بکەیـن: داخـۆ شـتی ئـاوا لـە قورئانـدا هەیـە؟!

لە سوورەتی (البقرة) چوار نموونەیان هێناوەتەوە:

**نموونـەی یەکـەم:** ئایـەتی ژمـارە (١٨٠)، کـە خـوا (سُبحانه وتعـالی) دەفەرمـوێ:

﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ البقـرة: ١٨٠

واتـە: لەسـەرتان پێویسـت کـراوە، هەرکاتێـک یەکێکتـان مـردنی لـەلا ئامادەبـوو، (واتـە: گەیشـتە حاڵـەتی سـەرەمەرگ، یـان زانی دەمـرێ)

ئەگـەر سـامان و ماڵـی بەجـێ دەهێشـت، کـە وەسـییەت بـکات بـۆ بـاب و دایـکان و بـۆ خزمـان، بەشـێوەیەکی پەسـەند، ئەمـەش مافێکـە لەسـەر پارێـزکاران.

پێشـتریش لەوبـارەوە قسـەمانکرد، گوایـە ئـەو دەقـەی پێغەمبـەر (علیـه الصـلاة والسـلام) کـە دەفەرمـوێ:

(قد أعطى اللّٰهُ كلَّ ذي حقٍّ حقَّه، فلا وصية لوارث)[1].

گوایـە ئـەم دەقـەی سـوننەت، حوکمـی ئایەتەکـەی لابـردوە، یاخـود هەندێـک گوتوویانـە: ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (النسـاء) کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾ النساء: ١١.

گوایە ئەم ئایەتە، حوکمی ئەوەی (البقرة)ی لابردوە!

دەڵێیـن: ڕاسـتە زانایـان هەندێکیـان وایـان گوتـوە، بـەڵام زانـای دیکـەش هـەن گوتوویانـە: نەخێـر وانیـە، بـۆ وێنـە: (عبدالرحمـن بـن نـاصر السـعدي) لەوبـارەوە دەڵـێ: [واعلـم أن جمهـور المفسريـن يرون أن هـذه الآية آيـة منسـوخة بآيـة المواريـث، وبعضهـم يـرى أنهـا في الوالديـن والأقربيـن مـن غـير الوارثـين، مـع أنـه لم يـدل عـلى التخصيـص بذلـك دليل والأحسـن مـن هـذا أن يقـال: إن هـذه الوصيـة للوالديـن والأقربـين مجملـة وردَّهـا اللـه إلى العـرف الجـاري)[2].

دەڵـێ: زۆربـەی ڕوونکـەرەوانی قوڕئـان پێیـان وایـە، ئەم ئایەتە نەسـخ کراوەتـەوە بـە ئایـەتی میراتـەکان، هەندێکیـان گوتوویانـە: ئـەم ئایەتـە لەبـارەی ئـەو دایـک و بابانـەو ئـەو خزمانەوەیـە کـە میـرات وەرناگـرن، بـەڵام هیـچ بەڵگەیـەک لەسـەر ئـەوە نیـە کـە چەمکـی ئـەم ئایەتـە تایبـەت بـکات بـەوەوە، باشـتر لـەوە ئەوەیـە کـە بگوتـرێ: ئـەم وەسـییەتکردنە بـۆ

---

(١)- أخرجه أحمد (٢٦٧/٥) و أبوداود: ٢٨٧٠ و ٣٥٦٥. والترمذي: ٢١٢٠ وابن ماجه: ٢٧١٣.
(٢)- تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنّان، ص٨٥.

دایـک و بابـان و بـۆ خزمـان، بـە کورتیـی هاتـوەو، خـوا (سُـبحانه وتعـالى) گێڕاویەتـەوە بـۆ ئـەوە کـە بـە پەسـەند دەزانـرێ لـە بـاوی خەڵـک دا.

واتـە: خـوا بـە کـورتی فەرموویەتیـی: بـاب و دایـك و خزمـان وەسـییەتیان بـۆ بکـەن، بـەڵام دوایـی ئـەو بـاب و دایکانـەی کـە میـرات دەگـرن و میراتیـان بـۆ دیارییکراوە، هەڵاوێـردراون، بەڵام بـاب و دایکانێـک، کـە میـرات ناگـرن، ئەگـەر بێبڕوابـن، یـان بـە هـەر هۆیەکـی دیکـەوە، هەروەهـا خزمانێـک کـە میـرات ناگـرن، وەسـییەتەکە دەیانگرێتـەوە.

کەواتە: ئەم وەسـییەتە هەر لەجێی خۆیەتی، چ مەبەسـت ئەوەبێ کەلێرەدا بەکورتیـی هاتـوە: دوایـی لـەوێ ڕوون کراوەتـەوە، چ مەبەسـت ئەوەبێ ئەو بـاب و دایـک و ئـەو خزمانـەی کـە میـرات ناگـرن، وەسـییەتیان بـۆ بکرێ، چ ئەگـەر میراتیـش بگـرن، وەک لـە تەفسـیری سـووڕەتی (ئەلبەقـەڕەدا) باسـمکردوە، دەگونجـێ میراتیش بگرن، بەڵام وەسییەتیشـیان بـۆ بکرێ، زیاد لـە بەشـەکەی خۆیـان ، کـە وەک میـرات دەیگرن، بابـای وەسـییەتکەر بۆی هەیـە لـە سـێیەکی ماڵەکەشی دا، وەسـییەت بـکات، چ بۆ بـاب و دایکی، چ بـۆ خزمانی کـە دەزانـێ نـەدار و ئاتاجن.

ئەمـە نموونـەی یەکـەم، کە بەدڵنیایی هیـچ بەڵگەیەک نیە لەسـەر ئەوە کە مەنسووخە.

**نموونـەی دووەم:** ئایـەتی ژمـارە (١٨٤) لـە سـووڕەتی (البقـرة) کـە پێشـتریش باسـانکرد، خـوای موتەعـال دەفەرمـوێ:

﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقـرة: ١٨٤ .

ئەمـە هەندێـک لـە زانایـان وایـان لێکداوەتـەوە، کـە ڕۆژووی مانگـی ڕەمـەزان، ئەوانـەی دەتوانـن بیگـرن، بـا فیدیـە بـدەن، گوایـە: ئەمـە نەسخ

کراوەتەوە بە ئایەتی دوایی کە دەفەرموێ:
﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾ البقرة: ١٨٥ .
لەو بارەوەش هەندێک ڕیوایەت دێنن.
بەڵام کە تەماشای ئایەتەکە دەکەین، زۆر بەڕوونیی دیارە کە مەبەست پێی ئەوە نیە، چونکە خوا دەفەرموێ:
﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ﴾ البقرة: ١٨٤ .
واتە: ئەوانەی (يطيقونه)، قەرەبوویەک خواردنی نەدارێکیان لەسەرە.
نەیفەرمووە بە ڕۆژوو مەبن، (يطيقونه)ش زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: بەقورسیی و زەحمەت بۆیان دەکرێ (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) دەڵێ: (أي يتكلّفونه ويشقُّ عليهم مشقَّةً غير محتملة كالشيخ الكبير) دوایی دەڵێ : (وهذا هو الصحيح)[1].
واتە: (يطيقونه) بە مانای ئەوە نیە کە توانایان بەسەردا دەشکێ، بەڵکو یانی: زۆر بە زەحمەت بۆیان دەگیرێ، بە قورسییەک کە تەحەممول ناکرێ، بۆیان دەگیرێ، وەک پیاوی بەتەمەن، ئەوە لە جیاتی هەر ڕۆژێک، قەرەبوویەک دەدا کە بریتییە لە خواردنی نەدارێک، دەڵێ: تەنیا ئەم ڕایەش ڕاستە!.
ئنجا ئایەتەکە ئەگەر تەماشای ڕواڵەتەکەی بکەین، ناگونجێ مەبەست پێی سەرپشک کردن بێ، لە نێوان ڕۆژوو گرتن و قەرەبوودانـدا، چونکە یەکسەر ئایەتەکە دەفەرموێ: (وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين)، نەیفەرمووە: (عليهم الصوم أو فدية طعام مسكين)، بەڵکو یەکسەر دەفەرموێ: ئەوانەی ئیتاقەی دەکەن،

(١)- تيسيرالكريم الرحمن في تفسير كلام المنان. ص٨٦ .

واتـە: زۆر لەسـەریان قـورس و زەحمەتـەو بۆیـان تەحەمـول ناکـرێ، ئـەوە بـا قەرەبـوو بـدەن، خـواردنی نەدارێـک، لەجیـاتی هـەر ڕۆژێـک.

﴿ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ﴾ البقرة: ١٨٤ .

هەرکەسێک زیاتریـش لـە خواردنـی نەدارێـک بـدات، خـۆ بەخشـانە، ئـەوە بـۆ ئـەو باشـترە.

﴿ وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة: ١٨٤ .

ئەوەنـدەی بۆشـتان بگونجـێ، ئەگـەر بەڕۆژووبـن بـۆ ئێـوە باشـترە، ئەگـەر بزانـن.

کەواتـە: هیـچ بەڵگەیـەک نیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەم ئایەتـەی، پێشـێ، مەنسـووخ بـێ و، ئایـەتی دوایـی نەسـخی کردبێتـەوە.

**نموونـەی سـێیەم:** لـە سـوورەتی (البقـرة) دا هـەردووک ئایەتـەکانی (٢٣٤) و (٢٤٠) ن، کـە خـوا (**سُبحانه وتعـالى**) باسـی عیددەی ئافـرەت دەکا کـە مێردەکـەی مـردوە (عـدّة المتـوفى عنهـا زوجهـا)، کـە ئایـەتی پێشـێ، ئایـەتی (٢٣٤) بـەو شـێوەیە هاتـوە:

﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِىٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ البقـرة: ٢٣٤ .

واتە: ئەو پیاوانەتان کە کۆچیان پێ دەکرێ (دەمرێنرێن) و ژنانێک بە جێدەهێڵن، ئەو ژنانە چاوەڕێی خۆیان دەکەن، چوارمانگ و دە شەو، هەرکاتێک گەیشتنە کاتی خۆیان، گوناحتان ناگاتێ لەوەدا کە لەبارەی خۆیانەوە بیکەن (خۆیان بڕازێننەوەو بەتەمای شووکردنەوەبن) بەشێوەیەکی پەسەند، خواش بەوەی دەیکەن، شارەزایە.

هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە هەرچەندە پێشێ هاتوە، بەڵام

ئایەتی ژمارە (٢٤٠)ی نەسخ کردوەتەوە، کە خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٤٠ .

واتـە: ئەوانەتـان، کـە دەمرێنرێـن و ژنانێـک بەجێدێڵـن، بـا وەسـییەت بـۆ ژنەکانیـان بکـەن، کـە مـاوەی سـاڵێک بەهرەمەنـد بکرێـن (لـەو مـاڵ و حاڵـەی ئـەو مێـردەی کۆچـی دوایـی کـردوە) و دەرنەکرێـن لـەو ماڵـە، بەڵام کاتێـک، کـە دەرچوون، ئێـوە هیچ گوناحتان لەسـەر نیە لەوەدا، کـە لەبارەی خۆیانـەوە دەیکـەن، بەشـێوەیەکی پەسـەندو، خـواش زاڵـی کارزانە.

هەندێـک گوتوویانـە: ئایـەتی ژمـارە (٢٣٤) هەرچەنـدە پێشـێ هاتـوە، بـەڵام ئـەم ئایـەتی ژمـارە (٢٤٠)ی کـە لـە ڕیزبەندیـی ئایەتەکانـدا لـە دوای ئەوەوەیـە، نەسـخ کردوەتـەوە!

بـەڵام ئەگـەر تەماشـای ئایەتـەکان بکەیـن، زۆر بەڕوونیـی دیـارە، کـە ئایـەتی ژمـارە (٢٣٤) ئیلزامییـە، کـە ئافـرەت مێـردی مـرد، دەبـێ (چـوار مانـگ و دە) شـەو چـاوەڕێ بـکات، بـەڵام ئایـەتی ژمـارە (٢٤٠) واتـە: زیاد لـە چوارمانـگ و دە شـەوەکە، ئافرەتەکـەی پێوە مولـزەم نەکـراوەو، مێردەکە وەسـییەت دەکات، کـە ئـەو ژنـە لـە ماڵەکەیـدا بمێنێتـەوە، تاکـو مـاوەی سـاڵێک.

واتـە: ئەمـە شـتێکی خۆ بەخشـانەیە، بـە وەسـییەت کـردن لـە لایـەن مێردەکـەوە، کـە خەریکـە کـۆچ دەکات و، لـە لایـەن خزمەکانیـەوە، کـە ئەو ژنـە لـەو ماڵەدا بهێڵرێتـەوە، تاکو سـاڵێک، ئنجـا دوای سـاڵەکە، بۆیان هەیە بڵێـن: ژنەکـە کەیفـی خۆیـەتی دەچێتـەوە لای کـەس و کاری، یـان شـوو دەکاتـەوە.

(عبدالرحمن بن ناصر السعدي) دەڵێ: زۆربەی ڕوونکەرەوان گوتوویانە: ئەم ئایەتەی ژمارە (٢٤٠) نەسخ کراوتەوە، بە ئایەتی ژمارە (٢٣٤)، کە چوار مانگ و دە شەوی داناوە، بەڵام دوایی دەڵێ: [وقيل: لم تنسخها بل الآية الأولى دلَّ على أربعة أشهر وعشر واجبة وما زاد على ذلك مستحبّة ينبغي فعلها، تكميلاً لحق الزوج ومراعَاتاً للزوجة، والدليل على أن ذلك مستحبٌّ، أنه هنا نفي الجناح على الأولياء إن خرجن، قبل تكميل الحول، فلو كان لزوم المسكن واجباً، لم يَنْفِي الحَرَج عنها[1].

واتە: گوتراویشە: ئایەتی ژمارە (٢٣٤) ئەم ئایەتەی نەسخ نەکردۆتەوە، بەڵکو ئایەتی یەکەم ئەوە دەگەیەنێ، کە چوار مانگ و دە شەو واجبە، لەسەر ئەو ئافرەتە چاوەڕێ بکا، دوای ئەوەی مێردی کۆچی دوایی کرد.

بەڵام لە چوار مانگ و دە شەوەکە زیاد، بۆ ئافرەتەکە پەسەندەو، وا باشە ساڵەکە تەواو بکات، هەم وەک ڕەچاوکردنی مافی مێردەکەی و هەم هی ژنەکەش، بەڵگەش لەسەر ئەوەکە شتێکی پەسەندە، ئەوەیە:کە لێرە فەرموویەتی: (فلا جناح عليكم)، گوناحتان ناگاتێ.

واتە: ئەی خزمانی مێردە مردووەکە، ئەگەر ئەو ئافرەتە بەر لەوەی ساڵەکە تەواوبێ، بچێتە دەریش، ئێوە گوناحتان ناگاتێ، ئنجا ئەگەر واجب بوایە، ئافرەتەکە ماوەی ساڵێک بمێنێتەوە لە ماڵی مێردیدا، ئەوە بێگومان نەیدەفەرموو: (فلا جناح عليكم). گوناحتان ناگاتێ.

کەواتە: ئەمەیان پەسەندو سوننەتەو، ئەوەی ئایەتی ژمارە (٢٣٤) یش واجبەو، هیچ تێکگیرانێک نیە.

پێشتریش گوتمان: یەکێک لە مەرجەکانی نەسخ، ئەوەیە: کە

---

(١)- تيسير الكريم المنّان في تفسير كلام المنان. ص ١٠٦.

ئایەتـەکان (ناسـخ و منسـوخ) تێکبگیرێـن، بـەڵام لێـرەدا هیـچ جـۆرە تێکگیرانێـک نابینیـن.

**نموونـەی چـوارەم:** هـەر لـە سـوورەتی (البقـرة)دا کـە پێشـتریش قسـەمان لێکـرد، ئایـەتی ژمـارە (٢٨٤)ە، کـە خـوا دەفەرمـوێ:

﴿لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقـرة: ٢٨٤

گوایە ئەمە نەسخ کراوەتەوە بە ئایەتی ژمارە (٢٨٦) کە دەفەرموێ:

﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ البقرة: ٢٨٦

گوایـە ئـەم ئایـەتی (٢٨٦) ئایـەتی ژمـارە (٢٨٤) نەسـخ کردوەتـەوە کـە پێشـتریش قسـەمان لێکـرد، بـەڵام بەدڵنیایـی لێرەشـدا نەسـخ لـە ئـارادا نیـە، بەڵکـو وەک لێکۆڵـەرەوان لـە ڕوونکـەرەوانی قورئـان گوتوویانـە: ئەمـە ڕوونکردنـەوەی نـاڕوون و کورتـە (تبیـین الْمُجْمَـل) ە.

(عبدالرحمن بن ناصر السعدي) جوان دەڵێ:

(لما نـزل: وإن تبـدوا مـا في أنفسـكم أو تخفـوه يحاسـبكم بـه اللـه)، شـق ذلـك عـلى المسـلمين لمـا توهَّمـوا أن مايقـع في القلـب لازمـة، والعارضـة المسـتقرة بهـا وغيرهـا مؤاخَـذُون بهـا، فأخبرهـم بهـذه الآيـة: لايكلـف اللـه نفسـا إلا وسـعها، أي تَسَـعُهُ طاقَتُهـا ولا يكلّفهـا مايشـقّ عليهـا)[1].

واتـە: کاتێـک ئایەتـی پێشـێ دابـەزی، هەندێـک لـە هـاوەڵان پێیـان وابـووە، ئـەوەی دەکەوێتـە دڵ، لـەو شـتانەی لـە دڵـدا دەچەسـپن، یاخـود خەیاڵێکـی خراپـە بەدڵـدا دێ، پێیـان وابـوو لەسـەر هەمـووی

(١)- تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، ص ١٢٠.

لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەکرێ و سزا دەدرێن، بەڵام خوا بەم ئایەتە بۆی ڕوونکردنەوەو هەواڵی پێدان، کە لەسەر هیچ کەس پێویست ناکات، جگە لەوەی کە لە توانایدا هەیە، ئەوەش لە توانای مرۆڤدا نیە کە هیچ غایلەو خەتەرەیەکی خراپی بەدڵدا نەیەت، کەواتە: ئەوە عەفووی بەسەردا دێ، بەڵام لەسەر ئەوە سزا دەدرێ کە لە دڵدا دەچەسپێ، ئەو نیەت و عەزم جەزمکردنانە کە لە دڵدا دەچەسپن، مرۆڤ لەسەر ئەوە سزا دەدرێ.

**نموونەی پێنجەم:** لە سوورەتی (النساء)دا ، کە دوو ئایەتەکانی ژمارە (١٥) و (١٦) ن، کە خوا (**سُبحانه وتعالى**) دەفەرموێ:
﴿ وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ١٥ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ١٦ ﴾ النساء.

پێم وایە زۆر لە ڕوونکەرەوانی قورئان، - وەک من لە تەفسیری سوورەتی (النساء) دا بە تەفسیل قسەم لەو دوو ئایەتە کردوە، لە لێکدانەوەی ئەم دوو ئایەتەدا بە هەڵەدا چوون، کە گوتوویانە: ئایەتی ژمار (١٥) مەبەستی ئافرەتانێکە کە زینا دەکەن، [واللآتي يأتين الفاحشة من نسائكم، فاستشهدوا عليهن أربعة منكم]، ئەو ئافرەتانەی فاحیشە دەکەن لە ئافرەتەکانتان، چوار لە خۆتانیان بەسەرەوە بەشایەت بگرن، (فإن شهدوا)، ئنجا ئەگەر شایەتییاندا، [فأمسكوهن في البيوت]، لە ماڵەکاندا حەپسیانبکەن، [حتى يتوفاهن الموت أو يجعل الله لهن سبيلا]، هەتا مردن دەیانمرێنێ، یاخود خوا ڕێیەکیان بۆ دەکاتەوە.

بەڵام وەک لە تەفسیری سوورەتی (النساء) دا باسمانکردوە: (فاحشة)

لێرەدا مەبەستی پێ زینا نیە، چونکە خوا فەرموویەتی: [واللآتي يأتين الفاحشة من نسائكم فاستشهدوا]، ئەو ئافرەتانەی فاحیشە دەکەن بەتەنیا، باسی بەرامبەرەکانیان نەکراوە، ئافرەتانێک کە بە تەنێ فاحیشە دەکەن، واتە: خۆ لێک خشاندن (سحاق) و (مساحقة) دەکەن کە ئەمەش جۆرێکە لە لادانی جینسیی، وەک چۆن لە نێوان پیاواندا نێر بازیی هەیە، لەنێوان ئافرەتانیشدا خۆ لێکخشاندن هەیە، لێرەدا باسی ئەوەیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی وا دەکەن، چوار پیاویان لەسەر بە شایەت بگرن، ئنجا ئەگەر شایەتییاندا، سزایەکەیان ئەوەیە لە ماڵێدا بیانهێڵنەوەو حەپسیانبکەن، هەتا دەمرن یاخود خوا ڕێیەکیان بۆ دەدۆزێتەوە، واتە: تاکو تەوبە دەکەن و، لێیان دڵنیا دەبن کە جارێکی دیکە ئەوە دووبارە ناکەنەوە.

بەڵێ بێگومان ئەمە هیچ پەیوەندیی بە زیناوە نیە، چونکە ئەگەر ئافرەتانێک زینا دەکەن، ئەدی کوا سزای پیاوەکانی زینایان لەگەڵ کردوون، چونکە زینا بە تەنێ ناکرێ؟! بەڵام موساحەقە لە نێوان ئافرەتاندا دەکرێ، [واللآتي يأتين الفاحشة من نسائكم]، ئەوانەی لە ئافرەتانتان فاحیشە دەکەن، واتە: خۆیان لێک دەخشێنن.

ئایەتی ژمارە (١٦)ش: [واللذان يأتيانها منكم]، هەروەها ئەو دوو پیاوەتان کە دەیکەن، واتە: ئەوانیش پێکەوە فاحیشە دەکەن، کە بریتییە لە نێربازیی، [فآذوهما]، ئازاریان بدەن، سزایان بدەن، [فإن تابا وأصلحا فأعرضوا عنهما]، ئنجا ئەگەر گەڕانەوەو چاکسازییانکرد، خۆیان چاککرد، وازیان لێ بێنن، [إن الله كان تواباً رحيماً]، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری میهرەبانە.

**نموونەی شەشەم:** نموونەیەکی دیکە، هەردووک ئایەتی ژمارە (٦٥) و (٦٦)ن، لە سوورەتی (الأنفال)، کە خوا **(سُبحانه وتعالى)** دەفەرموێ:
﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ الأنفال.

ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە، ئایەتی ژمارە (٦٦) ئایەتی ژمارە (٦٥)ی نەسخکردۆتەوە! بەڵام بێگومان هیچ نەسخ لە ئارادا نیە، خوا **(سُبحانه وتعالى)** لە ئایەتی ژمارە (٦٥) دا دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەر! بڕواداران هان بدە لەسەر جەنگ و فیداکاریی لە پێناوی خوادا، ئەگەر ئێوە بیست (جەنگاوەر) ی خۆڕاگرتان هەبن، بە سەر دووسەددا زاڵ دەبن لە بێبڕوایان و، ئەگەر سەدتان هەبێ (هی خۆڕاگر) بەسەر هەزاردا زاڵ دەبن، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە نافامن.

ئا ئەوە لە حاڵێکدا بووە، کە بڕواداران جۆری ئیمانەکەیان جۆرێکی مەحکەم بووە، وەک ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێن، دوایی خوا دەفەرموێ: (الآن خفف الله عنكم)، ئێستا خوا لەسەری سووککردن، [وعلم أن فيكم ضعفاً]، زانی کە بێ هێزییتان تێدا هەیە، ئنجا مادام لە جۆری ئیمانەکەیان دابەزیوە، خوا حوکمەکەی لەسەر سووککردوون، کە دەفەرموێ: [فإن يكن منكم مائة صابرة يغلبوا مائتين وإن يكن منكم ألف يغلبوا ألفين بإذن الله والله مع الصابرين]، ئنجا ئەگەر سەدی خۆڕاگرتان هەبێ، بەسەر دووسەددا زاڵ دەبن، لە بێبڕوایان و ئەگەر هەزارتان هەبن، بەسەر دوو هەزاردا زاڵ دەبن، خواش لەگەڵ خۆڕاگران دایە.

ئێمـە دەڵێیـن: ئایـەتی دووەم، ئایـەتی یەکەمـی نەسـخ نەکردۆتـەوە و، ئێسـتاش مسـوڵمانان ئەگـەر هێـزو پێزیـان هەبـێ، بـا یـەک بـە دە بـن، دە (١٠) مسـوڵمان لەبەرانبـەر سـەد بێبـڕوادا بـەر هەڵسـتیی بکـەن و، سـەد لەبەرابـەر هـەزاردا، ئیـدی لـەو نێوانەشـدا، بـەڵام ئەگـەر کوالێتیـی و جۆری ئیمانەکەیـان دابـەزی، ئـەو کاتـە خـوا لەسـەری سووککردوون، کـە یـەک بـە دوو بـێ، یـەک بـە دەیەکـەش هـەر هەیـە، یـەک بـە دووەکـەش هـەر هەیـە، یـەک بـە دەیەکـە لـە حاڵێکـدا کـە بـڕواداران ئیمانێکی باشـیان هەبـێ و، بەهێزبـن و بـە پێزبـن، بـا یـەک بـە دە بەرهەڵسـتیی بێبڕوایـان بکـەن!!

بـەڵام ئەگـەر بـەو شـێوەیە نەمـان، دەبنـەوە بـە یـەک بـە دوو، بەڵکـو جـاری وا هەیـە نـەک یـەک بـەدوو، بگـرە دە بـە یەکیـش نابن، وەک ئێسـتا مسـوڵمانان لـە هەمـوو دنیـادا بـە ملیـارو نیوێـک زیاتـر مەزەنـدە دەکرێـن، بـەڵام ناتوانـن بەرهەڵسـتیی چەنگێـک لە جوولەکـەکانی زایۆنیسـت بکەن، کـە دووەمیـن قیبلـەو سـێیەمین حەڕەمیـان لـێ زەوت و داگیرکـردوون!!

**نموونـەی حەوتـەم:** نموونەیەکـی دیکە دێنینەوە لەبارەی ئـەو ئایەتانەوە کـە هەندێـک لە زانایـان بەڵکو زۆریان، بە نەسـخکەرەوەو لابەریـان داناون، بـۆ ژمارەیـەک لـە ئایەتـەکان، بە تایبەت بـە نیسـبەت ئایەتی ژمـارە (٥) لە سـوورەتی (البراءة ،التوبة).

ئـەو ئایەتـە موبارەکە کە زۆرێـک لە زانایان ناویان ناوە: (آیة السـیف)، ئایـەتی شمشـێر، لـە حاڵێکـدا کە وشـەی شمشـێر لە قورئانـدا هـەر نەهاتوە، بەڵکـو وشـەی (أسـلحة) هاتوە، کـە کۆی سـیلاحە، واتە: چەک.

ئنجـا شمشـێربێ، تیروکەوانبـێ، ڕمبـێ، تفەنگبـێ، تۆپبـێ، سـاڕۆخبێ، هەرچـی بـێ دەیگرێتـەوە، (أسـلحة) هاتـوە.

کەچـی ئـەم ئایەتـە موبارەکەیـان ناونـاوە: ئایـەتی شمشـێر، زۆر بـە داخـەوەش کـە ملـی ژمارەیەکـی زۆر لـە ئایەتـەکانی قوڕئانیـان پـێ هەڵبڕیـوە، تەنانـەت یەکێـک لـە زانایـان بـە نـاوی (هبـة اللـه بـن سـلامة) کتێبێکـی هەیـە لەبـارەی (الناسـخ والمنسـوخ) ەوە کـە پێشـتریش ئاماژەیەکـمان پێـدا، ئـەو زانایـە دەڵـێ: ئـەم ئایـەتی ژمـارە (٥) لە سـوورەتی (التوبـة) دووسـەدو ئەوەنـدە ئایەتـەی نەسـخ کردوونـەوە! کـە هەمـوو ئـەو ئایەتانـەی باسـی چاوپۆشـیی کـردن و بـە خۆشـخوڵقیی ڕەفتارکـردن لەگـەڵ بێبڕوایانـداو لێبـوردن و سـینە فراوانیی...هتـد دەکـەن: ئەوانـە هەموویـان و، تەنانـەت ئـەو ئایەتانـەی باسـی بانگەوازکـردن بـۆ لای خـوا بـە حیکمـەت و بـە لێزانیـی دەکـەن، گوتوویـەتی: ئـەو ئایەتانـە هەموویـان حوکمەکەیـان لابـراوە، ئـەم ئایـەتی ژمـارە (٥) حوکمـی هەموویـانی لابـردوەو نەسـخ کردۆتـەوە!

بۆیـە بـە باشـمزانی تەماشـای ئـەو ئایەتە بکەیـن، ئەویـش دوای ئەوەی تەماشـای ئـەو سـیاقە دەکەیـن، کـە ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی تێـدا هاتـوە، چونکـە هۆکارێکـی سـەرەکیی بەهەڵەداچـوونی بەشـێک لـە زانایـان لەبـارەی تێگەیشـتنی هەندێـک ئایەتـەوە، دەرهێنانیانـە لـە ڕەوت (سـیاق) ەکانی خۆیـان و دابڕینیانـە!!

هەڵبەتـە ئێمـە قسـەی ڕوون و وردی خۆمـان لەبـارەی ئـەم ئایەتـەو ئایەتـەکانی دیکـەی سـوورەتی (التوبـة)ەوە کردوە، لـە کاتی تەفسـیرکردنی سـوورەتی تەوبـە، (البـراءة)دا لەبەرگـی هەشـتی تەفسـیرەکەماندا، بـەڵام ئێسـتاش بـە بۆنـەی دووبـارە قسـەکردنەوەمان لەبـارەی نەسـخەوە، لێـرە دا بـە بـاشی دەزانـم، سـەرنجێکی کـۆی ئـەو پێنـج ئایەتـە بدەیـن:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۝١ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ
أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ۝٢ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ
وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ
فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ۝٣ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟
عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ۝٤ فَإِذَا ٱنسَلَخَ
ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ
كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ
رَّحِيمٌ ۝٥﴾ التوبة.

ئەمە کۆی ئەو پێنج ئایەتەیە کە ئایەتی پێنجەمیان وەک گوتمان ناونراوە: (ئایەتی شمشێر) و، بە لابەرو بەتاڵکەرەوەی حوکمی ژمارەیەکی زۆر لە ئایەتەکانی قورئانیان داناوە!

ئنجا ئێمە سەرەتا ڕاستە مانای ئەم پێنج ئایەتە موبارەکە دەکەین، خوا -(سُبحانه وتعالى)- دەفەرموێ:

﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ التوبة: ۝١ .

واتە: ئەمە دوورییە لە خواو لە پێغەمبەرەکەیەوە، بۆ ئەوانەی پەیمانتان لەگەڵ دا بەستوون، لە هاوبەش بۆ خوا دانەران.

﴿ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ ﴾ التوبة: ۝٢

بە زەویدا بڕۆن ماوەی چوار مانگان (ئەی هاوبەشدانەرە هاوپەیمانە پەیمانشکێنەکان!.

﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ﴾ التوبة: ۝٢

بشزانن، کە ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین.

﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ التوبة: ٢

بە دڵنیایی خواش بێبڕوایان زەبوون و سەر شۆڕ دەکا.

﴿ وَأَذَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ ﴾ التوبة: ٣

ئەمەش ڕاگەیاندنێکە لە خواو لە پێغەمبەرەکەیەوە، بۆ خەڵک لە ڕۆژی حەجی گەورەدا (کە ڕۆژی عەرەفە بوو لە ساڵی دەیەمی کۆچییدا) .

﴿ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ ﴾ التوبة: ٣

کە خوا و پێغەمبەرەکەی لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دوورن.

﴿ فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ ﴾ التوبة: ٣

ئنجا ئەگەر گەڕانەوە ئەوە بۆ ئێوە باشترە.

﴿ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ ﴾ التوبة: ٣

بەڵام ئەگەر پشتتان کردەوە، بزانن کە ئێوە دەستەوسانکەرنین بۆ خوا.

﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ التوبة: ٣

موژدەش بدە بەوانەی بێ بڕوان بە ئازارێکی بە ئێش.

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا ﴾ التوبة: ٤

جگە لەوانەی کە لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون، دوایی هیچ کەم و کوڕییەکتیان نەبووە، [هیچیان لێ کەم نەکردوونەوە لە پەیمانەکەتان پابەندبوون بە بەڵێن و پەیمانەکەیانەوە].

﴿ وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا ﴾ التوبة: ٤

[ناڕاستەوخۆش] پشتیوانیی هیچ کەسێکیان نەکردوە لە دژی ئێوە.

﴿ فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡ ﴾ التوبة: ٤

ئەوانە تاکو کاتی خۆیان پەیمانەکەیان لەگەڵ تەواو بکەن.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ التوبة: ٤

بە دڵنیایی خوا پارێزکارانی خۆش دەوێن.

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ ﴾ التوبة: ٥

ئنجـا هەرکاتێـک مانگـە قەدەغەکـراوەکان تـەواو بـوون، (واتـە: ئـەو چـوار مانگـەی کـە مۆڵـەت دراوە بـە هاوبـەش بۆخـوا دانـەرەکان، هەڵوێسـتی خۆیـان یەکلایـی بکەنـەوە).

﴿ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴾ التوبة: ٥

ئێـوە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان (کـە پەیـمان شـکێن و بـێ بەڵێنـن) لـە هـەر شـوێنێک بەرپەلتـان کەوتـن بیانکـوژن.

﴿ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ ﴾ التوبة: ٥

بیانگرن و ئابلووقەیان بدەن.

﴿ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ﴾ التوبة: ٥

هەروەها لە هەموو بۆسەیەکدا بۆیان دابنیشن.

﴿ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ﴾ التوبة: ٥

ئنجـا ئەگـەر گەڕانـەوەو نوێژیـان بەرپاکـردو زەکاتیـان دا، ڕێیـان بـەردەن.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ٥

بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

بەسـەرنجدانی ئـەم ئایەتـە موبارەکانـەش، زۆر چـاک دەردەکـەوێ، کـە لێـرەدا خـوا (سُـبحانه وتعـالى) دووریـی خـۆی و پێغەمبەرەکـەی (علیـه الصـلاة والسـلام) ڕاگەیانـدوە لـەو هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـە کـە پەیمانیـان لەگـەڵ پێغەمبـەرو موسـوڵمانان‌دا هەبـووە، بـەڵام پابەنـد

نەبوون بە پەیمانەکانیانەوە، ئەمە ڕاگەیاندنی دوورییە لە لایەن خواو پێغەمبەرەوە، بۆ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی، کە هاوپەیمانبوون لەگەڵ ئەهلی ئیسلامدا، بەڵام پابەند نەبوون، خوا (سُبحانه وتعالى) چوار مانگ مۆڵەتیان بۆ دادەنێ و، ئاگاداریشیان دەکاتەوە، کە ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین و، خواش بێبڕوایان زەبوون و سەرشۆڕ دەکات.

کەدەفەرموێ: چوار مانگ بە زەویدا بڕۆن:﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٍ﴾ التوبة: ٢ واتە: چوار مانگ مۆڵەتە بۆخۆتان بیر بکەنەوە، یان:

١. پابەند دەبن بە پەیمانەکانەوە.
٢. یان مسوڵمان دەبن.
٣. یاخود ئامادەی جەنگ دەبن، دوایی خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ئەمەش ڕاگەیاندنە لە خواو لە پێغەمبەرەکەیەوە بۆ خەڵک، بۆ مرۆڤایەتیی، لە ڕۆژی حەجی گەورەدا، واتە: لە عەرەفاتدا، کە خوا لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دوورە، هەروەها پێغەمبەرەکەیشی (عليه الصلاة والسلام) لێیان دوورە، دوایی دەفەرموێ: (فإن تبتم فهو خير لكم)، ئنجا ئەگەر گەڕانەوە، واتە: لە پەیمان شکاندن گەڕانەوە، بۆ پابەندیی بە پەیمانەوە، ئەوە بۆ ئێوە باشترە، [وإن توليتم]، بەڵام ئەگەر پشتتان هەڵکرد، هەر لەسەر پەیمان شکاندنی خۆتان بەردەوام بوون، [فاعلموا أنكم غير معجزي الله وبشر الذين كفروا بعذاب أليم]، بزانن کە ئێوە دەستەوسانکەری خوا نینو، موژدەش بدە بەبێبڕوایان بە ئازارێکی بە ئێش.

بۆیەش دەڵێین: ئەمە تایبەتە بە هاوبەش بۆ خوا دانەرانێکەوە،

کـە پەیمانیـان هەبـووە لەگـەڵ مسـوڵمانانـدا، بـەڵام پابەنـد نەبـوون بـە پەیمانەکانیانـەوە، چونکـە دوایـی خـوا هەندێکیـان لـێ هەڵدەاوێـرێ و دەفەرمـوێ: [إلا الذيـن عاهدتـم مـن المشركـين]، [ئـەو دووریـی کردنـەی خـواو پێغەمبـەری خـوا (عليـه الصـلاة والسـلام) بـۆ هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرە پەیماندارەکانـە]، جگـە لەوانـەی پەیمانتـان لەگەڵـدا بەسـتوون [ثـم لم ينقصوكـم شـيئا]، دوایـی هیچیـان لـێ کـەم نەکردوونـەوە، واتـە: لـە هیـچ کـەم وکوڕییـان نەبـووە لـە هاوپەیمانیەتییەکەیانـدا، ڕاسـتەوخۆ، [ولم يظاهـروا عليكـم أحـدا]، ناڕاسـتەوخۆش پشـتیوانیی هیـچ کەسیان نەکردوە لـە دژی ئێـوە، ئائەوانـە [فأتمـوا إليهـم عهدهـم إلى مدتهـم]، ئەوانـە چـوار مانـگ مۆڵەتیـان مەدەنـێ، بەڵکـو پەیمانەکەیـان لەگەڵـدا تەواوبکـەن، تاکو کۆتایـی پەیمانەکەیـان، ئنجـا ئەگـەر سـاڵێکە، دوویـە، دەیـە، هەرچەنـدی هەیـە، [إن اللـه يحـب المتقـين] بـە دڵنیاییـش خـوا پارێـزکارانی خـۆش دەوێـن، ئەوانـەی خۆیـان دەپارێـزن لـە پەیـمان شـکاندن.

[فإذا انسـلخ الأشـهر الحرم]، ئەمە لێرەدا مەبەسـت پێی مانگە حەڕامەکان نیـە، واتـە: (رجـب بـە تەنیـاو (ذولقعـدةو ذولحجةو محـرَّم) بەڵکو مەبەسـت ئـەو چـوار مانـگ مۆڵەتەیـە کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرە هاوپەیمانـەکان کـە پابەنـد نەبـوون بـە پەیمانەکانیانـەوە، چـوار مانـگ مۆڵەتیـان دراوە، بـە زەویـدا بـڕۆن و بیربکەنـەوە لـە خۆیـان، ئایـا واز لە پەیـمان شـکێنیی دێنن و پابەنـد دەبـن بـە پەیمانەوە بەڕێـک و ڕاسـتیی، یاخود مسـوڵمان دەبـن، یاخود ئامـادەی جەنـگ دەبـن؟ بۆیـە دەفەرمـوێ (فإذا انسـلخ الأشـهر الحـرم)، ئنجا ئەگـەر چـوار مانگـە جەنـگ تێـدا قەدەغەکـراوەکان تـەواو بـوون، (فاقتلوا المشركـين حيـث وجدتموهم)، المشركيـن، ئەليف و لام (أل)ی سـەر (المشركين) بۆ ناسـاندنە، بـەڵام بـۆ عەهدە.

واتـە: هاوبـەش بۆ خوا دانـەرە پەیمان شـکێنەکان، بە بەڵگـەی ئایەتەکانی پێشـەوە، چونکە خوا (سُـبحانه وتعالی) لە ئایەتی ژمارە چـواردا، ئەوانەی کە پابەنـدن بـە پەیمانەوە، لێی هـەڵاواردوون، (إلاّ الذين عاهدتـم من المشركين ثم لم ينقصوكـم شـيئاً ولم يظاهـروا عليكم أحـداً، فأتموا إليهم عهدهـم إلى مدتهم)، کەواتـە: ئەمـە مەبەسـت پێی ئـەو هاوبەش بۆ خـوا دانەرانەیە کـە هاوپەیمان بـوون، بـەڵام پەیـمان شـکێن بـوون، کەواتـە: (فاقتلـوا المشركـين) یـانی: ئەو هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرە پەیـمان شـکێنانە بکـوژن، (حيـث وجدتموهـم)، لـە هەرشـوێنێک بەرپەلتـان کەوتـن، (وخذوهـم واحصروهـم)، بیانگـرن و ئابڵووقەیانبـدەن، (واقعـدوا لهـم كل مرصـد)، لـە هەمـوو بۆسـەیەکدا بۆیـان دابنیشـن، ﴿فَـإِن تَابُـواْ وَأَقَامُـواْ ٱلصَّلَـوٰةَ وَءَاتَـوُاْ ٱلزَّكَـوٰةَ فَخَلُّـواْ سَـبِيلَهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُـورٌ رَّحِيـمٌ ۝٥﴾ توبـة، ئنجـا ئەگـەر گەڕانـەوەو، نوێژیـان بەرپاکـردو، زەکاتیانـدا، ڕێیـان بـەردەن، بێگومـان خـوا لێبـوردەی بەبەزەییە.

کەواتـە: ئـەم ئایەتـە موبارەکـە ناگونجـێ بڵێیـن: ئـەو ئایەتانەی نەسـخ کردوونـەوە، کـە بـاسی بەچاکـە مامەڵەکردن لەگـەڵ کەسـانێکدا دەکەن، کە بێبـڕوان یـان هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرن، بـەڵام پەیـمان شـکێن نیـن، لەگـەڵ موسـوڵمانانداو، لەگەڵیانـدا تەبـاو ئاشـتییخوازن.

**بەڕێـزان کەواتـە:** لـە هیـچ کام لەو حـەوت نموونەیـەدا، ناگونجـێ بڵێین نەسـخ لـە ئـارادا هەیـە، هەروەهـا هەمـوو ئـەو ئایەتانـەی دیکـە کـە بـاسی ئـەوە کـراوە نەسـخ کرابنەوە، ئێمە لـە درێژەی تەفسـیری خۆمان، [تەفسـیری قورئـانی بـەرزو بەپێـز]دا، هەمـوو ئـەو ئایەتانـە هەڵوەسـتەمان لەبەردەمـدا کـردوون و قسـەمان لـێ کـردوون و، هیـچ دوو ئایەتێـک لـە قورئانـدا نیـن، بڵێیـن، ئـەو دوو ئایەتـە تێـک دەگیرێـن و، ئـەم ئایەتـە ئەوی دیکەی نەسـخ کردۆتـەوەو لابـردوە.

لە كۆتایی ئەم بابەتەدا دەڵێم: بێگومان ئەسڵ لە فەرمایشتی خوادا، ئەوەیە كە خوا فەرمایشتی خۆی دابەزاندوە، تاكو پەیڕەویی لێ بكرێ و، لێی تێبگەین و كاری پێبكەین.

ئەمە ئەسڵەكەیەو، ئەمە ئامانجی دابەزاندنی قورئانە، وەک خوا دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ ص: ٢٩

هەروەها خوا دەفەرموێ:

﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾ الأعراف: ٣

واتە: شوێن ئەوە بكەون كە لە خواوە بۆتان دابەزێندراوەو، شوێن سەرپەرشتیاران و دۆستانی دیكەی جگە لە خوا مەكەون، بە كەمیی پەند وەردەگرن.

بەڵێ ئەسڵ لە قورئاندا ئەوەیە كە ئێمە پەیڕەویی لێ بكەین و شوێنی بكەوین، ئامانجی دابەزێندرانی قورئان ئەوەیە، كەواتە: ئەوە كە فڵان ئایەتە حوكمەكەی نەسخ كراوتەوە، هەرچەندە دەشخوێندرێتەوە!! لە ڕاستییدا ئەمە شتێكی پێچەوانەی سروشتی قورئانە، خواش (سُبحانه وتعالى) هەواڵی پێداوین، دەفەرموێ:

﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴾ فصلت: ٤٢

واتە: (قورئان) پووچیی و ناحەقیی نە لە پێش دەستیەوە، نە لە دوایەوە، ڕووی تێ ناكات، لەلایەن خوای كارزانی ستایشكراوەوە دابەزێنراوە.

هەروەها خوا (سُبحانه وتعالى) ڕایگەیاندوە، كە ئەم قورئانە هەمووی موحكەمەو، هەمووی لە شوێنی خۆیدایە:

﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ الأنعام: ١١٥

واتە: فەرمایشتی پەروەردگارت لە ڕووی ڕاستیی و دادگەرییەوە، تەواوی کردوە، گۆڕان نیە بۆ فەرمایشتی خوا.

بۆیە دوای ئەم برە لێکۆڵینەوەیە، پێم وایە هەرکەسێک کە بە قەناعەت هێنانی پێش بیرکرنەوە، دەست و پێی خۆی نەبەستبن، دەگاتە دڵنیایی کە هەر ئەو ڕایە ڕاستە، کە ئەم موصحەفەی لەبەردەستی ئێمەدایە، ئەم قورئانە بەرزو مەزنە:

١ ـ هیچ ئایەتێکی تێدا نیە، کە بگونجێ بگوترێ: دەخوێندرێتەوە، بەڵام حوکمەکەی نەسخ کراوەتەوە و لابراوە!

٢ ـ یاخود حوکمەکەی ماوە، بەڵام ئایەتەکە خۆی نەسخ کراوەتەوە!!

٣ ـ یاخود: ئەم قورئانە ئایەتانێکی تێدا هەبوون، کە حوکم و خوێندنەوەکەیان نەسخ کراوەتەوە.

هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەر لەسەر ئەوە نیە، هەرچەندە ئێمە زیاتر قسە لەسەر ئەوە دەکەین، کە ئەم قورئانەی ئێستا لەبەر دەستی ئێمەدایە، ئەم موصحەفە، هیچ ئایەتێکی تێدا نیە کە مەنسووخ بێ و کاری پێ نەکرێ!

لە کۆتایی باسی هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئان دا دەڵێین:

زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە دروست نیە هیچ ئایەتێکی قورئان، بەبێ بەڵگەیەکی دڵنیاکەر لە پێغەمبەری خواوە، بە مەنسووخ دابنرێ، بۆ وێنە:

١ـ الشافعي گوتوویەتی: ( ولا يستدل على الناسخ والمنسوخ إلا بخبر عن رسول الله صلى الله عليه وسلم...)[١] واتە: بە هەواڵێک لە پێغەمبەری خواوە نەبێ، بەڵگە لەسەر نەسخ ناهێنرێتەوە.

٢ـ الغـزالي گوتوویـەتی: (لا ينسـخ حكـم بقول الصحابيِّ: نسـخ حكم كذا،

(١)- إختلاف الحديث ج١ ص٤٨٥.

مـا لم يَقُـلْ: سـمعت رسـول اللـه يقول: نسـخت حكـم كـذا... فلعلَّهُ ظـن ما ليس يُنْسَـخُ نسخاً)[١].

واتـە: هیـچ حوکمێـک بەقسـەی هـاوەڵ: فـڵان حوکـم نەسـخ کراوەتـەوە، نەسـخ ناکرێتـەوە، مەگـەر بڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا بـوو دەیفەرموو: فـڵان حوکمـەم نەسـخکردوەتەوە... چونکە ڕەنگە شـتێک کە نەسـخ نەبۆتەوە وایزانیبـێ نەسـخ بۆتەوە.

٣ـ إبن تيمية گوتوویەتی: (النَّسخُ لا يصار إليه إلا بيقين، وأمّا بالظن فلا يثبت النسخ)[٢].

واتە: نەسخ بە دڵنیایی نەبێ پەنای پێ نابرێ، بەڵام بە گومان نەسخ ناچەسپێ.

٤ـ إبن حزم گوتوویەتی: (لا يحل لمسلم أن يقول في آية ولا حديث بالنَّسخ إلاَّ عن نص...)[٣].

واتە: هیچ موسوڵمانێک بۆی نیە باسی نەسخ بوونەوەی ئایەتێک یان فەرموودەیەک بکات، مەگەر بە دەقێک...

٥ـ إبن رشد گوتوویەتی: (لم يجز أن نترك شرعاً وجب العمل به، بظن لم نُؤْمَرْ أن نوُجب النَّسْخَ به...)[٤].

واتە: شەرعێک کە کارپێکردنی پێویستە، دروست نیە بۆ گومانێک وازی لێ بهێنین، کە فەرمانمان پێ نەکراوە، نەسخی پێ پێویست بکەین.

٦ـ الشوكاني گوتوویەتی: (النَّسْخُ لا يثبت بالإحتمال...)[٥].

واتە: نەسخ، بە شێمانەو ئەگەر ناچەسپێ...

ئنجا شایانی باسە:

(١)- المستصفى ج١ ص ١٠٣.
(٢)- مجموع الفتاوى ج٢١ ص ٥٧٥.
(٣)- الإحكام في أصول الأحكام، ج٧ ص٣٨٠.
(٤)- بداية المجتهد ونهاية المقتصد، ج١ ص ٦١٣.
(٥)- فتح القدير، ج١ ص ٣٠٥.

کە وشەی (نسخ) و ڕیشەی (ن س خ) بە هیچ سەنەدێکی ڕاست، یان باش (صحیح أو حسن) لە فەرموودەی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) نەهاتوە، لە هیچ کام لەو کتێب و سەرچاوانەی سوننەت دا، کە هی ئەم فەرموودەناسانەن:

١ـ البخاري. ٢ـ مسلم. ٣ـ الترمذي. ٤ـ النسائي. ٥ـ أبوداود. ٦ـ إبن ماجة. ٧ـ أحمد (في المسند). ٨ـ مالك (في الموطأ). ٩ـ الدارمي. ١٠ـ الحاكم (في المستدرك). ١١ـ إبن حبان. ١٢ـ إبن الجارود. ١٣ـ إبن خزيمة. ١٤ـ البيهقي. ١٥ـ الدارقطني. ١٦ـ الشافعي (في المسند)[١].

کە بێگومان ئەوەش بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، چونکە خوای کار بەجێ و زانا، کتێبی کۆتایی خۆی (قورئان)ی بەوە وەسفکردوە، کە سەرجەم ئایەتەکانی موحکەم و پتەو و قایم و نە لەخشاون:

(الَر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ) هود ـ ١ ـ.

ئنجا مادام دڵنیایی (يقين) یمان هەیە لەبارەی موحکەم بوونی تێکڕای ئایەتەکانی قورئانەوە، هەتا دڵنیاییشمان لەبارەی مەنسووخ بوونی ئایەتێک، یان زیاتریەوە نەبێ، دروست نیە هەر لە خۆمانەوە باسی مەنسووخ بوونی بکەین.

پێشتریش باسمان کرد: زانایانێك کە بڕوایان بە هەبوونی نەسخ هەیە لەقورئاندا، ڕاجیایی زۆریان لەبارەی ژمارەی ئایەتە مەنسووخەکانەوە هەیەو بەلای کەمەوە یازدە (١١) ژمارەیان باسکردوون، کە زۆرترینیان دوو سەدو چل ونۆ (٢٤٩) کەمترینیان شەش (٦) ئایەتە!




(١)- نقد نظرية النسخ. د.جابر عودة ص٩٥. ط١ / ٢٠١٣م.

بەڕێزان!

خـوا پشـتیوان بـێ لـە حـەوت بڕگـەدا، باسـی تەفسـیری قورئـان دەکەیـن:

بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

**بڕگەی یەکەم: مانای تەفسیر.**

**بڕگەی دووەم: حوکمی تەفسیر.**

**بڕگەی سێیەم: مەرجەکانی ڕوونکەرەوەی قورئان.**

**بڕگەی چوارەم: چۆنیەتیی و شێوازی تەفسیرکردن.**

**بڕگەی پێنجەم: مێژووی تەفسیری قورئان.**

**بڕگەی شەشەم: دوو جۆرە سەرەکەییەکەی تەفسیر.**

**بڕگەی حەوتەم: تەفسیرەکەی بەندە: تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.**

## بڕگەی یەکەم: مانای تەفسیر [ معنى التفسير]:

أ ـ لە ڕووی زمانەوانییەوە: وشەی تەفسیر وشەیەکی عەرەبییە، کەواتە: بابزانین لە ڕووی زمانەوانییەوە چەمک و واتایەکەی چۆنە؟

[التفسير في اللغة: تفعيل من الفسر، ومعناه: الإبانة والكشف].

تەفسیر لە زمانی عەرەبییدا لەسەر کێشی (تفعیل)ەو لە (فسر)ەوە هاتوە، مانایەکەشی بریتییە لە: ڕوونکرنەوەو دەرخستن.

کەواتە: لە ئەسڵی زماندا تەفسیر واتە: ڕوونکردنەوەو دەرخستن.

ب ـ لە ڕووی زاراوەییەوە:

[واصطلاحاً: علم يفهم به القرآن بمعرفة معانيه واستخراج أحكامه وحِكَمه، وعظاته وعبره].

له ڕووی زاراوه‌ییه‌وه: ته‌فسیر، زانیارییه‌كه قورئانی پێ فام ده‌كرێ، به زانینی واتاكانی و، ده‌رهێنانی حوكمه‌كانی و حیكمه‌ته‌كانی و، ئامۆژگاریی و په‌نده‌كانی.

كه‌واته: وشه‌ی ته‌فسیر له ئه‌سڵی زماندا، به مانای ده‌رخستن و ئاشكرا كردن و ڕوونكردنه‌وه دێ، به‌ڵام له زاراوی زانایاندا: زانیارییه‌كه پێی له قورئان تێده‌گه‌ین، هه‌م له مه‌به‌سته‌كانی حاڵیی ده‌بین و حوكم و یاسایه‌كانی كه گرتوونیه خۆی ده‌ریاندێنین، هه‌روه‌ها حیكمه‌ته‌كانی و په‌ندو ئامۆژگارییه‌كانی.

زانایانی پێشین به‌م زانیارییه‌یان گوتوه (علم التأويل) زانیاریی ته‌ئویل، له‌و فه‌رمایشته‌ی پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم) ئه‌و وشه‌یه به‌كار هاتوه، كه دوعا ده‌كا بۆ عبدالله ی كوڕی عه‌بباس ئامۆزای، خوا له خۆی و بابی ڕازی بێ، كه فه‌رموویه‌تی: [أللهم فقهّهُ في الدين وعلِّمه التأويل][1].

واته: ئه‌ی خوایه! له ئاییندا شاره‌زای بكه‌و، ته‌ئویلی فێربكه، واته: ڕوونكردنه‌وه‌و تێگه‌یشتنی قورئانی فێربكه.

ئه‌بو جه‌عفه‌ری (طبري) كه به پێشه‌وای ڕوونكه‌ره‌وانی قورئان (إمام المفسرين) ناسراوه، هه‌میشه وشه‌ی ته‌ئویل به‌كاردێنێ له جیاتی ته‌فسیر، ته‌فسیره‌كه‌ی خۆیشی ناو نه‌ناوه: (جامع البيان عن تأويل آي القرآن) واته: كۆكردنه‌وه‌ی ڕوونكردنه‌وه، له‌باره‌ی لێكدانه‌وه‌ی ئایه‌ته‌كانی قورئانه‌وه.

كه‌واته: لێره‌دا ده‌بێ وریابین! وشه‌ی ته‌ئویل كه زانایانی پێشین به‌كاریان هێناوه، له جیاتی ته‌فسیرو ڕوونكردنه‌وه‌ی قورئان، جیایه، له‌و وشه‌یه‌ی یاخود له‌و واتایه‌ی دوایی زانایانی دواتر ئه‌و وشه‌یان پێ به‌كارهێناوه، كه گوتوویانه: [التأويل هو صرف اللفظ عن المعنى الراجح إلى المعنى المرجوح لدليل يقترن به].

واته: ته‌ئویل بریتییه له لادانی بێژه‌یه‌ك له مانا زاڵه‌كه‌ی، بۆ مانایه‌كی بێ

(١) - أخرجه أحمد: ٢٣٩٧ و ٢٨٧٩ و ٣٠٣٢ و ٣١٠٢، وابن سعد في الطبقات ج٢ ص٣٦٥، وابن حبان: ٧٠٥٥ والحاكم: ٦٢٨٠، وأصله في الصحيحين.

هێزی، لەبەر بەڵگەیەک کە لەگەڵیدا جووتە، لەبەر نیشانەیەک کە ڕێیان لێ دەگرێ بڵێین: ئەوە مەبەستە.

بۆ وێنە: ئێمە لێرە دانیشتووین، ئەگەر یەکێک بێ، بڵێ: شێرەکە هات، هەمووومان دەزانین شێر بەو قادرمانەدا سەرناکەوێ و، شێر لێرە نیە، بەڵکو مەبەست پێی پیاوێکی ئازایە، حاڵەت و ڕەوتەکە ڕێیان لێ دەگرێ کە بزانین و پێیان وابێ: مەبەست لە شێر ئەو دڕندەیە کە دەزانین.

### جۆرەکانی تەفسیر:

دەتوانیـن بڵێیـن: تەفسـیر چـوار جۆرە، وەک لـە هەندێـک شـوێنەواران دا هاتـوە، بـەڵام لـە ڕووی سـەنەدەوە زۆر ڕاسـت نیـن، بـۆ نموونـە: (إبـن عبـاس) گوایـە گوتوویـەتی:

[التفسـير عـلى أربعـة أوجـه، وجـه تعرفـه العـرب مـن كلامهـا، وتفسـير لايُعْـذَرُ أحـدٌ بجهالتـه، وتفسـير يعلمـه العلـماء، وتفسـير لايعلمـه إلا اللـه][1].

گوتوویـەتی: تەفسـیر چـوار جـۆرە، جۆرێکیـان عـەرەب لـە قسـەی خۆیـدا تێیـدەگا (واتـە: هەرکەسـێک عەرەبیـی بزانـێ ماناکـەی دەزانـێ)و، جۆرێکیـان هیچکـەس پۆزشـی بـۆ ناهێنرێتـەوە کـە نەیزانـێ (واتـە: دەبـێ هەوڵبـدا بیزانـێ) و، جۆرێکیـان زانایـان دەیزانـن، جۆرێکیشـیان تەنیـا خـوا (سُـبحانە وتعـالى) دەیزانـێ.

ئەم چوار جۆرە تەفسیرە تۆزێک ڕوونیان دەکەینەوە:

**جۆری یەکەم: عەرەب لە زمانی خۆیدا دەیزانێ:**

واتـە: هەرکەسـێ عەرەبیـی بزانـێ و، لـە زمـانی عەرەبیـی شـارەزابێ،

---

(١) - (جامع البيان) ابن الجرير الطبري: ج١، ص٣٤. بەڵام سەنەدەکەی بڕاوە، لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست نیە، بەس مانایەکەی ڕاستە.

کەم و زۆر لە قورئان تێ دەگات، بەڵام بێگومان بە مەرجێک، لە جوغزی قسەی زانایانی پێشین، لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان و پێشەوایان، لەو بازنەیە نەچێتە دەرو، بە پێی ڕێزمانی عەرەبییش بێت.

**جۆری دووەم: ئەوەیە کە هیچ کەس پۆزشی بۆ ناهێنرێتەوە، نەیزانێ:**

بریتییە لەوەی بۆخۆی ڕوونە، بێ ئەوەی ڕوون بکرێتەوە، کە قورئان بەزۆریی بەو شێوەیە، چونکە خوا (سُبحانه وتعالی) ناوی لە کتێبەکەی خۆی ناوە: [کتاب مبين، قرآن مبين]، واتە: ڕوون، یاخود ڕوونکەرەوە.

بەڵام بێگومان دەبێ خەڵک لێی وردبنەوەو تێوەی ڕامێنن، ئەوجار لە واتایەکەی تێدەگەن:

أ ـ وەک خوا لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ ص: ٢٩

واتە: ئەمە کتێبێکە دامان بەزاندوە بۆلای تۆ بەپێزە، تاکو لە ئایەتەکانیەوە ڕامێنن و، خاوەن عەقڵان پەندی لێوەربگرن.

ب ـ هەروەها لە سوورەتی (محمد)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴾ محمد: ٢٤

واتە: ئایا لە قورئان ڕانامێنن، یاخود دڵەکان قوفڵیان لێیدراوە؟

ج ـ هەروەها لە سوورەتی (القمر)دا، چوار جاران ئەم ڕستەیە، دووبارە دەبێتەوە:

﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾ القمر: ١٧

واتە: بە دڵنیاییەوە قورئانمان بۆ لێتێگەیشتن ئاسانکردوە، ئایا کەس نیە بێ لێی تێبگا؟!

کە ئەم جۆری دووەمەی تەفسیر، هەرکەسێک نەیزانێ، هیچ

بیانوو و پاساوێکی نیە، چونکە ڕوونە، بەڵام دیارە دەبێ خۆی لەگەڵ ماندووبکاو تێوەی ڕامێنێ و بیری لێبکاتەوە.

**جۆری سێیەم: ئەوەیە کە زانایان دەیزانن:**

واتە: کەسانێک کە توانای ورد تێگەیشتن و هەڵهێنجان و قووڵداچوونیان هەیە، ئەوانە دەیزانن، کە بێگومان ئەم جۆری سێیەم و جۆری دووەم، نیزیکیی و تێکەڵییان هەیە.

**جۆری چوارەم: جۆرو پلەی چوارەمی تەفسیر، ئەوەیە کە تەنیا خوا خۆی (سُبحانه وتعالى) دەیزانێ :**

کە مەبەست پێی ئەو ئایەتانەن، پێیان دەگوترێ: (متشابه)و زیاتر لەواتایەک هەڵدەگرن، یاخود واتا ڕواڵەتییەکەیان بۆ ئێمە ئیستیعاب ناکرێ و، عەقڵی ئێمە ناتوانێ وەخۆی بگرێ.

سێ بەشی سەرەکیی لە جۆری چوارەم کە بەس خوا دەیزانێ:

١ ـ هەواڵدان لەبارەی خواوە (سُبحانه وتعالى) و ناوەکانی خواو، سیفەتەکانی خواو، کارەکانی خوا، چۆنیەتییەکەیان بێگومان بۆ ئێمە زانراو نیە.

وەک خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴾ طه: ١١٠

واتە: زانیاریی ئەوان دەوری خوا نادات.

هەروەها خوا دەفەرموێ:

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ الشورى: ١١

واتە: هیچ شتێک وەک خوا نیە و، ئەو بیسەری بینەرە.

زانایان لەوبارەوە بنچینەیەکیان داناوە دەڵێن: [كل ما خطر ببالك، فليس الله كذلك].

واتـە: هەرچـی بـە زەیـن و خەیاڵـی تـۆدا دێ، خـوا بـۆ جـۆرە نیـە، نـە زاتی خـوا، نـە نـاوەکانی خـوا، نـە سـیفەتەکانی خـوا.

٢ ـ بەشـێکی دیکـە: بریتییـە لـە زانیـن و دەرککـردنی ژیـانی بـەرزەخ و، چییـەتی ئاخیـر زەمـان و، قیامـەت و سـیراط و بەهەشـت و دۆزەخ...هتـد.

ئەمـەش تەنیـا خـوا (سُـبحانە وتعـالی) وەک پێویسـت چییەتەکـەی دەزانـێ، تەنیـا خـوا دەزانـێ ئاخیـر زەمـان چـۆن دەقەومـێ و، تەنیـا خـوا دەزانـێ قیامـەت چـۆن دێ و، سـیرات و دۆزەخ و بەهەشـت، حەقیقەتەکەیان تەنیـا لـەلای خـوای موتەعالـە، بەڵـێ خـوا (سُـبحانە وتعـالی) بـۆ ئێمـەی ڕوون کردۆتـەوە، بایـی ئەوەنـدە کـە عەقڵـی ئێمـەو توانـای ئێمـە وەخـۆی بگـرێ، بـەڵام حەقیقـەت و چییەتەکەیـان، تەنیا لـەلای خوای پـەروەردگارە.

٣ ـ بەشـێکی دیکـە هـەر لـە جـۆری چـوارەم: پیتـە پچـڕ پچـڕەکان (الحـروف المقطعـة)ن.

کـە زۆرێـک لـە زانایـان ئەوانیشـیان لەنێـو موتەشـابیهدا دانـاون، چونکـە مانایەکـی ڕۆشـنیان نیـە بـۆ ئێمـە، بەڵـێ مانایەکـی گشـتییان هەیـە، کـە خـوا (سُـبحانە وتعـالی) ئـەم قورئانـەی هـەر بـەو پیـت و دەنگانـە دابەزانـدوە، کـە ئێمـە بەکاریـان دێنیـن، لـە نووسـین و لـە خوێندن و لـە قسـەکردنماندا، کەچـی ئێمـە دەستەوسـانین، نـەک لەبەرامبـەر کـۆی قورئانـدا، بەڵکـو دە (١٠) سـوورەتی و، بگـرە سـوورەتێکی سـێ ئایەتیـی وەک (الکوثـر و النـصر و العصر)یشـدا!!

**تیشکێک بۆ سەر موحکەم و موتەشابیهو، حیکمەتی هەبوونی ئایەتە موتەشابیهەکان:**

خوا (سُبحانه وتعالى) پێناسەی کتێبی خۆی بەوە دەکات کە زۆربەی هەرە زۆری ئایەتەکانی (محکمات)ن، موحکەمات کۆی (محکم)ە، یان (محکمة)یەو کەمێکیشیان (متشابهات)ن، کە کۆی (مُتَشابه)ە.

وەک لە سوورەتی (آل عمران) دا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَـٰبَ مِنۡهُ ءَايَـٰتٌ مُّحۡكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَـٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَـٰبِ ﴾ آل عمران: ٧.

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە کتێبی دابەزاندوە بۆ سەر تۆ، ئایەتانێکی تێدا هەن، موحکەمن (واتایەکەیان ڕۆشنە) ئەوانە ئەسڵی کتێبن، ئەسڵی قورئانن، هەندێک لە ئایەتەکانیشی موتەشابیهن (مانای وێکچوویان هەن، یاخود ماناکانیان ڕوون نین بۆ ئێمە) ئنجا ئەوانەیان، کە دڵیان لادانی تێدا هەیە، بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون، کە موتەشابیهن لەو (قورئان) بە مەبەستی ئاژاوەگێڕیی و بە مەبەستی ماناکردنی، لە حاڵێکدا مانایەکەیشی تەنیا خوا دەیزانێ، بەڵام ڕۆچوان لە زانیارییدا، دەڵێن: ئیمانمان پێی هەیە، هەمووی لە پەروەردگارمانەوەیەو، تەنیا خاوەن عەقڵانیش پەند وەردەگرن.

هەر لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هاتووە:

(عن عائشة رضي الله عنها قالت تلا رسول الله (صلی الله علیه

وسلم): (هو الذي أنزل عليك الكتاب إلى آخر الآية)، فذكرت الآية إلى آخرها) قال: رسول الله - (صلى الله عليه وسلم) - إذا رأيتم الذين يتبعون ما تشابه منه، فأولئك الذين سمَّى الله فاحذروهم)[1].

واته: دایکمان خاتو عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: [هو الذي أنزل عليك الكتاب تا کۆتایی] دوایی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: هەرکات ئەوانەتان بینین، کە بەدوای ئەو ئاتانە دەکەوتن، کە موتەشابیهن لە قورئاندا، ئەوانەن، کە خوا ناوی هێناون و، لێیان وریابن!

هەڵبەتە بە سەرنجدانی ئایەتەکە، کە دەفەرمووێ: [منه آيات محكمات هن أم الكتاب، وأخر متشابهات]، دەردەکەوێ: کە زۆربەی هەرە زۆری قورئان، ئایەتەکانی موحکەمن و کەمێکیشیان موتەشابیهن.

ئنجا لێرەدا ئیشکالێک دروست دەبێ، ئەویش ئەوەیە : حیکمەتی چییە خوا (سُبحانه وتعالى) هەندێک ئایەتی دابەزاندوون موتەشابیهن و پێیشی فەرمووین، دەبێ لە قورئانەوە ڕامێنین، (كتاب أنزلناه إليك مبارك ليدَّبَّروا آياته) ص ـ ٢٩ ـ هەروەها (أفلا يتدبرون القرآن..) محمد ـ ٢٤ ـ لە حاڵێکدا هەندێک لە ئایەتەکان بۆ ئێمە زاندراونابن؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: خوا کە فەرمان دەکات لە ئایەتەکانیەوە ڕامێنین، بێگومان ئەوە بۆ هەموو قورئانە، کە هەموو قورئان دەبێ ئێمە دووئەرکی لەبەرامبەردا جێ بەجێ بکەین:

**یەکەم:** بڕوامان پێی بێ.

**دووەم:** ئەوەی، کە پەیوەندیی بە کارو چالاکییەکانمانەوە هەیە، جێ بەجێی کەین.

---

(١) - البخاري: ٤٢٧٣، ومسلم: ٢٦٦٥.

ئـەو بەشـەی قورئانیـش ،کـە بـۆ ئێمـە مانایەکـەی ڕوون نەبـێ، گرنـگ ئەوەیـە پێویسـتە لەسـەرمان بـڕوای پـێ بێنیـن، وەک خـوا لەبـارەی ڕۆچـوان و قووڵبـووەوان بەزانیارییـدا، فەرموویـەتی: [والراسـخون في العلـم يقولـون آمنـا بـه كل مـن عنـد ربنـا] آل عمـران ـ ٧ ـ.

کەواتـە: ئـەوەی کـە ڕوونیـش نەبـێ و چـاک لێـی تـێ نەگەیـن، گرنـگ ئەوەیـە بـۆ ئێمـە، هـەر پێویسـتە بـڕوای پـێ بێنیـن.

ئنجـا دەڵێیـن: قورئـان فەرمایشـتی خوایـەو، فەرمایشـتی خـواش لەقـەدەر خوایـە، تەنیـا خـوا (سُـبحانه وتعـالى) دەزانـێ فەرمایشـتەکەی هەمـوو واتـاو مانـاکانی چییـن و چۆنـن؟ چونکـە خـوا (سُـبحانه وتعـالى) بـێ سـنووره لـە سـیفەتەکانیداو قورئانیـشی بـە زانیاریـی خـۆی دابەزانـدوە: [أنزلـه بعلمـه] النسـاء ـ ١٦٦ ـ، [أنزلـه الـذي يعلـم السـر في السـماوات والأرض] الفرقـان ـ ٦ ـ.

کەواتـە: دەبـێ بـە ئەنـدازەی خـوا زانیارییـمان هەبـێ، ئەوجـار لـە هەمـوو زانیاریـی قورئـان تێدەگەیـن!

هەرگیـز سـنوردار بـێ سـنووری پـێ وە خـۆ ناگیـرێ، موسـتەحیلە، پەرداخێـک ناتـوانی ئـاوی دەریایەکـی تێبکـەی، هەڵبەتـە ئەمـەش تەنیـا بـۆ نزیـک خسـتنەوەیە لـە عەقـڵ، ئەگەرنـا زانیاریـی خـوا کـە لـە قورئاندایـە، فراوانتریشـە لـە ئـاوی دەریـا لـە چـاو پەرداخێـک!.

بـەڵام بێگومـان زانایانیـش زۆریـان باسـکردوە کـە: حیکمـەتی چییـە خـوا ئایەتـانی موتەشـابیهی نـاردوون؟

١. گەورەتریـن حیکمـەت بریتییـە لـە تاقیکردنـەوەی مرۆڤـەکان، خـوا فەرمایشـتێکی فەرمـووە، لـە هەمـووی تـێ ناگـەی، بـەڵام بڕواشـت پێـی هەیـە، مـادام دڵنیـای کـە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـە

خــواوه‌ هێناویــه‌تی، بــڕوای پــێ دێنــی ئه‌گــه‌ر لــه‌ هه‌مــوو شی تێنه‌گــه‌ی.

٢. هه‌ندێــک لــه‌ ئایه‌تــه‌ موته‌شــابیهه‌کانیش ڕێژه‌ییــن، ئایه‌تێــک بــۆ که‌ســێک بــه‌ موته‌شــابیهـ لــه‌ قه‌ڵــه‌م ده‌درێ، بــه‌ڵام بــۆ که‌ســێکی دیکــه‌ کــه‌ توانــای تێگه‌یشــتن و زانیاریــی زیاتــره‌، بــه‌ موحکــه‌م داده‌نــرێ،

٣. ئــه‌و ئایه‌تــه‌ موته‌شــابیهانه‌ هــۆکاری ئه‌وه‌بــوون کــه‌ زانایــان زۆر ڕۆبچــن، زۆر قووڵببنــه‌وه‌ و، وردبنــه‌وه‌ له‌قوڕئــان به‌گشــتیی و، لــه‌و ئایه‌تــه‌ موته‌شــابیهانه‌ بــه‌ تایبه‌تیــی بــۆ لــێ تێگه‌یشــتنیان.

شــایانی باســه‌: وشــه‌ی موته‌شــابیهـ لــه‌ قوڕئانــدا بــه‌ واتــای دیکــه‌ش به‌کارهاتــوه‌، کــه‌ بریتییــه‌ لــه‌ وێکچــوونی ئایه‌تــه‌کانی قوڕئــان به‌گشــتیی، بۆیــه‌ش خــوا هه‌مــوو ئایه‌تــه‌کانی قوڕئــانی بــه‌ موته‌شــابیهـ ناوبــردوون، لــه‌ ســووره‌تی (الزومــر)دا ده‌فه‌رمــوێ:

﴿ اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَابًا مُّتَشَابِهًا ﴾ الزمر: ٢٣ .

واته‌: خوا باشترین فه‌رمایشتی دابه‌زاندوه‌ وێکچوویه‌.

واتــه‌: هه‌ندێکــی بــه‌ هه‌ندێکــی ده‌چــێ و، هه‌ندێکــی هه‌ندێکــی بــه‌ ڕاســت داده‌نــێ، بــێ ئــه‌وه‌ی دژایه‌تیــی و ناکۆکیــی لــه‌ نێــوان ئایه‌ته‌کانــدا هه‌بێــت، هه‌روه‌هــا واتایه‌کــی دیکــه‌ش بــۆ ئایه‌تــه‌ موته‌شــابیهه‌کان، مه‌به‌ســت پێیــان ئــه‌و ئایه‌تانــه‌ن کــه‌ بێژه‌کانیــان پێــک ده‌چــن، لــه‌ شــوێنه‌ جیــاوازه‌کانی قوڕئانــدا، کــه‌ هه‌ندێــک لــه‌ زانایــان ئــه‌و ئایه‌تانه‌یــان هه‌مــوو جیاکردوونــه‌وه‌و کتێبــی تایبه‌تیــان له‌بــاره‌وه‌ نووســیون، بــۆ وێنــه‌:

١. لــه‌ چــوار شــوێناندا خــوا (سُبحانه وتعــالى) باســی چــوار جــۆره‌ خۆراکی حــه‌ڕام ده‌کا، کــه‌ بریتیــن له‌:

أ ـ بۆ جگه‌ له‌خوا سه‌ربڕاو.

ب ـ مردارەوەبوو.

ت ـ گۆشتی بەراز.

ح ـ خوێن.

ئنجا تەنیا لە سوورەتی (البقرة) دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ﴾ البقرة: ١٧٣ .

بەڵام لە ئایەتی (١٤٥) لە سوورەتی (الأنعام) و، لە (١١٥)ی سوورەتی (النحل)، هەروەها لە سوورەتی (المائدة) ئایەتی (٣)دا ، خوا (سُبحانه وتعالی) دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ المائدة: ٣.

٢ ـ هەروەها خوا لە سوورەتی (الأنعام) (١٦٥) دا دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ الأنعام: ١٦٥.

بەڵام لە سوورەتی (یونس) دا دەفەرموێ:

﴿ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ...﴾ یونس: ١٤.

دیسان لە سوورەتی (فاطر) یشدا دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ فاطر: ٣٩.

٣ ـ هەروەها لە سوورەتی (البقرة) دا دەفەرموێ:

﴿ فَٱنفَجَرَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ﴾ البقرة: ٦٠.

بەڵام لە سوورەتی (الأعراف) دا دەفەرموێ:

﴿ فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ﴾ الأعراف: ١٦٠.

هەروەها وێنەی ئەوانە زۆرە، کە ئەوانەش هەندێک لە زانایان بە ئایەتی موتەشابیهـ ناویان دەبەن، واتە: وێک دەچن

## بڕگەی دووەم: حوکمی تەفسیر:

تەفسیرکردنی قورئان ئایا حوکمەکەی چییە؟!

بێگومـان خـوا قورئـانی بۆیـە دابەزانـدوە، کـە لێـی تێبگەیـن، وەک دەفەرمـوێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ ص: ٢٩.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (القمـر) دا، چـوار جـاران ئەمـە دووبـارە دەکاتـەوە:

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ١٧ ﴾ القمر: ـ ١٧، ٢٢، ٣٢، ٤٠ ـ.

واتـە: قورئانمـان بـۆ لێتێگەیشـتن، یـان بـۆ لەبەرکـردن، یـان بـۆ خوێندنـەوە ئاسـانکردوە، ئایـا کـەس نیـە بـێ لێـی تێبـگات، بیخوێنێتـەوەو لێـی حاڵیـی بـێ؟!

کەواتـە: هـەر دیـارە حوکمـی تەفسـیر بریتییـە لـە فەڕزبـوون، فـەڕزە لەسـەر ئۆممـەتی پێغەمبـەر (صـلی اللـە علیـە وسـلم) بەگشـتیی و، لەسـەر هـەر مسـوڵمانێک بـە تایبەتیـی، ئـەوەی کـە پێویسـتیی پێیـەتی بـۆ لێتێگەیشـتنی ئـەو شـتانەی کەلەسـەری پێویسـتن، وەک بووناسـیی، ئیمان و عەقیـدە، پەرستشـەکان، حـەڵاڵ و حـەڕام، ڕەوشـتەکان و، هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە لەسـەری پێویسـت دەبـن، لەسـەری فـەڕزە کـە لـە ئایەتـەکان تێبـگات، ئـەو ئایەتانـەی کـە ئـەو شـتانەیان گرتوونـە خۆیـان، هەروەهـا لەڕێـازی پێغەمبەریـش (صـلی اللـە علیـە وسـلم).

واتـە: مسـوڵمان دەبـێ کـەم و زۆر لـە قورئان تێبگات، کـەم و زۆر دەبێ لێـی حاڵیـی بـێ، خـوا قورئـانی دابەزاندوە بـۆ لێ تێگەیشـتن و، تێـوە ڕامان و لـێ حاڵیی بـوون و، پەند لـێ وەرگرتـن و کارپێکردن.

بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێناسەی تەفسیر، کە گوتمان چوار جۆرە:

أ ـ جۆرێکیان هەر زمانی عەرەبیی بزانی، لێی تێ دەگەی.

ب ـ جۆرێکیان کە هیچ کەس پاساوی نیە لێی حاڵی نەبێ.

ج ـ جۆرێکیان کە زانایان تێی دەگەن.

د ـ جۆرێکیـــش کـــە تەنیـــا خـــوا (سُـــبحانه وتعـــالى) بـــە تەواویـــی واتایەکـــەی دەزانـــێ.

ئەو کاتە چوار حوکم بەسەر تەفسیردا دەچەسپن:

**جـــۆری یەکەمیـــان:** فـــەڕزی کیفایەیـــە لەســـەر مســـوڵمانان کـــە کەســـانێکیان تێـــدا هەبـــن، ئەگـــەر عـــەرەب بـــن، یـــان غەیـــری عـــەرەب بـــن، بایـــی ئەوەنـــدە زمـــانی عەرەبیـــی بزانـــن، پێـــی لـــە قورئـــان تێبگـــەن، وەک پلـــەی یەکەمـــی تێگەیشـــتن.

**جـــۆری دووەم:** پاشـــان لەســـەر ئۆممـــەت و لەســـەر یـــەک یەکـــی مســـوڵمانان پێویســـتە بایـــی ئەوەنـــدە لـــە قورئانـــەوە ڕابمێنـــن و تێـــی بفکـــرن کـــە لێـــی حاڵیـــی بـــن و، هیـــچ کەســـێک بیانـــوو و پاســـاوی نیـــە، لـــە قوئـــان تێنـــەگات، وەک پلـــەی دووەمـــی تێگەیشـــتنی قورئـــان.

**جـــۆری ســـێیەم:** پلـــەی ســـێیەمی کـــە بریتییـــە لـــەوەی زانایـــان و پســـپۆڕان لێـــی تێدەگـــەن، ئەویـــش لەســـەر ئۆممـــەت پێویســـتە کـــە لـــە نێویـــدا پســـپۆڕان و زانایانێـــک هەبـــن، لـــە هەمـــوو قورئـــان تێبگـــەن و، هەمـــوو قورئـــان بزانـــن و لێـــی شـــارەزابن، بـــە پێـــی توانـــای خۆیـــان و، بـــۆ خەڵکـــی بەیـــان بکـــەن وباســـی بکـــەن.

**جـــۆری چـــوارەم:** پلـــەی چوارەمیـــش ئەوەیـــە کـــە موتەشـــابیهە و مانایەکـــەی بـــۆ ئێمـــە ڕوون نیـــە، یـــان زیاتـــر لـــە واتایـــەک هەڵدەگـــرێ، ئـــەوە بێگومـــان مـــرۆڤ دەبـــێ بـــەو مەبەســـتە زیاتـــر لێـــی وردبێتـــەوە،

هەرچەندە گوتراوە: موتەشابیهە، بەڵام ئەوەک لە موحکەم بێ، دەبێ زیاتر ڕامێنێ و وردبێتەوە، بەڵکو مانایەکی تێدا بەدی بکا، ئەگەر نا پێویستە ئایەتە موتەشابیهەکان، بڕوایان پێ بهێنرێ، بۆ ئەوەی وەک پێویست واتاو چەمک و مەبەستەکەیان لە عەقڵدا جێبێبێتەوەو، مرۆڤ بتوانێ، وەخۆی بگرێ و ئیستیعابی بکا.



## تەفسیری قورئان بە ڕاو بۆچوون (تفسير القرآن بالرأي):

لێرەوە دەپەڕینەوە بۆ بابەتێکی دیکە، کە لە هەندێک دەقاندا زەمکردنی هاتوە: لێکدانەوەی قورئان بە ڕاو بۆچوون (التفسير بالرأي).

هەڵبەتە دوو دەق لەوبارەوە هاتوون، بەڵام خاوەنی (المقدمات الأساسية في علوم القرآن) هەردووکیانی بە بێهێز داناون و گوتوویەتی: شایستەی پشت پێ بەستن نین.

یەکەمیان: (عن عبدالله بن عباس عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: من قال في القرآن بغير علم، (وفي رواية: برأيه) فليتبوأ مقعده من النار)[1].

واتە: لە عبداللە ی کوڕی عەبباس لە پێغەمبەری گێڕراوەتەوە - عليه الصلاة والسلام- کە گوتوویەتی: هەرکە سێک قسە لەبارەی قورئانەوە بکا، بەبێ زانیاریی [لە ڕیوایەتێکدا: بە بۆچوونی خۆی]، با شوێنی خۆی لە ئاگردا هەڵگرێ.

دووەمیان: (عن جندب بن عبدالله قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): من قال في القرآن برأيه فأصاب، فقد أخطأ)[2].

واتە: پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: هەرکەسێک لەبارەی قورئانەوە بە بۆچوونی خۆی بیڵێ و، بیپێکێ، ئەوە بە هەڵەدا چووە.

ئەم دوو گێڕانەوەیە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست نین و، لە ڕووی مەتن و نێوەڕۆکیشەوە، هەر ڕاست نین، چونکە هی یەکەمیان، بە هەر حاڵ ئەگەر ئینسان بەبێ زانیاریی لەبارەی قورئانەوە، قسە بکات دیارە ئەوە گوناحەو

(١) - أحمد: ٣٠٢٤، والترمذي: ٢٩٥٠، والنسائي في فضائل القرآن: ١٠٩ - ١١٠، وأبويعلى: ٢٣٣٨، وابن جرير الطبري: ١٢٣٩٢.
(٢) - أبو داود: ٣٦٥٣، والترمذي: ٢٩٥٢، والنسائي فضائل القرآن: ١١١، وأبويعلى: ١٥٢٠، والطبراني: ١٦٧٢، وابن جرير ج١ ص٣٥.

هەڵەیە، بەڵام بە بۆچوونی خۆی (برأیه) دەبێ ڕوون بکرێتەوە، بۆچوونی خۆی یانی چی؟ چونکە تەفسیر بەڕاو بۆچوون دوو جۆرە:

أ ـ کەسێک عەقڵی بەکاردێنێ و شارەزای زمانی عەرەبییە و شارەزای ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) و شارەزای زانستەکانی قورئانە و، لە ئایەتەکان ورد دەبێتەوەو تێیانەوەڕادەمێنێ، بۆچوونێکی بۆ دروست دەبێ، لەبارەی تێگەیشتن لە ئایەتێک، ئەمە شتێکی ڕاست و ڕەوایە.

ب ـ کەسێک شارەزای زمانی عەرەبیی نیەو، شارەزای زانستەکانی قورئان نیە، شارەزای ڕێبازی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) نیەو لە خۆوە بۆچوونێک لەبارەی ئایەتێکەوە دەڵێ، وای پێ خۆشە، یاخود وەک دەمارگیریی بۆ مەزهەبێکی دیاریکراو و بۆ ڕایەکی دیاریکراو، ئایەتێک مل پێ دەسووڕێنێ بەرەو مەبەستێک، یاخود وەک لاساییکردنەوەی کەسانێک لە پێش خۆیدا، ئایەتێک مل پێ دەسووڕێنێ بۆ مەبەستێک، بێگومان ئەوە سەرزەنشت کراوە، ئەگەرنا مرۆڤ عەقڵی بەکاربێنێ بۆ لێتێگەیشتنی قورئان و هۆکارەکانی ئەو لێ تێگەیشتنەشی ئامادەکردبن، وەک شارەزایی لە زمانی عەرەبیی و شارەزایی لە قورئان، شارەزایی لە هۆیەکانی هاتنە خواری قورئان ـ ئەو ئایەتانەی هۆی هاتنە خوارەوەیان هەیە ـ هەروەها شارەزایی لە ڕێبازی پێغەمبەر - (صلی الله علیه وسلم) - و لە ئوسووڵی فیقهـ، ئەوە بێگومان بەبێ عەقڵی خۆ بەکارهێنان، ئینسان لە قورئان تێناگات.

خواش دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ ص: ﴿٢٩﴾.

واتە: ئەم کتێبەمان بۆلات دابەزاندوە، بەپێزە تاکو لە ئایەتەکانیەوە ڕامێنن و، بۆ ئەوەی عاقڵمەندان پەندی لێوەرگرن.

هەروەها خوای موتەعال دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾﴾ البقرة: ٢٤٢.

واتە: ئاوا خوا ئایەتەكانیتان بۆ ڕوون دەكاتەوە بەڵكو تێبگەن!

بەڵام بێگومان كەسێك لە ئایەتێك تێ نەگات و لێی شارەزا نەبێ، نابێ تەكەللوف بكات و هەرچۆنێكی بێ شتێك بڵێ، بۆ ئەوەی بێ دەنگ نەبێ! با لەو بارەوە چەند دەقێك بێنین:

١ ـ (عن عبدالله بن أبي مليكة قال: سأل رجل ابن عباس قال: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ السجدة: ٥ ؟.

فقال ابن عباس: فما هو (يوم (كان مقداره خمسين ألف سنة) قال الرجل: إنما سألتك لتحدثني ، قال ابن عباس: هما يومان ذكرهما الله في كتابه، ألله أعلم بهما، فكره أن يقول في كتاب الله مالا يعلمه)[1].

واتە: عبدالله ی كوڕی ئەبی مولەیكە دەڵێ: پیاوێك لە (ابن عباس)ی پرسی لەبارەی: (في يوم كان مقداره ألف سنة مما تعدون) ڕۆژێك كە ئەندازەكەی هەزار ساڵە، لەوەی دەیژمێرن.

عبداللە ی كوڕی عەبباس گوتی: ئەدی ڕۆژێك ئەندازەكەی پەنجا هەزار ساڵە چییە؟! پیاوەكە گوتی: بۆیە لێم پرسی، تاكو بۆم باسبكەی!

عبداللە ی كوڕی عەبباس گوتی: ئەوانە دوو ڕۆژن، خوا باسی كردوون، (یەكیان هەزار ساڵ، یەكیان پەنجا هەزار ساڵ) خوا پێیان زاناترە، پێی ناخۆش بوو لەبارەی كتێبی خواوە شتێك بڵێ، كە نایزانێ.

(١) - أثر صحيح، أخرجه أبو عبيد في فضائل القرآن: ص٣٧٦، وابن جرير في تفسيره ٢٩ ص٧٢، والحاكم: ٨٨٠٣، وهو آخر حديث في المستدرك، وإسناده صحيح، وقال الحاكم: حديث صحيح على شرط البخاري.

کەواتــە: بەبــێ زانیاریــی قســە کردن لەبــارەی قورئانــەوە، بێگومــان قەدەغەیــە.

٢ ـ شــوێنەوارێکی دیکــە لەوبــارەوە: (عــن عبیداللــه بــن عمــر رضي الله عنهــا قــال: لقــد أدرکــت فقهــاء المدینــة، وانهــم لَیُعَظِّمــون القــول في التفســیر، منهــم ســالم بــن عبداللــه، وقاســم بــن محمــد، وســعید بــن مســیب، ونافــع)[1].

واتــە: (عبیداللــە) کــوڕی عومــەری کــوڕی خەتتــاب خــوا لێیــان ڕازی بــێ، دەڵــێ: شــەرعزانانی مەدینــەم بینیــن (یانــی شــارەزایان لــە دینــدا) کــە قســە کردن لەبــارەی تەفســیرەوەیان زۆر پــێ مــەزن بــوو!

لەوانــە: (ســالیمی کــوڕی عبداللــە ی کــوڕی عومــەر، و قاســمی کــوڕی موحەممــەدی کــوڕی ئەبوبەکــری صیددیــق و ســەعیدی کــوڕی موســەییەب و نافیــع)، کــە ئەمانــە شــارەزایانی مەدینــە بــوون و، فەتــوا لــە دوای هــاوەڵان لەســەر ئەمــان بــووە.

٣ ـ شــوێنەوارێکی دیکــە: (کان مــسروق بــن الأجــدع یقــول: اتقــوا التفســیر فإنَّمــا هــو روایــة عــن اللــه عزوجــل[2].

واتــە: مەســڕووقی کــوڕی ئەجــدەع دەیگــوت: خۆتــان لــە تەفســیر بپارێــزن، چونکــە لێکدانــەوەی قورئــان و ڕوونکردنــەوەی قورئــان، بریتییــە لــە گێڕانــەوە لــە خــواوە، (دەڵێــی: خــوا وایفەرمــووە).

٤ ـ شــوێنەوارێکی دیکــە: (قــال عامــر الشــعبي: واللــه مــا مــن آیــة إلا قــد ســألت عنهــا، لکنهــا الروایــة عــن اللــه)[3].

واتــە: عامیــری شــەعبیی گوتوویــەتی: بەخــوا هیــچ ئایەتێــک

(١)- أثر صحیح الإسناد أخرجه ابن جریر في تفسیره ج١ ص٣٧.
(٢)- أثر صحیح الإسناد أخرجه أبوعبید في الفضائل: ص٣٧٧.
(٣) -أثر صحیح الإسناد أخرجه ابن جریر في تفسیره ج١ ص٣٨.

نیە، مەگەر لەبارەیەوە پرسیومە لەزانایان (وەدەیزانم) بەڵام ئەوە گێڕانەوەیە لە خواوە (سُبحانه وتعالى).

کەواتە: مرۆڤ دەبێ لەبارەی قسەکردن لەبارەی قورئانەوەو واتاکردنی قورئانەوە، وریابێ.

هەڵبەتە زانایان جیاوازییان خستۆتە نێوان ڕای پەسەند و بۆچوونی پەسەند، لەبارەی قورئانەوەوبۆچوونی ناپەسەند، بۆ وێنە:

(البيهقي) لە (شعب الإيمان)دا دەڵێ:

(الرأي الذي يغلب على القلب من غير دليل قام عليه، فمثل هذا الرأي لايجوز الحكم به في النوازل، فكذلك لايجوز تفسير القرآن به، أما الرأي الذي يسنده البرهان، فالحكم به في النوازل جائز، وكذلك تفسير القرآن به جائز)[1].

واتە: ئەو ڕایەی کە دێتە سەر دڵ بەبێ بەڵگە (بەبێئەوەی بەڵگەیەکی لەسەر هەبێ) وێنەی ئەو ڕایە ناگونجێ حوکمی پێ بدرێ لەسەر ئەوشتانەی دەقەومێن، حوکمیان چییە؟ هەروەها ناشگونجێ بۆ تەفسیری قورئانیش بەکاربهێنرێ، بەڵام ئەو ڕایەی بەڵگەیەکی لەسەرە، هەم لە ڕووی فەتوادانەوە بۆ ئەو ڕووداوانەی دێنە پێشێ و، هەم بۆ لێکدانەوەی قورئانیش، دروستە.

(القرطبي) دەڵێ: ئەوە کە قەدەغەکراوە قورئان بەڕای خۆ لێکبدرێتەوە، ڕووی لە دووحاڵەتانە:

**حاڵەتی یەکەم:** کەسێک بۆچوونی لەبارەی شتێکەوە هەیە و، ئارەزوومەندە بۆی و دڵی لێیەتی، ئنجا بێنێ قورئان بەپێی ئارەزووی خۆی و بۆچوونی خۆی تەفسیربکات و، بیکاتە بەڵگە لەسەر ئەو

(١)- ج٢ ص ٤٢٣.

مەبەستەی کە خۆی حەزی لێیەتی، ئەمە کە بێگومان ئەوە شتێکی خراپە، ئنجا ئەوە جاری وا هەیە بە زانیارییەوەیەو، جاری وایە بە نەزانییەوەیەو، جاری وا هەیە مەبەستێکی باشی هەیەو، جاری واش هەیە مەبەستەکەی خراپە، بەڵام مادام بۆ هەواو ئارەزوویەک بێ، دروست نیە بەو شێوەیە قورئان لێکبدرێتەوە.

**حاڵەتی دووەم:** ئەوەیە کە کەسێک قورئان لێکبداتەوە، تەنیا بەوە کە شارەزای زمانی عەرەبییە، بێئەوەی ئاگاداری ڕای زانایان بێ و، ئاگاداری ئەو وشانە بێ کە زانایان قسەیان لێ کردوون و، بێ ئەوەی ئاگاداری ڕەوانبێژیی بێ و ئاگاداری وردەکارییەکانی زمانی عەرەبیی بێ، کەواتە: ئەوە ڕێگریی کراوە لەوەی کە قورئان بە عەقڵ و ڕای خۆ تەفسیر بکرێ.

(القرطبي) دەڵێ: مەبەست پێی ئەو دوو حاڵەتەیە، دوایی دەڵێ: (ما عدا هذين الوجهين فلا يتطرق النهي إليه)، جگە لەو دوو حاڵەتە:

یەکەم: کەسێک ئارەزووی لە شتێک بێ و بەپێی ئارەزوو و هەوای خۆی تەفسیری بکات،

دووەم: ئەوە کە تەنیا بە ڕواڵەتی زمانی عەرەبیی تەفسیری بکا، بێ ئەوەی شارەزای وشەکانی قورئانبێ و، بەبێ ئەوەی شارەزای هۆی هاتنە خوارەوەکان بێ و، شارەزای وردەکارییەکانی ڕەوانبێژیی بێ، کە لە زمانی عەرەبییدا هەن و، دەبێ لە قورئاندا بەکاربهێنرێن، ڕێگرییەکە ڕووی لەو دوو حاڵەتەیەو غەیری ئەو دوو حاڵەتە، ڕێ لێ گیراو نیە[1].

(١) - الجامع لأحكام االقرآن، للقرطبي ج١ ص٣٣ -٣٤.

## بڕگـەی سـێیەم: مەرجـەکانی ڕوونکـەرەوەی قورئـان (شروط مفـسر القـرآن):

ئایا کەسێک بیەوێ قورئان ڕوون بکاتەوەو شی بکاتەوە، لە خەڵکی بگەیەنێ، چی تێدا بە مەرج گیراوە؟!

کۆمەڵێک مەرج هەن، بەڵام پێم وایە ئەم حەوتە زۆر گرنگن:

**مەرجی یەکەم: بیرو بڕوایەکی ڕاستی هەبێت و، میتۆد (منهج)و بەرنامەیەکی ساغیشی هەبێت بۆ تەفسیرکردنی قورئان.**

ئەم مەرجەیان لە هەموویان گرنگترە، چونکە هەموو ئەوانەی قورئانیان بە جۆرێک لێکداوەتەوەو بە جۆرێک تەفسیر کردوە، کە لەگەڵ مەبەستەکانی قورئاندا نایەتەوەو، بەو لاولایاندا بردوە، ئەوانە بوون، کە لە ڕووی عەقیدەوە خەلەلیان هەبووە، یاخود لە ڕووی میتۆدو بەرنامەی مامەڵە لەگەڵ قورئاندا، کەم و کوڕییان هەبووە.

بۆیـە بێگومـان ئەمـە مەرجێکـی بەجێیـە، ئـەو زانایانـەش کە لەسـەر ئەو ڕێیـە ڕاسـتە بـوون، دیارە لـە دوای پێغەمبـەری خاتەم (صلى الله عليه وسـلم) هـاوەڵانی بـوون، خـوا لێیـان ڕازی بێ، هاوەڵان بە گشـتیی و بـە تایبەتی چوار خەلیفـە ڕاشـیدەکان و، ئەوانەیـان، کـە ناوداربـوون بـەوەی شـارەزابوون لـە قورئـان، وەک: (عبداللـە ی کـوڕی عەببـاس و، عبدالله ی کوڕی مەسـعوودو، موعـاذی کـوڕی جەبـەل و، عبداللـە ی کـوڕی زوبەیـرو، عبداللـە ی کـوڕی عومـەرو، عبداللـە ی کـوڕی عەمـری کـوڕی عـاص)، هەروەهـا پێشـەوایانی شـوێنکەوتوان، (الأئمـة التابعـون) هەروەهـا ئەوانـەی، کـە لـە دوای ئەوانەوە ڕۆیشـتوون، وەک: ئەبـو حەنیفـە، مالیـک، سـوفیانی سـەوریی، عبداللـە بنـو لموبـاڕەک، ئەلئەوزاعیـی، (سـوفیان بنـو عویەینـە، شـافیعیی، ئەحمـەد

بنولحەنبەل، ئەلحومەیدی، ئەلبوخاریی، ئیبنو جەریر ئەلتەبەڕیی) و، ئەوانی دیکەش کە لە سەر هەمان ڕێباز ڕۆیشتوون.

**مەرجی دووەم: ئەوەیە کە بابای ڕوونکەرەوەی قورئان، ئامانج و مەبەستێکی ڕاست و ڕەوای هەبێت:**

واتە:مەبەستێکی ئامادەکراوی نەبێ لە عەقڵ و زەینی خۆیدا، بیەوێ ئایەتەکان و چەمک و واتای ئایەتەکان، لەگەڵ ئەو مەبەست و ئارەزووەی خۆیدا بگونجێنێ، بەڵکو خۆی دابڕنێ لە هەرچی مەبەست و هەواو ئارەزوو هەیەو، ڕێک تەماشای ئایەتەکان بکات، ئایەتەکان چی پێ دەڵێن، ئەوە بڵێت، نەک خۆی ئەوە بە ئایەتەکان بڵێ، کە مەبەستیەتی! یانی: (لايُقَوِّلُ كتابَ الله مالم يَقُلْ) ئەوە بە زاری کتێبی خواوە نەڵێ کە نەیفەرمووە.

ئنجا ئەوە کە ئینسان نیازو مەبەستی باشی بێ و، تەنیا مەبەستی بێ بزانێ فەرمایشتی خوا مەبەستەکەی چییە؟ نەک خۆی مەبەست و هیواو ئاوات و یاخود ئامانجێکی لەدڵدا هەبێ، غەرەزێکی دیکەی لە دڵ گرتبێ، ئەمە زۆر یارمەتییدەرە بۆ مرۆڤ، کە باش لە قورئان تێبگات.

لەو بارەوە ئەم دەقە دێنین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(من يرد الله به خيراً يُفَقِهّه في الدِّين)[1].

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: هەرکەسێک خوا چاکەی بۆی بوێ، لە ئاییندا شارەزای دەکا.

(فیقه) بریتییە لە ورد تێگەیشتن، یاخود بریتییە لە تێگەیشتن لە مەرام و مەبەستی بێژەر.

بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەگەر ئینسان نیازو مەبەستەکەی تەواو نەبێ،

(١) - البخاري: ٧١، ومسلم: ١٠٣٧، من حديث معاوية بن أبى سفيان.

ئـەوە دەبێتـە هـۆی ئەوە کـە پەرچ و کۆسـپ لەبەردەمـی دا دروسـت ببێ، بۆ لێتێگەیشـتنی قورئان.

وەک لەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەرەوە دیارە (صلی الله علیه وسلم):

**یەکـەم:** پێغەمبـەر دەفەرمـوێ - علیه الصلاة والسـلام- : (مَـنْ تعلَّم العلم ليباهـي بـه العلماء، أو ليُماري بـه السـفهاء، أو لِيَصْرِف بـه وجوَه النـاسِ إليه، فهـو في النار)[١].

**واتـە:** هەرکەسـێک زانیاریی فێربێ، بـۆ ئەوەی خۆی پێ بەسـەر زانایاندا هەڵکێشـێ، یـان بـۆ ئـەوەی کـە شـەڕە قسـەو مشـت و مـڕی پـێ لەگـەڵ نەفامانـدا بـکات، یـان بـۆ ئـەوەی کـە ڕووی خەڵکـی بـەرەو لای خـۆی پـێ وەرچەرخێنـێ، ئـەوە لـە ئاگردایە.

**دووەم:** (عـن أبي هريـرة قـال: قـال رسـول اللـه (صـلى اللـه عليه وسـلم) : مـن تعلَّـم علـماً مـمّا يُبتْغـى بـه وجْهُ اللـه، لايتعلّمـه إلا ليصيـب بـه عَرَضاً من الدنيـا، لم يَجِـدْ عَـرْفَ الجنة يـوم القيامـة. يعنـي ريحها)[٢].

پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسـلام) فەرموویەتی: هەرکەسـێک زانیاریی فێربـێ لـەو زانیارییـەی ڕووی خـوای پـێ داوا دەکـرێ (ڕەزامەندیـی خـواو دیـداری خـوا) تەنیا بۆ ئـەوە فێری بێ، کـە ئامانجێکی دونیایی پێ وەدەسـت بهێنـێ، ئـەوە لـە ڕۆژی قیامەتدا بۆنی بەهەشـت ناکات.

خـواش (سُـبحانه وتعـالى) ڕێگریـی کـردوە لـە ئێمە کە شـوێن ئـارەزوو بکەویـن بـە گشـتیی، وەک دەفەرموێ:

﴿ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ ص: ٢٦.

(١)- الروياني في مسنده: ١٣٦٤، وبحشل في تأريخ واسط: ص١٢٨، البزار: ١٧٨، كشف الأسرار، غيرهم من حديث قتادة عن أنس. قلت: وهذا حديث حسن بطرقه.

(٢) - حديث حسن أخرجه ابن أبي شيبة ج٨ ص٧٣١، وأحمد:٨٤٥٧، وأبوداود: ٣٦٦٤، وابن ماجه: ٢٥٢، وأبو يعلى: ٦٣٧٣، وهو حديث حسن بطريقيه.

واتە: لە نێوان خەڵکدا بە حەق دادوەریی بکەو، شوێن ئارەزوو مەکەوە، ئەگەر نا لە ڕێی خوا لاتدەدا.

هەروەها لە سووڕەتی (القصص)دا فەرمووپەتی:

﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ القصص: ٥٠.

واتـە: کـێ گومڕاتـرە لـە کەسـێک کە شـوێن، ئـارەزووی خـۆی کەوتوە بەبـێ ڕێنماییـەک لە خـواوە (سُـبحانه وتعالی).

(الزرکـشي) لـە کتێبـە ناودارەکـەی خـۆی (البرهـان في علـوم القـرآن)دا قسـەیەکی جـوان دەکا لـەو بـارەوە، دەڵێ:

(واعلـم أنـه لا يحصـل للناظـر فهـم معـاني الوحـي حقيقـة، ولا يظهـر لـه أسرار العلـم، مـن غيـب المعرفـة، وفي قلبـه بدعـة، أو إصرار على ذنـب، أو في قلبـه كـبر، أو هـوى، أو حـب الدنيـا، أو يكون غـير متحقق الإيمـان، أوضعيف التحقيـق، أو معتمـد عـلى قـول مفـسِّر ليـس عنـده إلّا علـم بظاهـر، أو يكـون راجعـاً إلى معقولـه، وهـذه كلهـا حجـب وموانـع وبعضهـا آكد من بعـض)[1].

بەڕاستیی قسەکەی زۆر جوانە، دەڵێ:

بزانـە! بـۆ کەسـێک کـە سـەرنجی مانایـەکانی وەحیـی دەدا، ڕاسـتیی بـۆ دەرناکـەوێ و نهێنییـەکانی لـە پەنهـانی زانسـتەوە بـۆ دەرناکـەون، لـە حاڵێکـدا کـە دڵـی داهێنـان و بیدعەتی تێـدا بێ، یاخـود بەردەوامیی لەسـەر گوناحێـک، یاخـود لـە دڵیـدا خـۆ بـە زلگریـی هەبـێ، یـان هـەواو ئـارەزوو هەبـێ، یـان خۆشویسـتنی دونیـا هەبـێ، یاخـود ئیمانێکـی سـاغبووەوەی نەبـێ، یـان ئیمانەکـەی بێهێزبـێ لـە سـاغکردنەوەدا، یـان پشـت بـە قسـەی ڕوونکەرەوەیـەک ببەسـتێ کە تەنیـا زانیارییەکی ڕووکەشـی لەلایە، یاخود ئـەو ڕوونکەرەوەیـە تەنیـا بگەڕێتـەوە لای عەقڵی خـۆی، ئەمانـە هەموویان

(١)- ج٢ ص ١٨٠، ١٨١.

پـەردەو ڕێگـرن و هەندێکیشـان لـە هەندێکیـان کاریگەرتـرن، لـەوەدا کـە ڕێبگـرن، مـرۆڤ وەک پێویسـت لـە فەرمایشـتی خـوا تێبگات.

**مەرجـی سـێیەم: بریتییـە لـە سـاغکردنەوەو چەسـپاندن لـە تێگەیشـتندا:**

ئەویـش بـەوە کـە نابـێ کەسـێک کـە تەماشـای قورئـان دەکات، هەرچـی بـە ڕواڵـەتی زمـانی عەرەبیـی و ڕێزمـانی عەرەبیـی هاتـە زەینییـەوە، بڵـێ ئـەوە مانـای ئایەتەکەیـە، بەڵکـو دەبـێ لێـی وردبێتـەوەو تێیـەوە ڕامێنـێ و قووڵدابچـێ، هـەر بۆیـە خـوا (سُـبحانە وتعـالی) لـە چەنـد شـوێنێکی قورئانـدا، فەرمـانی بەئێمـە کـردوە، کـە لـە ئایەتـەکانی وردبینـەوە، بۆنموونـە:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ ص: ٢٩.

واتـە: ئەمـە کتێبێکـە بـۆلای تۆمـان دابەزانـدوە، بەپێـزە تاکـو لـە ئایەتەکانیـەوە ڕامێنـن و، بـۆ ئـەوەی خـاوەن عەقـڵان پەنـد وەربگـرن.

٢ـ هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴾ محمد: ٢٤.

واتە: ئایا لە قورئان ورد نابنەوە، یان دڵەکان قوفڵیان لێ دراوە!

٣ـ هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴾ النساء: ٨٢.

واتـە: ئایـا لـە قورئـان ڕا نامێنـن! ئەگـەر لـە لای جگـە لـە خـواوە بوایـە، ناکۆکیـی و دژ یەکیـی زۆریـان تێـدا دەبینـی.

کەواتـە: سـاغکردنەوەو ڕۆچـوون و قـووڵ بوونـەوەو ڕامـان و، پەلـە نەکـردن لـە دەرهێنـانی واتـای ئایەتـەکان، ئەمیـش مەرجـی سـێیەمە.

**مەرجی چوارەم: بریتییە لە وردبوون لە گواستنەوەداو پشت بەستن بە قسەیەک یان شوێنەوەرایێک، کە چەسپاوە لە ڕووی سەنەدەوە:**

ئنجا چ لە ڕووی زمانەوانییەوە، لە شیکردنەوەی وشەیەکدا لە ڕووی زمانەوانیەوە دەبێ وردبێ، ئایا کام سەرچاوەی زمان وایگوتوە، چ لە ڕووی ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) دەقێکی سوننەت کە دێنێ، دەبێ لە ڕووی (رواية) و (دراية)ەوە چەسپاوبێ، بەس لە ڕووی سەنەدەوە نا، بەڵکو دەبێ لە ڕووی نێوەڕۆکیشەوە سەرنجی بدات، ئایا لەگەڵ قورئاندا گونجاوەو لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەردا گونجاوە (عليه الصلاة والسلام) و لەگەڵ واقیع و لەگەڵ زانست و عەقڵدا تێکناگیرێ؟! چونکە پێغەمبەری خوا - عليه االصلاة والسلام - شتێک نافەرموێ، لەگەڵ عەقڵ و لەگەڵ زانستدا تێکبگیرێ.

جگە لەوەی کە دەبێ لە ڕووی ڕیوایەت و سەنەدیشەوە لێی بکۆڵێتەوە، هەروەها لە ڕووی هۆیەکانی هاتنە خوارەوە و، لەڕووی ئەو شوێنەوارانەوە کە لە هاوەڵانەوە دەگێردرێنەوەو، لە شوێنکەوتوانی هاوەڵانەوەو ئەوانی دوای ئەوانەوە، هەروەها هەر قسەیەک لە هەر زانایەکەوە دێنێ، پێویستە بە ئەمانەتی زانستییەوە بیهێنێ.

لە ئیمام ئەحمەدەوە هاتوە کە گوتوویەتی: (ثلاثة كتب ليس لها أصول: المغازي، والملاحم، والتفسير)[1].

ئیمام ئەحمەد گوتوویەتی: سێ جۆرە کتێب، بنچینەیان نیە: (مغازي) ئەوانەی باسی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەکان، دەکەن و (الملاحم) ئەویش ئەو بەسەرهاتانەی کە لە مێژوودا باسکراون و، تەفسیر.

(١)- الخطيب في الجامع لأخلاق الراوي: ١٤٩٣.

هەڵبەتـە مـن قسـەكەی ئیـمام ئەحمـەد ڕێـک وەرناگـرم و، پێـم وایـە زێدەڕۆیـی كـردوە، چونكـە جەنگنامـەكان ئەسڵێكیان هەیـە، جـارێ ئەوەی كـە دەچێتـەوە سـەر ئایەتـەكانی قورئـان و فەرمایشـتەكانی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) یاخـود ڕووداوەكانی مێـژوو كـە چەسـپاون، ئـەوە بناغەیەكـی گرنـگ و پتـەوە، مەلاحیمیـش ئـەو بەسـەرهات و گێڕدراوانـەی سـەنەدێكی ڕاسـتیان هەبـێ، جیـان لەوانـەی بـێ بناغـەن، مەبەسـتی لـە تەفسـیریش قسـەی ئـەو كەسـانەیە كـە لـە خـۆوە لەبـارەی قورئانـەوە قسـە دەكـەن، بـەڵام پێـم وایـە هـەر چـۆن بـێ جۆرێـک لـە زێدەڕۆیـی لـە قسـەكەیدا هەیـە!.

باشـتر لـەو قسـەیەی وی، قسـەی (الإمـام عبدالرحمن بـن مهـدي) یـە كـە گوتوویـەتی: (لايجـوز أن يكـون الرجـل إمامـاً، حتـى يعلـم مايصِـحُّ مـمّا لايصـح، وحتـى لايحتـجَّ بـكل شيء، وحتـى يعلـم مخـارج العلـم)[1].

عەبدوڕڕەحـمان كـوڕی مەهدیـی دەڵـێ: دروسـت نیـە پیاوێـک ببێتـە پێشـەوا تاكـو ئـەوە نەزانـێ كـە ڕاسـتەو، جیـای نەكاتـەوە لـەوە كـە ناڕاسـتەو، هەتـا وای لـێ نەیـەت كـە بـە هەمـوو شـتێک بەڵگـە نەهێنێتـەوەو، هەتـا نەزانـێ شـوێنی لێـوە دەرچـوونی زانیاریـی (ئـەو قسـەیەی كـە دەیـكات) بەڵگەكـەی چیـە؟

(١) - أثر صحيح أخرجه أبو نعيم في الحلية: ١٢١٣٩،والبيهقي في المدخل: ١٨٨، وإسناده صحيح.

**مەرجی پێنجەم: مەرجێکی دیکە کە زۆر زۆر پێویستە بۆ کەسێک بیەوێ قورئان تەفسیربکات، بریتییە لە:**

**شارەزابوونی بە واقیعی کۆمەڵگایەکەی خۆی، واقیعی کۆمەڵگای سنووورداری خۆی کە تێیدا دەژی و واقیعی فراوانی کۆمەڵگاو، واقیعی مرۆڤایەتیی کە ئەو کاتە تێیدا دەژی:**

لە ڕاستییدا هەرکەسێک شارەزای واقیعی خۆی نەبێ و، خێرو شەڕی کۆمەڵگای خۆی نەزانێ، ناتوانێ وەک پێویست قورئان لێکبداتەوە، چ جای بیشیچەسپێنێ بەسەر ئەو واقیعەدا کە تێیدا دەژی!

بۆیە ئەوەش مەرجێکی گرنگە، وەک ئیبنولقەییم لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (الطُّرُقُ الحُكْمِيَّة في السياسة الشرعية) دا، هەروەها لە کتێبی (إعلام الموقعين عن رب العالمين) دا دەڵێ: بۆ بابای فەتوادەر (مفتي)، دوو زانیاریی پێویستن:

یەکەم: زانیارییەک بەوەی کە خوا فەرموویەتی.

دوو: زانیارییەک بەو واقیعەی کە دەیەوێ، ئەوەی خوا فەرموویەتی بەسەریدا بچەسپێنێ!.

بۆیە شارەزابوون لە واقیع، لە کۆمەڵگای خۆت و، لە تەوژمە سیاسییەکانی، لە تەوژمە فیکرییەکانی و، لە پاشخانی جۆراوجۆری ئەو کۆمەڵگایە، گرنگە بۆ کەسێک بیەوێ قورئان تەفسیربکات بۆ خەڵک، تاکو بە تەفسیرکردن و لێکدانەوەی قورئان بەسەر واقیعدا، بیچەسپێنێ بە شێوەیەکی ڕێک وڕاست و دروست.

**مەرجی شەشەم:** ڕزگاربوون لە کۆت و بەندی دۆگمایی (جمود) و لاساییکردنەوەی کوێرانەو خۆ بەستنەوەو گرێدان بە بیروڕاو بۆچوونی کات بەسەر چوو، یان گۆڕاو، بۆ واقیع و هەل و مەرجێکی دیکەی جیاواز، یان گۆڕاو لەوەی بابای تەفسیرکەر تێیدا دەژی، وەک خوای کاربەجێ سەرزەنشتی بێبڕوایانی کردوە، لەسەر لاساییکردنەوەی پێشینانی بە هەڵەدا چوو و گومڕابوویان:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ﴾ البقرة: ١٧٠

**مەرجی حەوتەم:** وەدەستهێنانی هەرچی زیاتری زانیاریی و شارەزایی بەرچاو ڕوونیی لە هەموو ڕووێکەوە، چونکە بێگومان هەتا زانیارترو هۆشیارتر بێ، قەدری فەرمایشتی خوا باشتر دەزانێ و چاکتر دەتوانێ لێی تێبگات، پێشینان گوتوویانە: (قەدری زێڕ لەلای زێڕنگەرە).



## بڕگەی چوارەم: چۆنیەتیی و شێوازی تەفسیرکردن:

پێویسـتە بـۆ تەفسـیرکردنی قورئـان بـەلای کەمـەوە، پێنـج بنەمـا ڕەچاوبکرێـن، کـە ئەمانـەن:

**بنەمای یەکەم: ئەوەیە کە قورئان بە قورئان تەفسیر بکات:**

زانایـان لـە مێـژە گوتوویانـە: (القـرآن یفـسِّر بعضُـهُ بعضـاً)، قورئـان هەندێکـی هەندێکـی ڕوون دەکاتـەوە.

ئەمـە بنەمایەکـی یەکجـار گرنگـە، بـۆ هـەر کەسـێک بیـەوێ قورئـان تەفسـیربکاو، لێکداتـەوەو ڕوونی بکاتـەوە، چونکـە خـوا (سُـبحانە وتعـالی) لـە شـوێنێک ئایەتێـک دێنـێ بەکورتیـی، بـەڵام ئـەو مەبەسـتەی ئـەو ئایەتـە بەکورتیـی لەبارەیـەوە دەدوێ، لـە شـوێنێکی دیکـە ڕوونی دەکاتـەوە، بەڵکـو جـاری وا هەیـە هـەر لەیـەک سـیاقدا خـوا سـبحانە تعـالی وشـەیەک بـاس دەکات، دوایـی بـە ئایەتـەکانی دیکـە ئـەو وشـەیە ڕوون دەکاتـەوە، بـۆ وێنـە:

١ـ خوا (سُبحانە وتعالی) دەفەرموێ:

﴿ٱلۡقَارِعَةُ ۝١ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ۝٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ۝٣﴾ القارعة.

واتـە: داچڵەکێنـەر، داچڵەکێنـەر چییـە؟ چـی پێـی زانانـدووی داچڵەکێنـەر چیـە؟

دوایێ ڕوونی دەکاتەوە:

﴿يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ۝٤ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ ۝٥﴾ القارعة.

واتـە: ڕۆژێکـە خەڵـک وەک پەپوولـەی پـرژو بڵاو دەبـن. چیایەکانیش وەک خوریـی شـکنراوە دەبن.

وەک دیارە ئایەتەکانی دوایی ئەوەی کە لە ئایەتەکانی پێشێدا، پرسیار لەبارەیەوە کراوە، ڕوونی دەکەنەوە.

٢ـ هەروەها لە سووڕەتی (الفاتحة) دا ئێمە دەخوێنین:

﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ ﴾ الفاتحة: ٤.

خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت.

هەڵبەتە بە (مَلِكِ يوم الدين)یش خوێندراوەتەوە.

ئنجا ئایا ڕۆژی سزاو پاداشت، چ ڕۆژێکە؟ ئەوە لە سووڕەتی (الإنفطار)دا ئایەتەکانی (١٧ و ١٨ و ١٩)دا، ڕوونی دەکاتەوە:

﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدْرَىٰكَ مَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْـًٔا ۖ وَٱلْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾ ﴾ الانفطار.

واتە: چی بە تۆی زانانـدوە ڕۆژی سزاو پاداشت چییە؟ جارێکی دیکەش چی بە تۆی زانانـدوە ڕۆژی سزاو پاداشت چییە؟ ئەو ڕۆژەیە کە هیچکەس بۆ هیچکەس هیچی لە دەست نایەت و، کار هەمووی بەدەست خوایە.

هەڵبەتە ئەوە ڕوونکردنەوەی گۆشەیەکە لە گۆشەکانی ڕۆژی دوایی.

٣ـ هەروەها خوا (سُبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (آل عمران) دا دەفەرمویێ:

﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾ آل عمران: ٩٧.

واتە: بۆ خوا لەسەر خەڵکە سەردانی ماڵ (ماڵەکەی خوا، کەعبە) بۆ هەرکەسێک کە ڕێی تێبەرێ (بتوانێ بۆی بچێ).

بەڵام ئایا ئێمە چۆن حەج دەکەین؟ لە ئایەتەکانی سووڕەتی (البقرة) (١٩٦ – ٢٠٣) هەروەها لە ئایەتەکانی سووڕەتی (الحج) (٢٦ – ٣٧) دا خوا (سُبحانه وتعالى) بە تەفسیل باسی چۆنیەتیی ئەنجامدانی

خـوا پەرسـتییەکانی حـەج (مناسـک الحـج) ی کـردوه.

پێغەمبـەری خاتەمیـش (صـلی اللـه علیـه وسـلم) ئـەم شـێوازەی بەکارهێنـاوە، بەقورئـان قورئـانی تەفسـیر کـردوە، وەک لـەم فەرموودەیـەوە دیـارە:

(عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال: لما نزلت:
﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ الأنعام: ﴿٨٢﴾.
شـقَّ ذلـك عـلى أصحـاب رسـول اللـه - (صـلى اللـه عليـه وسـلم) - وقالـوا: أينَّـا لايظلـم نفسـه؟ فقـال رسـول اللـه - (صـلى اللـه عليـه وسـلم): ليـس هـو كـما تظنـون، إنمـا هـو كـما قـال لقـمان لابنـه:
﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾ لقمان: ﴿١٣﴾)[1].

واتە: عبدالله ی کوڕی مەسعوود دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی:
﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ الأنعام: ﴿٨٢﴾.

واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو، سـتەمیان لەگـەڵ ئیمانەکەیانـدا تێکـەڵ نەکـردوە، ئەوانـە دڵنیاییـان بـۆ هەیـەو، ئەوانـە ڕێـی ڕاسـتگرتوون.

ئەمـە لەسـەر دڵـی هـاوەڵان قـورس بـوو، هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) گوتیـان: کـێ لـە ئێمـە سـتەمی نەکـردوە؟! (ئـەم ئایەتـە دەفەرمـوێ: دەبـێ ئیمانـت هێنابـێ و ستەمیشـت لەگـەڵ ئیمانەکەتـدا تێکـەڵ نەکردبـێ، ئنجا دڵنیا دەبی لە سزای خـوا؟) پێغەمبەری خـواش (علیه الصـلاة والسـلام) دەفەرمـوێ: وا نیـە کـە ئێـوە گومـان دەبـەن، بەڵکـو ئەوە وەک قسـەی لوقمانـە بـۆ کوڕەکـەی، کـە پێیگـوت:
﴿وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾ لقمـان: ﴿١٣﴾.

(١) - البخاري:٣٢، ومسلم: ١٢٤.

واتــە: یــاد بکــەوە کاتێــک لوقــمان لــە کورەکــەی خــۆی گــوت کــە ئامۆژگاریــی دەکــرد:

ئــەی ڕۆڵــە گیــان! هــاوەڵ و هاوبــەش بۆ خــوا دامەنێ، بێگومــان هاوبەش دانان ســتەمێکی مەزنە.

کەواتــە: ســتەم (ظلم) لێرەدا مەبەســت پێــی هاوبەش بۆ خــوا دانانە، یانی: ئەوانــەی ئیمانیان هێناوەو شــیرکیان نەکردوە.

**بنەمـای دووەم: ئەوەیـە کـە لەبـەر ڕۆشـنایی سـوننەتداو بە هـۆی ڕێبازی پێغەمبـەرەوە (صـلى اللـه عليه وسـلم) تەماشـای ئایەتەکانی قورئـان بکەین:**

هەڵبەتــە ڕێبــازی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەگشــتیی و، هەندێک لــە دەقــەکانی ســوننەتیش لەبــارەی هەندێــک ئایــەتی تایبەتــەوە، بەتایبــەت، چونکــە پێغەمبــەری خــوا (عليــه الصلاة والســلام) بەچەنــد جۆرێــک قورئانی ڕوونکردۆتــەوە، هەڵبەتــە قورئــان بۆ خۆی ڕوونــە، بەڵام ئەگەر هەندێک شــت کــە لــە هــاوەڵان ئیشــکال بووبــێ، بــۆی ڕوونکردوونەوە، بــۆ وێنە:

١. لە سوورەتی (الشمس)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا﴾ الشمس: ١٢.

واتــە: کاتێــک خراپترینــی گەلی ســەموود دەرچــوو (بۆ پەیکردن و پاشــان ســەربڕینی حوشترەکە).

پێغەمبــەر (عليــه الصــلاة والســلام) ڕوونی کردۆتــەوە: (فقــال: إنبعــث لها رجـل عزيـز عـارم منيـع في رهطه، مثـل أبي زمعـة)[1].

واتــە: پیاوێــک، بەهێــز، خراپــەکارو لــە نێــو گەلەکەیــدا بەرگرییلێکــراو، بــۆی دەرچــوو، وەک ئەبــی زەمعــە وابــوو.

ئەبــو زەمعــە کــە لەســەردەمی نەفامییــدا بــووە، پیاوێکی بەدەســتەڵات و

---

(١)- البخاري:٤٦٥٨، ومسلم: ٢١٥٥.

خراپەکار بووە و، پێغەمبەر فەرموویەتی: سەربڕی حوشترەکەی (صالح) وەک وی بوو.

٢. هەروەها پێغەمبەر - (علیه الصلاة والسلام) (السبع المثاني) بە فەرمایشتی خۆی ڕوون کردتەوە، فەرموویەتی: (الحمدلله رب العالمین، هي السبع المثاني والقرآن العظیم الذي أوتیته)[١].

پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ویستوویەتی ئەمەی پێ تەفسیربکا: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ الحجر: ٨٧.

ئنجا فەرموویەتی: الحمدلله رب العالیمن (واتە: سوورەتی فاتیحە) حەوت ئایەتە دووبارەکراوەکەن و، ئەو قورئانە مەزنەن کە پێم دراوە.

٣. جاری واش هەبووە بە هۆی ڕێبازی پێغەمبەرەوە، شتێک کە بەکورتیی هاتوە، ئەو بە درێژیی ڕوونی کردۆتەوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ﴾ المائدة: ٣.

واتە: مردارتان لەسەر قەدەغە کراوە.

بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕوونی کردۆتەوە کە مرداربووی نێو دەریا ڕەوایە، فەرموویەتی: (هو الطهور ماؤه، الحلُّ مَیْتَتُهُ)، واتە: دەریا ئاوەکەشی پاکەو مردارەوەبووەکەشی حەڵاڵە[٢].

واتە: هەروەها پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) لەبارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، کە دەفەرموێ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ إبراهیم: ٢٧.

٤. خوا بە قسەی چەسپاو ئەوانەی بڕوایان هێناوە، لە ژیانی دنیاو

---

(١)- البخاري:٤٢٠٤، هەروەها بە ژمارە: ٤٤٢٧ هێناویەتی.

(٢) - المالك في الموطأ: ٤٥، وأحمد: ٧٢٣٣، وأبوداود: ٨٣، والترمذي: ٦٩، والنسائي: ٥٩،١٧٦ - ٤٣٥٠، وابن ماجه: ٣٨٦،٣١٤٦.

دوارۆژدا، دەیانچەسپێنێ، ئەم دەقەی لەبارەوە هاتوە: (عن البراء بن عازب رضي الله عنه أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: المسلم إذا سُئِلَ في القبر، يشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله، فذلك قوله: (يُثَبِّت الله الذين آمنوا بالقول الثابت في الحياة الدنيا وفي الآخرة)[1].

واتە: مسوڵمان کاتێک لە گۆڕدا لێی دەپرسرێ، شایەدیی دەدا کە جگە لەخوا هیچ پەرستراوێک نیەو، موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوە فەرمایشتی خوایە کە دەفەرموێ: خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بەقسەی چەسپاو دەچەسپێنێ، لە ژیانی دونیاو لە مەنزڵگەی کۆتاییشدا.

٥. جاری واش هەبووە کە لە ئایەتێکدا ئیشکالێک دروست بووە بۆ هاوەڵان، پێغەمبەری خواش (عليه الصلاة والسلام) ئەو ئیشکالەی ڕەواندۆتەوە، وەک لەم حەدیسەدا هاتوە: (عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) من حُوسِبَ عُذِّب، فقلت: أليس قد قال الله عزوجل: (فسوف يحاسب حساباً يسيراً) فقال: ليس ذاك الحساب، إنما ذاك العَرْضُ، من نوقش الحساب يوم القيامة عُذِّب[2].

دایکمان خاتو عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: هەرکەسێک لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ، سزا دەدرێ، منیش گوتم: ئەدی خوا - عزوجل- نەیفەرمووە: (فسوف يحاسب حساباً يسيراً)، (لێپرسنەوەیەکی ئاسانی لەگەڵ دەکرێ؟! (الإنشقاق) – ٨) فەرمووی: ئەوە ئەو حیساب و لێپریسنەوەیە نیە کە من مەبەستمە،

(١)- البخاري: ١٣٠٣و ١٤٢٢ ومسلم: ٢٨٧١ .
(٢) - البخاري: ١٠٣، ومسلم: ٢٨٧٦.

بەڵکو ئەوە هەر ڕانواندنە، بەڵام هەرکەسێک لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ لە ڕۆژی دواییدا، ئازارو سزا دەدرێ.

٦. جاری واش هەیە پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) بە دەقێکی سوننەت ئەوەی کە لە قورئاندا هاتوە، هەوڵیداوە زیاتر ڕوونی بکاتەوە، بۆ وێنە: (عن عبدالله بن الشخير قال: أتيت النبي (صلى الله عليه وسلم) وهو يقرأ: (ألهاكم التكاثر) قال: يقول ابن ادم: مالي مالي، قال: وهل لك يا ابن ادم من مالك إلّا ما أكلت فأفنيت، أو لبست، فأبليت أو تصدَّقت فأمضيت؟!)[1].

واتە: عبدالله ی کوڕی شیخخير دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەکاتێکدا کە (ألهاكم التكاثر)ی دەخوێندو دەیفەرموو: ڕۆڵەی ئادەم! دەڵێ:سامانەکەم، سامانەکەم، ئەی ڕۆڵەی ئادەم! ئایا تۆ لە سامان وماڵەکەت، تەنیا ئەوەندە نیە، کە خواردووتەو تەواوت کردوە، یاخود پۆشیوتەو ڕزاندووتە، یاخود کردووتە بە خێرو چاکەو تێت پەڕاندوە؟!

گومانی تێدا نیە: ئەو شوێنانەش، کە پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) بە هۆی دەقێکی سوننەتیەوە لە قورئانی مەزن، چ وشەیەکی قورئان، چ ڕستەیەک، ڕوونی کردوونەوە، ئەوەش دوای پشت بەستن بە قورئان، بۆ تێگەیشتنی قورئان، بنەمای گرنگی دووەمە.

**بنەمای سێیەم: ئەوەیە کە ئێمە بە شوێنەوارەکانی هاوەڵان، قسەکانیان و کردەوەکانیان و ڕەفتارەکانیان، لە قورئان تێبگەین:**

هەڵبەتە زانایان لەو بارەوە مشت و مڕیان زۆر بووە، کە

---

(١) - أخرجه مسلم: ٢٥٥٨.

ئایـا قسـەی هـاوەڵان چۆنـەو حوکمـی چییـە؟ بەگشـتیی تەفسـیرکردنی هاوەڵانیـان بـۆ قورئـان کـردوە بـە چـوار بەشـەوە:

**بـەشی یەکـەم: گێڕانـەوەی ئەوەیـە کـە لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەردا بـووە (صـلی اللـه علیـه وسـلم) وەک هـۆی هاتنـە خـواری ئایەتێـک یـان سـوورەتێک، یـان هەواڵـدان لەبـارەی شـتێکەوە، کـە لەوکاتـەدا بـووە:**

بـۆ وێنـە: دایکـمان خاتـو عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ، ئـەم ئایەتـە موبارەکـەی خوێنـدەوە:

﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾ الأحـزاب: ١٠.

دایکمان خاتو عائیشە گوتی: [قالت: کان ذلك یوم الخندق][1].

واتـە: ئـەوە کـە خـوا باسـی دەکات لـە ڕۆژی خەندەقـدا بـووە، (لـە جەنگـی ئەحزابـدا).

ئەمـە زانایـان دەڵێـن: حوکمەکـەی حوکمـی فەرمـوودەی مەڕفووعـە، واتـە: بەرزکرابێتـەوە بـۆ لای پێغەمبـەر (علیـه الصـلاة والسـلام) و بـە بەڵگـە دادەنـدرێ، چونکـە خاتـو عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، ئـاگاداری جەنگەکـە بـووە، ئـاگاداری حاڵەکـە بـووەو، زانیویشـیەتی ئـەم ڕسـتە قورئانییـە، لـە بـارەی چ ڕۆژێـک و چ بەسـەرهاتێک و چ ڕووداوێکـەوە دەدوێ؟

**بەشی دووەم: ئەوەیە کە شێوەی ئەوە بە عەقڵ و ڕا نەگوترێ.**

ئەمیـش دیسـان هـەر حوکمـی فەرمـوودەی مەرفوعـی هەیـە، کـە بەرزکرابێتـەوە بـۆلای پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) وەک:

(١) - البخاري: ٣٨٧٧، ومسلم: ٣٠٢٠.

أ ـ ئەو دەقەی کە ئیبنو عەبباس دەیهێنێ لەبارەی ئیسماعیل - علیه السلام - و بابی و دایکی و (ئیبراهیم و هاجەر) - صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ و، بنیاتنانی کەعبە، کە بەسەرهاتێکی دوورو درێژی باسکردوە، بەڵام لەوێدا نەیگوتوە: (قال النبي (صلى الله عليه وسلم)) پێغەمبەری خوا فەرمووی، کە لە سەحیحی بوخارییدا هاتوە بە ژمارە (٣٣٨٤) بەڵام ئەمە بێگومان حوکمی مەرفووعی هەیە، چونکە قسەی وا بە ڕا و عەقڵ و بۆچوون ناکرێ.

هەروەها قسەیەکی دیکەی ئیبنو عەبباس لەو بارەوە کە گوتوویەتی: [ليس في الدنيا شيء مِمّا في الجنة إلا الأسماء] واتە: لەوەی کە لە بەهەشتدا هەیە، لە دنیادا هیچیان نین، جگە لە ناوەکانیان (واتە: ئەو نازو نیعمەتانەی خوا باسیان دەکا لە بەهەشتدا، بەس ناوەکانیان لە دونیادا هەن)[(١)].

ئەمە بۆچی دەگوترێ: حوکمەکەی ئەوەیە کە بەرز کراوەتەوە بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ؟ چونکە بە ڕاو بۆچوون، خۆ شتی وا ناگوترێ.

ئنجا ئەوە کە عبدالله ی کوڕی عەبباس ئەم قسەیەی لە ئیسرائیلیاتەوە هێنابێ، ئەگەرەکەی زۆر بێ هێزە، چونکە نەچەسپاوە عبدالله ی کوڕی عەبباس لە ئیسرائیلیاتەوە شتی هێنابێ، تەنیا جار جار گوێی لە (کعب الأحبار) گرتوە، بەڵام ئەویش کەمەو، جاری واشە ڕەخنەی لێ گرتوە، بەڵام هەندێک لە هاوەڵان وەک عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص و، ئەبوهورەیرە، کە لە زانایانی خاوەن کتێب، ئیسرائیلیاتەوە، شتیان گواستوەتەوە، بێگومان ئەوەی دەیڵێن، یەکسەر حوکمی فەرموودەی بەرز کراوەی نیە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

---

(١)- أخرجه وكيع بن جراح في نسخته عن الأعمش: ١، وهناد في الزهد: ٣ - ٨، وابن جرير في تفسيره: ج١ ص١٧٤، وابن حاتم في تفسيره: ٢٦٠. وآسناده صحيح.

أ ـ بۆ وێنە: (قول أبي هريرة في تفسير قوله تعالى:
﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا﴾ القصص: ٤٦.
قال نودي أن، يا أمة محمد! أعطيتكم قبل أن تسألوني، وأجبتكم قبل أن تدعوني[1].

ئەبو هورەیرە لە لێكدانەوی فەرموودەی خوا: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذۡ نَادَيۡنَا﴾ القصص: ٤٦، دا گوتوویوتی: بانگكرا: ئەی ئۆممەتی موحەممەد! بەر لەوەی داوام لێبكەن پێمداون و، بەر لەوەی بانگم بكەن و لێم بپاڕێنەوە، وەڵامم داوەنەوە.

بەڵام ناتوانین بڵێین: ئەوە حوكمی بەرزكراوە (مرفوع)ی هەیە، چونكە دەگونجێ ئەبوهورەیرە لە زانایانی جوولەكەوە وەری گرتبێ.

**بەشی سێیەم: لە جۆرەكانی قسەی هاوەڵان ئەوەیە كە وشەیەكیان ڕوون كردبێتەوە، لەو ڕووەوە كە عەرەب وایان بەكارهێناوە:**

كە مادام ئەو هاوەڵە (خوا لێی ڕازی بێ)، شارەزابێ، قسەكەی بە بەڵگە دادەنرێ لە گواستنەوەی زماندا، ئنجا ئەوەی كە ئیبنو عەبباس دەیڵێ لەو ڕووەوە، لەوەی (الخليل بن أحمد بن الفراهيدي، والفراء و أبو عبيدة) و ئەوانی دیكە دەیڵێن، بەهێزترە.

**بەشی چوارەم: لە قسەی هاوەڵان ئەوەیە كە ئەو هاوەڵە بە بۆچوونی خۆی قسەیەكی كردبێ:**

كە ئەمە غەیری ئەو سێ بەشەیەو، ئەوە بۆچوونی خۆیەتی و بە بەڵگەیەكی پابەندكەر (المُلْزِم) دانانرێ و، ئەوەش زۆر زۆرە لە تەفسیری قورئاندا.

(١) - أثر صحيح أخرجه النسائي في التفسير: ٤٠٢، وابن أبي حاتم: ١٦٩٤٦، والحاكم: ٣٥٣٥، وإسناده صحيح.

**بنەمـــای چـــوارەم: بـــۆ تەفســـیرکردنی قورئـــان، ئەوەیـــە کـــە ئێمـــە قورئـــان تەفســـیر بکەیـــن و ڕوونی کەینـــەوە، بـــە قســـەی شـــوێنکەوتوانی هـــاوڵان و ئـــەوانی دوای وان:**

کـە ئەمـەش زۆر زۆرەو زانایانێـک، کـە لـەدوای هاوەڵانـەوە هاتـوون و لەوانـەوە زانسـتیان وەرگرتـوە، بێگومـان قسـەیان زۆر کـردوە لەبـارەی قورئانـــەوەو، بۆمـــان هەیـــە، کـــە لەوانیشـــەوە بەهرەمەندبیـــن، بـــەڵام بێگومـان جگـە لـەو قسـانەی هـاوەڵان، کـە پێـیان وایـە: بـە بۆچـوونی خۆیـان نەیانگوتـوە، بەڵکـو لـە پێغەمبەریـان بیسـتوە، لەبـەر ئـەوەی ئـەو بابەتـە لـەو جـۆرە نیـە، کـە مـرۆڤ بەعەقڵـی خـۆی بیڵـێ، جگـە لـەوە، ئـەوی دیکـە هیچـی پابەندکـەر نیـە بـۆ کـەس!

**بنەمـای پێنجـەم: ئەوەیـە کـە تەماشـای دەلالـەتی زمانەوانیـی بکـرێ و، تەماشـای قیاسـکردنی هاووێنـەکان بـۆ سـەر یەکدی بکـرێ:**

ئەمیـش بێگومـان بنەمایەکـی گرنگـەو، پێویسـتە تەماشـا بکـرێ: ئایـا ئـەو وشـەیە لـە ئەسـلی زمـانی عەرەبییـدا، واتایەکـی هەیـە، دوو واتـای هـەن، زیاتـری هـەن؟ چـۆن بـەکار هێـنراوە؟

هەروەهـا ئـەو شـتانەی، کـە وێـک دەچـن، قیـاس دەکرێنـە سـەر یەکدی، کـە ئـەوەش زانایـان زۆر گرنگییـان پێـداوە، بـۆ وێنـە: عبداللـە ی کـوڕی عەبـاس دەڵـێ: (کنـت لا أدري مـا فاطـر السـماوات والأرض؟ حتـى أتـاني أعرابيـان يختصـمان في بـئر، فقـال أحدهـما: أنـا فطرتهـا، يقـول أنـا ابتدأتهـا)[1].

واتـە: عبداللـە ی کـوڕی عەبـاس دەڵـێ: نەمـدەزانی (فاطـر السـماوات والأرض) یـانی چـی، تاکـو دوو عەرەبیـی خێڵەکیـی هاتنـە

(١) - أبوعبيد في فضائل القرآن: ص٣٤٥، هەروەها ابن الأنباري في الوقت والإبتداء: ١٠٩،البيهقي في الشعب: ١٦٨٢، بسند حسن.

لام، لەبارەی بیرێکەوە ناکۆکیی و مشتومڕیان بوو، یەکێکیان گوتی: (أنا فطرتها)، واتە: من یەکەم جار بیرەکەم لێداوە، (کەواتە: (فاطر) یانی پەیداکەر لەنوێ، کەسێک، زاتێک کە ئەم گەردوونەی پەیدا کردوە، کە پێشتر وێنەی نەبووە).

هەروەها ئەو زانستانەی وەک پێشەکیی وان بۆ لێتێگەیشتنی قورئان، کە هەر پێوەندییان بە زمانی عەرەبیی و، بە (قیاس) و ئەوانەوە هەیە، بۆ وێنە: شارەزابیێ لە ئوسوولی فیقهـ، هەروەها شارەزابیێ لە هۆیەکانی هاتنە خوارو، لە خوێندنەوەکانی قورئان، ئەوانەش بێگومان هاوکاری دەبن بۆ چاکتر لێ تێگەیشتنی قورئان.



## بڕگەی پێنجەم: مێژووی تەفسیری قورئان (تأريخ تفسير القرآن):

خوا (سُبحانه وتعالى) کە فەرمایشتی کۆتایی خۆی بۆ پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دابەزاندوە، ئەو فەرمایشتە، خوا لە چەندان ئایەتدا ڕایگەیاندوە کە فەرمایشتێکە ڕوونە:

١- ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ۝١ ﴾ الحجر.
٢- ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ۝١ ﴾ النمل.
٣- ﴿ بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ ۝٥٢ ﴾ الأعراف.
٤- ﴿ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ۝١ ﴾ هود.

لە چەندان شوێندا خوا (سُبحانه وتعالى) باسی ڕوونیی فەرمایشتەکەی خۆی کردوە، بۆیە پشت (جیل)ی یەکەمی مسوڵمانان، کە هاوەڵانن خوا لێیان ڕازی بێ، لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەمدا (صلى الله عليه وسلم) خۆیان کە عەرەبیی زمان بوون و قورئانیش بە عەرەبیی دابەزێندراوە، لە هەمووی تێگەیشتوون، مەگەر لە وشەیەک، یان ڕستەیەک، لە ئایەتێک دا، یەکێکیان گرفتێکی بۆ دروست بووبێ، ئەویش گەڕاوەتەوە بۆ لای پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) پێغەمبەری خواش تیشکی بۆ خستۆتە سەر، وەک لەو بارەوە قسەمان لێکرد.

مێژووی تەفسیرکردنی قورئان بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم:** لە ڕۆژگاری هاوەڵاندا.

**قۆناغی دووەم:** لە ڕۆژگاری شوێنکەوتوانی هاوەڵاندا (تابعي

الصحابــــة) و ، ڕۆژگارەکانی دیکـــەش لــــە دوای جیلــــی تابیعیـــــن و جیلـــەکانی دی.

**قۆناغـــی ســـێیەم:** دانـــانی تەفســـیرەکان، کـــە هەتـــا ئـــەم ڕۆژگارەی ئێســـتای ئێمـــە بەردەوامــە.

ئێمە سەرو تیشک دەخەینە سەر ئەو سێ قۆناغە:

**قۆناغـی یەکـەم: تەفسـیرکردنی قورئـان لـە ڕۆژگاری هاوەڵانـدا - خـوا لێیـان ڕازی بـێ - :**

هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ کاتێـک وەحیـی خـوای پـەروەردگار دادەبـەزی، لەبـەر ئـەوەی بەزمـانی عەڕەبیـی بـوو، بۆیـان ڕوون بـوو، مەگـەر چۆن، وشـەیەک، ڕسـتەیەک، ئایەتێـک بـۆ ئـەوان جێـی ئیشـکال بووبـێ، ئەویـش گەڕاونـەوە بـۆ لای پێغەمبـەری خاتـەم (صـلى اللـه عليـه وسـلم) ئەگـەر نـا هەمـووی بـۆ ئـەوان ڕوون بـووە، ئێمـە لـەو بـارەوە، دوو وێنـان دێنینـەوە:

**وێنـەی یەکـەم:** کاتێـک ئایـەتی ژمـارە (٨٢) لـە سـوورەتی (الأنعـام) دابـەزی:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ الأنعام: ٨٢.

خـوا دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو، ئیمانەکەشـیان لەگـەڵ سـتەمدا تێکـەڵ نەکـردوە، ئائەوانـە دڵنیاییـان بـۆ هەیـەو، ئەوانـە ڕێـی ڕاسـتگرتوون.

کاتێک ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزی، لەسەر هاوەڵان قورس بوو، پێیان وابوو مەبەست لە (ظلم) گوناحە بە ڕەهایی، ئنجا گوتیان: کێ لە ئێمە ستەمی نەکردوە؟، وەک پێشتریش ئەو دەقەمان لەو بارەوە هێنا، ئەمەش ئەو دەقەیە کە هەرکام لە بوخاریی بە ژمارە (٣٢) و موسلیم بە ژمارە (١٢٤) هێناویانە:

(لما نزلت:
﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴾ الأنعام: ٨٢.
شـقَّ ذلـك عـلى أصحـاب رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم)، وقالـوا: أيُّنـا لايَظْلِـمُ نَفْسَـه؟ فقـال رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم): ليـس هـو كـما تظنـون، إنمـا هـو كـما قـال لقـمان لابنـه:
﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَـٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ لقمـان: ١٣.)

کاتێـک ئـەم ئایەتـە دابەزیـوە، لەسـەر هـاوەڵان قـورس بـووەو هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (صـلى اللـه عليـه وسـلم) گوتیـان: کێ لـە ئێمە ستەم لـە خـۆی نـاکات؟ پێغەمبـەری خـواش (عليـه الصـلاة والسـلام) بۆی ڕوونکردنـەوەو فەرمـووی: وا نیـە وەک ئێـوە گومـان دەبـەن، بەڵکـو ئـەوە وەک ئـەو قسـەیەی لوقـمان وایـە کـە بـە کوڕەکـەی گـوت:
﴿ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ لقمان: ١٣.
ئـەی ڕۆڵـە گیـان! هـاوەڵ و، هاوبـەش بـۆ خـوا دامەنـێ، چونکـە هاوبـەش بـۆ خوادانـان، سـتەمێکی مەزنـە.
کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ:
﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴾ الأنعام: ٨٢.
یـانی: ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو، ئیمانەکەشـیان لەگـەڵ شـیرکدا تێکـەڵ نەکـردوە.

**وێنەی دووەم:**

(قال عدي: لما نزلت:
﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ﴾ البقرة: ١٨٧.
(عمـدت إلى عِقـالٍ أسـود وإلى عِقـال أبيـض، فجعلتهـا تحت وسـادتي،

فجعلت أنظر في الّليل فلايستبين لي، فغدوت على رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فذكرت له ذلك، فقال: إنما ذلك سواد الليل وبياض النهار)[١].

واتە: عەدی کوڕی حاتەمی تائیی دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزی :

﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ البقرة: ١٨٧.

[کە ڕستەیەکە لە ئایەتی ژمارە (١٨٧)ی سوورەتی (البقرة) ].

من هەڵسام عیقاڵێکی (عیقال ئەوە بووە کە لەسەریان ئاڵاندووەو لە جیاتی مێزەری ئێستا بووە، یاخود هەر گوریسێک و پەتێک بووە کە حوشتریان پێ بەستووەتەوە) ڕەش و یەکێکی سپییم هێنا، لە ژێر سەرینەکەمم دانان و، بەشەوێ هەر تەماشام دەکردن، تاکو بۆم دەرکەوێ: کامیان ڕەشەو کامیان سپییە؟ بەڵام بۆم دەرنەدەکەوت، بەیانیی زوو چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا - علیه الصلاة والسلام- ئەوەم بۆ باسکرد، ئەویش فەرمووی: مەبەست لە (الخيط الأبيض و الخيط الأسود) تاریکایی شەو و ڕۆشنایی ڕۆژگارە (نەک گوریسێک یان عیقاڵێکی ڕەش و یەکێکی سپیی).

واتە: تاکو سپێدەی بەرە بەیان لە ڕەشایی شەو، جیا دەبێتەوە.

لەو بارەوەش نموونەی دیکە زۆرن، کە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، شتێک کە بۆیان ئیشکال بووبێ، پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) بۆی ڕوون کردوونەوە.

کاتێک کە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) لە ژیاندا بوو، هاوەڵان یەکسەر دەچوونە خزمەتی و شتێک کە بۆیان ناڕوون

(١) - البخاري: ١٨١٧ و ٤٢٣٩ و٤٢٤٠، ومسلم: ١٠٩٠.

بوویێ، داوایان لێکردووەو بۆی ڕوون کردوونەوە.

بەڵام دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) کە خەڵک بە کۆمەڵ هاتنە نێو ئیسلام و فراوان بوونی پانتایی دەوڵەتی ئیسلامیی لێ کەوتەوە، کە موڵکی فارس و زۆربەی موڵکی ڕۆمی گرتەوە، هەروەها بەلای میسرو کیشوەری ئەفریقادا ڕۆیی، هەروەها لەولاوە بەرەو ئاسیا ڕۆیشت و، خەڵکێکی زۆر هاتنە نێو ئیسلامەوە، کە زمانیان زمانی عەرەبیی نەبوو، بۆیە ئەوانە پێویستییان بەوە هەبوو، کە قورئانیان بۆ ڕوون بکرێتەوە.

ئنجا ئەوانەی کە لەو ڕۆژگارەدا، خەڵک ڕوویان تێدەکردن بۆ لێتێگەیشتن لە قورئان و، بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام بەگشتیی، ئەمانە بوون:

١ـ أبو بكر الصديق.
٢ـ عمر بن الخطاب.
٣ـ عثمان بن عفان.
٤ـ علي بن أبي طالب.
٥ـ عبدالله بن مسعود.
٦ـ عبدالله بن عباس.
٧ـ أبي بن كعب.
٨ـ زيد بن ثابت.
٩ـ عائشة.
١٠ـ أبوموسى الأشعري.
١١ـ معاذ بن جبل.
١٢ـ أبوالدرداء.



١٣ـ عبدالله بن عمر.

١٤ـ أنس بن مالك.

١٥ـ أم سلمة.

١٦ـ عبداللـه بـن عمـرو بـن العـاص و، ژمارەیەكـی دیكـەش لـە هـاوەڵان، خـوا لـە هەموویـان ڕازی بـێ.

ئەمانـە ئـەو كەسـانە بـوون، كـە خەڵـك بـۆ لایـان دەگەڕانـەوە، بـۆ لـێ تێگەیشـتنی قوڕئـان.

هەڵبەتـە لـە نێـو ئەوانەشـدا سـێیان دیارتربـوون، یـان ڕۆڵـی زیاتریـان بینیـوە لـە ڕوونكردنـەوەی قوڕئانـدا:

**یەكـەم:** (عبداللـه بـن عبـاس بـن عبدالمطلـب) خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ.

كـە ئـەو تەفسـیرەی لـەوەوە نەقـڵ كـراوە، لـە هیـچ كام لـە هاوەڵانـی پێغەمبـەرەوە (علیـە الصـلاة والسـلام) هێنـدە نەقـڵ نەكـراوە و نەگێڕراوەتـەوە، ئەویـش پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـە علیـە وسـلم) بـە تایبـەت دوعـای بـۆ كـردوە، كـە ئەمـە دەقـی دوعایەكـەیـەتی، فەرموویەتی: (أللَّهم فقهِّه في الدين، وعلّمه التأويل)[1].

واتـە: ئـەی خوایـە! لـە ئاییندا شـارەزای بكـەو، لێكدانەوەی تەفسـیری قوڕئـانی فێربكـە. تەئویلیش تەفسـیرە یـانی: ڕوونكردنـەوەی قوڕئان.

عومـەری كـوڕی خەتتـاب (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لـە ڕۆژگاری خۆیـدا ڕاوێـژی بـە عبداللـە ی كـوڕی عەببـاس كـردوەو لـە ڕیـزی هـاوەڵانی بـەدردا داینـاوە، هەرچەنـدە تەمـەنی كـەم بـووە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی لـە قوڕئانـدا شـارەزا بـووە، ئنجـا كـە لـەو بارەشـەوە گلەیـی لێكـراوە، وەك

(١) - أخرجه أحمد: ٢٣٩٧ - ٢٨٧٩ - ٣٠٣٢ - ٣١٠١ وابن سعد في الطبقات: ج٢ ص٣٦٥، وابن حبان: ٧٠٥٥، والحاكم: ٦٢٨٠، وأصله في الصحيحين.

لـه تەفسـیری سـوورەتی (النـصر) دا باسـهان کـردوه، عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ، هـاوەڵانی تاقیکردوونـەوەو عبداللـه ی کـوڕی عەبباسیشـیان لـە نێـودا بـووه، عبداللـه ی کـوڕی عەبـباس وەڵامـی پرسـیارەکەی بەڕاسـتی داوەتـەوە.

هەروەهـا لەبـارەی عبداللـه ی کـوڕی عەبباسـەوە، عبداللـه ی کـوڕی مەسـعوود کـه یەکێـک بـووه لـه زۆر شـارەزایانی هـاوەڵان، هـەم لـه قورئانـداو هـەم لـه دینداریـیـدا، بـه گشـتیی، گوتوویـەتی: (نعـم ترجـهان القـرآن ابـن عبـاس)[1].

عبداللـه ی کـوڕی مەسـعوود گوتوویـەتی: باشـترین وەرگێـڕەری قورئـان ئیبنـو عەبباسـه، تەرجومانیـش کەسێکه کـه قورئـان ڕوون دەکاتـەوەو مانـای دەکات.

(مجاهـد بـن المكـي) کـه قوتابـی عبداللـه ی کـوڕی عەبـباس بـووه گوتوویـەتی: [كان ابـن عبـاس إذا فـسَّر شـيئاً رأيـت عليـه نـوراً][2].

موجاهیـد گوتوویـەتی: وەختێـک عبداللـه ی کـوڕی عەبـباس شـتێکی لـه قورئـان ڕوون دەکـردەوە، ڕووناکییـت لەسـەر دەبینـی.

**دووەم:** لـه هـاوەڵان کـه تەفسـیری قورئـانی لـێ گێڕدراوەتـەوە، بـەڵام بـه ئەندازەیەکـی کەمـتر (أمـير المؤمـنين علـي بـن أبي طالـب رضي اللـه عنـه).

کـه هەندێـک لـه زانایـان پێـش عبداللـه ی کـوڕی عەبباسیشـیان خسـتوەو گوتوویانـه عبداللـه ی کـوڕی عەبـباس زانیارییەکـەی لـه عـەلی کـوڕی ئەبـی تاڵیبـەوە وەرگرتـوە.

(١) - أثر صحيح أخرجه ابن سعد: ج٢ ص٣٦٦، وابن أبي شيبة: ج١٢ ص١١١، وأحمد في الفضائل: ١٥٦٦ - ١٨٦٣، وابن جرير في تفسيره: ج١ ص٤٠. وغيرهم بإسناد صحيح.
(٢) - أخرجه عبدالله بن أحمد في زوائد الفضائل: ١١٣٥، بإسناد صحيح.

ئنجا عەلی خوا لێی ڕازی بێ، لێی گێڕدراوتەوە کە گوتوویەتی: [سلوني عن كتاب الله، فإنه ليس من آية إلّا وقد عرفت بليل نزلت أم بالنهار، في سهل أم في جبل؟][1].

عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب خوا لێی ڕازی بێت گوتوویەتی: لەبارەی کتێبی خواوە لێم بپرسن، چونکە هیچ ئایەتێکی نیە، مەگەر دەزانم بەشەوێ دابەزیوە یان بەڕۆژێ و، لە دەشت دابەزیوە یان لە چیا.؟

**سێیەم:** لە هاوەڵان کە تەفسیری قورئانی زۆر لێ گێڕدراوەتەوە، بەڵام بە ئەندازەیەکی کەمتر لە عبداللە ی کوڕی عەبباس، بریتییە لە عبداللە ی کوڕی مەسعوود.

کە لێیگێڕدراوتەوە گوتوویەتی: [والله الذي لا إله إلا هو ما أنزل سورة من كتاب الله إلّا أنا أعلم أين أنزلت، ولا أنزلت آية من كتاب الله إلا أنا أعلم فيما أنزلت، ولو أعلم أحداً أعلم مني بكتاب الله تبلغه الإبل، لركبت إليه][2].

عبداللە ی کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: بەو خوایەی جگە لەو پەرستراوێکی دیکە نیە، هیچ سوورەتێک لە کتێبی خوا دانەبەزێندراوە، مەگەر من دەزانم لە کوێ دابەزیوەو، هیچ ئایەتێک لە کتێبی خوا دانەبەزێنراوە، مەگەر دەزانم لەبارەی چییەوە دابەزیوە، ئەگەر زانیبام کەس هەیە لە من شارەزاتر بە کتێبی خوا و، حوشتر دەمگەیەنێ، سواری حوشتران دەبووم و دەچووم بۆلای (بۆ ئەوەی لەبارەی قورئانەوە لێی بەهرەمەندبم).

ئەمە قۆناغی یەکەمی تەفسیری قورئان، لە ڕۆژگاری هاوەڵاندا خوا لێیان ڕازی بێ.

(١)- أثر صحيح أخرجه بن سعد: ج٢ ص٣٣٨، وإسناده صحيح.
(٢) - البخاري: ٤٧١٦ ومسلم: ٢٤٦٣.

**قۆناغـــی دووەم: تەفســـیرو لێكدانـــەوەی قورئـــان لـــە ڕۆژگاری شـــوێنكەوتواندا (في عهـــد التابعـــين):**

لـە ڕۆژگاری جیلـی دوای هاوەڵانـدا، واتـە: جیلـی شـوێنكەوتواندا، هەندێـك لـە زانایـان پەیـدا بـوون لـە زانایـانی شـوێنكەوتوان كـە بـە زۆریـی لـە عبداللـه ی كـوڕی عەبباسـەوە، خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ بەهرەمەنـد بووبـون، لەوانـە:

**یەك:** مجاهد بن جبر المكي.

**دوو:** سعيد بن جبير الكوفي.

**سێ:** عكرمة مولى بن عباس المدني.

**چوار:** طاوس بن كيسان اليماني.

**پێنج:** عطاء بن رباح المكي.

ئەم پێنجە لە هەموو زانایانی ڕۆژگاری خۆیان زیاتر لەبارەی تەفسیری قورئانەوە، قسەیان كردوە.

وەك شوێنەكانیشیان:

١ـ لە مەدینەدا، ئەم زانایانە زیاتر قورئانیان تەفسیر دەكرد و لێكیان دەدایەوە:

أ ـ سعيد بن المسيَّب.

ب ـ زيد بن أسلم.

ج ـ أبوالعالية الرياحي.

د ـ محمد بن كعب القرظي.

ئەم چوارە لە ناودارەكانی زانایان بوون لە (مەدینە) بۆ تەفسیركردنی قورئان.

٢ـ لە مەككەش ئەمانە بوون:

أ ـ علقمة بن قيس النخعي.

ب ـ مسروق بن الأجدع.

ج ـ الأسود بن يزيد.

د ـ مرة الهمداني.

هـ ـ عامر الشعبي.

و ـ إسماعيل بن عبدالرحمن السدي.

ز ـ إبراهيم النخعي.

ئەم حەوتە لەو زانایانە بوون کە لە کووفە زۆرترین قورئانیان تەفسیر کردوەو، خەڵک بەزۆریی بۆلای ئەوان دەگەڕایەوە.

٣ـ لە بەسرەش، ئەم چوارە هەبوون:

أ ـ الحسن البصري.

ب ـ محمد بن سيرين.

ج ـ قتادة بن دعامة السدوسي.

د ـ ربيع بن أنس.

ئەمانەش لە بەسرا ناوداربوون بە تەفسیرکردنی قورئان.

هەروەها ئەوانەی بەوانەوە پەیوەست دەکرێن، کە ئەوانیش قورئانیان زۆر لێ گێڕدراوەتەوە، کە تەفسیریان کردوە:

أ ـ الضحاك بن مزاحم الهلالي.

ب ـ أبوصالح باذان مولى أم هانيء.

ئەم دووەش هەر لە ڕیزی ئەوانەدا بوون کە باسمانکردن.

هەڵبەتە ئەوانەی کە لە عبدالله ی کوڕی عەبباسەوە نزیک بوون، لە شاگردەکانی و قوتابییەکانی، ئەوانەی کە لەوەوە زیاتر بەهرەمەند بووبوون، لە نێو هەموویاندا عیکریمە (عكرمة) لە هەموویان ناودارتر بووە.

وەک لەم دەقەدا دەردەكەوێ:

(سـئل أبـو حاتـم الـرازي عـن عكرمـة وسـعيد بـن جبـير أيهـا أعلـم بالتفسـير؟! قـال أصحـاب ابـن عبـاس، عيـال عـلى عكرمـة)[١].

واتـە: پرسـيار لـە ئەبـو حاتيمـی ڕازيـی كـراوە، لـە بـارەی عيكريمـەو سـەعيدی كـوڕی جوبەيـرەوە، كامەيـان شـارەزاترن لـە ڕوونكردنـەوەی قوڕئـان دا؟ گوتوويـەتی هـاوەڵانی عبداللـە ی كـوڕی عەبـاس هەمووويـان ئاتـاج بـوون بـۆ عيكريمـە، يـانی: هەمووويـان لـەوەوە زياتـر بەهرەمەنـد بـوون.

هەر لەو بارەوە ئەم شوێنەوارەش هەيە:

(قـال حبيـب بـن أبي ثابـت: اجتمـع عنـدي خمسـة لايجتمـع عنـدي مثلهـم أبـداً: عطـاء، وطـاوس، ومجاهـد، وسـعيد بـن جبـير، وعكرمـة، فأقبـل مجاهـد وسـعيد بـن جبـير يلقيـان عـلى عكرمـة التفسـير، فلـم يسـألاه عـن آيـة، إلّا فسّرهـا لهـا، فلـمّا نفـد ماعندهـا، جعـل يقـول: أنزلـت آيـة كـذا في كـذا، وأنزلـت كـذا في كـذا)[٢].

واتـە: حەبيبـی كـوڕی ئەبـی سـابيت دەڵـێ: ڕۆژێـک پێنـج كـەس لـە لای مـن كۆبوونـەوە، كـە هەرگيـز پێنـج كەسـی وا لـەلای مـن كـۆ نابنـەوە: عطـاء، وطـاوس، ومجاهـد، وسـعيد بـن جبـير، وعكرمـة.

ئنجـا موجاهيـدو سـەعيدی كـوڕی جوبەيـر پرسـياريان لـە عيكريمـە دەكـرد لەبـارەی لێكدانـەوەی قوڕئانـەوە، هەر ئەوان پرسـياريان لـێ دەكردو ئەويـش بـۆی ڕوون دەكردنـەوە، كاتێـک پرسـيارەكانيان تـەواو بـوون، ئنجا خـۆی دەسـتی پێكـرد گـوتی: فڵان ئايەتـە لە بارەی فـڵان شـتەوە دابەزيوەو، فـڵان ئايەتـە لەبـارەی فـڵان شـت و فـڵان شـتەوە دابەزيوە!

---

(١) - الجرح والتعديل لابن أبي حاتم: ج٧ ص٩.
(٢) - أخرجه أبو نعيم في الحلية: ٤٣١٩، بإسناد حسن.

کەواتە: لە قۆناغی دووەمدا، قۆناغی شوێن کەوتوانی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوانەی باسمانکردن زۆرترین ڕۆڵیان بینیوەو، لە نێو هەموویاندا قوتابییەکانی عبداللە ی کوڕی عەبباس.

ئنجا جگە لە عیکریمە، موجاهیدیش زۆر ناودار بووە لە تەفسیردا، لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی:

(عَرَضْتُ القرآنَ على ابن عباس، ثلاث عرضات، أقف عند كل آية، أسأله: فيم أنزلت؟ وفيم كانت؟)[١].

واتە: موجاهید گوتوویەتی سێ جاران هەموو قورئانم لەگەڵ عبداللە ی کوڕی عەبباسدا دەورکردۆتەوە، لە هەر ئایەتێک لێم دەپرسی: لەبارەی چییەوە دابەزیوەو، لەبارەی چییەوە بووە؟

هەروەها لە سوفیانی سەورییەوە گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی:

(إذا جاءَكَ التفسير عن مجاهد فحسبك به)[٢].

واتە: هەرکاتێک تەفسیر لە موجاهیدەوە بە تۆ گەیشت، ئەوەت بەسە.

هەروەها لە سوفیانی سەوریەوە هاتوە کە گوتوویەتی:

(خذوا التفسير من أربعة: سعيد بن جبير، ومجاهد، وعكرمة، والضحاك بن مزاحم)

روي بإسناد لا بأس به)[٣].

واتە: تەفسیر لە چوار کەسان وەربگرن: سەعیدی کوڕی جوبەیر، موجاهید، عیکریمە،ضەحاکی کوڕی موزاحیم.

(١) - أخرجه الدارمي: ١١٠٨.
(٢) - أخرجه بن اجرير:ج١ ص٤٠، باسناد صحيح.
(٣) - أخرجه ابن عدي في الكامل:ج٥ ص١٥٠.

**قۆناغــی ســێیەم: تەفســیر لــە قۆناغــی دوای شــوێنکەوتوانی هاوەڵانــەوەدا:**

لـەو قۆناغـەدا وردە وردە دەسـتکراوە بـە نووسـینەوەی تەفسـیرو تۆمارکـردنی. هەڵبەتـە هەندێـک شـت پـاڵ دەدرێتـە لای عبداللـە ی کـوڕی عەببـاس، بـۆ وێنـە: (المقبـاس تفسـیر ابـن عبـاس)، بـەڵام لێکۆڵـەرەوانی ڕیوایەتـان دەڵێـن: ئـەوەی کـە پـاڵ دەدرێتـە لای عبدالله ی کـوڕی عەبباس یـان لای موجاهیدو جگە لەوانیش، گوایە تەفسـیریان نووسـیوە، ڕاسـت نیە، چونکـە ئـەوان هـەر بـە زارەکیـی تەفسـیریان گوتووەتـەوە.

ئنجـا لـە نێو شـوێنکەوتوانی شـوێنکەوتواندا (أتباع التابعیـن)، ئەوانەی دەسـتیان کردووە بە نووسـینی تەفسـیر، ئەمانەیـان زۆر ناوداربوون:

١ـ (عبدالرحمن بن زیْد بن الأسلم).

٢ـ (سعید بن أبي عروبة).

٣ـ (عبدالملك بن عبدالعزیز بن جریج).

٤ـ (سفیان الثوري).

٥ـ (سفیان بن عیینة).

ئەمانــە هەندێکیــان تەفســیرەکەیان چاپیــش کــراون و، هەندێکیــان تەفســیرەکەیان بــڵاون و لــەو تەفســیرانەدان کــە لــە دوای ئەوانــەوە نــووسراون و، ئـەو زانایانـە لـە تەفسـیرەکانیان وەریانگرتـوەو، مـەرج نیـە تەفســیرەکەیان بــە ئێمــە گەیــبن.

لە دوای ئەوانیش هەندێکی دیکە دیسان تەفسیریان نوسیوە، وەک:

١ـ (روح بن عبادة) کە لە ساڵی (٢٠٥)ی کۆچیی دا، کۆچی دوایی کردوە.

٢ـ(عبدالرزاق الصنعاني) کە لە ساڵی (٢١١)ی کۆچییدا ،کۆچی دوایی کردوە.

٣ـ (سنید بن داود) لە ساڵی (٢٢٦)ی کۆچییدا کۆچی کردوە.

٤ـ (سعيد بن منصور) له ساڵی (٢٢٧)ی كۆچیدا كۆچی دوایی كردوه.

٥ـ (أبوبكر عبدالله بن محمد بن أبي شيبة) له ساڵی (٢٣٥)ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

٦ـ (عبد بن حميد) له ساڵی ٢٤٩ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

واته: هەموو ئەوانه له نیوەی یەكەمی سەدەی سێیەمی كۆچییدا تەفسیریان نووسیوەو، كۆچی دواییان كردوه.

هەندێكی دیكەش له زانایان كه له ڕووی زمانی عەرەبییەوە، زۆر شارەزابوون و، لەو بارەوە خزمەتێكی باشی قورئانیان كردوه، ئەمانەن:

١ـ (أبو زكريا يحى بن زياد الفراء) كه زۆر ناودارەو له ساڵی (٢٢٧)ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

٢ـ (أبو عبيدة معمر بن مثنى) كه له ساڵی (٢٠٩)ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

٣ـ الأخفش أبو الحسن سعيد بن مسعدة البصري) له ساڵی (٢١٠) ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

٤ـ (محمد بن عبدالله المسلم بن قتيبة الدينوري) له ساڵی (٢٧٦) ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

ئنجا دوایی له كۆتایی سەدەی سێیەمی كۆچییدا، هەندێك تەفسیری كۆكەرەوە دەركەوتن، كه له هەموویان ناودارتر تەفسیرەكەی:

١ـ (أبو محمد ابن جرير الطبري)یە، كه له ساڵی (٣١٠)ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

٢ـ لەدوای وی تەفسیرەكەی (أبوبكر محمد بن إبراهيم بن منذر النيسابوري)یە، كه له ساڵی (٣١٨)ی كۆچییدا، كۆچی دوایی كردوه.

٣ـ دوای وی تەفسیرەكەی (أبو محمد بن عبدالرحمن بن محمد أبي

حاتـم الرازي)یـە کـە لـە سـاڵی (٣٢٧)ی کۆچییـدا، کۆچـی دوایـی کـردوە.
واتـە: ئەمانـە لـە کۆتایـی سـەدەی سـێیەمداو، لـە سـەرەتای سـەدەی چوارەمـدا ژیـاون.

دوایـی لـە سـەدەی چوارەمـی کۆچیـی دا، زیاتـر زانسـتی تەفسـیر بڵاو بـووەوەو، جگـە لـەو زانایانـەی کـە بـە زانایـانی زۆرمتمانـە پێکـراو لـە نێـو ئۆممەتـدا دادەنرێـن، هەندێـک لـە زانایـانی دیکـەش، وەک هەندێـک لـە موعتەزیلـەو لـە شـیعە، هەندێـک تەفسـیریان نووسـین.

هەروەهـا هەندێـک لـە زانایانیـش بەتایبـەت لەبـارەی حوکمـە شـەرعییەکانی قورئانـەوە، کتێبیـان نووسـی، کـە لـە هەموویـان ناودارتـر لـە پێشـووەکان، ئەمانـە بـوون:

١ـ (القـاضي إسـاعیل بـن إسـحاق المالـکي) کـە لـە سـاڵی (٢٨٢)ی کۆچییـدا، کۆچـی دوایـی کـردوە.

٢ـ (أبـو جعفـر أحمـد بن محمد بن سـلامة الطحاوي) کە لە سـاڵی (٣٢١) ی کۆچییدا کۆچـی دوایی کردوە.

٣ـ (أبوبکـر أحمـد بـن عـلي الـرازي الجصـاص) کـە لـە سـاڵی (٣٧٠)ی کۆچییـدا، کۆچـی دوایی کـردوە.

٤ـ دواتـر لـە سـەدەی شەشـەمدا: (إبـن العـربي المالـکي) کـە لـە سـاڵی (٥٤٣)ی کۆچیـی دا، کۆچی دوایـی کردوە، ئەوانـە هەموویـان کتێبیان هەیە بەنـاوی (أحـکام القرآن).

٥ـ هەروەهـا دواتـر لـە سـەدەی حەوتەمـی کۆچییـدا: (القرطبـي) تەفسـیرێکی نـاوداری نووسـی، کـە زۆر لـە حوکمـە شـەرعییەکان، کـە لـە ئایەتـەکان وەردەگیرێـن، گرتوونیـە خۆی، بەنـاوی: (الجامع لأحـکام القرآن).

## بڕگەی شەشەم: دوو جۆرە سەرەکەییەکەی تەفسیر:

شایانی باسە کە تەفسیرەکان بەگشتیی دوو ڕێڕەویان گرتوونە بەر:

ڕێڕەوی یەکەم: تەفسیری بە شوێنەوار(التفسير بالمأثور):

ئەو تەفسیرانەی کە ئیعتیمادیان لەسەر خودی قورئان و لەسەر سوننەت و، لەسەر ئەو شوێنەوارانەی کە لە هاوەڵان و لە شوێن کەوتوانەوە، گێڕدراونەوە، بووە کە لە هەموویان ناودارتر ئەم حەوت تەفسیرەن لەو بارەوە، مەرجیش نیە تەنیا بە (مأثور) تەفسیریان کردبێ، بەڵکو تەفسیری (بالرأي) و بە بۆچوونی خۆشیانی تێدا هەیە:

**تەفسیری یەکەم:** (جامع البيان عن تأويل آي القرآن) کە هی (أبو جعفر الطبري)یە، کە لەساڵی (٣١٠)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوەو لە هەمووتەفسیرەکان ناودارترەو، لەڕاستییدا (ئەبو جەعفەر) بە پێشەوای ڕوونکەرەوانی قورئان دادەنرێ و، زۆریش لەوە فراوانترە کە تەنیا تەفسیری (بالمأثور) بێ!

**تەفسیری دووەم:** (تفسير القرآن العظيم مسنداً عن رسول الله والصحابة والتابعين) کە هی (الإمام عبدالرحمن بن أبي حاتم الرازي)یە، کە لەساڵی (٣٢٧) ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**تەفسیری سێیەم:** تەفسیری (معالم التنزيل) هی (الإمام محيي السنة أبي محمد الحسين بن مسعود البغوي)یە، کە لە ساڵی (٥١٦)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**تەفسیری چوارەم:** (زاد المسير في علم التفسير) ــە، کە هی (الإمام أبي الفرج عبدالرحمن بن علي بن الجوزي)يە، کە لەساڵی (٥٩٧)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**تەفسیری پێنجەم:** (تفسير القرآن العظيم)، کە هی (أبي الفداء إسماعيل بن كثير الدمشقي)يە، کە لەساڵی (٧٧٤)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوەو ئەم تەفسیرە، کورتکراوەی زۆر لە تەفسیرەکانی پێشووی گرتۆتە خۆی.

**تەفسیری شەشەم:** (الدر المنثور في التفسير بالمأثور)، تأليف الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي، کە لە ساڵی (٩١١)ی کۆچییدا کۆچی دوایی کردوە، کە ئەمە بەزۆریی تەنیا ڕیوایەتەکانی تێدان.

**تەفسیری حەوتەم:** کۆتا تەفسیری لەو جۆرە: (فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية في علم التفسير)ە، کە هی (العلامة محمد بن علي الشوكاني اليماني)يە کە لە ساڵی (١٢٥٠) ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە و، لە ڕاستییدا تەفسیرەکەی شەوکانیی، ئەوە نیە کە تەنیا بە (مأثور)بێ، بەڵکو بۆچوون و عەقڵی خۆیشی باش تێدا بەکار هێناوە، هەروەها ئەوانی دیکەش هەموویان کەم و زۆر عەقڵ و ڕاو بۆچوونیی خۆیانیان بەکارهێناوە.

ئەو ڕەخنانەی لەو جۆرە تەفسیرانە دەگیرێن، بە گشتی دوو ڕەخنەن:

**ڕەخنەی یەکەم:** زۆربەیان هێندێک فەرموودەیان هێناون، کە لە ڕووی سەنەدەوە بێهێزن، بەڵکو جاری وا هەیە نەک هەر بێهێزن، هەڵبەستراویشبن.

**ڕەخنـــەی دووەم:** بەســـەرهاتی جووله‌کـــەو نەصرانیـــی و خـــاوەن کتێبانیـــان زۆر هێنـــاون، کـــە بـــە (الإسرائليـــات) نـــاودارن.

کـە دیـارە پشـتیان بـەوە بەسـتوە کـە پێغەمبـەری خـوا - علیـه االصـلاة والسـلام - فەرموویـەتی: (بَلِّغـوا عنِّـي ولـو آيـة، وحَدِّثـوا عـن بنـي إسرائيـل ولا حـرج، وَمَـنْ كَـذَب علـيَّ متعمِّـداً، فَلْيَتَبـوَّأ مقعـدَه مـن النـار)[١].

واتـە: لـە منـەوە ئایەتێکیـش بـێ بیگەیەنـن و، لەبـارەی بەنـوو ئیسرائیلیشـەوە بدوێـن و، هیـچ سـەغڵەتییتان لەسـەر نیـە، بـەڵام هەرکەسـێک درۆ بەنـاوی منـەوە بـکات، باشـوێنی خـۆی لـە ئاگـردا هەڵبگـرێ.

کاتی خۆیشـی عبداللـە ی کـوڕی عەبباس خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ هۆشـداریی داوە، بەخەڵکـی ڕۆژگاری خـۆی، کـە زۆر لـە خـاوەن کتێبانـەوە شـت نەگوازنـەوەو، ئـەم قسـەیەی گێڕدراوەتـەوە، کـە گوتوویـەتی:

(يـا معـشر المسـلمين! كيـف تسـألون أهـلَ الكتـاب عـن شيء، وكتابكم الـذي أنـزل اللـه عـلى نبيِّكـم أحْـدَثُ الأخبـار باللـه، مَحْضـاً لَـمْ يُشَـبْ، وقـد حدثكـم اللـه أن أهـل الكتـاب بدَّلـوا من كتب اللـه وغـيرَّوا، فكتبـوا بأيديهم، قالـوا: هـو مـن عندالله، ليشـتروا بذلك ثمنـاً قليـلاً، أولا ينهاكم مـا جاءكم من العلـم وعـن مسـألتهم؟ فـلا والله مـا رأينا رجـلاً منهم يسـألكم عن الـذي أُنزِلَ إليكم)[٢].

عبداللـە ی کـوڕی عەببـاس گوتوویـەتی: ئـەی کۆمەڵـی مسـوڵمانان! چـۆن لـە خـاوەن کتێبان لەبـارەی شـتێکەوە دەپرسـن، کتێبەکەشـتان کە خوا

(١) - أحمد: ٦٤٨٦ و ٦٨٨٨، والبخاري: ٣٢٧٤، والدارمي: ٥٤٨ والترمذي: ٢٦٦٩.
(٢)- أثر صحيح أخرجه الشافعي في الأم: ج١٢ ص٥٣٨، والبخاري: ٢٥٣٩ - ٦٩٢٩ - ٧٠٨٥، والبيهقي في الكبرى:١٠ ص١٦٢ - ١٦٣.

دایبەزاندووەتە سەر پێغەمبەرەکەتان (صلى الله علیه وسلم) نوێترین هەواڵە لەلایەن خواوەو، ساغەو هیچ شتێکی تێکەڵ نەبووە (خلْتەی تێکەڵ نەبووە) لە حاڵێکدا کە خواش هەواڵی پێداون و بۆی باسکردوون، کە خاوەن کتێبەکان لە کتێبەکانی خوایان گۆڕیوەو تێکیان داون، بەدەستی خۆیان شتیان نووسیوەو گوتوویانە: لە لایەن خواوەیە، تاکو بەوە نرخێکی کەم بکڕن، ئایا ئەو زانیارییەی کە بۆتان هاتوە، ڕێتان لێ ناگرێ کە داوا لەوان بکەن، لەوان بپرسن؟ بەخوا هیچ پیاوێکمان لەوان نەبینیوە لەبارەی ئەوەوە کە بۆ ئێوە دابەزیوە، پرسیار لە ئێوە بکات!).

بەڵام هەندێک لە ڕوونکەرەوانی قورئان، خوا لێیان خۆشبێ، زێدەڕۆییان کردوە لە گێڕانەوەی ئەو شتانەدا کە لە خاوەن کتێبانەوە دەگێڕدرێنەوە، لە حاڵێکدا کە کتێبەکانیشیان تێکدراون، بەداخەوەش زۆرێک لەو گێڕراوانەوەی لە خاوەن کتێبانەوە هاتوون، سیمای جوانی قورئان و تەفسیری قورئانیان تێکداوە، وەک لە تەفسیرەکەی خۆمدا زۆرجار هەڵوەستەمکردوە، لەو بارەوە.

ئەوەش کە لە خاوەن کتێبانەوە هاتوە، کورتەکەی ئەوەیە کە سێ بەشە:

**یەکەم:** ئەوەی لەگەڵ قورئان و لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) گونجاوەو، ئەوە حەقە.

**دووەم:** ئەوەی کە لەگەڵ قورئان و لەگەڵ سوننەتدا ناگونجێ و، ئەوان بە درۆی دادەنێن، ئەوە پووچەو بەتاڵە.

**سێیەم:** ئەوەی هیچ شتێک لە قورئاندا و لە سوننەتی پێغەمبەریشدا (علیه الصلاة والسلام) نیە، بەڕاستی دابنێ، یان بەدرۆی دابنێ، پێویستە نە بە حەق، نە ناحەق باس نەکرێ، هەربۆیەش لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا

ـ علیه الصلاة والسلام ـ هاتوه: (لا تُصَدِّقوا أهل الكتاب ولا تكذِّبوهم)[١]، واتە: خاوەن کتێبەکان بە ڕاست دامەنێن و بەدرۆشیان دامەنێن.

کە مەبەست پێی ئەم جۆرەی سێیەمی ئەو شتانەیە کە لێیان دەگێڕدێنەوە، ئەگەرنا لە شتێکدا بزانی درۆیان کردوە، دەڵێی: درۆتان کردو بەهەڵەداچوون، وەک عبداللە ی کوڕی عەبباس وای گوتوە بە هەندێک لە خاوەن کتێبان، هەروەها لە شتانێکدا پێکابیان، دەڵێی: پێکاوتانەو لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دەگونجێ، بەڵام ئەوەی کە دیار نەبێ، داخۆ لەگەڵ قورئان و سوننەتدا گونجاوە، یان خود نەگونجاوە، دەبێ لێی بێدەنگبین، نەوەک ڕاستبێ و، بەهۆی بەدرۆ دانانیەوە، گوناحباربین، یاخود هەڵەبێ و بە هۆی بەڕاست زانینیەوە گوناحباربین.



(١)- رواه البخاري: ٤٢١٥ و ٦٩٢٨ و ٧١٠٣، وابن جرير في تفسيره (٣/٢١) والبيهقي في (الكبرى) (١٦٣/١٠) و (الشُعَب): ٥٢٠٧ .

## ڕێڕەوی دووەمی تەفسیران: تەفسیر بە عەقڵ و بۆچوون (التفسير بالرأي):

سەرەتا پێویستە بزانرێ کە تەفسیرکردنی قورئان بەعەقڵ و بۆچوونی خۆ، مانای وانیە پشت نابەستی بەوەی کە لە پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) هاتووە، لە هاوەڵانەوە هاتووە، لە تابیعینەوە هاتووە! بەڵام زیاتر عەقڵی خۆ بەکار دەهێنرێ، بۆ لێتێگەیشتنی ئایەتەکان و، ئەوەش هەر فەرمانی خوایە:
﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ ص: ٢٩ .

واتە: ئەمە کتێبێکی بە پێزە دامانبەزاندوە، تاکو لە ئایەتەکانیەوە ڕامێنن و، بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵان پەندی لێ وەربگرن و لێی تێبگەن.

ئنجا بێگومان هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ و، شوێنکەوتوانی هاوەڵانیش و ئەوانی دیکەش، هەموویان کەم و زۆر گرنگییان داوە بە بەکارهێنانی عەقڵی خۆیان، بۆ لێتێگەیشتنی قورئان، هەر بۆیەش ڕەخنەم هەیە لەو قسەیە کە دەڵێ: تەفسیر دوو جۆرە: (بالمأثور) و (بالرأي) لە ڕاستییدا ئێمە هیچ تەفسیرێکمان نیە، بگوترێ هەمووی (بالمأثور)ە، هەموویان عەقڵی خۆیان تێدا بەکارهێناوە، لە تێگەیشتنی وشەکانی قورئان، لەگەڕانەوە بۆ زمانی عەرەبیی، لە گەڕانەوە بۆ مێژوو، لە گەڕانەوە بۆ ڕاستییەکانی کە عەقڵ و زگماک دەرکیان دەکەن، هەروەها ئەوەی کە (التفسير بالرأي) شی پێ دەگوترێ، نووسەرەکانی کەم و زۆر، پشتیان بەستوە بە شوێنەوارەکان کە نەقڵ کراون، چ لە پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) چ لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانەوە.

هەندێک لەو تەفسیرانەی کە لەو بوارەدا تەفسیری ناودارن، دەتوانین بڵێین ئەمانەن:

**١ـ تەفسیری یەکەم:** [المحَّرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز] هی (الإمام أبي محمد عبدالحق ابن غالب ابن عطية الغرناطي) کە لە ساڵی (٥٤١) دا، کۆچیی دوایی کردوە.

**٢ـ تەفسیری دووەم:** (الكشاف عن حقائق التنزيل وعيون الأقاويل في وجوه التنزيل) هی : (أبي القاسم جارالله محمود بن عمر الزمخشري) کە لە ساڵی (٥٣٨)ی کۆچیی دا، کۆچی دوایی کردوە.

**٣ـ تەفسیری سێیەم:** (مفاتيح الغيب أو التفسير الكبير) هی (العلامة النظار فخرالدين محمد بن عمر بن الحسين الرازي) کە لە ساڵی (٦٠٦)ی کۆچیی دا، کۆچی دوایی کردوە.

**٤ـ تەفسیری چوارەم:** لەو بارەوە [أنوار التزيل وأسرار التأويل] هی (القاضي الامام ناصر الدين عبدالرحمن بن عمر بن محمد البيضاوي الشافعي)یە، کە لە ساڵی (٦٨٥)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**٥ـ تەفسیری پێنجەم:** [البحر المحيط] هی: (الإمام أبي حيان محمد بن يوسف بن علي الغرناطي الأندلسي) کە لە ساڵی (٧٤٥)ی کۆچییدا، کۆچی دوایی کردوە.

**٦ـ تەفسیری شەشەم:** [نظم الدرر في تناسب الآيات والسور] هی: (الإمام برهان الدين حسن بن ابراهيم بن عمر بن حسن البقاعي الشافعي) کە لە ساڵی (٨٨٥) دا، کۆچی دوایی کردوە.

ئەمانەش بەگشتیی دوو ڕەخنەیان لێگیراون:

**یەکەم:** کەمتر گەڕاونەوە بۆ قسەی زانایانی پێشین، لە هاوەڵان و شوێنکەوتوانی هاوەڵان و دوای وانیش.

**دووەم:** لـە تەفسـیرکردنی ئایەتـەکانی کـە بـاسی سـیفەتەکانی خـوا دەکـەن، زیاتـر لای تەئویلیـان گرتـوە، هەڵبەتـە تەئویـل بـە گشـتیی قەدەغە نیـە، بـەڵام هەندێـک جـار زێـدە ڕۆییـان تێـدا کـردوە.

هەندێـک لـە زانایانیـش لـە ڕووی زمانەوانییـەوە، زیاتـر گرنگییـان بـە تەفسـیری قورئان داوە، وەک:

١ـ (إعـراب القـرآن) هـی: (إمـام النحـو أبي جعفـر أحمـد بـن محمـد بـن إسماعيل النحـاس) کـە لـە سـاڵی (٣٣٨)دا، کۆچـی دوایـی کـردوە.

٢ـ کتێبێکـی دیکـە لـەو بـارەوە: (مشـکل إعـراب القـرآن) هـی (الإمـام أبي محمـد مـكي أبي طالـب القيسـي القرطبي)یـە، کـە لـە سـاڵی (٤٣٧)دا کۆچـی دوایـی کـردوە.

٣ـ یەکـی دیکـە لـەو جـۆرە تەفسـیرانە: (إمـلاء مـا مـنَّ بـه الرحمـن مـن وجـوه الإعـراب والقـراءات في جميـع القـرآن) هـی (الإمـام بقـاء عبداللـه بـن حسـين العكـبري الحنبلي)یـە، کـە لـە سـاڵی (٦١٦)دا کۆچـی دوایـی کـردوە.



تەفسیرە هاوچەرخەکان:

تەفسـیرە هاوچەرخـەکان، ئـەو تەفسـیرانەی لـە ڕۆژگاری ئێمـەدا نـووسراون، لـە پێـش هەموویانـەوە:

١ـ (تفسـير المنـار) هـى (محمـد رشـيد رضا القلمـوني البغـدادي الأصل) کـە لـە سـاڵی (١٣٥٤)ی کۆچییـدا، کۆچی دوایـی کردوە.

٢ـ دووەم لـەو تەفسـیرانەی هاوچـەرخ: تەفسـیرەکەی سـەیید قوتبـە (في ظـلال القـرآن) کـە لـە سـاڵی (١٣٨٧) ی کۆچیـی و لـە سـاڵی (١٩٦٦)ی زاینـی دا، کۆچـی دوایـی کـردوە، ئەویـش تەفسـیرێکە زیاتـر ئـەوەی کـە قورئـان دەیگەیەنـێ، لـە تێگەیشـتنێکی هاوچەرخانـە، بەتایبـەت لـە ڕووی حوکـم و سیاسـەت و بەڕێوەبـردنی کۆمەڵـگاوە، باسـیکردوە.

٣ـ یەکـی دیکـە لـەو تەفسـیرانە : (التحريـر والتنوير) هي (العلامة الشـيخ محمـد الطاهـر بـن عاشـور المالكي شـيخ جامـع الزيتونـة، بتونـس) لـە (١٣٠٣) ی کۆچییـدا، کۆچـی دوایـی کـردوە، ئەمیـش بەڕاسـتیی تەفسـیرێکی نایاب و نـاوادارە، بـەڵام بێگومـان تەنیـا قورئـان و فەرمایشـتی خـوا، لـە هەڵـەو کـەم و کوڕیـی خاڵییە.

٤ـ یەکـی دیکـە لـەو تەفسـیرانە: (أضـواء البيـان في إيضاح القـرآن بالقرآن) هـی: (الشـيخ محمـد بـن مختـار الجكنـي الشـنقيطي)یە کە لـە سـاڵی (١٣٩٣) دا، کۆچـی دوایی کـردوە.

هەڵبەتـە ژمارەیەکـی دیکەش تەفسـیر هـەن وەک: (روح: المعـاني) و (روح البيـان) و (التفسـير المنير) و (تفسـير النابلسـي) و (تفسـير الجواهر)...

شـایانی باسیشـە: هەندێـک نووسـەر بەشـێک لـەو تەفسـیرانە بـە خـراپ دادەنێـن بەتایبـەت: تەفسـیرەکەی (إمام فخرالديـن الرازي) ، (التفسـير الكبير)،

هەروەها تەفسیرەکەی (الزمخشري) تەفسیری (الكشاف) لەبەر ئەوەی لەسەر بیروڕای موعتەزیلە بووە، لە هەندێک لە تەفسیرەکەیدا ئەوەی پێوە دیارە، ئەوەی لێ بە ڕەخنەی دەگیرێ، بەڵام من پێم وایە کە ڕەخنە گرتنەکە، لە جێی خۆیدا نیە، بەڵێ (زمخشري) موعتەزیلە بووە، بەڵام موعتەزیلە کۆمەڵێک بوون لە مسوڵمانان کاتی خۆی، بەڵێ هەڵەو کەم و کوڕییان هەبووەو، عەقڵیان گەورە کردوە لەسەر حیسابی نەقڵ، بەڵام بێگومان تەفسیرەکەی (الكشاف) زۆر لە ڕوونکەرەوانی قورئان پشتیان پێ بەستوە، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، هەروەها تەفسیرەکەی (إمام فخرالدين الرازي)یش بەڵێ زێدە ڕۆیی کردوە، لە هەندێک باسی فەلسەفەو عیلمی کەلام و مشەی نەیارانی، ئەوانەی کە بە نەیاری زۆرینەی مسوڵمانان دانراون، بەڵام تەفسیرەکەی خاڵی زۆر وردو گرنگیشی تێدا هەن، کە زۆر لە توێژەرەوان لێی بەهرەمەند بوون.



## بڕگەی حەوتەم: تەفسیرەکەی بەندە: تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز :

ئەو تەفسیرە لە نووسینیدا، لە زیاتر لە سی (٣٠) تەفسیر بەهرەم وەرگرتووە.

ئەو تەفسیرەش، من بە حەوت قۆناغ هێناومە:

لە دەستپێک و سەرەتادا ئەو سوورەتەی دەمەوێ تەفسیری بکەم، دەیهێنم، پێناسەی ئەو سوورەتە دەکەم، ناوی ئەو سوورەتەو، شوێنی دابەزینی و، نێوەڕۆکەکەی و، تایبەتمەندییەکانی دەخەمە ڕوو، دوایی ئەو سوورەتە دابەش دەکەم بۆ چەند دەرسێک، هەر کۆمەڵە ئایەتێک کە پێکەوە پەیوەستن، جاری وا هەیە پێنجن، جاری وا هەیە سێن، جاری وا هەیە بیستن، جاری وا هەیە سیین، ئەو ئایەتانە بەیەکەوە دێنم و دەیانکەم بە دەرسێک و تەفسیریان دەکەم، ئەویش بە حەوت قۆناغ:

**قۆناغی یەکەم:** سەرەتا پێناسەی ئەو کۆمەڵە ئایەتە دەکەم.

**قۆناغی دووەم:** ئایەتەکان دێنم، بە نووسین و بە خوێندنەوە دەیانخوێنم.

**قۆناغی سێیەم:** مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان دێنم، مانای وشە بە وشەیان.

**قۆناغی چوارەم:** شیکردنەوەی وشەکان دێنم، ئەو وشانەی کە بە پێویستی دەزانم شیانبکەمەوە، دەیانهێنم، شییاندەکەمەوە لە ڕووی فەرهەنگەکانی زمانەوە، بەتایبەت کتێبە ناودارەکەی (مفردات ألفاظ القرآن)ی ڕاغبی ئەصفهانیی، بەڵام جاری واش هەیە دەچم بۆ

فەرهەنگـەکانی دیکـەی زمـان، وەک (لسـان العـرب، القامـوس المحيـط، المعجـم الوسـيط ، مختـار الصحـاح) و جگـە لەوانيـش.

**قۆناغـی پێنجـەم:** هـۆی هاتنـە خـوار، ئەگـەر هەيانبـێ دەيخەمـە ڕوو.

**قۆناغـی شەشـەم:** مانـای گشـتيی، مانـای گشـتی لـە ڕاسـتييدا تەفسـيرێکی کورتـە، تەفسـيرێکی خۆڵاسـەو پوختـە.

**قۆناغـی حەوتـەم:** قۆنـاغ و هەنـگاوی حەوتـەم بـۆ تەفسـيرەکەم، لـە ژێـر ناوونيشـانی: (مەسـەلە گرنگـەکان)دا، ئـەو ئايەتانـە دێنـم بڕگـە بڕگـە شـييان دەکەمـەوە.

بـەو حـەوت قۆناغـە، يـان بـەو حـەوت هەنـگاوە، ئايەتـەکان تەفسـير دەکـەم و، خۆشـم نەبەسـتۆتەوە بـە ڕای هيچـکام لـە ڕوونکـەرەوانی قورئانـەوە، بـەڵام هەوڵمـداوە لـە هەمـوويـان بەهرەمەندبـم و عەقڵـی خۆيشـم بەکارهێنـاوە، بـۆ تەتەڵەکـردن و لەبێژينگيـدانی بيـروڕای ڕوونکـەرەوانی قورئـان، کاميـان ڕايەکـەی زياتـر لـە ڕاسـتييەوە نزيکـە، کاميـان پێکاويـەتی، کاميـان نەيپێـکاوە، هيچيانـم بـەوە دانەنـاون، کـە لـە هەمـوو شـتێکدا تەسـليمی بيروڕايەکـەی بـم، هيچيشـيانم بـەوە دانەنـاوە هيـچ شـتێکی لـێ بەهرەمەنـد نەبـم.

هەمـوو تەفسـيرەکانم تەماشـام کـردوون و بەهـرەم لـێ وەرگرتـوون، هيواداريشـم ئـەو تەفسـيرەی مـن نووسـيومە، کـە لـەڕووی قەبـارەوە دەگاتـە سـی (٣٠) بەرگـی گـەورە (تەفسـيری قورئـانی بـەرزو بەپێـز)، کەلێنێکـی بـاش بگـرێ.

هەندێـک شـت، کـە ڕەنگـە لـە تەفسـيرەکانی ديکـەدا بـەو شـێوەيە نەبێـت، هێناومـە، هەڵبەتـە جگـە لـە تەفسـيری ئايەتـەکان، جـار جـار چەنـد

کورتە باسێکیش دێنم بە بۆنەی زیاتر تیشک خستە سەر نێوەڕۆکی ئایەتەکانەوە، ئەو کورتەباسانەش شتێکی تایبەتن لە تەفسیرەکەی مندا هاتوون، کورتە باسەکانیش جۆراو جۆرن، جاری وا هەیە لە ڕووی فیقهییەوەن، جاری وا هەیە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوەن، جاری وا هەیە لە ڕووی مێژووییەوەن، جاری وا هەیە لەڕووی زانستیەوەن، لە ڕووە جۆراو جۆرەکانەوە، کورتە باسەکان دێنم، بۆ ئەوەی تیشکی زیاتر بخەنەسەر چەمک و واتای ئایەتەکان.



بەڕێزان!

لە پێنج بڕگەدا، ئەم تەوەرە بە كورتیی و پوختیی دەخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەكەم: پێناسە:

ئایا مەبەستمان لە چاك خوێندنەوەی قورئان (تجويد تلاوة القرآن) چییە؟
(إبن الجزري) لە كتێبە ناودارەكەی خۆی (النشر في قراءات العشر)دا[1] دەڵێ: [التجويد مصدر من جوّد تجويداً، والإسم منه الجودة، ضد الرداءة، يقال: جوّد فلانٌ في كذا، إذا فعل ذلك جيّداً، فهو عندهم عبارة عن الإتيان بالقراءة مجوَّدة الألفاظ، بريئة من الرداءة في النطق، ومعناه: آنتهاء الغاية في التصحيح، وبلوغ النهاية في التحسين].
دوایی لە لاپەڕە (٢١٢) دا وەك تەواوكردنی ئەو قسەیەی خۆی دەڵێ: [وهو حلية التلاوة وزينة القراءة، وهو إعطاء الحروف حقوقها وترتيبها مراتبها، ورد الحرف إلى مخرجه وأصله، وإلحاقه بنظيره، وتصحيح لفظه وتلطيف النطق به على حال صيغته وكمال هيئته، من غير إسراف ولا تعسّف، ولا إفراط ولا تكلّف].
واتە: وشەی تەجوید (التجويد) چاوگە لە (جوّد تجويداً)ەوە هاتوە، ناوەكەش بریتییە لە (الجودة) (واتە: باشیی) (جودة) پێچەوانەو دژی (الرداءة)یە واتە: خراپیی، دەگوترێ: (جوَّد فلانٌ في كذا) ئەگەر كارەكەی باشكرد، ئنجا تەجوید (لەلای پسپۆڕانی ئەو بوارە) بریتییە لەوە كە خوێندنەوەكە بێژەكانی ڕێكبن و، دووربن لە خراپیی گۆكردن، مانای تەجوید ئەوەیە، كە بگاتە ئەو پەڕی لە ڕاستییدا و ئەوپەڕی لە چاكییدا...

(١)- ص ٢١٠.

چاک خوێندنـەوەی قورئـان، بریتییـە لـە ڕازاوەیـی خوێندنـەوەو جوانیی خوێندنـەوە، ئەویـش ئەوەیـە: هـەرکام لـە پیتـەکان مـافی خـۆی پـێ بـدرێ و هەرکامیـان لـە ڕیزبەندیـی خۆیـدا دابنـدرێ و، پیتەکـە بگێڕدرێتـەوە بـۆ شـوێنی دەرچـوونی خـۆی و بنەچەکـەی خـۆی و، بلکێنـدرێ بـە هاووێنـەی خۆیـەوەو، بەشـێوەیەکی ڕاسـت ببێـژرێ و، بەڕێژگەکـەی خـۆی و حاڵـە تەواوەکـەی خـۆی، گۆبکـرێ، بـە بـێ زێدەڕۆیـی و تێپەڕانـدن، هەروەهـا بەبـێ لـێ تێپەڕانـدن و ئـەرک دانەبەرخـۆو خـۆ ئەزیـەت دان.

لەڕاسـتیدا تەجویـد بریتییـە لەوە کـە قورئـان بخوێندرێتەوە بە ئیعڕابـەوە، چونکە (إعـراب) واتـە: ڕوونکرنەوەو دەرخسـتن، ئەویش (ئیعڕاب) کاتێک ڕاسـت دەردەچێ، کە لە هەڵەی پیتـەکان پارێزراوبین، هەروەهـا لە هەڵەی وشـەکان پارێزراوبین، دیسـان لە هەڵەی قسـەش پارێزراوبین.

ئنجا بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ تـووشی هەڵـەی پیتـەکان نەبـێ، زانیاریـی تەجویدیـان دانـاوەو، بـۆ ئـەوەی توشـی هەڵـەی وشـەکان نەبـێ، زانایـان دوو زانیارییـان دانـاون:

**یەکەم:** زانیاریی گۆڕین (علم الصَّرْف) بۆ ئەوەی بزانین: وشە چۆن دادەتاشرێ، چۆن هاتوە و لەکوێوە هاتوەو لەکوێ دادەنرێ؟!

**دووەم:** زانیاریی ڕێزمان (علم النحو) بۆ ئەوەی بزانن: پێگەو شوێنی ئەو وشەیە دەبێ چۆن بێ؟

هەروەها بۆ ئەوەی قسەکە هەمووی، گوتنەکەو خوێندنەکە، هەمووی ڕێکبێ، زانیارییەکیان داناوە بۆ قورئان، کە پێی دەگوترێ: (علم الوقف والإبتداء) زانیاریی وەستان و دەستپێکردن، لەکوێ دەستپێدەکەی و لەکوێ دەوەستی؟

جاری وا هەیە لە شوێنێک بوەستی، مانای ئایەتەکە تێک دەچێ و، حەرامە لەوێ بوەستی، هەروەها لە هەندێک شوێن پێویستە بوەستی و، ئەگەر بێت و ئەو وشەیەی پێشێ بە هی دوای خۆیەوە بگەیەنی، مانایەکەی هەڵە دەردەچێ، ئەوەش زانیارییەکی گرنگی قورئانە، کە دیارە هەمووشیان هەردەچنەوە نێو زانیاریی (چاک قورئان خوێندن)ەوە



## بڕگەی دووەم: حوكمی زانستی تەجوید، (چاك قورئان خوێندن):

خوا ـ (سُبحانه وتعالى) ـ فەرمانی پێ کرووین کە باش قورئان بخوێنین، وەك دەفەرموێ:

﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ المزمل: ٤

واتە: قورئان بخوێنە بە ڕێك و پێكیی و بەچاكیی.

هەروەها خوای پەروەردگار هەواڵی پێداوین، کە ئەم قورئانە بەزمانێكی عەرەبیی ڕۆشنە:

﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ١٩٤ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ١٩٥﴾ الشعراء.

واتە: ئەمە دابەزێندراوی پەروەردگاری جیهانییانە، ڕووحی ئەمین دایبەزاندووەتە سەر دڵی تۆ، تاكو لە ترسێنەران و وریاكەرەوان بی، بەزمانێكی عەرەبیی ڕۆشن.

زمانی عەرەبیی خۆی یانی: زمانێكی ڕۆشن، گەلی عەرەب ناویان لە زمانی خۆیان ناوە: (اللسان العربي، اللغة العربية) بۆچی؟! چونكە زمانەكەی خۆیان پێ ڕۆشن بووە، بەڵام ناویان لە زمانەكانی جگە لە عەرەبیی ناوە: (عجمي) لەبەر ئەوەی پێیان نا ڕۆشن بووە، هەڵبەتە هەموو كەسیش زمانی خۆی پێ ڕۆشنەو، زمانی دایكی خۆی، بەڵام زمانەكانی دیكەی پێ ناڕۆشنە، بەڵام ناوی زمانی عەرەبیی وا هاتووە.

لە بارەی حوكمی زانیاریی تەجویدەوە، قسەی دوان لە زانایان بێنین:

**یەکـەم:** (الإمـام أبـو محمـد البغـوي) گوتوویـەتی: (إن النـاس كـما أنهم مُتَعبَّـدون باتِّبـاع أحـكام القـرآن وحفظ حـدوده، فهـم مُتعبَّـدون بتلاوته وحفظ حروفـه، علـى سـنن خـطِّ المصحـف الإمـام الـذي آتفقـت عليـه الصحابـة، وألاّ يجـاوزوا فيـما يوافـق الخـطَّ، عـمّا قـرأ بـه القـرّاءُ المعروفـون الذيـن خَلَفُـوا الصحابـة والتابعـين، واتفقـت الأمـة علـى آختيارهـم)[1].

واتـە: خەڵـک هـەروەک چۆن داوایـان لێکـراوە، بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن بـە شـوێنکەوتنی حوکمـەکانی قورئـان و پاراسـتنی سنوورەکانی، بەهەمـان شـێوە داواشـیان لێکـراوە بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکەن، بـە خوێندنی قورئـان و پاراسـتنی پیتەکانی، لەسـەر ڕێبـازی ئەو ڕێنووسـەی موصحەفی ئیـمام، کـە هـاوەڵان لەسـەری یەکدەنگ بـوون، دەبـێ تێنەپەڕێنن لـەوەدا کە موافیقـی ئـەو ڕێنووسـەیە کە قورئان خوێنە نـاسراوەکان پێیـان خوێندوە، کە لـە دوای هـاوەڵان و شـوێنکەوتوانەوە هاتـوون و، ئۆممـەتی ئیسـلام لەسـەر هەڵبژاردنیـان یەکدەنـگ بووە.

**دووەم:** یەکـی دیکـە لـە زانایـان کە لەبـارەی حوکمی زانیاریـی تەجوید (بـاش قورئـان خوێندن)ەوە، قسـەی کـردوە: (أبـو جعفر النحـاس)ە، دەڵـێ:

[والقـراءة بالترتيـل والمكـث واجبـة بنص القـرآن، والترتيـل: التبيين، فمن التبييـن تفصيـل الحـروف، والوقف على مـا تم معنـاه منها][2].

ئەلنەحاس دەڵێ: خوێندنەوەی قورئان بە تەڕتیل و بە وەستان و بەکاوە خۆ، بە دەقی قورئان پێویسـتەو، وشـەی تەڕتیـل واتە: ڕوونکردنـەوەو، ئنجا لـە ڕوونکردنـەوەی قورئانـە، کـە پیتـەکان لێـک بپچڕێندرێن و، لەو شـوێنە کـە مانایەکەی تەواو بووە، بوەسـتی.

کـە دەڵـێ: پێویسـتە قورئـان بـە تەڕتیل و بـە کاوە خۆ بخوێـنرێ، ئاماژە

(١) - البغوي: معالم التنزيل: ج١ ص٣٧.
(٢)-القطع والإستئناف للنحاس: ص ٧٣ -٧٤.

دەكا بـەو ئایەتـە موبارەكەی سـوورەتی (الإسراء):

﴿ وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا ﴾ الإسراء: ١٠٦

واتـە: ئەمـە قورئانێكـە پچڕاندوومانە (بەش بەشـمانكردوە) تاكو بەسـەر خەڵكیـدا وە خوێنـی و بـە كاوە خۆو بەشـێنەیی و، پلە پلە دامـان بەزاندوە.

پێغەمبـەری خاتەمیـش (صـلی الله علیه وسـلم) زۆر هانی مسـوڵمانانی داوە، كـە قورئـان بـەو شـێوەیە خـوا دایبەزانـدوە، ئـاوا بخوێندرێتـەوە، وەك لـەم فەرموودەیـەوە دیـارە، پێغەمبـەر (علیه الصـلاة والسـلام) فەرموویەتی:

(عـن عبداللـه بـن مسـعود رضي اللـه عنـه أن النبـي (صـلى اللـه عليـه وسـلم) سـمعه يقـرأ، فقـال: مَـنْ أحـبَّ أن يقـرأ القـرآن غَضَّـاً كـما أُنـزِلَ، فليقرأْه علـى قـراءة ابـن أم عبـدٍ)[1].

واتـە: جارێكیـان پێغەمبـەر (علیـە الصـلاة والسـلام) گوێـی لـە عبدالله ی كـوڕی مەسـعوود بـوو قورئـانی دەخوێنـد، فەرمـووی: هەركەسـێك حـەزدەكا قورئـان بخوێنـێ بـە تەڕیـی، وەك تـازە دابەزیبـێ، بـا بـە شـێوەی ئیبنـی ئوممـی عەبـد (ئەمـە نازنـاوی عبداللـە ی كـوڕی مەسـعوود بـووە) بیخوێنـێ، وەك خوێندنەوەكـەی ئـەو بیخوێنـێ.

عبدالله ی كوڕی مەسعوودیش لەو بارەوە گوتوویەتی: [أعربوا القرآن فإنه عربي][2].

واتە: قورئان ڕوون بكەنەوە، چونكە قورئان ڕوونە.

دیارە كاتێك قورئان ڕوون دەكرێتەوە، كە هەركام لە پیتەكان مافی خۆی پێ بدرێ و، بە شێوەی خۆی شوێنی دەرچوون وبێژرانەكەی چۆنە، ئاوا گۆ بكرێ و ببێژرێ، هەروەها هەركام لە وشەكانی، لە شوێنی خۆیاندا دابندرێن.

---

(١)- أحمد: ٣٥ و ٤٢٥٥ و ٤٣٤٠ و ٤٣٤١، و ابن ماجة: ١٣٨، قلت: وإسناده جيد.

(٢)- أثر حسن أخرجه ابن أبي شيبة: ٢٩١٠٨، وأبو عبيد في فضائل القرءان: ٣٤٨، قلت: وهذا إسناد صالح.

کەواتــە: بــاش قورئــان خوێنــدن، حوکمەکــەی ئەوەیــە کــە پێویســت (واجــب)ە، چونکــە خــوا (سُــبحانه وتعــالى) بــە پێغەمبــەری خاتــەم (صــلى الـلـه علیـه وسـلم) دەفەرمـوێ :

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤ .

واتە: قورئان بەرێک و پێکیی بخوێنە.

هەروەهـا پێـی دەفەرمـوێ:﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴾ الإسراء: ١٠٦ .

واتــە: ئەمــە قورئانێکــە بــەش بەشــمان کــردوە، تاکــو بەشــێنەیی بەســەرخەڵک دا بخوێندرێتــەوەو، پلــە پلــەش دامانبەزانــدوە.

ئەمەش یانی: ئێمە چۆنمان دابەزاندوە، تۆش بەو شێوەیە بیخوێنە.



## برگـەی سـێیەم: چـۆن بـاش قورئـان خوێنـدن (تجویـد) زەبـت بکـرێ و، چـاک بخوێنـدرێ؟

بێگومـان قورئـان بـەو شـێوەیە بـاش دەخوێنـدرێ، کـە ئـەو بنەمـاو بنچینانـەی پێشـەوایانی قورئانخوێـن دایاننـاون، کـە لـە کتێبەکانیانـدا هاتـوون، ڕەچـاو بکرێـن و، بـەو شـێوەیە قورئـان بخوێنـدرێ، کە شـارەزایان و پسـپۆڕانی ئـەو بـوارە دایاننـاوە.

هەڵبەتـە زۆرێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: مەرجـی (بـاش قورئـان خوێنـدن) ئەوەیـە کـە مـرۆڤ لـە زاری قورئـان خوێنێـک وەری بگـرێ، (إبـن کثیـر) لـە (فضائـل القـرآن)[1] دا گوتوویـەتی: **[أمـا تلقـين القـرآن فمـن فـم المُلَقّـن أَحْسَـن، لأن الكتابـة لاتـدلُّ عـلى الأداء، كـما أن المُشـاهَد مـن كثـير ممـن يحفـظ مـن الكتابـة فقـط، يكـثر تصحيفـه وغَلَطُـه، وإذا أدّى الحـال إلى هـذا مُنـعَ منـه، إذا وجـد شـيخاً يوقفُـهُ عـلى ألفـاظ القـرآن، فأمـا عنـد العَجْـز عـمّا يُلَقّـنُ، فـلا يكلِّـف اللـه نفسـاً إلاّ وسـعها، فيجـوز عنـد الـضرورة مـا لايجـوز عنـد الرفاهيـة، فـإذا قـرأ في المصحـف والحالـة هـذه، فـلا حـرج عيلـه، ولـو فُـرِضَ أنْ قـد يحـرِّف بعـض الكلـمات عـن لفظهـا، عـلى لغتـه ولفظـه].**

واتـە: وەرگرتنـی قورئـان لـە زاری بابـای فێرکـەرەوە باشـترە، چونکـە جـاری وایـە نووسـین شـێوەی گۆکـردنی ئـەو وشـەیە ناگەیەنـێ، هەروەهـا ئـەوەش بینـدراوە لـە زۆرێـک لەوانـەی کـە تەنیـا بـە هـۆی نووسـینەوە قورئـان لەبـەر دەکـەن، دوایـی هەڵـەو پەڵەیـان دەبـێ، ئنجـا ئەگـەر حاڵەکـە بەوشـێوەیەبێ، دەبـێ ڕێـی لـێ بگیـرێ، ئەگـەر مامۆسـتایەک ببینێـی کـە

(١) - ص ٤٩٠.

بێـژە کانی قورئـانی فێربـکا، بـەڵام لە کاتێکـدا دەسـتی ناگاتە مامۆسـتایە کی شـارەزا، کـە بـەو شـێوەیە قورئـانی فێربـکات، ئـەو کاتـە خـوا لـە هیـچ کـەس داوا نـاکات، کـە جگـە لـەوەی لـە تواناییـدا هەیـەو لەبـەر ناچاریـی دروسـتە، چونکـە ئـەوەی لـە ناچارییـدا دروسـت دەبـێ، لـە کاتـێ دا کەناچـار نـی، دروسـت نیـە، بۆیـە ئەگـەر کەسـێک بیـەوێ لـە موصحەفدا قورئـان بخوێنـێ، هیـچ سـەغڵەتیی لەسـەر نیـە، ئەگـەر گریـمان هەندێـک لـە وشـەکانیش لـە بێـژەی خۆیـان لابـداو، بەپێـی زمـانی خـۆی و بێـژەی خـۆی بیانڵـێ یانـی: لەبـەر ئـەوەی لـەزاری کەسـێکەوە وەری نەگرتـوە، ئـەوە چاوپۆشـیی تێـدا دەکـرێ.

هەڵبەتـە ئـەوەی (إبـن کثیـر) گوتوویـەتی، هەڵوێسـتێکی میانجییـەو لەگـەڵ ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبەریشـدا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) ڕێکدێتـەوە، کـە دەفەرمـوێ:

[الماهـر بالقـرآن مـع السـفرة الكـرام الـبررة، والـذي يقـرأُ القـرآن ويتتعتع فيـه وهـو عليه شـاقٌّ، لـه أجـران][1].

واتـە: بابـای شـارەزا لـە قورئـان، لەگـەڵ نوێنـەرە بەڕێـزە چاکەکارەکانە (ئـەو فریشـتانەی خـوا قورئـانی پێـدا ناردوون) ئـەوەش کـە قورئـان دەخوێنـێ و هەڵـەی تێـدا دەکات و دەگەڕێتـەوە بـۆی و بێژەکـەی چـاک بـۆ نایـەت و، لەسـەری قورسـە، دوو پاداشـتی هـەن.

یانی: داشتی خوێندنەکەی و پاداشتی زەحمەتەکەی.

[التعتعة: عُسْرٌ في النطق، ومشقة].

تەعتەعـە: بریتییـە لـەوەی کەسـێک بـە زەحمـەت شـتێکی بـۆ ببێژرێ و بـە قورسـیی بـۆی بگوترێ.

---

(١) - البخاري: ٤٦٥٣، ومسلم: ٧٩٨.

لەوبارەوە کە ئەگەر کەسێک زۆریش شارەزا نەبێ لە قورئان، هەر دەبێ بیخوێنێ و خۆی لەگەڵ ماندوو بکات و، پاداشتی هەر هەیە، هەروەها ئەگەر کەسێک، شارەزایەکی قورئان فێرکەریشی دەست نەکەوێ، لەسەری پێویستە هەر قورئان بخوێنێ، ئەم دەقەش دێنین:

**[عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما قال: خرج علينا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ونحن نقرأ القرآن، وفينا الأعرابي والأعجمي، فقال آقرأوا فكلّ حسن، وسسيجيء أقوام يقيمونه كما يقام القِدْحُ يتعجّلونه ولا يتأجّلونه]**[1].

واتە: جابیری کوڕی عبدالله خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) جارێک هاتە لامان کە ئێمە قورئانمان دەخوێند، ئەعرابییمان تێدابوو، (عەرەبیی خێڵەکیی) و ئەعجەمیی (بابای غەیرە عەرەب) فەرمووی: بخوێنن هەمووی هەر باشە، لەمەودوا کۆمەڵانێک دێن، قورئان دەخوێنن وەک چۆن قیدح {(قدح) ئەو دارەیە کە دەکرێ بە تیر، پێش ئەوەی نووکەکەی تێبخرێ، کە ڕێک وڕاستە} ئاوا ڕاستی دەکەن، (چاکی دەخوێنن) بەڵام پەلەی تێدا دەکەن چاوەڕێی پاداشتەکەی ناکەن.

واتە: هەوڵ دەدەن ئێستا لێی بەهرەمەندبن لەژیانی دونیادا، بەڵام چاوەڕێی پاداشتەکەی ڕۆژی دوایی ناکەن، بەڕواڵەت چاکی دەخوێنن، بەڵام باش لێی بەهرەمەند نین و، باش کاری پێ ناکەن و پێیەوە پابەند نین!

(١) - أخرجه سعيد بن منصور في (فضائل القرآن): ٣١، وأحمد: ١٥٢٧٣، وأبوداود: ٨٣٠ والبيهقي في (الشعب): ٢٦٤٢، قلت: وإسناده صحيح.

## بڕگەی چوارەم: پلەکانی قورئان خوێندن:

زانایان گوتوویانە: قورئان خوێندن چوار پلەیە:

**جۆری یەکەم: (التحقيق):**

(إبن الجزري) لە کتێبی (النشر)دا[1] دەڵێ:

[وهو عبارة عن إعطاءِ كلِّ حَرْف حقَّه، من إشباع المَدِّ وتحقيق الهمزة، وإتمام الحركات واعتماد الإظهار والتشديدات، وتوفيةِ الغُنّات وتفكيك الحروف، وبيانها وإخراج بعضها من بعض، بالسكت والترسل واليسر والتُّؤَدَه، وملاحظة الجائز من الوقوف].

واتە: تەحقیق بریتییە لەوە کە هەر پیتە مافی خۆی پێبدرێ، لەوە کە درێژکردنەوەکەی بەتەواویی بێ و، هەمزەکەی چاک دیاربکرێ و، حەرەکەکان (واتە: سەرو بۆرو ژێر) چاک تەواو بکرێن و، شوێنی دەرخستن باش دەربخرێ، شوێنی گیرە باش بگیرێ و، مینگەکان باش مافی خۆیان پێ بدرێ و، پیتەکان لێک بپچڕێندرێن و، هەر پیتە بە شێوەی خۆی و لە شوێنی خۆیەوە دەربچێ، لە شوێنێک کە پێویستە بوەستی، بوەستی، لە شوێنێک پێویست بێ لەسەر خۆبێ، لەسەرخۆبێ و، لە شوێنێک پێویست بێ بە ئاسانیی بێ، بە ئاسانی بێ و، ڕەچاوی وەستانە دروست(جائز)ە کان بکرێ.

**جۆری دووەم: (الحَدْر):**

هەر (إبن الجزري) لە کتێبەکەیدا[2] دەڵێ: [الحَدْرُ عبارة عن إدراج القراءة وسرعتها وتخفيفها، بالقصر والتسكين والإختلاس والبدل،

(١) - ص٢٠٥.
(٢) - ص٢٠٧.

والإدغام الكبير وتخفيف الهمز، ونحو ذلك مما صحّت به الرواية، ووردت به القراءة، مع إيثار الوصل بإقامة الإعراب ومراعاة تقويم اللفظ وتمكُّن الحروف].

واتە: حەدر بریتییە لە بەپەلە خوێندنی قورئان، بە خێرایی، بە سووككردنیەوە بەهۆی (قصر و تسكين و إختلاس و بدل و الإدغام الكبير وتخفيف الهمز)ەوە، [ئەوانە هەموویان زاراوەی تەجویدیین بە كورتیی ماناكانیان ئاوان:(قصر) كورتكردنەوە، (تسكين) وەستاندن و ئارامكردنەوە، (إختلاس) لێدزینی پیتێك یان وشەیەك و باش گۆ نەكردنی، (بدل) گۆڕین، (الإدغام الكبير) تێكداجۆشدانی گەورە، ئەوە كە دوو پیت تێكدا دەمج بكرێن، (تخفيف الهمز) هەمزەكە بە سووكیی بگوترێ.]

هەروەها وێنەی ئەوانە كە بە ڕیوایەتی ڕاست هاتوە، بەوشێوەیە خوێندراوەو، قورئانخوێنەكان ئاوایان خوێندوە، بەڵام پێویستە ئەوە هەڵبژێردرێ كە هەمووی پێكەوە بلكێندرێ و، ڕێك ئاشكرا بكرێ و، بێژەكان جوان بگوترێن و، پیتەكانیش لای كەمی مافی خۆیانیان پێ بدرێ و بچەسپێنرێن.

**جۆری سێیەم:** (التدوير):

كە ئەویش پلەیەكە لە نێوان تەحقیق و حەدرداو (إبن الجزري) گوتوویەتی:[ وهو المختار عند أكثر أهل الأداء][1].

**واتە:** ئەوە بژاردەی زۆربەی ئەوانەیە كە قورئان خوێن بوون.

**جۆری چوارەم:** الترتيل:

ئەمیش ئاوا پێناسەكراوە: (وهو القراءة المبيّنة المفسِّرة المستوعبة

(١) - النشر: ص٢٠٧.

لأحكام التلاوة، وهو قراءة التدبُّر التي نزل القرءان بالأمر بها، كما قال تعالى:

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤).

واتە: تەرتیل بریتییە لە خوێندنی ڕوونی ڕوونکراوە، کە هەموو حوکمەکانی قورئان خوێندن بگرێتە خۆی و، قورئان خوێندنی بە تێوەڕامانەوەیە، کە قورئان بەو شێوەیە دابەزیوە، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤.

بێگومان هەرکام لە (تەحقیق و تەدویر)یش هەردەچنەوە نێو تەڕتیلەوە، (تەڕتیل)یش واتە: بەڕێک و پێکیی و بەکاوە خۆ بخوێندرێ و، مافی خۆ بدرێ بە پیتەکان و بە وشەکان، کەواتە: ئەوەی دەبێ مرۆڤ لێی وریابێ، ئەوەیە کە خوێندنی بە خێرایی (حَدْر) هێندە خێرا نەبێ، فریای ماف پێدان پێدانی پیتەکان و وشەکان نەکەوێ.



## بڕگەی پێنجەم و کۆتایی: لەبارەی قورئان خوێندنەوە:

ئایا خوێندنی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) بۆ قورئان چۆن بووە؟!

ئێمە لەو بارەوە ئەم سێ دەقە دێنین:

یەکەم: (عن أم المؤمنين حفصة رضي الله عنها قالت: مارأيت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) صلَّى في سبحته قاعداً حتى قبل وفاته بعام، فكان يُصَلِّي في سبحته قاعداً، وكان يقرأ بالسورة فَيُرَتِّلها حتى تكون أطول من أطول منها)[1].

دایکی بڕواداران خاتو حەفصە کچی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوام نەبینیوە (صلى الله عليه وسلم) نوێژی سوننەتی بە دانیشتنەوە کردبێ، تاکو ساڵێک پێش کۆچی دوایی، ئەو کاتە نوێژی سوننەتی بە دانیشتنەوە دەکردو، سوورەتێک لە قورئانی دەخوێند، بەڕێک و پێکیی دەیخوێند، هەتا درێژتر دەبوو لە سوورەتێکی لە خۆی درێژتر (ئەگەر ئەو خوێندبای).

دووەم: (عن أم المؤمنين أم سلمة رضي الله عنها كانت تصف قراءة النبي (صلى الله عليه وسلم) بأنها كانت قراءة مفسَّرة حَرْفاً حَرْفاً.

وأنس بن مالك يذكر أن النبي (صلى الله عليه وسلم) كان يمُدّ بها صوتَهُ مداً.

ويفسر أنس ذلك في رواية فيقول: كان مَدّاً، ثم قرأ بسم الله

---

(١) - حديث صحيح أخرجه مالك: ٣٦٣، وأحمد:ج٦ ص٣٨٥، ومسلم: ٧٣٣، والترمذي: ٣٧٣، والنسائي: ١٦٥٨، قال الترمذي: حديث حسن صحيح.
والسبحة صلاة النافلة.

الرحمـن الرحيـم، يمـد ببسـم اللـه، ويمـد بالرحمـن، ويمـد بالرحيـم)[١].

دایکـی بـڕواداران ئوممـو سـەلەمە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەری (صـلى اللـه عليـه وسـلم) وەسـف كـردوە كـە: خوێندنەوەیەكـی ڕوون بـووە، پیـت پیـت.

ئەنەسـی كـوڕی مالیـك گوتوویـەتی: پێغەمبـەر (عليـه الصـلاة والسـلام) دەنگـی خـۆی بـە قورئـان خوێندنەكـەی درێـژ دەكـردەوە.

ئنجـا ئەنـەس ڕوونی كردۆتـەوە لـە ڕیوایەتێكـداو گوتوویـەتی: قورئـان خوێنـدنی پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) درێـژ بـوو، دوایـی (بسـم اللـه الرحمـن الرحيـم)ی خوێنـدەوە، (بسـم اللـه)ی درێـژ كردۆتـەوە و، (الرحمـن)ی درێـژ كردۆتـەوە و، (الرحيـم)ی درێـژ كردۆتـەوە[٢].

سـێیەم: هەروەهـا ئـەم دەقـەش هاتـوە: (سـمع عبداللـه بـن مُغَفَّـل النبـيّ يقـرأ قـراءة لَيِّنَـةً يُرَجِّـع فيهـا يقـول: (آآآ) .

وفي روايـة: رأيـت النبـي (صـلى اللـه عليـه وسـلم) يقـرأ وهـو عـلى ناقتـه وجملـه، وهـي تسـير بـه وهـو يقـرأ بسـورة الفتـح، قـراءة لينـة يقـرأ وهـو يرجـع)[٣].

واتـە: عبداللـه ی كـوڕی موغەففـەل دەڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خوابـوو خوێندنێكـی نەرمـی دەخوێنـد، دەنگـی پـێ دەلارانـدەوە، دەیفەرمـوو: ئـااا.

گێڕراوەكـەی دیكـە: پێغەمبـەری خـوام بینـی كـە بـە سـواری حوشـترە مێیەكـەی یـان نێرەكـەی، سـووڕەتی (الفتـح)ی دەخوێنـد،

---

(١) - أحمد في المسند: ج٦ ، ٢٩٤ و٣٠٠، والبخاري في (خلق أفعال العباد) : ١٧١، وأبوداود: ١٤٦٦، والترمذي: ٢٩٢٣، والنسائي: ١٠٢٢ - ١٦٢٩، وابن خزيمة: ١١٥٨، والحاكم: ١١٦٥، والبيهقي: في (السنن) ج٣ ص١٣.

(٢)- البخاري: ٤٧٥٩.

(٣)- البخاري: ٤٠٣١ و ٤٥٥٥ و٤٧٤٧ و ٤٧٦٠، ومسلم: ٧٩٤.

خوێندنێکی نەرم دەنگی دەلارانـدەوە.

کەواتە: خوێندنەوەی پێغەمبەری خاتەمیش -(صلى الله عليه وسلم) - بۆ قورئان بەشێوەیەکی ئەوپەڕی ڕێک وپێک بووە، بەو شێوەیە بووە کە خوا فەرمانی پێکردەو، دەنگی خۆی پێ لارانـدۆتەوە.



بەڕێزان!

ئەدەبەكانـی قورئانخوێنـدن زۆرن، بـەڵام ئێمـە گوڵبژێرێكـمان كـردوون و، ئەوانـەی هێناومانـن، سـەرجەم سـێزده (١٣) ئەدەبـن و، لـە سـێزده خـاڵ دا دەیانخەینـە ڕوو:

**ئەدەبـی یەكـەم: كـە دەبـێ مـرۆڤ ڕەچـاوی بـكات بـۆ قورئـان خوێنـدن، بریتییـە لـە: نیـەت و دڵـی خـۆ سـاغكردنەوه، كه ئـەو قورئانـە بۆ بەمەبەسـتی بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەندیـی خـواو پاداشـتی خـوا، بخوێنـێ:**

پێشتر ئەم دەقەمان هێناو دووباره دەیهێنینەوه:

(عـن جابـر بـن عبداللـه رضي اللـه عنهـما قـال: دخـل رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم) المسـجد، فـإذا فيـه قـوم يقـرأون القـرآن قـال: إقـرأوا القـرآن وابتغــوا بــه اللــه عزوجــل، مــن قبــل أن يــأتي قــوم يقيمونــه إقامــة القــدح يتعجلونــه ولا يتأجلونــه).

واتـە: جابیـری كـوڕی عبداللـه خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) هاتـە مزگـەوت، كۆمەڵێـك قورئانیـان دەخوێنـد، فەرمـووی: قورئـان بخوێنـن و خـوای زاڵ و شـكۆداری پـێ بخـوازن [خـوا (سُـبحانه وتعـالى) بـە قورئـان خوێندنەكەتـان بخـوازن، واتـە: پاداشـتی خـوا] بەرلـەوەی كۆمەڵێـك بێـن ڕێكـی بكـەن وەك چـۆن تیـر ڕێـك بكرێ، بـەڵام (يتعجلونـه ولا يتأجلونـه) مەبەسـتیان بەهـرەی دونیایـە نـەك پاداشـتێ كـە خـوا لـە دواڕۆژدا دەیـدا.

**ئەدەبـی دووەم: بریتییـە لـەوەی قورئانەكـەی بـە كاوه خـۆ، بەشـێنەیی، بە تێوەڕامانـەوه بخوێنـێ، تاكـو هەم لە ڕووی لێتێگەیشـتنەوه لێـی بەهرەمەندبێ، هەم لـە ڕووی پاداشتیشـەوه لێـی بەهرەمەندبێ:**

لەو بارەوە با چەند دەقێک بێنین:

١. (جـاء رجـل إلى عبدالله بـن مسـعود رضي الله عنـه فقـال: (أني لأقـرأ المفصـل في ركعـة، فقـال عبدالله: هَـذّاً كَهَـذِّ الشـعر، إن أقوامـاً يقـرأون القـرءان لا يجـاوز تراقيهـم، ولكـن إذا وقـع في القلـب فرسـخ فيـه، نفـع)[1].

واتـە: پیاوێـک هاتـە لای عبداللـه ی کـوڕی مەسـعود (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، گـوتی: مـن هەمـوو موفەسسـەڵ [واتـە: لـە سـوورەتی قافـەوە (ق) تاکـو سـوورەتی ئەلنـاس (الناس)، سـوورەتە کورتـەکان] لـە یـەک ڕکاتـدا دەخوێنـم، عبداللـە گـوتی: خوێندنـە وەک خوێنـدنی شـیعر، کۆمەڵانێـک قورئـان دەخوێنـن لـە گەروویـان ئـەو دیـو نابـێ، بـەڵام قورئـان ئەگـەر کەوتـە نێـو دڵ و تێیـدا چەسـپا ئنجـا سـوود دەگەیەنـێ.

هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هاتوە:

٢. (قـال أبـو جمـرة: قلـت لابـن عبـاس: إني رجـل سريـع القـراءة، فربمـا قـرأت القـرآن في ليلـة مـرة أو مرتـين، فقـال ابـن عبـاس: لأنْ أقـرأ بسـورة واحـدة أعجـب إليّ مـن أفعـل مثـل الـذي تفعـل، فـإن كنـت فاعـلاً بعـد، فاقـرءه قـراءة تُسْـمِعُ أُذُنيْـكَ ويَعيـه قَلْبُـك)[2].

ئەبـو جەمـرە کـە یەکێـک بـووە لەزانایـانی تابیعیـن، دەڵـێ بـە عبداللـه ی کـوڕی عەبباسـم گـوت: مـن پیاوێکـم زۆر بەخێرایـی قورئـان دەخوێنـم، جـاری وا هەیـە قورئـان هەمـووی لـە شـەوێکدا دەخوێنـم، جارێـک یـان دوو جـار، عبداللـە کـوڕی عەببـاس پێـی گـوت: ئەگـەر سـوورەتێک بخوێنـم پێـم باشـترە لـەوەی وەک تـۆ بکـەم (ئـەوەی تـۆ دەیکـەی منیـش وابکـەم) ئەگـەر هـەر بەخێراییـش دەیخوێنـی، وای بخوێنـە کەبـە هـەردوو گوێیەکانتـی بیسـتێنی و دڵیشـت لێـی تێبـگات.

(١)- أخرجه البخاريی: ٤٧١٠، وموسليم: ٨٢٢، والترمذي: ٦٠٢، والنسائي: ١٠٠٤.
(٢)- أثر صحيح أخرجه البيهقي في الشعب: ٢١٥٩، وإسناد صحيح.

٣. لەوبارەوە ئەم دەقەش دێنین:

(عـن عبداللـه بـن عمـرو بـن العـاص رضي اللـه عنهـما أنـه كان يختـم في كل ليلـة، فقـال لـه النبـي (صـلى اللـه عليـه وسـلم): إقـرأ القـرآن في كل شـهر، قـال: قلـت: يانبـي اللـه! إني أطيـق أفضـل مـن ذلـك، قـال: فاقـرأه في كل عشريـن، قـال: قلـت يـا نبـي اللـه! إني أطيـق أفضـل مـن ذلـك، قـال: فاقـرأه في كل عـشر، قـال: قلـت يـا نبـي اللـه! إني أطيـق أفضـل مـن ذلـك، قـال: فاقـرأه في كل سـبع ولا تَـزِدْ عـلى ذلـك)[1].

عبداللـه ی کـوڕی عەمـری کـوڕی عـاص خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ، باسـیکردوە کـە هەمـوو شـەوێک قورئـانی یەکجـار خوێنـدوە، ئەوەنـدەی قورئانـەی ئـەو کاتـە دابەزیـوە، پێغەمبـەر (عليـه الصـلاة والسـلام) پێـی فەرمـوو: قورئـان هەمـووی لـە مـاوەی مانگێکـدا تەواوبکە، بیخوێنـە، دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە باشـترم لـە توانـادا هەیـە، فەرمـووی: بـە هـەر بیسـت ڕۆژێ جارێـک قورئـان بخوێنـە، دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە باشـترم لـە توانـادا هەیـە، فەرمـووی: لـە هـەر دە ڕۆژانـدا جارێـک هەمـوو قورئـان تـەواو بکـە، گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لـەوە باشـترم لـە توانـادا هەیـە، فەرمـووی: بـە حـەوت ڕۆژان هەمـوو قورئـان تـەواو بکـەو، لـەوە زیاتـر مەکـە، (لـەوە زیاتـر مەخوێنـە).

واتـە: لـە حەفتەیەکـدا، کـە هـەر ڕۆژەی چـوارو جوزئـو شـتێکی بەردەکـەوێ، لـەوە زیاتـر پەلـە مەکـە لـە خوێنـدنی قورئانـدا.

٤ـ لـە فەرموودەیەکـی دیکـەدا هاتـوە کـە پێغەمبـەری خـوا (عليـه الصـلاة والسـلام) بـە عبداللـە ی کـوڕی عەمـری کـوڕی عاصـی فەرمـووە:

---

(١) - البخاري: ٤٧٦٦ و ٤٧٦٧ ومسلم: ١١٥٩.

هـەر لـەو بەسـەر هاتـەدا کـە ڕابـرد:

(لم يفقه من قرأ القرءان في أقل من ثلاث)[1].

واتـە: هەرکەسـێک بەسـێ شـەوو ڕۆژان کەمـتر هەمـوو قورئـان بخوێنـی، لێـی تـێ نـاگا.

**ئەدەبـی سـێیەم: ئەدەبـی سـێیەمی قورئـان خوێنـدن، ئەوەیـە کـە بابـای قورئـان خوێـن، هەوڵبـدات لـە شـوێنێکی هێمـن و ئـارام قورئانەکـەی بخوێنـێ، نـەک لـە نێـو قەڵەباڵغیـی و، شـوێنێک کـە دەنگـە دەنـگ و هـەرای لـێ بـێ، کـە نـە بۆخـۆی بزانـێ چـی خوێنـدوە، نەکەسـانێکیش کـە گوێبیسـتی دەبـن، هیچـی لـێ حاڵیـی بـن:**

بێگومـان ئـەوە ئـەدەبی خوێنـدنی فەرمایشـتی خوایـە، کـە دەبـێ لـە شـوێنێکی هێمـن و ئـارام و بـێ دەنـگ و، بەڕێـزو حورمەتەوە، فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خـوا بخوێنـێ.

خوا (سُبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ الأعراف: ٢٠٤.

واتـە: هـەرکات قورئـان خوێنـدرا، گوێـی بـۆ هەڵخـەن و بێدەنگـبن، بەڵکـو بەزەییتـان لەگـەڵ بنوێندرێ.

کەواتـە: لـە کاتێـدا کـە قورئـان دەخوێنـدرێ، پێویسـتە گوێی بـۆ هەڵبخرێ و، پێویسـتە بێدەنگیـی بکـرێ، ئـەوە دەبێتـە مایـەی بەزەیـی خـوا بـۆ سـەر کەسـێک کـە بـەو شـێوە قورئـان دەخوێنـێ، یـان گـوێ لـە قورئـان خوێنـدنی کەسـێکی دیکـە دەگـرێ.

لەو بارەوە دەگونجێ ئەم دەقەش بەبەڵگە بێنینەوە:

---

(١) - أخرجه ابن أبي شيبة: ٨٥٧٣، وأحمد: ٦٥٣٥، وأبوداود: ١٣٩٠ و ١٣٩٤، والترمذي: ٢٩٤٩، والنسائي في فضائل القرءان: ٩٢ وابن ماجة: ١٣٤٧، والدارمي: ١٤٦٤، وابن حبان: ٧٥٨، والبيهقي في الشعب: ٢١٦٨. قلت: وإسناده صحيح، وقال الترمذي: حديث حسن صحيح.

(عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما أن النبي (صلى الله عليه وسلم) اعتكف وخطب الناس، فقال: أما إذا أحدكم قام في الصلاة، فإنه يناجي ربه، فليعلم أحدكم ما يناجي ربه، ولايجهر بعضكم على بعض بالقراءة في الصلاة)[1].

عبدالله ی کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) چووە ئیعتیکافەوە، دوایی وتاری بۆ خەڵک دا، فەرمووی: یەکێکتان کە بۆ نوێژێ هەڵدەستێ، لەگەڵ پەروەردگاریدا ڕازو نیازو وتووێژ دەکات، با بزانێ چی لە خزمەت پەروەردگاریدا دەڵێ! هەروەها با هەندێکتان لە قورئانی خوێندنی نوێژێدا، بەسەر هەندێکتاندا دەنگ هەڵنەهێنن.

واتە: بە هێمنی و ئارامی لە نوێژدا قورئان بخوێنن، تاکو ئەوانەی دیکە کە گوێیان لێیەو لە تەنیشتن، لێیان تێک نەچێ و، هیچ کەس نابێ مافی هیچ کەس بخوات.

**ئەدەبی چوارەم: بۆ قورئان خوێندن، ئەوەیە دەبێ کەسێک کە قورئان دەخوێنێ، دڵ و مێشکی خۆی سافبکاتەوە:**

واتە: خۆی بۆ ئامادە بکات لە ڕووی فیکرییەوە، مێشک و عەقڵی لەولاولا نەبێ و، لە ڕووی دەروونییەوە، هیچ شتێکی سەغڵەتکەری نەبێ، کە بێ ئاگای بکات لە قورئان خوێندنەکە، ئنجا چ لەنوێژدا بیخوێنێ، چ لە دەرەوەی نوێژدا بیخوێنێ.

لەو بارەوەش کە ئەوە شتێکی ئاشکرایەو پێویستیی بە بەڵگەی نەقڵیی ناکا، بەڵام دەگونجێ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە بکەینە بەڵگە کە دەفەرموێ:

(١) - أحمد: ٤٩٢٨، ومن طريقه الطبراني في الكبير: ١٣٥٧٢، قلت: وهذا إسناد صحيح.

(لا صلاة بحضرة الطعام ولا وهو يدافعه الأخبثان)[١].

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: نوێژ ناکرێ لە کاتێکدا خواردن ئامادە کراوەو دانراوە، هەروەها نابێ نوێژ بکرێ لەکاتێکدا دوو شتە پیسەکان (میزو پیسایی) مرۆڤ سەغڵەت دەکەن.

ئنجا بە قیاس لەسەر ئەو دوو حاڵەتە، هەرشتێکی دیکە کە عەقڵ و دڵی مرۆڤ داگیرکات، دەبێ مرۆڤ خۆی لەوانە دەربازبکاو، بە دڵێکی ساف و بە مێشکێکی خاڵی لە مەشغەڵەت و سەرقاڵیی، قورئان بخوێنێ.

**ئەدەبی پێنجەم: دەبێ قورئان خوێندنەکەی دەست پێبکات بە پەنا بەخوا گرتن لە شەیتان:**

وەک خوا ـ (سُبحانه وتعالى) ـ فەرمانی پێکردوە:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ النحل.

خوا (سُبحانه وتعالى) فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم دەکات -(صلى الله عليه وسلم)- دەکات لە پشت ئەویشەوە بە هەرکەسێک کە پەیڕەویی لەو دەکاو بەڕێی ئەودا دەڕوا، دەفەرموێ: هەرکاتێک قورئانت خوێند، پەنا بەخوا بگرە لە شەیتانی دوور خراوە، بەدڵنیاییەوە ئەو دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا نیە کە بڕوایان هێناوەو، پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن، بەڵکو تەنیا دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە کە شوێنی دەکەون و، دەیکەن بە هاوبەش (ی خوا لە پەرستندا).

(١) - أحمد: ج٦ ، ٣٢ و ٥٤و ٧٣، ومسلم: ٥٦٠، وأبوداود: ٨٩، عن عائشة رضي الله عنها.

**تەعبیری پەنابەخوا گرتن:**

ئایا، پەنا بەخوا بردن لە کاتی قورئان خوێندندا، شێوازو ڕێژگەکەی چۆنە؟ هەڵبەتە دواتریش ئێمە لە تەوەری نۆزدەیەم و کۆتاییدا لەوبارەوە قسەیەکی لێ دەکەین، بۆیە لێرەش هەر بەکورتیی دەڵێین: پەنا بە خوا گرتن بە هەر تەعبیرێک، فەرمانەکەی پێ جێ بەجێ بێ، دەگونجێ، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری بەڵکو تێکڕای قورئان خوێنان، ئەم تەعبیرەیان بەکار هێناوە: [أعوذ بالله من الشيطان الرجيم]، پەنا بەخوا دەگرم، لە شەیتانی دوورخراوە (لە بەزەیی خوا).

ئنجا کە تێکڕای قورئان خوێنان و شەرعزانان ئەم تەعبیرەیان هەڵبژاردوە، ڕێک لە ئایەتە موبارەکەش وەریانگرتوە، کەپێشتر هێنامان، ئایەتی (٩٨) لە (النّمل) ، ئەوە کورتە یەک بوو دەربارەی پەنا بەخوا گرتن لەکاتی قورئان خوێندنداو، دواتریش لەتەوەری نۆزدەدا زیاتری لێ دەدوێین.

**حوکمی پەنا بەخوا گرتن چیە؟!**

زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە، بەڵام ڕای بەهێزتر ئەوەیە کە شتێکی پەسەندە لەکاتی قورئان خوێندن لە نێو نوێژدا، یاخود لە دەرەوەی نوێژ، پەنا بەخوا بگیرێ و ئیستیعازە (الإستعاذة) بکرێ.

هەڵبەتە هەندێ لە زانایان ڕایان وایە کە: [أعوذ بالله من الشيطان الرجيم] گوتن فەرزە، بەڵام بە سەرنجدانی تێکڕای ئەو شوێنەوارانەی لەو بارەوە هاتوون، بۆمان دەردەکەوێ کە شتێکی پەسەندو چاکە.

یەکێک لە بەڵگەکان لەو بارەوە ئەم دەقەیە:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) إذا كبَّر في الصلاة سكت هُنَيْةً قبل أن يقرأ، فقلت يارسول الله:

بـأبي أنـت وأمـي أرأيـت سـكوتك بـين التكبـير والقـراءة مـا تقـول؟ قـال أقـول: أَللَّهـم باعـد بيني وبـين خطايـاي كـما باعـدت بـين المـشرق والمغـرب، أللهـم نقِّنـي مـن خطايـاي كـما يُنَقَّـى الثَّـوبُ الأبيـض مـن الدَّنـس، أللهـم آغسـلني مـن خطايـاي بالثلـج والمـاء والـبرد)(١).

ئەبوهورەیـرە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ پێغەمبـەری خـوا (صـلى اللـه عليـه وسـلم) دوای ئـەوەی (أَللـه أكـبر)ی دەكـرد (هـی نوێـژ دابەسـتن) ماوەیەكـی كـەم بێدەنـگ دەبـوو، بەرلـەوەی دەسـت بـكات بـە خوێنـدنی قوڕئـان (سـوورەتی فاتیحـەو سـوورەتی دوای سـوورەتی فاتیحـە) منیـش پێمگـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! بـاب و دایكـم فیداتـبن، ئـەو وەسـتانەت لـە نێـوان (أللـه أكـبر) كـردنی نوێـژ دابەسـتن و قوڕئـان خوێندنـدا، چـی تێـدا دەڵێـی؟ فەرمـووی: تێیـدا دەڵێـم: ئـەی خوایـە! دووریـی بخـە نێـوان مـن و گوناحەكانـم، وەک چـۆن دووریيـت خسـتۆتە نێـوان ڕۆژهـەڵات و ڕۆژ ئـاواوە، ئـەی خوایـە! لـە هەڵەكانـم پاكـم بكـەوە، وەک چـۆن پۆشـاكی سـپی لـە چڵـک پـاک دەبێتـەوە، ئـەی خوایـە! لـە گوناحەكانـم بمشـۆ بـە بەفـرو بـە ئـاوو بـە تـەرزە.

لێـرەدا پێغەمبـەری خاتـەم (صـلى اللـه عليـه وسـلم) باسـی ئیسـتعیازە گوتنـی نەكـردوە، هەڵبەتـە ئەمـە وەک ئیبنولجەزەریی لە كتێبـە ناودارەكەی خـۆی (النـشر في قـراءات العـشر)دا دەڵـێ: ئەمـە ڕای زۆربـەی زانایانە.

ئنجـا گوتنـی: (أعـوذ باللـه مـن الشـيطان الرجيـم)، یاخـود پەنـا بەخـوا گرتـن، بەرلـە دەسـتپێكردن، شـتێكی پەسـەندە بـۆ هەمـوو قوڕئـان خوێنێـک، چ بەتەنـێ بخوێنـێ، چ لەگـەڵ كۆمەڵێـكدا بخوێنـێ، چ لەنێـو نوێـژدا چ لـە دەرەوەی نوێـژ، بـەڵام گوتنـی (أعـوذ باللـه مـن الشـيطان

(١)- أخرجه البخاري: ٧١١، ومسلم: ٥٩٨.

الرجيم) لەکاتێکـدا کـە وتـار دەدرێ، یـان ئامۆژگاریـی دەکـرێ، یـان فەتـوا دەدرێ، سـوننەت نیـە، وەک زۆر لـە ئامۆژگارییـکارو وتاربێـژەکان ئەوەیـان کـردوە بـە عـادەت.

**ئەدەبـی شەشـەم: ئەوەیـە کـە دەنگـی خـۆی بـە قورئـان خوێندنەکـەی خـۆش بـکا، ئەوەنـدەی دەتوانـێ، بـەڵام بەبـێ زۆر لەخۆکـردن (تكلّف):**

لەو بارەوەش دەق زۆرن و ئێمە سێ دانەیان بە نموونە لێ دێنینەوە:

١ـ (عـن الـبراء بـن العـازب رضي اللـه عنـه قـال: قـال رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم): زَيِّنـوا القـرآن بأصواتكـم)[1].

واتــە: پێغەمبــەر (عليــه الصــلاة والســلام) فەرموویــەتی: قورئـان بـە دەنگەکانتـان جـوان بکـەن.

واتــە: کاتێـک قورئـان دەخوێنـن، دەنگـی خۆتـان خـۆش و چـاک بکەن و دەنگتـان بلارێننەوە.

لـە بێژەیەکـی دیکـەدا هاتـوە: (حَسِّـنوا القـرآن بأصواتكـم، فـإنَّ الصـوت الحَسَـنَ يزيد القـرآن حُسْـناً)[2].

واتــە: قورئـان بەدەنگەکانتـان جـوان بکـەن، چونکـە دەنگـی خـۆش، چاکیـی و جوانیـی قورئـان زیـاد دەکا.

٢ـ هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هاتوە:

(لم يأذن الله لشيء، ما أذن للنَّبيّ أن يَتَغنَّى بالقرآن)[3].

واتە:خوا (سُبحانه وتعالى) بۆ هیچ شتێک گوێی نەگرتوە، بە ئەندازەی گوێبیستبوونی بۆ پێغەمبەرێک کە قورئان بەدەنگ لاراندنەوەوە دەخوێنێ.

(١) - أحمد في المسند: ج٤ : ٢٨٣ و٢٨٥ و٢٩ و٣٠٤، والبخاري في خلق أفعال العباد: ٢٥٠و ٢٥٤ و ٢٥٦، وأبوداود: ١٤٦٨، والنسائي ١٠١٥ و ١٠١٦، وفي فضائل القرءان: ٧٥، وابن ماجه: ١٣٤٢، والدارمي ٣٣٧٢، وإسناده صحيح.

(٢) - أخرجه الدارمي: ٣٣٧٣، والحاكم: ٢١٢٥، والبيهقي في الشعب: ٢١٤١، وإسناده حسن.

(٣) -البخاري: ٤٧٣٥ و ٤٧٣٦ و٧٠١٥، ومسلم: ٧٩٢.

مەبەســت لــە (يتغنــيَّ بالقــرآن) دەنــگ خۆشــكردن و لاراندنەوەيــە، هەڵبەتــە لــە ســنووری خۆيــدا.

٣ـ دەقێكی دیكە لەوبارەوە:

(عــن أبي مــوسى الأشــعري رضي اللــه عنــه قــال: قــال رســول اللــه (صــلى اللــه عليــه وســلم) لأبي مــوسى: لــو رأيتنــي اســتمع لقراءتــك البارحــة، لقــد أوتيــت مزمــاراً مــن مزامــير آل داود)[١].

ئەبومووســای ئەشــعەریی (خــوا لێــی ڕازی بــێ) دەگێڕێتــەوە، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا علیــە الصــلاة والســلام پێــی گوتــم: ئەگــەر دەتبينــم دوێنــێ شــەوێ گوێــم بــۆ قورئــان خوێندنەكــەت گــرت، بەدڵنيايــی تــۆ ئاوازێــك لــە ئــاوازە خۆشــەكانی داوود و بنەماڵەكەيتــت پێــدراوە.

(مزاميــر)، كــۆی (مزمــار)ەو ميزماريــش بــەو ئامێــرە دەڵێــن كــە دەنگــی خۆشــی لێــدێ، ئنجــا شمشــاڵە، عــوودە، تەپڵــە، دەفــە، هەرچــی هەيە.

پێغەمبــەری خاتــەم (صــلى اللــه عليــه وســلم) دەنگــی خۆشــی ئەبومووســای ئەشــعەریی بــە ئاوازێــك لــە ئــاوازەكانی داوود دانــاوە، داوديــش دەنگــی يەكجــار خــۆش و دڵبزوێــن بــووە.

(الشــافعي) ڕەحمــەتی خــوای لــێ بــێ، لــەو بــارەوە گوتوويــەتی: (لابــأس بالقــرآءة بالألحــان وتحســين الصــوت بــأيِّ وجــهٍ مــا كان، وأحــب مــا يقــرأ إليَّ حَــدْراً وتحزينــاً)[٢].

واتــە: قەيــدێ نــاكات قورئــان بــە ئــاوازان بخوێنــدرێ و بــە دەنگــی خــۆش، بــە هەرشــێوەيەك بــێ، بــەڵام خۆشەويســترين جــۆری قورئــان خوێنــدن لــەلای مــن، ئەوەيــە كــە بــە خێرايــی بــێ، بــەڵام بــە دەنــگ لاراندنــەوەو، دەنــگ پەژارەداركــردن و خەمباركردنــەوە بــێ.

---

(١)- البخاري: ٤٧٦١، ومسلم: ٥٤٦.
(٢) - مختصر المزني: ص٣١١، الأم: ج٦، ١١٠، ومناقب الشافعي للبيهقي: ج١، ص٢٨٠.

**ئـەدەبی حەوتـەم: لـە ئەدەبـە کانی قورئـان خوێنـدن ئەوەیـە کـە بابـای قورئـان خوێـن، هەوڵبـدات زۆر بـە کڕووزانـەوەو لاڵانـەوەو بـە ملکەچیـی بـۆ خـواوە، قورئانەکـە بخوێنـێ.**

ئنجا ئەگـەر بەبـێ زۆر لـە خۆکـردن (تکلّـف) گریانیشـی بـێ، ئەویـش شـتێکی پەسـەندە، چونکـە خـوا (سُـبحانه وتعـالی) بەنـدە چاکـە کانی خـۆی وا پێناسـە کردوە کـە بـە قورئـان کارتێکـراو دەبـن و گریانیشـان دێ.

بۆ نموونە:

١ـ لە سوورەتی (الزمر)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ﴾ الزمـر: ٢٣.

واتـە: خـوا باشـترین فەرمایشـتی دابەزانـدوە، کتێبێکـە وێکچوویـە، دووبارە کراوەیـە، ئەوانـەی سـام و هەیبەتیـان بەرامبـەر پەروەردگاریـان هەیـە، پێسـتیان ڕێکـدێ، (مچوڕکەیـان پێـدا دێ) دوایـی پێسـتیان و دڵیـان نـەرم دەبـێ بـەرەو یـادی خـوا، ئـەوەش ئـەو ڕێنماییـەی خوایـە کـە هەرکەسـێکی بیـەوێ پێـی ڕاسـتە ڕێ دە کاو، هەرکەسـێک خـوا گومڕاییـکات، هیـچ ڕێنماییکارێکـی نیـە.

بێگومـان خـواش (سُـبحانه وتعـالی) لـە گۆتـرە نـە کەس گومـڕا دە کات و، نە کەسـیش ڕاستە ڕێ دە کات.

٢ـ هەروەهـا خـوا (سُـبحانه وتعـالی) لـە سـوورەتی (الحدیـد) دا دەفەرمـوێ:

﴿ أَلَمۡ يَأۡنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخۡشَعَ قُلُوبُهُمۡ لِذِكۡرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلۡحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلُ فَطَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَمَدُ فَقَسَتۡ قُلُوبُهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴾ الحدید: ١٦.

واتــە: ئایــا کات نەهاتــوە بــۆ ئەوانــەی بڕوایــان هێنــاوە کــە دڵیــان بــۆ یــادی خــواو، بــۆ ئــەو حەقــەی کــە داییەزانــدوە، ملکەچبــێ، وەک ئەوانــەی پێشــتر کتێبیــان پێدرابــوو، نەبــن، کــە ماوەیــان بەســەردا تێپــەڕی (ماوەیەکــی درێــژ) دڵیــان ڕەق بــوو و، زۆریشــیان لادەربــوون؟

٣- هەروەهــا خــوا (سُــبحانه وتعــالى) لــە ســوورەتی (الإسراء) دا بۆمــان بــاسی کۆمەڵێــک دەکاو دەفەرمــوێ:

﴿ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ قُلْ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓاْ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ﴿١٠٩﴾ ﴾ الإسراء.

واتــە: ئەمــە قورئانێکــە جیــا جیامــان کــردوە، بــۆ ئــەوەی بەســەر خەڵکیــدا بیخوێنــیێ، بــەکاوە خــۆو بەشــێنەیی و، بــەش بــەش دامانبەزانــدوە، بڵــێ: بــڕوای پــێ بێنــن یــان بــڕوای پــێ نەهێنــن، ئەوانــەی پێشــتر زانیارییان پێــدراوە، هەرکاتێــک بەســەریاندا بخوێنرێتــەوە، بەســەر چەناگەکانیانــدا دەکــەون بــە کڕنووشــبردوویی (واتــە: کڕنــووش دەبــەن) دەشــڵێن: پاکیــی بــۆ پەروەردگارمــان، بــە دڵنیایــی بەڵێنــی پەروەردگارمان هاتە دی و، بەســەر چەناگەکانیانــدا دەکــەون، دەگریــن و ئــەوەش ملکەچییــان تێــدا زیــاد دەکا.

٤ـ هەروەها لە سوورەتی (مریم)دا لەو بارەوە خوا دەفەرموێ:

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ﴾ مريم: ﴿٥٨﴾.

دوای ئــەوەی خــوا (سُــبحانه وتعــالى) باســی ژمارەیــەک لــە پێغەمبەران دەکات - صــەڵات و ســەلامی خوایــان لەســەربێ - دەفەرمــوێ: ئەوانــە ئــەو کەســانەن خــوا چاکــەی لەگەڵــدا کــردوون لــە پێغەمبــەران لــە وەچــەی ئــادەم و، لەوانــەی لەگــەڵ نووحــدا هەڵمانگرتــن و، لەوەچــەی ئیبراهیــم و

ئیسرائیل (یعقوب) و لەوانەی ڕاستەڕێانکردن و هەڵانبژاردن، کاتێک ئایەتەکانی خوای بە بەزەییان بەسەردا دەخوێندرانەوە، بەکڕنووشدا دەکەوتن بە گریانەوە.

چەند دەقێکی سوننەتیش لەو بارەوە دێنینەوە:

**یەکەم:** (عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنه قال: قال لي النبي (صلى الله عليه وسلم): إقرأ عليَّ، قلت: أقرأُ عليك و عليك أُنزل؟ قال فإنِّي أُحِبُّ أن أسمعه من غيري، فقرأتُ عليه سورة النساء حتى بلغت:

﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ النساء: ٤١.

قال: أمْسِك، فإذا عيناه تذرفان، وفي لفظ: فرفعت رأسي فإذا دموعه تسيلُ)[١].

عبدالله ی کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: قورئانم بەسەردا بخوێنە، گوتم: چۆن قورئانت بەسەردا بخوێنم کە بۆسەرتۆ دابەزیوە؟ فەرمووی: حەزدەکەم لە غەیری خۆمەوە بیبیستم، منیش سووڕەتی (النساء)م بەسەردا خوێند، تاکو گەیشتمە ئەو شوێنەی کە دەفەرموێ:

﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ النساء: ٤١.

واتە: حاڵ چۆن دەبێ ئەگەر لەهەر کۆمەڵگایەک شایەتێکمان هێناو، تۆشمان بە شایەت هێنا بەسەر ئەمانەوە! ئنجا فەرمووی: بەسە، یەکسەر تەماشام کرد چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهات لە، بێژەیەکدا دەڵێ: سەرم بەرزکردەوەو تەماشامکرد، فرمێسکەکانی لە چاوی دەڕژان.

(١)- البخاري: ٤٣٠٦ و ٤٧٦٢ و٤٧٦٣ و ٤٧٦٨ و ٤٧٦٩، ومسلم: ٨٠٠.

**دووەم:** هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین:

(عن عائشة رضي الله عنها قال: إن ابا بكر رجل رقيق، إذا قرأ غلبه البكاء)[1].

واته: دایکمان خاتو عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: ئەبوبەکر پیاوێکی زۆر دڵ نەرمە، زۆر خاوەن سۆزە، کاتێک قورئان بخوێنێ، گریان بەسەریدا زاڵ دەبێ.

ئەمە لەبارەی ئەبوبەکرەوە.

**سێیەم:** لەبارەی عومەرەوە (خوا لێی ڕازی بێ):

(عن عبدالله بن شداد بن الهادي قال سمعت نشيج عمر بن الخطاب وأنا في آخر الصفوف في صلاة الصبح، يقرأ من سورة يوسف، يقول (إنما أشكو بثِّي وحُزْني إلى الله)[2].

عبدالله ی کوڕی شەددادی کوڕی هادی دەڵێ :گوێم لە پڕمەی گریانی عومەری کوڕی خەتتاب بوو لەحاڵێکدا من لە کۆتایی ڕیزەکاندا بووم لە نوێژی بەیانییدا، لە سوورەتی یوسفی دەخوێند لە کاتی خوێندنی ئەم ڕستەیەدا گریانی هات: (إنما أشكوا بثي وحزني إلى الله)، واتە: من خەم و خەفەت و دڵ تەنگیی خۆم، تەنیا بۆ لای خوا سکاڵا دەکەم.

**چوارەم:** لەو بارەوە ئەم شوێنەوارەش دێنین:

(عن عبدالله بن عروة بن الزبير قال: قلت لجدَّتي أسماء: كيف كان يصنع أصحاب رسول الله (صلى الله عليه وسلم) إذا قرأوا القرءان

(١) - البخاري: ٦٥٠، وهو في الصحيحين بمعناهُ من حديث عائشة نفسها.

(٢) - أخرجه بن أبي شيبة: ٣٥٦٥، ويحيى بن معين في تأريخه: ٢٢١٣، والبيهقي في الشعب: ٢٠٥٧، وعلقه البخاري في صحيحه: ج١، ص٢٥٢، بصيغة الجزم وإسناده صحيح، وصحح إسناده الحافظ ابن حجر في تغليق التعليق: ج٢ ص ٣٣٠.

قالـت: كانـوا كـما نعتهـم اللـه عزوجـل: تَدْمَـعُ أعينهـم، وتَقْشَـعِرُّ جلودُهـم، قلـت: فـإنَّ ناسـاً هاهنـا إذا سـمعوا ذلـك، تأخذهـم عليـه غشـية فقـال: أعـوذ باللـه مـن الشـيطان)[1].

عبداللـه ی كـوڕی عـوڕوەی كـوڕی زوبەیـر دەڵـێ: بـە نەنكـی خـۆم (ئەسـماء)م گـوت: هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (صـلی اللـه علیـه وسـلم) كاتێـك قورئانیـان دەخوێنـد، چییـان دەكـرد؟ ئەویـش گـوتی: وەک خـوا عزوجـل باسـی كـردوون، وەسـفی كـردوون، ئاوابـوون، چاویـان فرمێسـكی پێـدا دەهـات و پێسـتیان موچوڕكـەی پێـدا دەهـات، منیـش گوتـم: خەڵكانێـك هـەن لـەم ڕۆژگارەدا، كاتێـك كـە گوێیـان لـە قورئـان دەبـێ، لەهـۆش خۆیـان دەچـن! ئەسـمائیش گـوتی: [أعـوذ باللـه مـن الشـیطان]، پەنـا بەخـوا دەگـرم لـە شـەیتان، واتـە: پەنـا بەخـوا دەگـرم لـەوە كـە ئەوانـە دیـارە تێدەپەڕێنـن، یاخـود جۆرێـك لـە زۆر لـە خۆكـردن (تكلّـف) دەكـەن كـە كاریگەریـی شـەیتان لەسـەریان هەیـە.

**ئەدەبـی هەشـتەم: ئەوەیـە كـە لـە كاتی قورئـان خوێندنـدا، بابـای قورئـان خوێـن بزانـێ : بـەوەی دەیخوێنـێ، دوێنـدراوە:**

قورئـان خوێـن دەبـێ بـاش بـاش تێوەڕابمێنـێ، لەمانـای ئـەوەی دەیخوێنـێ، لەباسـی ئیـمان و، بـاسی حـەڵاڵ و حـەڕام و، بـاسی بەڵێنـی خـواو، باسـی هەڕەشـەی خـواو، باسـی بەسـەرهات و پەنـدەكان و، بـەو شـێوەیە لەگـەڵ قورئـان خوێندنەكـەدا مامەڵـە بـكات، كـە لەگەڵیـدا گونجـاوە.

با لەو بارەوە ئەم دەقە بێنین:

(عـن الحذیفـة بـن الیـمان رضي اللـه عنـه قـال: صلَّیـت مـع النبي

(١)- أثر صحیح أخرجه سعید بن منصور في فضائل القرءان في سننه رقم: ٩٥، قلت: إسناده صحیح.

(صلى الله عليه وسلم) ذات ليلة، قال: فافتتح البقرة، فقرأ حتى بلغ رأس المأة، فقلت يركع، فمضى حتى بلغ المائتين، فقلت يركع، ثم مضى حتى ختمها، قال: فقلت يركع: قال: ثم افتتح سورة آل عمران، حتى ختمها، قال: فقلت يركع: قال ثم افتتح سورة النساء فقرأها، قال: ثم ركع، قال: فقال في ركوعه سبحان ربي العظيم، قال وكان ركوعه بمنزلة قيامه، ثم سجد، فكان سجوده مثل ركوعه، فقال في سجوده سبحان ربي الأعلى، قال: وكان إذا مر بآية رحمة سأل، وإذا مرَّ بآية فيها العذاب، تعوَّذ، وفي لفظٍ استجار، وإذا مرَّ بآية فيها تنزيه لله عزوجل، سبَّح)[1].

واتە: حوذەیفەی کوڕی یەمان دەڵێ: شەوێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) نوێژمکرد، سووڕەتی (البقرة)ی دەست پێکرد، خوێندی هەتا گەیشتە سەری سەد ئایەت، گوتم: ڕەنگە بچێتە ڕکووع، دوایی ڕۆیشت، تا گەیشتە دووسەد ئایەت، گوتم: ڕەنگە لە دووسەد ئایەت ڕکووع بەرێ، دوایی ڕۆیشت، هەتا تەواویکرد، گوتم: ڕەنگە بچێتە ڕکووع و، سووڕەتی (آل عمران)ی دەست پێکرد، هەتا تەواوی کرد، گوتم: بچێتە رکووع، دوایی سووڕەتی (النساء)ی دەست پێکردو ئەویشی خوێند، دوایی چووە ڕکووع، لە ڕکووعەکەیدا فەرمووی: (سبحان ربي العظيم)، ڕکووعەکەیشی بە ئەندازەی وەستانەکەی بوو.

دوایی چووە کڕنووش، کڕنووشەکەیشی بە ئەندازەی ڕکووعەکەی بوو، لە کڕنوشبردندا دەیفەرموو: (سبحان ربي الأعلى)، کاتێک بەلای ئایەتێکدا تێپەڕیبایە، باسی ڕەحمەت و بەزەیی خوا بوایە، داوای بەزەیی خوای دەکرد و، بەلای ئایەتی سزاو ئازاردا تێپەڕیبایە پەنای بەخوا

(١)- أحمد في مسنده: ٣٨٢ و ٣٨٤ و ٣٨٩ و٣٩٤ و٣٩٧، ومسلم ٧٧٢، وأبوداود: ٨٧١، والترمذي: ٢٦١، والنسائي: ١٠٠٠٨ و ١٠٠٠٩ و١١٣٣ و ١٦٦٤، وابن ماجه: ١٣٥١، والدارمي: ١٢٨١.

دەگرت(یاخود دەچووە پەنای خواوە) کاتێک بەلای ئایەتێکدا تێپەڕبایە، بەپاک ڕاگرتنی خوای تێدابوایە، خوای بەپاک دەگرت.

لەوبارەوە هەم فەرموودە، هەم شوێنەواری دیکەش هەن، کە واباشە مرۆڤ بەپێی گونجان لەگەڵ نێوەڕۆکی ئایەتەکاندا، کارلێک بکات و لەگەڵیاندا هاودەمبێ.

چەند دەقێک لەو بارەوە:

١. (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي (صلى الله عليه وسلم) كان إذا قرأ (سبِّح اسم ربك الأعلى) قال: سبحان ربي الأعلى)[١].

واتە: عبدالله ی کوڕی عەبباس دەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێک سوورەتی (سبح اسم ربک الأعلى)ی خوێندبایە دەیفەرموو: (سبحان ربي الأعلى) (فەرمانەکەی خوای جێ بەجێ دەکرد) پاکیی بۆ پەروەرگاری هەرەبەرزم.

٢. هەروەها لەو بارەوە: ئەم دەقەش هەیە:

(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: إذا قرأ أحدكم (سبِّح اسم ربك الأعلى) فليقل: سبحان ربيّ الأعلى، وإذا قرأ (أليس ذلك بقادر على أن يحيي الموتى) فليقل: أللهم بلى، أو أللهم سبحان ربي بلا)[٢].

عبدالله ی کوڕی عەبباس گوتوویەتی: ئەگەر یەکێکتان سوورەتی (سبح اسم ربک الأعلى) ی خوێند با بڵێ: (سبحان ربيّ الأعلى) (فەرمانەکەی خوا جێ بەجێ بکات) و، هەرکاتێک ئەو ئایەتەی خوێند: (أليس ذلك بقادر على أن يحيي الموتى) (ئایا خوایەکی ئاوا توانادار نیە کە مردوان زیندوو بکاتەوە؟!) بابڵێ: ئەی خوایە! با، یاخود ئەی خوایە! پاکیی بۆ پەروەردگارم، با.

(١) - أَخرجَهُ أحمد: ٢٠٦٦، وأبوداد: ٨٨٨٣، والطبراني في الكبير: ١٢٣٣٥، وإسناده صحيح.
(٢)- أثر صحيح أخرجه ابن الضريس في فضائل القرآن: ص١٣، والبيهقي في الشعب: ٢٠١٠٠، وإسناده صحيح.

٣. هەروەها لەو بارەوە شوێنەواری دیکەیش زۆرن، بۆ وێنە: لە کاتێکدا مرۆڤ سوورەتی (التين) دەخوێنێ و دەگاتە ئایەتی: (أليس الله بأحكم الحاكمين) بڵێ: (بلى وأنا على ذلك من الشاهدين). خوا دەفەرموێ: ئایا خوا کاربەجێترینی حوکمڕانان نیە؟ ئەویش بڵێ: با منیش لەسەر ئەوە لە شایەدانم.[١]

٤. هەروەها ئەگەر کۆتایی سوورەتی (المرسلات) ی خوێند:

﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴾ المرسلات: ٥٠.

کە بڵێ: (آمنت بالله وكتابه)[٢].

بڕوام بەخواو کتێبەکەی هێنا.

هەڵبەتە ئەمانە ئەگەر لە ڕووی سەنەدیشەوە بێهێزبن، بەڵام بە قیاس بۆ سەر شوێنەکانی دیکەی قورئان، شتێکی گونجاون.

٥. هەروەها لە دایکمان خاتو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە:

(عن عائشة رضي الله عنها أنها كانت إذا قرأت : ﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴾ الطور: ٢٧.

قالت: أللهم مُنَّ عليَّ وقِني عذاب السّموم)[٣].

کاتێک دایکمان خاتو عائیشە سوورەتی (الطور)ی دەخوێندو دەگەیشتە ئەوە دەفەرموێ:

﴿ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴾ الطور: ٢٧.

ئەویش دەیگوت: ئەی خوایە! چاکەم لەگەڵدا بکەو، لە سزای بای بەگڕ بمپارێزە.

(١)- روي بسند لم يثبت (المقدمات الأساسية في علوم القرآن) : ص٥٠٩.
(٢)- روي بسند لم يثبت، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٣)- أثر صحيح أخرجه البيهقي في الشعب: ٢٠٩٢، وابن أبي شيبة: ٦٠٣٥، وابن أبي حاتم في تفسيره، كما في تفسير ابن كثير: ج٦ ص٤٣٥، وإسناده صحيح.

٦. هەروەها لەکاتی خوێندنی: (فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) الرحمن -١٣- دا، بڵێ: (ولا بشيئٍ من نعمة ربِّنا نُكَذِّبُ)[١]، واتە: بەهیچ کام لەچاکەکانی پەروەردگارمان بێبڕوانین.

هەڵبەتە زانایان باسی ئەوەشیان کردوە، کە مەرج نیە لەو بارەوە ڕێژگەیەک هەبێ، دیارییکراوو نەقڵکراو لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، کە ئەو شێوە وەڵام دانەوەیە لەگەڵ نێوەڕۆکی ئایەتەکاندا بگونجێ، وەک خاوەنی ( المقدامت الأساسية .. ) هێناویەتی.[٢]

**ئەدەبی نۆیەم:** ئەوەیە کە مرۆڤ لەکاتێکدا قورئان دەخوێنێ خۆی لە هەموو ئەو شتانە بپارێزێ کە لەگەڵ قورئان خوێندندا ناگونجێن، وەک لەگەڵ خەڵکدا قسەکردن، یان وەڵام دانەوەی سەلام، یان کەسێک کە دەپژمێ، بڵێ: (الحمدلله) ئەویش پێی بڵێ: (يرحمك الله)و وێنەی ئەوانە.

بەڵام هەندێک لە زانایان ئەو حاڵەتانەیان هەڵاواردوون، هەندێکیش گوتوویانە: نابێ لەو حاڵەتانەشدا وەڵام بداتەوە.

ئەوانی دیکەش گوتوویانە: دەگونجێ مادام سەلامەکە بەتایبەت لەو کرابێ، یاخود پرسیارێکی لێ بکرێ، یاخود بانگ بکرێ، لەو کاتەدا دەگونجێ وەڵام بداتەوەو، وەڵامی سەلام بداتەوە.

١ـ لەو بارەوە ئەو شوێنەوارە هەیە:

(عن عبدالله بن عون قال: كان بن سيرين يكره أن يقرأ الرجل القرآن إلا كما أنزل، يقرأ ثم يتكلم، ثم يقرأ)[٣].

(١) - أخرجه ابن أبي الدنيا في (كتاب الشكر لله عزوجل): ٦٧، والخطيب البغدادي في تأريخه (٣٠١\٤). وابن جرير في التفسير(٢٧\١٢٣)، والبّزار في الكشف الأستار): ٢٢٦٩ ، وإسناده حسن.
(٢) - ص ٥١٠ .
(٣) - أثر صحيح أخرجه أبو عبيد في الفضائل: ص١٩٠، بإسناد صحيح.

عبداللـه ی کـوڕی عـەون دەڵـێ ئیبنـو سـیرین پێـی ناخـۆش بـووە کـە پیـاو قورئـان بخوێنـێ، مەگـەر بـەو شـێوەیەی کـە دابەزیـوە، پێـی ناخـۆش بـوو کـە بخوێنـێ، دوایـی قسـەبکات و، دوایـی بخوێنـێ (واتـە: دەبـێ قسـەی ئاسـایی تێکـەڵ بـە قورئـان خوێندنەکـە نـەکات).

٢ـ هەرلەوبارەوە ئەم شوێنەوارەش هاتوە:

(عـن نافـع مـولى عبداللـه بـن عمـر قـال: كان ابـن عمـر رضي اللـه عنهـما إذا قـرأ القـرآن لم يتكلّـمْ حتـى يفـرغ منـه، فأخـذت عليـه يومـاً، فقـرأ في سـورة البقـرة حتـى إذا انتهـى إلى مـكان، قـال: تـدري فيـم أنزلـت؟ قلـت: لا، قـال: أنـزل في كـذا وكـذا ثـم مـضى)[1].

واتـە: نافیـع خزمەتـکاری عبداللـە ی کـوڕی عومـەر (یـان: کۆیلـەی ئازادکـراوی) دەڵـێ: عبداللـە ی کـوڕی عومـەر کـە قورئـانی دەخوێنـد، قسـەی نەدەکـرد تاکـو لـێ دەبـووەوە، ڕۆژێـک لـەلای بـووم سـووڕەتی (البقـرة)ی خوێنـد، تـا گەیشـتە شـوێنێک، دوایـی خۆی ئـاوڕی لـێ دامەوەو گـوتی: دەزانـی لەبـارەی چییـەوە دابەزیـوە؟ گوتـم: نـا، گـوتی: لەبـارەی فـڵان شـت و فـڵان شـتەوە دابەزیـوە، دوایـی بـەردەوام بـوو لەسـەر قورئـان خوێندنەکـەی.

**ئەدەبـی دەیـەم: لـەکاتی قورئـان خوێندنـدا، ئەوەیـە کـە کاتێـک باوێشـکی هاتـێ، باوێشـکەکەی بگێڕێتـەوە:**

چونکـە پێغەمبـەری خـوا (صـلى اللـه عليـه وسـلم) فەرموویـەتی: (إن اللـه يُحـبُّ العُطَّـاسَ ويكـره التثـاؤب، فـإذا عطـس أحدكـم وحمـد اللـه، كان حقـاً عـلى كل مسـلم سَـمِعَه أن يقـول: يرحمـك اللـه، وأمـا التثـاؤب فإنّـما هـو مـن الشـيطان، فـإذا تَثـاءَبَ أحدكـم فلْـيردّه مااسـتطاع، فـإنَّ أحدكـم إذا

---

(١) - حديث صحيح أخرجه أبوعبيد: ص١٩٠ -١٩١، والبخاري: ٤٠٥٣ والبيهقي في الشعب: ٢١٣٣.

تثـاءب، ضحـك منـه الشـيطان)[١].

واتـه: ئەبـو هورەیـرە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خاتـەم (صـلى اللـه عليـه وسـلم) فەرموویـەتی: بەدڵنیایی خـوا پژمینی خـۆش دەوێ و، ڕقـی لـە باوێشـکە، ئنجـا ئەگـەر یەکێکتـان پژمـی و سـتایشی خـوای کـرد، هـەر مسـوڵمانێک کـە گوێبیسـتی دەبـێ، لەسـەری پێویسـتە بڵـێ: (یرحمـک اللـه) (خـوا بەزەیـی پێتـدا بـێ) بەڵام باوێشـک لـە شـەیتانەوەیە، ئەگـەر یەکێکتـان باوێشـکی هاتـێ، بـا بەگوێـرەی توانـای بیگێڕێتـەوە، چونکـە کەیەکێکتـان باوێشـکی دێتـێ، شـەیتان پێـی پێدەکەنـێ.

لەو بارەوە ئەم شوێنەوارە هاتوە:

(عـن مجاهـد المـكي قـال: إذا تثاءبـت وأنـت تقـرأ القـرآن، فأمسـك القـراءة حتـى يذهـب تثاؤبـك)[٢].

واتـه: موجاهیـدی مەککەیـی، [کـە قوتابـی عبداللـە ی کـوڕی عەبباسـە] گوتوویـەتی: ئەگـەر لـەکاتی قورئـان خوێندنـدا باوێشـکت هاتـێ، قورئـان خوێندنەکـە ڕاگـرە، تاکـو باوێشـکەکەت دەڕوات.

**ئەدەبـی یازدەیـەم: ئەوەیـە کـە لـەکاتی قورئـان خوێندنـدا لەکـوێ دەسـت پـێ دەکرێ و لـە کـوێ دەوەستێ؟ ئەوانـە پێویستە ڕەچاو بـکات:**

چونکـە بێگومـان ئەو شـوێنانەی کـە داندراون ئەگەر نەوەستی، مانای ئایەتەکـە، هەڵـە دەردەچـێ، واتە: وەک ئـەوە دەرناچێ کە خوا ویسـتوویەتی (سُـبحانه وتعـالى) هەروەهـا دەبـێ شـوێنی دەسـتپێکردن دیاربـێ و، شـوێنی وەسـتان دیاربـێ، هەروەهـا پێویسـتە ئـەوەش بزانیـن کـە زانایـان قورئانیان دابەشـکردوه بـۆ سـیی بـەش (ثلاثین جـزء) و هـەر بەشـێکیان کردوۆتە دوو

(١) - البخاري: ٣١١٥و-٥٨٦٩ و٥٨٧٢ ، ومسلم: ٢١٩٤، واللفظ للبخاري.
(٢) - أخرجه أبو عبيد في فضائل القرآن: ص١١٨، وسعيد بن منصور: ٩٨ ، والآجري في أخلاق حملة القرآن: ص٢٠٣، والبيهقي في الشعب: ٢١٢٥، بإسناد صحيح.

حیـزب، ئنجـا مرۆڤ لەکاتی قورئـان خوێندندا، پابەند نیە بـەوە کە لە کۆتایی جـوزءدا، یـان لـە کۆتایـی حیزبـدا، یـان لـە کۆتایـی نیـوە حیزبـدا بوەسـتێ، چونکـە ئـەوە دابەشـکردنی زانایانـە، بۆ ئەوە کە چۆن قورئـان بخوێندرێ، لە ڕووی قەبـارەو لـەڕووی کاتـەوە، بـەڵام هیـچ زانایـەک نەیگوتوە، پێویسـتە لەسـەری جوزئەکە بوەسـتی، چونکە لـەو حاڵەتەدا بابەتێـک دوولەت دەبێ، لەکاتێکـدا دابـەش دەبـێ بـۆ جوزئـی پێشـێ و جوزئـی دوایە، یان بـۆ حیزبی پێشـێ و حیزبـی دوایە.

بۆیـە پێویسـتە لـە کاتی قورئـان خوێندنـدا، مـرۆڤ زۆر ڕەچـاوی ئـەوە بـکات پابەندبـێ بەواتـاوەو، هـەر کاتێـک بەسـەرهاتێکی پێغەمبـەران (علیـه الصـلاة والسـلام) یاخـود شـتێک کـە خـوا دەیفەرمـوێ (سُـبحانه وتعـالى) دەبـێ تەماشـای نێـوەڕۆک و واتایەکـەی بـکات و بەپێـی نێـوەڕۆک و واتایەکـەی بێخوێنـێ و، نابـێ بیپچـڕێ و دایبـڕێ.

**ئەدەبـی دوازدەیـەم: ئەوەیـە کـە دەبـێ بابـای قورئـان خوێـن، ڕازاوە بـێ بـە ڕەوشـت و ئەدەبـەکانی کـە قورئـان فەرمانیـان پـێ دەکا:**

کـە بێگومـان قورئـان فەرمـانی کـردوە بـە هەمـوو ئەدەبێکـی بـەرزو جـوان، هـەروەک لـەم دەقـەوە دیـارە:

(عـن سـعد بـن هشـام أنـه سـأل عائشـة رضي اللـه عنهـا فقـال: أنبئيـني عـن خلـق رسـول اللـه (صـلى اللـه عليـه وسـلم)، قالـت: ألسـت تقـرأ القرآن؟ قلـت بـلى، قالـت: فـإنَّ خُلُـق نبـي اللـه كان القـرآن)[1].

واتـە: سـەعدی کـوڕی هیشـام پرسـیاری لـە خاتـو عائیشـە کـرد (خـوا لێـی ڕازی بـێ) (دایکـی بـڕواداران) پێیگـوت: هەواڵـم پێبـدە لەبـارەی ڕەوشـت و ئـاکاری پێغەمبـەری خـواوە - علیـه الصـلاة والسـلام- ئەویـش

(١)- أحمد في المسند: ج ٦، ٥٣ و ٥٤و ٩٤ و٩٥ و١٦٣، ومسلم: ١٤٦، وأبوداود: ١٣٤٢، والنسائي: ١٦٠١، والدارمي: ١٤٤٧.

گوتی: ئایا قورئان ناخوێنی؟ گوتم: با، ئەویش گوتی: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قورئان بوو.

واتە: قورئان چۆن دەفەرموێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو شێوەیە ڕەفتاری دەکرد.

هەڵبەتە ئەهلی قورئان دەبێ لەنێو خەڵکدا ، ناسراوو دیاربن بە ڕەوشتە بەرزو جوان و پەسەندەکانیان.

**ئەدەبی سێزدەیەم:** پێویستیی پاکییە بۆ قورئان خوێندن، پاکیش دوو جۆرە: پاکیی گچکە واتە: دەستنوێژ هەبوون و، پاکیی گەورە، واتە: لەش پیسیی لەسەر نەبوون.

زۆربەی زانایان دەڵێن: دەستنوێژ هەبوون بۆ خوێندنی قورئان، شتێکی پەسەندو چاکە و مرۆڤ لەسەری تووشی پاداشت دەبێ، بەڵام واجب نیەو، بەبێ دەستنوێژ دروستە قورئان بخوێندرێ.

لەو بارەوەش دەگونجێ ئاماژە بەم دەقە بکرێ: (عن مهاجر بن قنفذ رضي الله عنه أنه سلَّم على رسول الله وهو يتوضَّأ، فلم يردّ عليه حتى توضأ، فردَّ عليه، وقال: إنه لم يمنعْني أن أردَّ عليك، إلاَّ أَنّي كَرِهْت أن أذكر الله الاّ عن طهارة، وفي لفظٍ وضوءٍ)[1].

ئەو هاوەڵە خوا لێی ڕازبێ (مهاجر)ی کوڕی (قنفذ) دەڵێ: سەلامم لە پێغەمبەری خوا کرد (عليه الصلاة والسلام) لە حاڵێکدا دەستنوێژی دەگرت، ئەویش وەڵامی نەدامەوە، تاکو دەستنوێژەکەی تەواوکرد، دوایی وەڵامی دایەوە و فەرمووی: هیچ شتێک ڕێی لێ نەگرتم وەڵامت بدەمەوە، ئەوە نەبێ، کە پێم ناخۆش بوو بە پاکیی نەبێ، [لە بێژەیەکدا: بەدەستنوێژەوە نەبێ] ناوی خوا بێنم.

(١) - أحمد في المسند: ج٤: ٣٤٥ ، ج٥: ٨٠، وأبوداود: ١٧، وابن ماجه: ٣٥٠، و إسناده صحيح.

کەواتــە: نــاوی خــوا هێنــان بــە دەســتنوێژەوە پەســەندەو، بەبــێ دەســتنوێژیی بەتایبەتیــی قورئــان خوێنــدن ناپەســەندە.

بەڵگــەش لەســەر ئــەوە کــە بــە مــەرج نەگیــراوە مــرۆڤ دەســت نوێــژی هەبــێ، بــۆ قورئــان خوێنــدن، ئــەو فەرموودەیــە، کــە خاتــو عائیشــە هێناویــەتی:

قالــت: (کان رســول اللــە (صــلی اللــە علیــە وســلم) یذکــر اللــە عــلی کل أحیانــە)[١].

واتــە: پێغەمبــەری خــوا (صــلی اللــە علیــە وســلم) لــە هەمــوو حاڵەکاندا یــادی خــوای دەکــرد، (واتە: دەســت نوێــژی بووبــێ، یــان نەیبووبێ).

دەربــارەی لەشپیســیی گــەورە لەســەر نەبــوون، وەک: (لــەش پیســیی، حەیــز، زەیســانیی)، زۆربــەی زانایــان ڕایــان وایــە حەرامــە، بــۆ کەســێک لەشپیســیی گــەورەی لەســەر بــێ، یاخــود ئافرەتێــک کە لــە حەیزدابــێ، قورئان بخوێنێ.

بــەڵام هەندێــک لــە زانایــان گوتوویانــە: ناپەســەندە مــرۆڤ کاتێک لەشــی پیــس بــێ، قورئــان بخوێنــێ، بــەڵام حــەرام نیــە، لــەو بــارەوە ئەوانیــش چەنــد شــتێک بــە بەڵگــە دێننــەوە، بــەڵام ئەوانــە، کــە گوتوویانــە: نابــێ بەلــەش پیســیی قورئــان بخوێنــدرێ، ئەمــە لــە عومــەری کــوڕی خەتتابــەوە دەگێڕنەوە: (لایقــرأ الجنــب القــرآن)[٢].

هەروەها ئەم دەقەش هەیە:

(وعــن عــلي بــن أبي طالــب رضي اللــە عنــە، سُــئل عــن الجنــب: أیقــرأ القــرآن؟ قــال: لا ولا حرفــاً).[٣]

---

(١) - أحمد ومسلم: ٣٧٣، وأبوداود: ١٨، والترمذي: ٣٣٨٤، وابن ماجە: ٣٠٢.
(٢)- رواه ابن أبي شیبة: ١٠٨٠ بإسناد صحیح.
(٣)- رواه ابن أبي شیبە: ١٠٨٠ بإسناد صحیح.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: بابای لەشپیس، نابێ قورئان بخوێنێ.

هەروەها عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، پرسیاری لێکراوە لە بارەی لەش پیسەوە، ئایا قورئان دەخوێنێ؟ گوتوویەتی: نەخێر تەنانەت پیتێکیش نابێ بخوێنێ.

بەڵام وا پێدەچێ ئەو زانایانەی دەڵێن: پاکیی لە لەشپیسیی بەس پەسەندەو فەرز نیە، لای ئاسانکاریی و مۆڵەتیان گرتوە.

بەهەر حاڵ ئەوەندەی بگونجێ، دەبێ مرۆڤ بە لەشپیسیی و بە بێ دەستنوێژیی قورئان نەخوێنێ، بەڵام ئەگەر ناچار بوو، بەتایبەت بۆ کەسێک کە دەرس دەخوێنێ، یان حاڵەکەی وابوو پەکی لەسەر ئەوە کەوتبوو، ئەو کاتە دەتوانێ بەپێی ڕای ئەو زانایانەی کە بە مۆڵەتیان داناوە، یاخود گوتوویانە: هەبوونی لەشپاکیی گەورە و گچکە تەنیا پەسەندەو فەرز نیە، دەتوانێ بەپێی ڕای ئەو زانایانە مامەڵە بکات.

لێرەش دا کۆتایی بە تەوەری هەژدەیەم دێنین.



# تەوەری نۆزدەیەم

# چۆن مامەڵە لەگەڵ کتێبی بەرێزی خوای بەرزو مەزندا بکەین؟[1]




(١)- ئێمە ئەم باسە ڕاستەوخۆ لە: [موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله] [الكتاب الخامس الأيمان بكتب الله (سُبحانه وتعالى)]ط٢ /٢٠١٧م، الفصل الخامس (كيف نتعامل مع كتاب الله الكريم؟) دەگوازینەوە، بە پوختکردنەوەوە.

بەڕێزان!

**ئەم تەوەرە لە حەوت بڕگەدا دەخەینە ڕوو:**

**بڕگـەی یەکـەم:** بەئـەدەب بـوون و بـە مـەزن گرتـن لـە خزمـەت کتێبـی خـوادا.

**بڕگەی دووەم:** خوێندنەوەو گوێگرتن، یان گوێ هەڵخستن.

**بڕگەی سێیەم:** بیرلێکردنەوەو تێوەڕامان.

**بڕگەی چوارەم:** کارتێکران و پەند وەرگرتن.

**بڕگەی پێنجەم:** شوێنکەوتن و مل بۆ کەچکردن.

**بڕگەی شەشەم:** پاک و چاککردن و فێرکردن.

**بڕگەی حەوتەم:** چاکسازیی و حوکمڕانکردن.

شـایانی باسـە: ئێمـە کاتی خـۆی ئـەم باسـەمان لـە کتێبـی (چـۆن باشـتر لـە قورئـان بەهرەمەنـد دەبیـن؟)دا، کـە دواتـر لەگـەڵ کتێبـی (ئەرکـی سەرشـانمان بەرانبـەر بـە قورئـان)دا بـە هەردووکیـان کتێبـی: (بـا لـە خزمـەت قورئاندابین)یـان لـێ پێـک هـات، لەوێـش هێناومانـە.

ئێمە ئەم حـەوت بڕگەیە: (التأدب والتعظیم، التلاوة والإسـتماع، التفكر والتدبـر، التأثر والتذكـر، الإتباع والتسـلیم، التزكیة والتعلیـم، الإصلاح والتحكیـم) بەڕیزبەندییەکی پلە پلەیـی ڕیزمانکردووون.

**چونکـە هەنـگاوی یەکـەم**، بـۆ هەڵـس و کەوتێکـی ڕاسـت و دروسـت لەگـەڵ کتێبـی بەڕێـزو بەپێـزی خـوای بـەرزی مەزنـدا ، ئەوەیـە، کـە لەگەڵیـدا بەئـەدەب بیـن و زۆر ڕێـزی بگریـن و بـە مـەزنی بگریـن، وەک بـۆ فەرمایشـتی خـوا شایسـتەیە.

**هەنگاوی دووەم:** کە بەدوایدا دێ، بریتییە لە خوێندنەوەی کتێبی خوا بەشێوەیەکی ڕێک و پێک، یاخود گوێ بۆ هەڵخستنی بە سەرنجدان و بە تێوەڕامان و بێدەنگییەوە.

**هەنگاوی سێیەم:** بریتییە لە تێوەڕامان و بیرلێکردنەوە، چونکە لەڕاستییدا خوێندنەوەی کتێبی خوا، ئامانج لێی لێتێگەیشتن و پەند لێ وەرگرتنیەتی، ئەویش لە ئەنجامی ئەوەدا کە بەعەقڵ و هۆشەوە بخوێندرێ، یاخود گوێی بۆ بگیرێ، دێتە دی.

**ئنجا هەنگاوی چوارەم:** کە بەدوای بیرلێکردنەوەو تێوەڕاماندا دێ، بریتییە لە کارتێکران و پەندوەرگرتن.

**ئنجا هەنگاوی پێنجەم:** شوێنکەوتن و ملکەچکردن، بێگومان هەرکەسێک بە قورئان کارتێکراوبێ و پەندی لێ وەربگرێ، شوێنکەوتن و ملکەچکردن (الإتباع والتسليم)ی تێدا دێتەدی.

**ئنجا هەنگاوی شەشەم:** پاک و چاککردن و فێرکردن، چونکە هەرکەسێک ملکەچبێ بۆ کتێبی خواو بەحەق شوێنی بکەوێ، ئەوەش هەمان کارەکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی هەڵساوە: پاک و چاککردنی خەڵک و فێرکردن (التزكية والتعليم)یان،ئەویش بەو پرۆسەیە هەڵدەستێ.

**لە کۆتاییشدا هەنگاوی حەوتەم:** کە بریتییە لە چاکسازیی پێ کردن و حوکمڕانکردن، یانی چاکسازیی کردن بە قورئان و قورئان حوکمڕانکردن بە سەر کۆمەڵگادا، لە هەموو بوارو ڕەهەندەکانی ژیان و، گوزەرانیاندا، چ وەک تێڕوانینەکان، چ وەک بەهایەکان، چ وەک پێوەرەکان، چ وەک دروشمەکان، چ وەک ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان، چ وەک بەرنامەکانی ژیان، لە ڕووەکانی ئابووریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و جەنگ و ئاشتیی و پەیوەندییەکانەوە.

ئێستاش با یەک بەیەک بەو حەوت بڕگەیەدا بچینە خوار:

## بڕگەی یەکەم: بەئەدەب بوون و بە مەزنگرتن (التأدب و التعظیم)

بناغەی هەڵس و کەوتی ڕاست لەگەڵ کتێبی بەڕێزو بە پێزی خوای بەرزو مەزندا، ئەوەیە کە لەگەڵیا بە ئەدەب بین و بەمەزنی بگرین و ڕێزی بگرین و حورمەتی بزانین، ڕێزلێگرتن و ئەدەب و حورمەتێک کە شایستەی پێگەی بەرزو بێ وێنەی فەرمایشتی خوایە.

پێویستە ئەوەش بزانین کە ئەدەبی ئینسان لەگەڵ خواداو، بە مەزن گرتنی بۆ کتێبی خواو، بەرزگرتنی بۆ کتێبی خواو، حورمەت دانانی بۆ کتێبی خواو، قەدر زانینی بۆ فەرمایشتی خوا، بە ئەندازەی ناسینیەتی بۆ خواو، ئیمانیەتی پێی و بەندایەتییەتی بۆی.

بێگومان بە ئەندازەی ئەوە کە مرۆڤ بە خوای پەروەردگار ئاشنا دەبێ و، لێی نزیک دەبێ وەک بڕوا پێبوون و بەندایەتیی و پارێزلێکردنی، بە ئەندازەی ئەوەش لە فەرمایشتەکەی تێدەگا.

مرۆڤ ئەگەر بەڕاستیی و بە جیددیی بیربکاتەوە لەبارەی قورئانی مەزنەوە، کە چۆن خوا (سُبحانه وتعالى) کۆتا فەرمایشتی خۆی لە ڕێی باشترین و بەرزترین فریشتەی خۆیەوە، جیبریل علیه الصلاة والسلام دابەزاندوە بۆ سەر دڵی کۆتایی پێغەمبەرانی و، نزیکترینی دۆستەکانی و باشترینی بەندەکانی موحەممەدی کوڕی عبداللە ی کوڕی عەبدولموطەڵیب - صەڵات و سەلام و بەرەکاتی خوای لەسەربێ - کاتێک مرۆڤ بیر لەوە دەکاتەوە کە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: بە دڵنیایی ئەم قورئانە دابەزێندراوی پەروەردگارو خاوەنی جیهانییانە، ڕووحی ئەمیندار دایبەزاندوە بۆ سەر دڵی تۆ، تاکو تۆ لە ترسێنەران و هۆشیار کەرەوان بی، بەزمانێکی عەرەبیی ڕۆشن.

کاتێک مرۆڤ بیر لەوە دەکاتەوە، خەریکە ئەو ڕاستییە مەزنەی قورئان، بەزەحمەت لە عەقڵ و دڵ و خەیاڵ و ئەندێشەی مرۆڤدا جێگەی دەبێتەوە!.

خوا (سُبحانە وتعالى) کە سنوورێک نیە بۆ سیفەتەکانی، خوا خاوەنی بوونی ڕەهاو بێ سنوورە، خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسەندو بێ وێنەیە، زانیاریی خوا، بەزەیی خوا، حیکمەتی خوا، دەسەڵاتی خوا، ویستی خوا، بەخششی خوا، لێبوردنی خوا، هەموو سیفەتەکانی خوا، بێگومان ئەوپەڕیان نیەو بێسنوورو ڕەهان.

کاتێک مرۆڤ بیر لەوە دەکاتەوە: ئەو خوا مەزنە، ئەو خوا بەرزە، ئەو خوا بێ وێنەیە، ئەو کۆتا فەرمایشتەی خۆی دابەزاندوە بە باشترین فریشتەیدا، بۆ سەر دڵی باشترین و چاکترینی بەندەکانی، سەروەری پێغەمبەران موحەممەد (علیە الصلاة والسلام) بەڕاستیی بەڕاستیی ئەوە شتێکی یەکجار گەورەو مەزنە!

هەروەک خوا (سُبحانە وتعالى) لە سوورەتی (الحشر) ئایەتی ژمارە (٢١) دا دەفەرموێ:

﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الحشر: ٢١.

واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندبایە سەر کێوێک، سەر چیایەک، دەتبینی ترس و لەرزو سام دایدەگرت و، پارچە پارچە دەبوو لە سام و هەیبەتی خوا، ئەو وێنانەش بۆ خەڵکی دێنینەوە، بەڵکو بیرکەنەوەو ڕامێنن.

هەروەها خوا (سُبحانه وتعالى) فێرکردنی قورئانی کردوە بە سەر ڕشتەی چاکەو نیعمەتەکانی، لە سوورەتی (الرحمن) دا کە سی و یەک (٣١) جار ڕوو دەکاتە مرۆڤ و جندو پێیان دەفەرموێ: بە کام لە چاکەکانی پەروەرگارتان بێبڕوان، کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بەدرۆ دادەنێن:

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ الرحمن: ١٣.

خوا لە سوورەتی - الرحمن - دا دەفەرموێ:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ ١ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ٢ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ٣ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ٤ ﴾ الرحمن.

بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە

(خوای) بە بەزەیی، قورئانی فێرکردوە، (قورئانی فێری مرۆڤ و جند کردوە) مرۆڤی هێناوەتە دی، ڕوونکردنەوەو دەربڕینی فێرکردوە.

وەک دەبینین خوا (سُبحانه وتعالى) فێرکردنی قورئانی خستوەتە پێش دروستکردنی ئینسانەوە، چونکە لە ڕاستییدا ئینسان بەبێ هیدایەتی خوا، کە بۆ مرۆڤایەتیی لە دوای هاتنی پێغەمبەری کۆتایی، لە قورئاندا بەرجەستەیەو لە ڕێبازی پێغەمبەردا - عليه الصلاة والسلام- کە ڕێبازی پێغەمبەریش هەر بریتییە لە بەرجەستەکردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع.

مرۆڤ بەبێ هیدایەتی خوا، لەسەر بوونەکەی قەرزدار دەبێتەوە، بۆیە خوا (سُبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الرحمن) دا، کە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی تێدا بەیان دەکا، چ لە دنیا، چ لە دوا ڕۆژدا، فێرکردنی قورئانی کردوە بەیەکەمین چاکەو نیعمەتی خۆی: ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ ١ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ٢ ﴾ الرحمن.

ئنجا دوایی دەفەرموێ:
﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ۝٤ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ۝٥ ﴾ الرحمن.
تاكو كۆتایی.

كەواتــە: - بەڕێـزان! - هەنــگاوی یەكـەم لــە بــواری مامەڵــە لەگــەڵ كتێبـی بەڕێـزو بەپێـزی خـوای پـەروەردگاردا، ئەوەیە كـە ئەوپـەڕی ئەدەب و ڕێـزو حورمـەت و بـە مـەزن گرتـن و بـە بەرزگرتنـمان بـۆی هەبـێ.

بێگومـان كتێبـی خـواش شایسـتەی ئەوەیـە، چونكـە هیـچ شـتێك لـە فەرمایشـتی خـواو لـە ئایەتـەكانی كتێبـی خـوا، گەورەتـر نیـە، خـوا (سُبحانه وتعـالى) دوا كتێبی خۆی، دوا فەرمایشـتی خۆی بـە كۆمەڵێـك سـیفەتی بـەرزو مـەزن پێناسـە كـردوە، وەك لـە تـەوەری یەكەمـی ئـەم بابەتـەدا، لـە پێناسـەی قورئانـدا، گوتمـان، كـە خـوا كتێبـی خـۆی بـە بەرزیـی، بـە مەزنیـی، بـە حیكمـەت، بـە عیـززەت، بـە كـەڕەم، پێناسـە كـردوە.

كەواتــە: ئێمــەش بــە ئەنـدازەی ئــەوە، كــە لــە قورئـان نزیـك دەبیـن ئـەو سـیفەتە بەرزانـە لـە قورئانـەوە فێـر دەبیـن و، لـە قـەدەر خۆمـان لـە خۆمانیانـدا بەرجەسـتە دەكەیـن، بێگومـان بـە ئەنـدازەی ئـەوە كە ناسـینمان بـە ڕاسـت بـۆ خـوا دەبـێ و، ئیمانمـان بـە خـوا دەبـێ و، بەندایەتییمان بـۆ خـوا دەبـێ و، تەقوامـان لەبەرامبـەر خـوادا دەبـێ، بـە ئەنـدازەی ئـەوەش ئـەدەب و ڕێـزو حورمەتمـان لەبەرامبـەر فەرمایشـتەكەیدا دەبـێ.

## بڕگەی دووەم : چاک خوێندنەوەی قورئان و باش گوێ بۆ گرتنی:

دوای ئەوەی مرۆڤ ئەدەب و ڕێزو حورمەتی شایستە، بۆ کتێبی خوا لە خۆیدا بەرجەستە دەکا، ئنجا هەوڵ دەدا ئەو فەرمایشتەی خوا بخوێنێ و، ئەگەر نەتوانێ بخوێنێ، گوێی لێ بگرێ.

باسەرنجی چەند ئایەتێک بدەین:

١. خوا (سُبحانه وتعالى) لە سووڕەتی (الكهف) دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴾ الكهف: ٢٧.

واتە: ئەوەی کە لە کتێبی پەروەردگارت بۆت سروشکراوە، بیخوێنەوە، گۆڕان نیە بۆ وشەکانی خواو، لە جیاتی خواو جگە لە خوا، هیچ پەناگەیەکت چنگ ناکەوێ.

٢. هەروەها لە سووڕەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ:

﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ العنكبوت: ٤٥.

واتە: ئەوەی لە کتێب بۆت سروشکراوە، بیخوێنەوە.

٣. هەروەها لە سووڕەتی (المزمل)دا فەرموویەتی:

﴿ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴾ المزمل: ٤.

واتە: قورئان بخوێنەوە بە ڕێک و پێکیی.

دەگوترێ: (ثغر مرتل) ، واتە: زارێک کە ددانەکانی ڕێک و پێک بن، نەک شاش و باش، کەواتە: تەرتیل واتە: ڕێک و پێک خوێندنەوە، مافی خۆ دان بە هەرکام لە پیت و وشەکانی.

٤. لە سووڕەتی (النحل) یشدا دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ النحل: ٩٨.

واتە: هەرکات قورئانت خوێند، پەنا بەخوا بگرە لە شەیتانی دوور خراوە لە بەزەیی خوا.

٥. هەروەها لە سوورەتی (الأعراف)یشدا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ الأعراف: ٢٠٤.

واتە: هەرکاتێک قورئان خوێندرایەوە، گوێی بۆ هەڵبخەن و بێدەنگبن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێندرێ.

کەواتە: ئەم هەنگاوی دووەمە لە چوار ئەرکاندا بەرجەستە دەبێ:

**ئەرکی یەکەم:** خوێندنەوەی کتێبی خوا لەسەر مسوڵمانان هەموویان پێویستە، بێگومان تاک تاک لەسەر هەرکامێکیان پێویستەو، بە کۆش لەسەر هەموویان پێویستە.

ئنجا ئەوەی کە لەسەر تاک تاکی موسوڵمانان پێویستە، لای کەمەکەی بەوە دێتەدی کە لە نوێژدا دەیخوێنن، چونکە فەرزە بەشێک لە قورئان لە نوێژە فەرزەکاندا بخوێندرێ، وێڕای ئەوە، لەسەر کۆی موسوڵمانانیش فەرزە، هەموو قورئان بخوێنن و لەبەری بکەن و لێی شارەزابن، بەڵام لەسەر تاک تاکیان فەرزە، کە بە ئەندازەی توانایان لێی بخوێنن، وەک خوا دە فەرموێ:

﴿ فَٱقْرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ﴾ المزمل: ٢٠.

واتە: ئەوەندەی بۆتان سێنا دەبێ، لەقورئان بخوێنن.

ئەمە ئەرکی یەکەم.

**ئەرکی دووەم:** ئەوەیە کە قورئان بەڕێک وپێکیی بخوێندرێ، کە بریتییە لە تاکە شێوازی شایستە بە خوێندنەوەی کتێبی خوا، وەک خوا دەفەرموێ:

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ ﴾ المزمل: ٤.

واتە: قورئان بەڕێک و پێکیی بخوێنە.

(أم سلمة) دایکی بڕواداران، (خوا لێی ڕازی بێ)، خوێندنەوەی پێغەمبەری (علیە الصلاة والسلام) بۆ قورئان بۆ وەسف کردووین و ڕایگەیاندوە، کە قورئان خوێندنەکەی ڕوون و بەشێنەیی بووە، وەک لەم دەقەوە دیارە:

(ثبت عن أم سلمة أنها نعتت قراءة رسول الله (صلى الله عليه وسلم): مفسّرة حرفاً حرفاً)[1].

لە ئوممو سەلەمەوە چەسپاوە کە خوێندنەوەی پێغەمبەری -علیە الصلاة والسلام - وەسف کردوە، گوتوویەتی: خوێندنەوەیەکی ڕوون بوو، پیت پیت.

پێشتریش گوتمان: کە وێنەی هێناوەتەوە بۆ خوێندنەوەی (بسم الله الرحمن الرحيم)، (بسم الله)ی خوێندوە، (الرحمن)ی خوێندوە، (الرحيم)ی خوێندوەو درێژی کردوونەوە.

وشەی (الترتيل)یش وەک (راغب الأصفهاني) لە (مفردات ألفاظ القرءان)[2] لە بێژەی (رتل) دا دەڵێ: (هو الوضوح ، والتؤدةُ و تحسين القراءة).

واتە: (ترتيل) بریتیە لە ڕوونیی و لە سەرەخۆیی و چاک خوێندن.

لە چ ڕوویەکەوە؟ لەو ڕووەوە کە پیتەکان لە شوێنی خۆیانەوە دەربچن و، هەر پیتە مافی خۆی پێبدرێ و، هەر وشەیە مافی خۆی پێ بدرێ، لە کاتی بێژران و گۆکراندا.

(١)- أخرجه أحمد: (٦/٢٩٤و ٣٠٠) والبخاري في (خلق أفعال العباد): ١٧١ وأبوداود ١٤٦٦ والنسائي: ١٠٢٢، والترمذي: ٢٩٢٣ وحسنه، وابن خزيمة: ١١٥٨، والحاكم: ١١٦٥.
(٢)- ص٣٤١ .

ئنجـا ئـەو بنچینـەو بنەڕەتانـەی کـە پسـپۆڕانی بـواری قورئـان خوێنـدن دایاننـاون، ڕەچـاو بکرێـن، پێشـتریش لەتـەوەری حەڤـدە دا بەدرێژیـی قسـەمان لـەو بـارەوە کـرد.

**ئەرکـی سـێیەم:** هـەر لـە هەنـگاوی دووەمـدا، ئەوەیـە کـە بـەر لـە قورئـان خوێنـدن، پەنـا بەخـوا بگیـرێ.

وەک ئایەتەکەی سووڕەتی (النحل) دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ النحل: ٩٨.

واتـە: هـەرکات قورئانـت خوێنـد، پەنـا بەخـوا بگـرە لـە شـەیتانی دوور خـراوە (لـە بەزەیـی خـوا).

ئـەو سـیغەیەش کـە زۆر نـاو دارە، لەبـارەی ئیسـتیعازەوە، ئەوەیـە کـە بگوتـرێ: (أعـوذ باللـه مـن الشـيطان الرجيـم)[1].

واتە: پەنا بەخوا دەگرم لە شەیتانی دوور خراوە.

هەندێکیشـیان گوتوویانـە: واباشـترە ئەمـە بگوتـرێ: (أعـوذ باللـه السـميع العليـم مـن الشـيطان الرجيـم).

هەندێکیـش گوتوویانـە: ئـەم ڕێژگەیـە باشـترە: (أعـوذ باللـه السـميع العليـم مـن الشـيطان الرجيـم، مـن همـزه ونفخـه ونفثـه)[2].

سـوننەتە ئەمـە بگوتـرێ: پەنـا بـە خـوای بیسـەری زانـا دەگـرم لـە شـەیتانی دوور خـراوە لـە بەزەیـی خـوا، لـە هەمـزی و نەفخـی و نەفثـی.

(همز): بریتییە لە تانەدان و خوتخوتەکرنی شەیتان.

(نفخ): بریتییە لە فووپێداکردنی.

(١) - البخاري: ٥٧٦٤، ومسلم: ٦٨١٢، عن سليمان، بمناسبة تلاحي رجلين، هەروەها بڕوانە: النَّشر في القراءات العشر، لابن الجزري) ج١، ص ٢٤٣ .

(٢) - رواه أهل السنن الأربعة وهذا لفظ الترمذي: ٢٤٢.
قال الترمذي: وهو أشهر شيء في هذا الباب.

(نفث): بریتییە لە قسەی خراپ فێرکردنی.

**ئەرکی چوارەم:** ئەوەیە کە پێویستە گوێ بگیرێ و، گوێ هەڵبخرێ لە کاتی قورئان خوێندندا.

وەک ئایەتی ژمارە (٢٠٤) لە سوورەتی (الأعراف) دەیهێنێ:
﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ الأعراف: ٢٠٤.

واتە: هەرکاتێک قورئان خوێندرایەوە، گوێی بۆ هەڵخەن و گوێ بگرن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێندرێ.

(المعجم الوسيط) دەڵێ: (الإنصات: هو سكوت مع الإستماع)[١].

کە دەفەرموێ: (فاستمعوا لە وأنصتوا) (إنصات) بریتییە لە بێدەنگیی لەگەڵ گوێگرتن دا.

(والإستماع: سماع مع متابعة وتدبر)[٢].

واتە: (إستماع)یش بریتییە لە گوێگرتن لەگەڵ شوێنکەوتن و تێوەرامان دا.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: (لعلكم ترحمون).

دوای ئەوەی فەرمان دەکا بە گوێگرتن و گوێهەڵخستن و بێ دەنگبوون، مانای ئەوەیە لە ئەنجامی گوێگرتن و گوێ هەڵخستن و بێ دەنگ بووندا بۆ خوێندرانی قورئان، بەزەیی خوای پەروەردگار لەلایەن مرۆڤەوە دەستەبەر دەکرێ.

کۆتایی ئەم هەنگاوی دووەمەش، بەم دوو فەرمایشتە دێنین:

**فەرموودەی یەکەم:** (من قرأ حرفاً من كتاب الله، فله به حسنة، والحسنة بعشر أمثالە، لا أقول (ألم) حرف، ولكن ألف حرف، ولام حرف،

(١)- ص ٩٢٥.
(٢)- ص ٤٤٩.

ومیم حرف)[١].

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەرکەسێک پیتێک لە کتێبی خوا بخوێنێ، چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ و، چاکەش یەک بە دەیە، ناشڵێم (ألم) هەمووی پیتێکە، بەڵکو ئەلیف پیتێکە، لام پیتێکە، میم پیتێکە.

کەواتە: (ألم) دەکا سێ پیت و، هەر پیتێک بە چاکەیەک دەنووسرێ و، هەر چاکەیەکیش یەک بە دەیە، مانای وایە (ألم) سی (٣٠) پاداشیی چاکەی لەسەرە.

**فەرموودەی دووەم:** (الماهر بالقرآن مع سفرة الكرام البررة، والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق، له أجران)[٢].

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: شارەزا لە قورئان لەگەڵ نوێنەرە بەڕێزە چاکەکارەکاندایە، (واتە: فریشتەکان) ئەو کەسەش کە قورئان دەخوێنێ و تێیدا هەڵدەنگوێ، تێیدا دەگیرێ[٣]

لەسەری قورسە، ئەوە دووپاداشتی هەن (هەم پاداشتی خوێندنەکەی و، هەم پاداشتی ماندوو بوون و زەحمەتەکەی).



(١) - الترمذي: ٢٩١٠، عن عبدالله ابن مسعود، وحسّنه الألباني في السلسلة الصحيحة: ٣٣٢٧.
(٢)- مسلم : ١٨٩٨ عن عائشة .
(٣)- تعتع فلان في كلامه، تردّد فيه، وتعتع الشيءَ أقلقه و حرّكه بعنف ، المعجم الوسيط، ص٨٥.

## برگەی سێیەم: بیرکردنەوەو تێوەڕامان (التفكُّر والتدُّبر):

بێگومـان خوێندنـەوەی قورئـان، هەرچەنـدە هەمـوو بنچینـەکانی بـاش خوێنـدنی قورئـان، واتـە: تەجویـدی قورئانـی تێـدا ڕەچـاو بکرێـن، ئەگـەر بیرکردنـەوەو تێوەڕامـانی لەگەڵـدا نەبـێ و قـووڵ بوونـەوە لـە واتـای وشـەکانی لەگەڵـدا نەبـێ، هەروەهـا هـی ڕسـتەکان و ئایەتـەکان و، ئـەو ڕەوتانـەی ئایەتەکانیـان تێـدا هاتـوون و چۆنیەتیـی پێکـەوە گونجـانی ئایەتـەکان، ئـەوە بێگومـان ئامانجـی خـۆی وەک پێوسـت ناپێکـێ!

هەربۆیـە خـوا (سُـبحانه وتعـالی) لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا فەرمـانی پێکردووینـ: بیـر لـە فەرمایشـتەکەی بکەینـەوەو تێیـەوە ڕامێنیـن و لێـی وردبینـەوە.

بۆ وێنە:

١ـ ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل: ٤٤.

واتـە: ئێمـە ذیکرمـان بـۆ لای تـۆ دابەزانـدوە، تاکـو ئـەوەی بـۆلای خەڵـک دابەزێنـدراوە، بۆیـان ڕوونکەیـەوەو، بەڵکـو خۆشـیان بیرکەنـەوە.

٢ـ هەروەها لە سوورەتی (ص)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ ص: ٢٩.

واتـە: ئەمـە کتێبێکـە بـۆ لای تۆمـان دابەزانـدوە، پـڕ پیـت و پێـزە، تاکـو لـە ئایەتەکانیـەوە ڕامێنـن و، تاکـو ئەوانـەی خـاوەن عەقڵـن، پەنـدی لـێ وەربگـرن.

٣ـ هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴾ الأنعام: ٩٨.

واتە: ئایەتەکان خۆمان ڕوونکردوونەوە، بۆ کۆمەڵێک کە ورد تێبگەن.

٤ـ هەروەها لە سوورەتی (العنكبوت) دا دەفەرموێ:
﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾ العنكبوت: ٤٣.

واتــە: ئـەو وێنانــە بـۆ خەڵكـی دێنینـەوە، بـەڵام تەنهـا زانایـان لێیـان تێدەگــەن.

٥ـ هەروەها لە سوورەتی (سبأ) دا خوا دەفەرموێ:
﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ سبأ: ٦.

واتــە: ئەوانــەی زانیارییــان پێــدراوە، دەزانــن کــە ئــەوەی لــە پەروەردگارتــەوە بــۆ لای تــۆ دابەزێنــدراوە، هــەر ئــەوە حەقــە و، بــەرەو ڕێیــازی زاڵــی ستایشــکراو، ڕێنمایــی، ڕاســتە ڕێ دەکا.

ئنجـا بێگومـان مـرۆڤ بـە ئەنـدازەی ئـەوە کـە پاشـخانێکی فیکریـی باشـی دەبـێ و زانیاریـی بـاشی دەبـێ، لەبـارەی دیـن و ژینـەوە، بـە تایبـەت چەکـدار دەبـێ بـە زانسـتەکانی ڕۆژگاری خـۆی، بێگومـان باشـتر لـە چەمـک و واتـای ئایەتـەکان حاڵیـی دەبـێ، بـەڵام وێـڕای ئـەوە، پێویسـتە دوو مەرجـی دیکـەش هەبـن:

**مەرجـی یەکـەم:** ئیمانێکـی مەحکـەم بـە خـوا (**سُـبحانه وتعـالى**) و پەیوەندییەکـی بـاش لەخزمـەت خـوادا، وەک بەندایەتیـی و فەرمانبەریـی و، پارێزکاریـی، چونکـە مـرۆڤ تەنانـەت بـۆ قسـەی غەیـری خـوای پەوورەردگاریـش بـۆ قسـەی خەڵکیـش، هەتـا بـەو کەسـەی قسـە دەکا، پێـی ئاشـناتربێ، باشـتر لـە قسـەکانی تێـدەگا.

هەربۆیـەش خـوا (**سُـبحانه وتعـالى**) بەهەرمەندبـوون لـە کتێبـی خـۆی، تایبەتکـردوە بـە پارێزکارانـەوە، وەک دەفەرموێ:

١ـ ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة: ٢.

واتە: ئەو کتێبە هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، ڕێنماییە بۆ پارێزکاران.

٢ـ هەروەها لە سووڕەتی (یونس) دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ یونس: ٥٧.

واتە: ئەی خەڵکینە! بەدڵنیایی لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتووەو، چارەسەر بۆ ئەوەی لە سینەکاندا هەیەو، ڕێنمایی و بەزەیی بۆ بڕواداران.

٣ـ هەروەها لە سووڕەتی (فصلت)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ﴾ فصلت: ٤٤.

واتە: بڵێ: ئەم قورئانە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ڕێنماییەو چارەسەرە.

**ئەمە مەرجی یەکەم** بۆ ئەوەی مرۆڤ باش لە قورئان بەهرەمەندبێ، لە ئەنجامی بیرلێ کردنەوە و تێوەڕامانی ئایەتەکانی دا، کە دەبێ پەیوەندییەکی باشی لە خزمەتی خوادا هەبێ، وەک ئیمان و بەندایەتیی و پارێزکردن، بە ئەندازەی نزیکیی لە خوا، لە فەرمایشتی خوا تێدەگەی!

**مەرجی دووەم:** ئەوەیە کە مرۆڤ عەقڵ و سۆزی خۆی ڕزگاربکات لە هەرچی بیرو ڕاو بۆچوون و، نەرێت و شتی بە میرات گیراوی پێشینان و باب و باپیران و کۆمەڵگا هەیە، چونکە ئەگەر مرۆڤ عەقڵەکەی ئازاد نەبێ و، دڵەکەی ساغ نەبێ لەو شتانە، بێگومان ئەو شتانە بۆی دەبن بە پەردەو نێوان، بۆی دەبن بە تەم و مژو ڕێی لێ دەگرن، وەک پێویست لە فەرمایشتی خوا تێبگا.

وەک خوا (سُبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الإسراء) دا ئەو ڕاستییەمان

بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرمویٚ:

﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾
وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟
عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: کاتێک قورئانت خوێند، لە نێوان تۆداو ئەوانەی بێبڕوان بە مەنزڵگەی کۆتایی، پەردەیەکی داپۆشراو دادەنێین و، کیفەکان دەخەینە سەر دڵیان، کە لێی تێبگەن و، لە گوێیەکانیاندا قورسایی دادەنێین و کاتێک تۆ لە قورئاندا بەتەنیا باسی پەروەردگارت بکەی، ئەوانە پاشەو پاش دەسڵەمنەوە و بەسڵەمینەوەوە دوور دەکەونەوە.

کەواتە: نەریت و خو و بیرو بۆچوونی هەڵەو لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینان، ئەوانە هەموویان دەبن بە پەردە لە نێوان مرۆڤ و تێگەیشتنی لە فەرمایشتی خوای پەروەردگاردا!

بۆیە: مەرجی دووەمی بەهرەمەند بوون لە قورئان، لە ئەنجامی تێوەڕامان و تێفکرینی ئایەتەکانیدا، ئەوەیە کە مرۆڤ عەقڵ و دڵی خۆی ئازاد بکات، لە هەموو ئەو شتانە کە پێچەوانەی قورئانن، لە هەموو ئەو شتانە کە هی سەردەمی نەفامیین، لە هەموو ئەو خشپ و خاڵ و لیتەو لاڵانەی، کە لە عەقڵ و دڵی خەڵک دەئاڵێن و، بۆیان دەبن بە کیف و توورەکەو، بۆیان دەبن بە قورسایی وگوێ و چاوو عەقڵ و دڵیان، لە ڕاستییەکانی قورئان بەهرەمەند نابن.



## بڕگەی چوارەم: کارتێکران و پەند وەرگرتن (التأثّر والتذکّر) :

بێگومان ئەگەر مرۆڤ ئەو سێ هەنگاوەی پێشەوەی نان: سەرەتا ڕێزو ئەدەبی پێویست لەگەڵ خوادا، لەخۆیدا بەرجەستە بکات، پاشان کتێبی خوا بەڕێک و پێکیی بخوێنێتەوەو، باش گوێی بۆ هەڵبخات و گوێی بۆ بگرێ، دواییش بیری لێ بکاتەوە و لە ئایەتەکانیەوە ڕابمێنێ، بەو مەرجانەی کە باسمانکردن، هەتا ئەوە زیاتربێ، ئەم هەنگاوی چوارەمە، باشتر و ڕاستتر دەنرێ، کە مرۆڤ کارتێکراو بێ بەفەرمایشتی خواو پەند وەربگرێ و لێی بەهرەمەندبێ.

مەبەستمان لە کارتێکراوبوون (تأثّر) و کارتێکراویی، ئەوەیە کە مرۆڤ کارلێک بکات لەگەڵ ئەو ڕاستییانەدا کە کتێبێ خوا باسیان دەکا: لە ناوە بەرزو پەسندەکانی خوا، لە سیفەتە باڵایەکانی، لە کارو بارە بێ وێنەکانی، لە بەدیهێنەرایەتیی و خاوەندارێتیی و پەروەردگارێتیی تەنیا پەرستراوێتیی خواو، سەرپەرشتیی خواو حوکمڕانێتیی خوا، هەروەها بەهەشت و دۆزەخ و هەموو ئەو شتانەی کە لە قورئاندا باسکراون، مرۆڤ کارتێکراوبێ بە قورئان، واتە: ئەو ڕاستییانە زیاتر لە عەقڵ و دڵیدا بچەسپن.

هەروەها مەبەستمان لە پەندوەرگرتن (تذکّر) ئەوەیە کە لە ئەنجامی کارلێککردن لەگەڵ ئەو ڕاستییانەی قورئاندا، مرۆڤ هەرچی زیاتر بەهرەو پەند وەربگرێ، لەو ڕاستییانە، دوای ئەوەی لە عەقڵ و دڵیدا دەچەسپن، ئنجا پڕاکتیزەیان بکا لە ژیانی خۆیداو بەرجەستەیان بکات، لە خۆیدا، ئنجا ئایا ئەوانیش لە چیدا بەرجەستە دەبن؟ لە بڕوا هێنان بەخواو، بەیەکگرتنی خواو، تەنیا پەرستنی خواو، بڕوا بە ڕۆژی

دوایـی و، بـە فریشـتـەکانی خـواو، بەکتێبـەکانی خـواو، بـە پێغەمبـەرانی خـوا، هەروەهـا بـڕوا بـوون بـە فەرمانـەکانی خـواو بەقەدەغـەکانی خـوا، بـە حەڵاڵـەکانی خـواو حەڕامەکانـی خـوا، هەروەهـا بڕوابـوون بـە سیفەتە بـەرز و پەسـەندەکان، کـە خۆییـان پـێ بڕازێنێتـەوەو، سـیفەتە نـزم و پەسـتەکان کـە خۆییـان لـێ دووربگـرێ و، دڵـی خـۆ چەسـپاندن لەسـەر جـێ بەجـێ کـردنی فەرمـانی خـواو، خـۆ دوورگرتـن لـە قەدەغـەکان و ئیکتیفـا کـردن بـە کەمێکـی حـەڵاڵ و، چـاو نەبڕینـە حەڕامـی زۆرو بـۆر.

خـوا (سُـبحانه وتعـالی) لـە چەنـد شـوێنێکی کتێبـی خۆیـدا، بۆمـان باسـی ئـەو حاڵـەتی کارتێکراوبـوون و پەندوەرگـتن (تأثـر و تذکـر) دەکا، بـۆ نموونـە :

١ـ ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الزمـر.

پێشـتریش ئـەم ئایەتەمـان چەنـد جارێـک هێنـاوە، واتـە: خـوا باشـترین فەرمایشـتی دابەزانـدوە، ئایەتـەکانی پێـک دەچـن، ڕاسـتییەکانی پێـک دەچـن، (مثـاني)، دووبـارە دەبنـەوە، یاخـود سـتایشی خوایـان پـێ دەکـرێ، (تقشـعِرُّ منـه جلـود الذیـن یخشـون ربهـم)، ئەوانـەی سـام و هەیبەتیـان بەرامبـەر پەروەردگاریـان هەیـە، پێسـتیان ڕێکـدێ، موچوڕکـەی پێـدا دێ، تـەزووی پێـدا دێ، (ثـم تلیـن جلودهـم وقلوبهـم الی ذکراللـه)، دوایـی پێسـتیان و دڵیـان بـەرەو یـادی خـوا نـەرم دەبـێ، ئـەوەش ڕێنمایـی خوایـە، هەرکەسـێکی بـوێ ڕاسـتەڕێی دەکاو، هەرکەسـێکیش خـوا گومـڕای بـکا، هیـچ ڕێنماییکارێکـی نیـە.

٢ـ هەروەها لە سوورەتی (الفرقان) دا خوا دەفەرموێ:
﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴾ الفرقان: ٧٣.

واتــە: بەنــدەکانی (خــوای) بــە بەزەیــی ئەوانــەن کاتێــک ئایەتــەکانی پەروەردگاریــان بیــر دەخرێنــەوە، لەبەرامبەریانــدا کــەڕو کوێــر نابــن.

لەبەرامبــەر ئایەتــە بیســتراوەکاندا کــەڕ نابــن و، لەبەرامبــەر ئایەتــە بیــنراوەکان و دیــاردەو دیمەنــەکانی بوونــەوەرو دەوروبەریانــدا، کوێرانــە مامەڵــە ناکــەن.

٣ـ هەروەها لە سوورەتی (السجدة) دا خوا دەفەرموێ:
﴿ إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْۤ سُجَّدٗا وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۩ ١٥ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ١٦ ﴾ السجدة.

واتە: تەنیا ئەوانە بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە، کە کاتێک بیریان دەخرێنەوە، بە کڕنووشدا دەکەون و، بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاک دەگرن و خۆشیان بە زل ناگرن. ئەوانەی کە تەنیشتەکانیان لەسەر جێیەکانیان بەرز دەبنەوە (بۆ شەو نوێژ هەڵدەستن) لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوە بە ترس و ئومێدەوە و، لەوەش کە پێمان داون دەبەخشن.

ئەم دوو ئایەتەی سوورەتی (السجدة)، حەوت سیفەت لە ئەو کەسانەدا کە ئەهلی قورئانن و چۆنیەتیی کارتێکراوبوونیان بە قورئان و، پەند وەرگرتنیان لە قورئان، بۆمان دەخەنە ڕوو:

**یەک:** خێرایی کردن لە کڕنووشبردندا، لە کاتی خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا، یاخود گوێ بیست بوونیاندا (إذا ذکّروا بها خرّوا سجّداً).

**دوو:** بەپاککگرتنی خوای بەرزو ستایشکردنی (وسبَّحوا بحمد ربهم)، بەستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاکدەگرن.

**سێ:** خۆ بەزلنەگرتن، چ لەبەرامبەر ئایەتەکانی خواو یاساکانی خوادا، چ لەبەرامبەر دروستکراوەکانی خواو بەندەکانی خوادا (وهم لایستکبرون).

**چوار:** خۆ پابەندکردنیان بە شەونوێژەوەو هەڵسانیان لەسەر جێگەکانیان و تەنیشت بەرزکردنەوەیان (تتجافى جنوبهم عن المضاجع).

**پێنج:** پاڕانەوە لە پەروەردگاریان و ڕازو نیاز لەگەڵدا کردنی (يدعون ربهم).

**شەش:** مانەوە لەنێوان ترس و ئومێددا، ترس لە دادگەریی خوا و، سزای خوا، بەهۆی تاوان و خەراپەکانیانەوەو، ئومێد بە بەزەیی خواو بەخششی خوا (خوفاً وطمعاً).

**حەوت:** بەخشین لەوەی خوا پێیداون: (وممـا رزقناهم ينفقون)، ئنجا (لەوەی پێیان داون دەبەخشن) بەس ماڵ و سامان ناگرێتەوە، بەڵکو زانست دەگرێتەوە، عەقڵ دەگرێتەوە، قسە ڕۆیشتنی نێو کۆمەڵگا دەگرێتەوە و جگە لەوانەش دەگرێتەوە.

کەواتە: ئەهلی قورئان بەو جۆرە کە خوا بۆمان وێنا دەکا، کارتێکراو دەبن بە قورئان و بەهرەمەند دەبن و، کارلێک دەکەن لەگەڵ قورئاندا.



## بڕگـەی پێنجـەم: شـوێنکەوتن و مـل بـۆ کەچکـردن (الإتِّبـاع والتسـليم):

بێگومـان مـل کەچکـردنی موسـوڵمان، هەروەهـا کۆمەڵـگای مسـوڵمان بـۆ کتێبـی خـواو، شـوێنکەوتنی مرۆڤـی مسـوڵمان و کۆمەڵگـەی مسـوڵمان بـۆ کتێبـی خـواو، ملکەچکـردنی بـۆ کتێبـی خـوا، کـە بریتییـە لـەوەی پابەندبێ بـە هەرچـی لـە کتێبـی خـوادا هەیە، بەپێـی توانـا، لە ڕاسـتییەکان و حوکمـەکان و حیکمەتـەکان و فێرکردنـەکان، (حقائـق وأحـكام وحكـم وتعليـمات)، ئـا ئەمـە بەرهەمـی هەنـگاوەکانی پێشـێیە.

هەرکەسێ چوار هەنگاوەکەی پێشێ بنێ و بە چوار قۆناغ، مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ کتێبی خوادا بکات، ئەو چوار هەنگاوەی پێشێ و، ئەو چوار قۆناغەی پێشێ ، ئەم هەنگاو و قۆناغەی پێنجەمە بەرهەم دێنن.

ئەگەر مرۆڤ بەڕاستیی:

**یـەک:** ئەدەبـی هەبـێ لە خزمـەت فەرمایشـتی خواداو، بەمـەزنی بگرێ و بەبـەرزی بگرێ.

**دوو:** ڕێک و پێک بیخوێنێ و، چاک گوێی بۆ هەڵبخاو گوێی بۆ بگرێ.

**سێ:** باش بیری لێ بکاتەوەو تێوەی ڕابمێنێ.

**چـوار:** بـاش پێـی کارتێکراوبـێ و پەنـدی لـێ وەربگـرێ، ئـەوە ئـەم هەنـگاوی پێنجەمـەو ئـەم قۆناغـی پێنجەمـە، دەبێتـە بەرهەمـی چـوار قۆنـاغ و هەنـگاوی ڕابـردوو.

بۆیە خوا -(سُبحانه وتعالى)- لە چەند ئایەتێک لە قورئان دا، بۆمان باسی ئەم شوێنکەوتن و ملکەچکردنە بۆ کتێبی خوا دەکات، بۆ وێنە:

١ـ لە سەرەتای (الأعراف)دا دەفەرموێ:

﴿ الٓمٓصٓ ﴿١﴾ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: ئەلیف لام میم صاد، ئەمە کتێبێکە بۆلای تۆ دابەزێنراوە، با لەسینەتدا سەغڵەتیی نەبێ لەبارەیەوە (بۆیە بۆت دابەزێنراوە) پێی بترسێنی، (مرۆڤایەتیی پێ بترسێنی پێی هوشیاربکەیەوە)و پەندو بیرخەرەوە و ئامۆژگارییشە بۆ بڕواداران، شوێن ئەوە بکەون کە لەپەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوەو، لەجیاتی وی، دوای سەرپەرشتیاری دیکە مەکەون، بەکەمیی بیر دەکەنەوە.

٢ـ هەروەها لە سووڕەتی (الأنعام) دا، خوا بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ الأنعام: ١٠٦.

واتە: شوێن ئەوە بکەوە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆلات سروش کراوە، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیەو، پشت لە هاوبەش بۆ خوا دانەران بکە. (ڕوویان لێ وەرگێڕە).

٣ـ هەروەها لە سووڕەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: ئەمەش کتێبێکە دامانبەزاندوە، پڕپیت و پێزو بەرهەم دارە، دە جا شوێنی بکەون و پارێز بکەن، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێندرێ.

٤ـ هەروەها لە سووڕەتی (یونس) دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾ یونس: ١٠٩.

واتە:[ئەی موحەممەد! هەروەها هەرکەسێک کە ڕێی موحەممەدەوە

دەڕوا] شـوێن ئـەوە بکـەوە کـە بـۆلات سروشـکراوەو خۆشـت ڕابگـرە، تاکـو خـوا بڕیـار دەدات و، دادوەریـی دەکات و، ئـەو باشـترینی حوکمـڕان و دادەوەرانـە.

٥ـ لە ئایەتی (٦٥) ی سوورەتی (النساء) یشدا، خوا دەفەرمویێ:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النسـاء.

واتــە: نەخێـر، سـوێند بـە پـەروەردگارت، بـڕوا ناهێنـن تاکـو تـۆ نەکەنـە دادوەر لـەوەدا کـە تێیـدا کەوتوونـە ڕا جیایـی و کێشـەوە، لـە نێـوان خۆیانـدا، دوایـی هیـچ سـەغڵەتیی لـە دڵ و دەروونیانـدا هەست پـێ نەکـەن، سـەبارەت بـەوەی بڕیـارت داوەو، بـە تـەواوی ملکەچـبن.

کەواتــە: مسـوڵمانی شـوێنکەوتوو بـۆ قورئـان و، ملکەچکـردوو بـۆ قورئـان، ئـەو کەسـەیە ئـەم چـوار سـیفەتەی تێـدا بێنـەدی:

**یـەک:** لـە ڕووی عەقڵییـەوە، قەناعـەتی سەداسـەدو تێـرو تەواویـی بـێ بەڕاسـتیی تێـرو تەواویـی فەرمایشـتی خـوا، وەک خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾ الأنعام: ﴿١١٥﴾. فەرمایشـتی پـەروەردگارت لـە ڕاسـتیی و دادگەرییـدا، تـەواوی کـردوە. چونکـە فەرمایشـتی خـوا، دوو بەشـە: یـان حوکمـە، یـان هەواڵـە، هەواڵـەکانی لـە سـەدا سـەد ڕاسـتن و، حوکمەکانیـشی لـە سـەدا سـەد دادگەرانـەن.

**دوو:** ڕازیـی بـوون و پەسـەندکردنی دەروونیـی ڕەهـا، مرۆڤی مسـوڵمان و کۆمەڵـگای مسـڵمان دەبـێ هەرچـی لـە فەرمایشـتی خـوادا هاتـوە، هەرچـی خـوا لـە فەرمایشـتەکەیدا ڕوونی کردوەتـەوە، لـە دڵ و دەروونـەوە پەسـەندی بـکات بـە تێـرو تەواویـی.

**سـێ:** دانپێداهێنـانی بەزمـان بەڕاسـتیی، فەرمایشـتی خـوا، پێویسـتە

مرۆڤی مسوڵمان و کۆمەڵگای مسوڵمان هەرچی خوا فەرموویەتی لە فەرمایشتی خۆیدا، بەزمان دانی پێدا بێنێ و بیسەلمێنێ.

**چوار:** پابەندیی تێرو تەواوو بە پێی توانا، بە جەستەو بە ئەندامەکان بە تاک و بە کۆمەڵگاوە، بەوەوە کە خوا فەرموویەتی.

هەرکات ئەم چوارە، واتە: قەناعەت هێنانی عەقڵیی، ڕازیی بوونی دەروونیی، دانپێدا هێنانی بە زمان، ئەنجامدانی بە ئەندامەکان، هەرچواریان هەبوون، ئنجا مانای وایە ئەو کەسە شوێن کتێبی خوا کەوتووەو، بۆ کتێبی خوا مل کەچ بووە.



## بڕگەی شەشەم: پێ تەزکییە کردن و فێرکردن:

خوا (سُبحانە وتعالی) لە چوار شوێن لە کتێبەکەی خۆیدا، چوار ئەرکی بۆ پێغەمبەر (علیە الصلاة والسلام)خستوونە ڕوو، کە بریتین لە:

١ـ خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا.

٢ـ تەزکیەکردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) بۆ ئۆممەتەکەی.

٣ـ فێرکردنی کتێب بۆیان.

٤ـ فێرکردنی حیکمەت پێیان.

بۆ وێنە: لە ئایەتی (١٦٤) لە سوورەتی (آل عمران) دا خوا دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾﴾ آل عمران.

واتە: بەڕاستیی خوا چاکەی لەگەڵ بڕواداران دا کرد، لە خۆیان پێغەمبەرێکی لە نێودا ڕەوان کردن، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو، تەزکییەیان دەکاو، کتێبیان فێر دەکات و حیکمەتیان فێر دەکا، بەڕاستییش پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرا دا بوون.

هەڵبەتە هەمان ئەم چوار ئەرکە، لە سوورەتی (البقرة) شدا لە دوو ئایەت داو، لە سوورەتی (الجمعة) شدا، لە ئایەتی ژمارە (٢) دا هاتوون.

ئنجا بێگومان ئەرکی هەڵگری قورئانیش و ئەرکی شوێنکەوتووی قورئانیش، هەر هەمان ئەرکی پێغەمبەری خاتەمە (صلى الله علیه وسلم) چونکە هەرکەسێک بەڕاستیی شوێنکەوتووی پێغەمبەری خاتەم بێ، دیارە میراتگریەتی، پێغەمبەریش (صلى الله علیه وسلم) قورئانی بۆ ئێمە بە میرات بە جێهێشوە، لەگەڵ ڕێبازەکەی خۆی دا، کە ئەویش هەر بریتییە لە بەرجەستەکردنی قورئان لە سەر ئەرزی

واقیـع، لـە ژیـانی تاکیـی و خێزانیـی و کۆمەڵایەتیـی و سیاسـییدا.

کەواتە: وەک چۆن ئەرکی پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) بووە ئایەتەکانی خوا بەسەر خەڵکدا بخوێنێتەوە، هەروەها ئەرکی بووە کە بە هۆی قورئانەوە، پاک و چاکیان[1] بکات.

ئنجا وەک چۆن ئەرکی پێغەمبەری خاتەم (علیه الصلاة والسلام) بووە، خەڵک و کۆمەڵگا پاک و چاک بکات و گەشەیان پێ بدات، پاکیان بکات لەسیفەتە خراپەکان و، بیانڕازێنێتەوە بە سیفەتە باشەکان، بە هەمان شێوە، ئەوە ئەرکی شوێنکەوتوانی پێغەمەبەریشە - صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ -.

ئەمەچەمک و واتای پاک و چاککردن (تزکیة) ئیجا بابێینە سەر ڕوونکردنەوەی واتای فێرکردن (تعلیم)ی پێغەمبەری خوا بۆ کتێب و حیکمەت، بەخەڵک: (یعلِّمهم الکتاب والحکمة) وەک زۆر جاران گوتوومانە، (کتاب) مەبەست پێی شەریعەتی خوای پەروەردگارە، واتە: لایەنە یاساییەکەی قورئان و، (حکمة) یش لایەنە ئاکارییەکەی قورئانەو لە شوێنی خۆ دانانی یاسایەکانە، وەک چۆن ئەرکی پێغەمبەر -علیه الصلاة والسلام- بووە کە دوای ئەوەی ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، وەک تاک تاک پاک و چاکیان دەکا، وەک کۆمەڵیش هەم شەریعەتی خوایان فێربکات، هەم حیکمەت و لێزانیی و کارامەییان فێربکات لە جێبەجێکردنی شەریعەتدا، هەمان ئەرک، ئەرکی هەرکەسێکی دیکەیە کە بەدوای پێغەمبەری خاتەمدا (علیه الصلاة والسلام) دەچێ، پێغەمبەری خواش فەرموویەتی: (خیرکم مَنْ تَعَلَّم القرآن وَعَلَّمه)[2]. واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە، قورئان فێربێ و فێری خەڵکی بکا.

(١)- (تزکیة) واتە: پاک و چاککردن، وشەی (زکی یزکو زکاة) بە سێ واتایان هاتوە، (طهر)، (نما)، (صلح)، واتە: پاک بوو، گەشەی کرد، چاک بوو. بڕوانە: المعجم الوسیط. زکی.
(٢)- رواه البخاري: ٤٧٣٩ .

## بڕگـەی حەوتــەم و کۆتایــی: بریتییــە لــە چاکســازیی پێکــردن و حوکمــڕان کــردنی قورئــان لــە کۆمەڵــگادا.

بۆ مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ کتێبی خوادا، ئەگەر ئەو شەش هەنگاوو قۆناغەی ڕابردوو، چاک ڕەچاو بکرێن، قۆناغی حەوتەم دەبێتە بەرهەم و میوەی ئەو شەش قۆناغەی ڕابردوو.

چونکە کتێبی خوا، وەک چۆن هاتوە تاکەکان پاک و چاک بکات، بەڵام بە هەمان شێوە هاتووشە کۆمەڵگا پاک و چاک بکا، پاکسازیی و چاکسازیی تێدا بکا.

وشەی (إصلاح) لەسەر کێشی (إفعال)ە، یانی: چاککردن، (الإصلاح: جعل الشحص صالحاً)، کەواتە: ئیصڵاحی کۆمەڵگا واتە: چاککردنی کۆمەڵگا، ئەوە چەمکەکەی دیارو ئاشکرایە.

دواییش ئەگەر تەماشای پێغەمبەران بکەین - صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ - خوای بەرز و مەزن پێغەمبەرانی بە (صالح) ناو هێناون، بۆ وێنە لەبارەی لووطەوە دەفەرموێ:

﴿ وَأَدْخَلْنَاهُ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنبياء.

هەروەها لەبارەی (ئیسماعیل و ئیدریس و ذەلکیفل) ەوە دەفەرموێ:

﴿ وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ الأنبياء.

هەروەهــا ســولەیمانیش صــەڵات و ســەلامی خــوای لەســەربێ، دەپاڕێتــەوەو دەڵــێ:

﴿ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ ﴿١٩﴾ ﴾ النمل.

کەواتە: ئیصڵاح واتە: صاڵحکردن و چاککردن.

ئنجا ئەگەر تەماشای قسەی شوعەیب صەڵات و سەلامی خوای لەسەربێ،

بکەین، کە لە ئایەتی ژمارە (٨٤) تاکو ژمارە (٨٨)ی (هود) دا شوعەیب وتووێژ دەکات لەگەڵ خەڵکەکەی خۆیداو، سەرەتا بانگیان دەکا بۆ بەندایەتیی کردن بۆ خوا و، هاوبەش بۆ خوا دانەنان، دوایی لێیان قەدەغە دەکات لە کێشان و پێوانەدا کەم و کوڕییان هەبێ، هەروەها نیعمەت و چاکەکانی خوایان بیر دەخاتەوەو دەیانترسێنێ لە سزاو تۆڵەی خوا، دوایی جارێکی دیکە فەرمانیان پێ دەکا، کە کێشان و پێوان بە تەواویی و بە دادگەرانە بکەن، دوایی لێیان قەدەغە دەکات ، شتی خەڵک بەکەم بگرن، شتی مادیی یان مەعنەویی، دوایی ڕێگرییان لێ دەکات کە تێکدان و خراپەکاریی لە زەویدا بکەن، دوایی ڕێنمایییان دەکات بژیوی حەڵاڵ لە خوا داوا بکەن، دوای هەموو ئەوانە پێیان دەڵێ:

﴿ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ﴾ هود: ٨٨.

واتە: من تەنیا چاکسازییم دەوێ، هەتا بتوانم.

کەواتە: هەموو ئەوانەی شوعەیب باسی کردوون، دەچنە نێو چوارچێوەی چاکسازییەوە.

دەربارەی حوکمڕانکردنی کتێبی خوا (تحكيم كتاب الله)، دیارە خوا کتێبی خۆی بۆیە ناردوە تاکو حوکمڕان و، فەرمانڕەوابێ و، کاری پێ بکرێ لە نێو کۆمەڵگادا، وەک دەفەرموێ:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ ٤٨ المائدة.

واتە: کتێبیشمان بە حەق بۆلای تۆ دابەزاندوە، هەموو کتێبەکانی پێش

خۆی بەڕاست دادەنێ و، بەسەریشیانەوە چاودێرە، دەجا تۆ لە نێوانیاندا بە بەوەی خوا دایبەزاندوە دادوەریی بکەو شوێن ئارەزووەکانیان مەکەوە، واز لەو حەقە بێنی کە بۆت هاتوە، بۆ هەرکامێکتان بەرنامەو میتۆدو ڕێبازێکمان داناوە، (واتە: لە وردەکارییەکاندا)...

٢ـ هەروەها هەر لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ:

﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴾ المائدة: ﴿٤٩﴾.

واتە: هەروەها حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی خوا دایبەزاندوەو، شوێن ئارەزووەکانیان مەکەوە.

٣ـ هەروەها هەر لە سوورەتی (المائدة) دا فەرموویەتی:

﴿ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ المائدة.

ئایا حوکمی نەفامیی دەخوازن، ئایا حوکمی کێ لە هی خوا چاکترە بۆ کۆمەڵێک کە بڕوایەکی پتەویان هەبێ؟!.

٤ـ هەروەها لە سوورەتی (النساء) دا فەرموویەتی :

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾ ﴾ النساء.

ئێمە کتێبمان بە حەق بۆ سەر تۆ دابەزاندوە، تاکو دادوەریی بکەی لە نێوان خەڵکدا، بەوەی خوا پێشانت دەداو مشت و مڕیش لەسەر خیانەتکاران مەکە.

کەواتە: هەنگاوی حەوتەم و کۆتایی: مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ کتێبی خوادا، ئەوەیە کە هەوڵبدەین چاکسازیی کۆمەڵگای پێبکەین، لە هەموو بوارو ڕەهەندەکانی ژیانیدا، لە ڕووی سیاسیی، لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی کۆمەڵایەتیی، پێش ئەوانە لە ڕووی بووناسیی و فیکریی و ئیمانیی و ئاکاریی و ڕەوشتییەوە، هەروەها هەوڵیش بدەین ئەو کتێبەی خوا

حوکمڕان بکەین، بەسەر کۆمەڵگادا بەو شێوەیەی خوا (سُبحانه وتعالى) دایناوە، کۆمەڵگا ژیانەکەی بەڕێوە بچێ و، بەو شێوەیە کە خوا فەرموویەتی لە دوا فەرمایشتی خۆیدا، خەڵک پابەندبێ بەحەڵاڵ و حەڕام و، بە فەرمان و ڕێگرییەکانی خوای بەرزو مەزنەوە.

ئەمە ئەو حەوت هەنگاوە بوون، ئەو حەوت قۆناغە کە پێویستە ڕەچاو بکرێن، بۆ مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ کتێبی خوای بەرزی مەزندا.

خوا بەلوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە تەوفیقیان دەداو کارئاسانییان بۆ دەکات، بەو شێوەیە، کە بۆ کتێبی خوا شایستەیەو، شایستەی پایەی بەرز و بێ وێنەی خوایە، مامەڵە لەگەڵ کۆتا فەرمایشتی خوادا بکەن، تاکو هەم لە دنیادا لە سایەی مامەڵەی ڕاست و دروست لەگەڵ کتێبی خوادا، سەربەرزو بەختەوەر بین و، هەم لە ڕۆژی دواییشدا ڕوو سوورو شادمان بین.

لێرەشدا کۆتایی بە کۆی ئەم بابەتە دێنین:

(قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا)

وصلى الله وسلم على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين.

پێداچوونەوەی یەکەم:

٢٠٢١/٣/٢٥ز

١٢/شەعبانی/١٤٤٢ک

پێداچوونەوەی دووەم:

٢٠٢١/٧/١٤ز

٤\ذي الحجة/١٤٤٢ک

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | أ / كتێبە كوردییەكان | | |
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {كۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكەم: سوورەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سووڕەتی: (یوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سووڕەتەكانی: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٣) سووڕەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٤) سووڕەتی: (الإسراء) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٥) سووڕەتەكانی: (الكهف) و (مريم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٦) سووڕەتەكانی: (طه) و (الأنبياء) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ١٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٧) سووڕەتەكانی: (الحج) و (المؤمنون) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٨) سووڕەتەكانی: (النور) و (الفرقان) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (١٩) سووڕەتەكانی: (الشعراء) و (النمل) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٢ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی: (٢٠) سووڕەتەكانی: القصص) و (العنكبوت) | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٢٣ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٦<br>چاپی دوو/٢٠١٨ | |
| ٢٤ | قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەرەدا | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | **بیروبڕواو فیكری ئیسلامیی** | | |
| ٢٥ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٦ | ڕێبـازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کـامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسـوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسـوڵمان) |
| ٢٧ | پڕۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك/١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو کتێبی: (پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسـلامیی) |
| ٢٨ | پڕۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ٢٩ | بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی چوار/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبییش |
| ٣٠ | چەند مەسـەلەیەکی بـاوی سـەردەم، سـەرنجێکی واقیعیانەو هەڵسـەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش/٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبیو تورکییو فـارسـییش |
| ٣١ | خواناسـیی، ئاییـن، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلامو پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| ٣٢ | ناوە هەرەجوانەکانی خوا «سبحانە وتعالی» | چاپی یەك /٢٠١٣ | |
| | **مەوسـووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا، (٦ بەرگ)** | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٣٣ | بەرگی یەکەم: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٣٤ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتییدا | | |
| ٣٥ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەتو لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٣٦ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٣٧ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دواییو قەزاو قەدەر | | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٣٨ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٣٩ | مسوڵمانی كامڵ : بەشی یەكەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| ٤٠ | تەوژمی ئیسلامییو عەلمانییو خاڵە هاوبەشو جیاوازەكانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی)و، ئەوەی دیكەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ٤١ | ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكانو هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٤٢ | تەرجەمەی كوردیی عەقیدەی طـە حاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٤٣ | ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طە حـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٤٤ | سیكۆلاریزمو دیموكراسیی لەئەزموونی كوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیو، شێوەزاری كرمانجیی |
| ٤٥ | درەوشاوەیی ئیمانو پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماكو عەقڵو زانستو وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠٢٠ | |
| | **مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییو واقیعدا** | | |
| ٤٦ | كتێبی یەكەم: پێناسەو چییەتو سەر گوزشتەو سەرچاوەكانو گرنگیی: بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٤٧ | كتێبی دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٤٨ | كتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٤٩ | كتێبی چوارەم: پایەكانی بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٥٠ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | زنجیرەی: باچاکتر ئیسلام بناسین! | | ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە |
| ٥١ | ئاڵقەی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٢ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران «علیهم الصلاة والسلام» | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | |
| ٥٣ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٤ | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | | دوایی خرایە نێو کتێبی: (خواناسیی, ئایین, ئیمان) |
| ٥٥ | بیرو باوەڕ | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| | زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن، کە لە: (١٢) کتێب پێکهاتوە | | |
| ٥٦ | بەرگی یەکەم: واقیعی دژواری ئوممەت: هۆکارو چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠<br>چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٥٧ | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٥٨ | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگاو پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٥٩ | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | چاپی یەك/٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠٢١ | |
| ٦٠ | بەرگی پێنجەم: پایەکانی بووناسیی و، ڕوونکردنەوەی ئیمان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦١ | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی, تەزکیە, تەقوا | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٢ | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٣ | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦٤ | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەكیی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٥ | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٦ | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەكانی تەبایی و یەكڕیزیی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| ٦٧ | بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەكانی مسوڵمانەتییەكی ڕاست و هاوسەنگ | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | **فیقهی ئیسلامیی** | | |
| | **مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ)** | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٦٨ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاك و خاوێنیی | | |
| ٦٩ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٧٠ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |
| ٧١ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٧٢ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسوكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٧٣ | جەژن و یادو بۆنەكان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٧٤ | سروودو مۆسیقاو چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە كراوە |
| ٧٥ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزكیەی نەفس و ڕەوشت و ئاكار** | | |
| ٧٦ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٧٧ | ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی شەش/٢٠٢١ | وەرگێردراوە بۆ زمانی عەرەبیو فارسییش |
| ٧٨ | تەزکیەو تەبایی‌و، یەکرێزیی‌و برایی | چاپی یەك/١٩٩٨ | |
| ٧٩ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٨٠ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخانو، وازهێنان لە گوناە و سەرپێچیی‌و، گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی شەش/٢٠٢١ | |
| ٨١ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٨٢ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨٣ | گیانی ژیان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨٤ | مەوسووعەی: ڕەوشتو ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٨٥ | ئەدەبو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی‌و عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | **بانگەوازو کاری ئیسلامیی** | | |
| ٨٦ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٨٧ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێ‌یەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی چوار/٢٠٢٠ | |
| ٨٨ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٨٩ | بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٩٠ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٥ | |
| ٩١ | هەڵسەنگاندنو هەڵوێستمان لەم قۆناغەدا | چاپی یەك/١٩٩٥ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٢ | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| ٩٣ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٩٤ | بزووتنەوەی ئیسلامیی‌و ئاسۆیەكی گەش‌و ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| ٩٥ | ئیسلام‌و كێشە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٩٦ | زانایانی ئیسلام كێن‌و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٩٧ | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج‌و هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٩٨ | هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٩٩ | چۆن لە جیهاد تێبگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ١٠٠ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج‌و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ١٠١ | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین‌و لەسەر جەنگ كردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ١٠٢ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ‌و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ١٠٣ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك‌و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ١٠٤ | ئیسلام‌و مسوڵمانەتیی‌و كاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ١٠٥ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٠٦ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە: **ئاڵقەی یەکەم:** بەڵگەکانی ئەوانەی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان. **ئاڵقەی دووەم:** بەڵگەکانی ڕەوایی بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ١٠٧ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ١٠٨ | با لادانو تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵییو گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ١٠٩ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ١١٠ | هەڵوەشاندنەوەی پەڕگیریی | چاپی دوو/ ٢٠١٨ | کۆی سێ نامیلکەی پێشووە |
| ١١١ | بەرەو بانگەوازێکی ڕاستو ڕەسەن | چاپی یەك/ ٢٠١٩<br>چاپی دوو/ ٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن |
| ١١٢ | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/ ٢٠١٩<br>چاپی دوو/ ٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن |
| ١١٣ | کێ شایستەی مینبەرو میحرابە؟ | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | | |
| ١١٤ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١١٥ | ئاڵقەی دووەمو سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ١١٦ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| ١١٧ | چۆن گەشە بە کۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟ | چاپی یەك / ٢٠٢٠ | |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی دادگەریی کوردستان** | | |
| ١١٨ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١١٩ | راپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ١٢٠ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمانو واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠/ ٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٢١ | وتاری فیکریی‌و سیاسیی کۆمەڵی دادگەریی کوردستان/ ٢٠٢١/٢/١٨ | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| | **نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد** | | |
| ١٢٢ | کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٢٣ | مەسەلەی کورد چیەو چۆنو بەچی چارەسەر دەکرێ؟ | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٢٤ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ١٢٥ | سۆزی نەتەوایەتیی‌و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی چوار/٢٠١٨ | وەرگێردراوەتە سەر زمانی فارسیی |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٢٦ | چارەسەری كێشەی كورد لە نێوان ئیمانو پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| ١٢٧ | چەند ڕێنموویەك بۆ حاڵەتی ئیسلامیی لە كوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٢٨ | جەژنی قوربانو جەنگی قەڵاتووكان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | **سیاسەت و حوكمڕانیی** | | |
| ١٢٩ | چەند بابەتێكی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵاو وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | **مەوسووعەی: ئیسلامو دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ)** | چاپی یەك / ٢٠١٤ | |
| ١٣٠ | بەرگی یەكەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشتو بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ١٣١ | بەرگی دووەم: بنەمایەكانی سیستمی حوكمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ١٣٢ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەكان): یاسادانان جێبەجێكردن دادوەریی | | |
| ١٣٣ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ١٣٤ | ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ١٣٥ | قورئانو پاكسازییو چاكسازیی لە هەرێمی كوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣٦ | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/ ٢٠١٩<br>چاپی سێ/٢٠٢١ | |
| ١٣٧ | واقیعی دژواری ئوممەت: هۆكارو چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠<br>چاپی دوو/٢٠٢١ | دواتر خرایە نێو زنجیرەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن |
| ١٣٨ | سەركردایەتیی كردن لەئیسلامدا چیەو چۆنە؟! | چاپی یەك/٢٠٢١ | |
| **ئافرەت و خێزان** | | | |
| ١٣٩ | ئافرەتی مسولمانی كورد، مافە شەرعییەكانیو ئەركە گرنگەكانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٣ | |
| ١٤٠ | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەكەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| **مێژوو** | | | |
| ١٤١ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەكانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١٤٢ | چەند مەلۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەكانم)، بەشی یەكەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٤٣ | بەركولێكی كاروچالاكیی و ڕووداوەكانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێڕدراوە |
| **دیدارو گفتوگۆ** | | | |
| ١٤٤ | سنوورە قەدەغەكان مەشكێنن! (چاوپێكەوتنی دكتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٤٥ | ئەشكەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیركەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی كراوەو چاپ و بڵاوكراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوە |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٤٦ | گەنج لە چەمكە هەنووكەییەكاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | |
| ١٤٧ | گفتوگۆیەك لەگەڵ بابمدا | چاپی یەك ٢٠٢١ | |
| **زنجیرەی بابەتە هەنووكەییەكان** | | | |
| ١٤٨ | گەنجەكانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی‌و لاسایی كردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٤٩ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٥٠ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥١ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ‌و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٢ | سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٣ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٥٤ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی‌و چەند سەرنج‌و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٥ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٥٦ | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٥٧ | قوتابیان لەم هەل‌و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن‌و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٥٨ | واقیعی هەرێمی كوردستان ، دیدێكی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٥٩ | سروشت‌و پایەكانی خێزان‌و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع‌و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٦٠ | كاری ئیسـلامییو ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێـك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٦١ | حوكمی لە ئیسـلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسـەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٦٢ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەیو چەند سـەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٦٣ | لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوونو نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٦٤ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٦٥ | ڕەوەندی كورد لە هەندەرانو ئەركی سـەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٦٦ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسـەرێكی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٦٧ | گەنجو قەیرانی ڕووحیی: هۆكار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٦٨ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەكان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب/كـتێـبە عـەڕەبییەكـان** | | |
| | موسوعة : الإسـلام كما يتجلّى في كـتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | سەرجەم بەرگەكان كاركردن تێیدا بەردەوامە بۆ تەرجەمەكردنی بۆ سەر هەردوو زمانی توركیی و فارسیی |
| | كە لە چاپی یەكەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| ١٦٧ | الكتاب الأول: الإسـلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلـق | ط الثانية/٢٠١٦ | بۆ هەردوو زمانی توركیی و فارسیی وەرگێڕدراوە |

| ژ | كتێبەكان | بەرواروو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٦٨ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركیی و فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٦٩ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركیی و فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٧٠ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | بۆ هەردوو زمانی توركیی و فارسیی وەرگێڕدراوە |
| ١٧١ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٧٢ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٧٣ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوَّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٧٤ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٧٥ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٧٦ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| ١٧٧ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٧٨ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٧٩ | نقض فكرة التطرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | ترجم إلى اللغات: الفارسية والإنجليزية والتركية |
| ١٨٠ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٨١ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٨٢ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٨٣ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| ١٨٤ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٨٥ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٨٦ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى / ٢٠١١ | |
| ١٨٧ | علماء الإسلام: أوصافهم النّبيلة، وظائفهم الثقيلة، مواقفهم الجليلة | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| ١٨٨ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٨٩ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٩٠ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى<br>والثانية/٢٠١٨ | |
| ١٩١ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| ١٩٢ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ١٩٣ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأُمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| | ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ١٩٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سوورەتی: (الناس) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ تاکو هەمووی چاپ دەکرێ | | |
| ١٩٥ | قورئانو سوننەت وەك ڕووحو جەستە تێکهەڵکێشن | | |

# کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
# مامۆستا عەلی باپیر



- ناو: عەلی باپیر وەتمان.
- لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز) دا لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.
- زانستە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی لە (ڕانیەو سلێمانیی)و لە لای زانایانی کوردستانی عێراق و «دواتریش کوردستانی ئێران» بەدەستهێناون، هەروەها لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەرزو بەپێزی لەبەر کردوە.
- لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، لە کۆلیجی شەریعەت.
- لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی

داوەو، لــە مزگەوتــی (نۆڕسـیی) لــە شــاری ڕانیــە دامــەزراوەو، بــەردەوام بــووە لەســەر دەرس گوتنــەوەو بانگــەوازی ئیســـلامیی و...هتد.

- یەکەمیــن بەرهەمــی لەســاڵی: (١٩٨٣)زدا نووســیوە بەنــاوی: (پوختەیــەك دەربــارەی ئیســلام) پاشــان کتێــبو بەرهەمەکانــی بــەردەوام بــوون کــە ئێســتا ژمارەیــان لەســەد (١٠٠) تێپەڕیــوە، لــە مەوســووعەو کتێــبو نامیلکــەو، بەزمانــی کوردیــیو عەڕەبیــیو، هەندێــك لــە کتێبەکانیشــی کــە بەزمانــی کوردیــی نووســیونی، بــۆ زمانەکانــی: عەڕەبیــیو، فارســییو، تورکیــیو، ئینگلیزییــش وەرگێــڕراون.
- لەســاڵی (١٩٨٧ز)دا پــاش ســاڵانێك لــە خەباتــی ئاشــکراو نهێنیــی پەیوەســت لەگــەڵ بزووتنــەوەی پەیوەندیــی ئیســلامییدا، کــە لەکۆتایــی حەفتایەکانــی ســەدەی پێشــوودا ڕێکخســتنە نهێنییەکانــی دامــەزران، چۆتــە چیــاو دەســتی بەخەباتــی چەکداریــی کــردوە لــە چوارچێــوەی بزووتنــەوەی ئیســلامییدا، کــە لەچەنــد ناوچەیەکــی کوردســتاندا بنکــەو بــارەگای ســەربازیی هەبــوو دژی ڕژێمــی بەعــسو، هێــزی حەمــزەی لــە بنــاری چیــای قەندیــل دامەزرانــد.
- لــە ســاڵی (١٩٨٨ز)دا بــووە بــە ئەندامــی مەکتەبــی سیاســیی بزووتنــەوەی ئیســلامیی.
- لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵــی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری هەمان ساڵداو وریاکردنــەوەی خەڵکــی کوردســتان، لــە مەبەســتو ئامانجەکانــی ڕاپەڕینــی جەماوەریــیو ناســاندنی بزووتنــەوەی ئیســلامییدا.

- تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەکۆی دەنگی ئەندامانی سەرکردایەتیی بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.
- لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزیندانەدا مایەوەو، هەر لەزیندانەدا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێبو زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسییو، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بوو.
- تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێبو نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامییو عەقیدەو فیقهو حوکمو سیاسەتو تەزکیەی نەفسو ئەخلاقو، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکانو...هتد)دا.
- لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.
- کۆمەڵی دادگەریی تائێستا چوار کۆنگرەی بەستوون، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) (٢٠٢١)داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر و سەرۆک هەڵبژێردراوەتەوە.

- لـــە (٢٠٠٧/٩/١٣) پـــرۆژەی تەفـــسیرکردنی قورئانـــی بـــەرزو بەپێـــزی دەســـتپێکردو، لـــە (٢٠٢٠/٨/٢٩) کۆتایـــی پێهـــاتو ئێـــستاش زۆربـــەی چـــاپو بڵاوکراوەتـــەوە و ئـــەوی دیکەشـــی لەژێـــر چاپـــە.

بـــۆ زانیاریـــی زیاتـــر لەســـەر ژیانـــی دانـــەر، ســـەردانی لینکـــی خـــوارەوە بکـــەن:

 www.alibapir.com

 / alibapir  / alibapir1  / Ail Bapir's Media Office



قورئانی مەزن ئاڵقەی: (1)

Ali Bapir / عەلی باپیر
facebook.com/alibapir

26:41 / 52:11

پێشکەشکردنی زنجیرە دەرسی: (قورئانی مەزن) لەلایەن مامۆستا عەلی باپیرەوە، کە پێکهاتووە لە: (20) دەرس لە ڕۆژانی : (٢٨ – ٨ – ٢٠٢٠) تاکو: (١٨ – ٩ – ٢٠٢٠).






https://www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwuVOtq1vnlNWp2eZvwO90pe

# نێوەڕۆک


AliBapir
archive.org/details/@alibapir
www.alibapir.com

# قورئانی مەزن

توێژینەوەیەکە لەبارەی کتێبی بەرزو بەپێزی خوا (قورئان)ەوە، لەژێر نۆزدە (19) ناو و نیشانی جیاجیاداو، دەتوانم بڵێم: سەرجەم ئەو بابەتانەی زانستەکانی قورئان (علوم القرآن)یان لێ پێك دێن، گرتوونیە خۆی.

هیوادارم مایەی بەرچاوڕوونییەکی تەواوبێ، بۆ هەرکەسێك بیەوێ بەقورئان ئاشنا بێ و بزانێ:

1- قورئان یانی چی و، چییەو چۆنەو، حیکمەتی دابەزرێنرانی چییە؟

2- قورئان چۆن دابەزرێنراوەو کۆکراوەتەوەو، لەدوو توێی موصحەفدا بەرجەستەبووە؟

3- قورئان خوێندنەکان (القراءات) چەندن و چۆنن و، حیکمەتی جیاوازییان چییە؟

4- پێویستە چۆن قورئان بخوێنین و، هەرچی قووڵترو ڕاستتر لێ تێبگەین؟

5- ئەدەب و ئاکارەکانی مامەڵەی شایستە لە خزمەت قورئان چی و چیین؟

هەروەها لەم کتێبەدا بەدرێژیی لێ کۆڵینەوە لەبارەی چۆنیەتی تەفسیرکردنی قورئان و تەفسیرە باوەکانەوە کراوەو، بابەتی هەبوون و نەبوونی (نسخ)یش لەقورئاندا لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلی لەبارەوە کراوە.


www.alibapir.net


/alibapir1


/alibapir




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

